# ئەڤینی ئیمان

فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی

بەرگی دووەم

١٤٣٦ ک - ٢٠١٤ ز

منتدى اقرأ الثقافي
www.iqra.ahlamontada.com

ناوی کتێب: نەڤینی نیمان

بابەت: وتار بەرگی دووەم

نووسەر: فاتح مەلا ڕەسول شارستێنی

دیزاین: جەمل دەروێش

چاپی یەکەم

تیراژ: ٥٠٠ دانە

چاپ: چاپخانەی پیرەمێرد

# پێڕست

وتاری یەکەم بۆمانگی شەعبان

# پاراستنی دین

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعلى آلِهِ وَصَحْبِه أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: لەم وتارەدا بە پشتیوانی خوای پەروەردگار لەخزمەت برگەیەکی تری باسی (ئیسڕا و میعراج)ی پێغەمبەری خۆشەویستماندا دەبین کە دەفەرموێ:** (ثُمَّ خَرَجْتُ، فَجَاءَنِي جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلَام بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ، وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ، فَاخْتَرْتُ اللَّبَنَ، فَقَالَ جِبْرِيلُ: اخْتَرْتَ الْفِطْرَةَ). رَوَاهُ مُسْلِم

**واتە: پاشان دەرچووم لەوێ و جوبریل هات بۆلام و قاپێ شەراب و قاپێك شیری نیشان دام و فەرمووی یەکیان هەڵبژێرە، منیش شیرەکەم هەڵبژارد. جوبریل فەرموی: فیطرەتت هەڵبژارد.**

**ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ:** (إِخْتَرْتَ عَلامَةَ الإِسْلام وَالإِسْتِقامَةِ).

**واتە: کاتێ جوبریل فەرمووی: فیطرەتت هەڵبژارد. واتە نیشانەی ئیسلام و دامەزراویت هەڵبژارد کە شیر نموونەی ئیسلام و ئیستیقامەیە...**

**بەڵێ ئیسلام وەکو شیر وایە. باشە کێ هەیە قەرزاری شیر نەبێ و یەکەم شتی چووبێتە سەر دەم و زمان و ناو گەدەی مرۆڤ، لەناو تەواوی خواردن و خواردنەوەکانی سەر زەویدا بریتییە لە شیر. هیچ کەسێ نییە بڵێ: ڕۆژێ لە ڕۆژان منداڵێك شیری بە هیچ**

جۆرێك نەخواردوە. تەنانەت ئەگەر كەسێك لە دوای لەدایكبوونییەوە شیری پێ نەدرابێ و بەشتێكی تر گۆش كرابێ، ئەوە بە نمونەیەكی سەرسوڕهێنەر و نامۆ دێتە بەرچاو.. بەڵێ ئەو كەسەی كە ئێستا گەورە بوە و ماست و شیریش ناخوات، هەر بەشیر بەخێو كراوە!..

بەڕێزان: زۆر وێكچون (تەشبیه) لە نێوان شیر و ئیماندا هەیە، بۆ نموونە:

شیر دەبێ ئاگادار بی نەبزڕكێ بە سەرما و گەرما، ئەینا بە كەڵك نامێنێ. ئیسلامیش دەبێ زۆر بە جوانی پارێزگاری لێ بكەی. نەهێڵی تەوژمی بێ دینی چەپ و ڕاستی بەربكەوێ، بۆ ئەوەی عەقیدەكەت بە پوختی بمێنێتەوە.

- شیر دەبێ دەستێكی خاوێن بیدۆشێ و هەوێنی بكات. ئیسلامیش دەبێ كەسی دڵسۆز و دڵپاك بڵاوی بكاتەوە.

- هەرچی ئاكار و ڕەوشتی جوانە هی ئیسلامە هەروەكو هەرچی شیرینی و چوكلێت و پسكیت و ساردەمەنی خۆش و نایاب هەیە، هەمووی بەرهەمی شیرە.

كەواتە: ئیسلام = شیر = فیطرەتی پاكی مرۆڤایەتی..

ئیمانداران: یەكێ لەسوڕەتەكانی قورئان، ناوی سوڕەتی (محمد)ە. لەو سوڕەتەدا باسی شیر كراوە. لەو ئایەتەدا كە دەفەرموێ: ﴿ مَّثَلُ ٱلْجَنَّةِ ٱلَّتِى وُعِدَ ٱلْمُتَّقُونَ ۖ فِيهَآ أَنْهَٰرٌ مِّن مَّآءٍ غَيْرِ ءَاسِنٍ وَأَنْهَٰرٌ مِّن لَّبَنٍ لَّمْ يَتَغَيَّرْ طَعْمُهُۥ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ خَمْرٍ لَّذَّةٍ لِّلشَّٰرِبِينَ وَأَنْهَٰرٌ مِّنْ عَسَلٍ مُّصَفًّى ۖ وَلَهُمْ فِيهَا مِن كُلِّ ٱلثَّمَرَٰتِ وَمَغْفِرَةٌ مِّن رَّبِّهِمْ ۖ كَمَنْ هُوَ خَٰلِدٌ فِى ٱلنَّارِ وَسُقُوا۟ مَآءً حَمِيمًا فَقَطَّعَ أَمْعَآءَهُمْ ﴾ محمد: ١٥

واتە: وێنەی ئەو بەهەشــتەی کە بەڵێن دراوە بدرێت بە خواناس و پارێــزکاران، ئەمەیە: چەندەها ڕووباری لە ئاوی ســازگار و تام و نەگــۆڕاوی تێدایــە. هەروەها چەندەها ڕووباری شــیر کە تامی تێك نەچووە. هەروەها چەندەها ڕووبار لە شــەرابی تامخۆش و بۆنخۆش. (کە لە خواردنەوەی بێزار نابن و لەبەرچاویان ناکەوێت) بۆ ئەوانەی دەیخۆنەوە. چەندەها ڕووبار لە هەنگوینی پاڵفتە و بێگەرد. هەروەها بۆیان هەیە لەو بەهەشتەدا لە هەموو جۆرە بەرووبووم و میوەیەکی جوان و بەتام و بۆنخۆش. هاوکات لەگەڵ لێخۆشبوون و خۆشەویستی پەروەردگاریاندا، ئایا ئەو بەختەوەرانە وەکو ئەو کەسانە وان کە لە ناو ئاگری دۆزەخدا نەمرن و ئاوی لەکوڵ دەکرێت بەگەروویاندا، کە ڕیخۆڵەکانیان پارچە پارچە و توێ توێ دەکات؟!.

بەڵێ بەڕێزان: لەســورەتی محمددا باســی شــیری بەهەشتمان بۆ دەکات، خــوای گــەورە پێمان ببەخشــێ. کە بە ڕاســتی ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە: وەکو شیر محمد (ﷺ) پێویستە بۆ ژیان و کەس لە شیر بێ ئیحتیاج نییە.. کەسیش نییە قەرزاری ئەو محمدە (ﷺ) نەبێ.

هەروەکو گۆشــت و ئێســقان و مۆخ و عەقڵ و هەموو لاشــە بە گشتی، هەمووی بە هۆی شیرخواردنی کۆرپەوە لە دایکی زیاد دەکات و درووست دەبێ و گەشە دەکا و گەورە دەبێ، ئاواش هەرچی فەزیلەت و چاکی و پاکی و جوانی و ڕێز و وەفا و خۆشەویستی و ئەمانەت و دڵســۆزی و پوختی سەر ئەم زەوییە هەیە. سەرچاوەکەی ئیسلامە و پێغەمبەری ئیسلامە (ﷺ).

پاشــان ســەرنج بدەن: شــیر دەســتی مرۆڤی تێدا نییە و هەموو بەشــەریەت کۆببنــەوە ناتوانن ئەو دڵۆپە شــیرەی کــە لە مەمکی ئافرەت یان گوانی شیردەرێك دێتە دەرەوە، کە هەر پارچە گۆشتێکە لەو لاشــەیە، بتوانن لەو هەموو گۆشتەی لاشە تەنها یەك دڵۆپ شیر دەربێنن، دەی هەروەکو چۆن شــیر دەستی مرۆڤی تێدا نییە، ئاواش ئیسلام و پەیامی قورئان دەستی مرۆڤی تێدا نییە و لە لایەن خوای گەورەوە بە خەڵات پێشکەش بە مرۆڤ کراوە.

ئەمجا تەماشاکەن: چۆن ئەگەر کەسێك بیەوێ شیری دایك نەدا بە منداڵ و شیری قوتوی بداتێ، یان شیری سروشتی نەخوا و شیری قوتوی وشك بەکاربێنێ. وە بڵێ ئەوە نییە، شیری خواکردیشم بەکار نەهێنا و ئەو شیرەی بە دەستی مرۆڤ دروستکراوە جێگەی گرتۆتەوە و هیچ عەیبی نییە. دەی بەهەمان شــێوە مرۆڤ دەتوانێ ئیســلام نەکات بە بەرنامەی ژیانی و بەرنامەی دەستکردی مرۆڤ بۆ خۆی هەڵبژێرێ و هیچ عەیبیشی نەبێ و پێی بژی و ژیانی بەڕێوە بباتا!.. لە وەڵامدا دەڵێیــن: ئەمە لە ڕووکەشــدا ڕاســتە. بەڵام ئەگــەر بگەڕێینەوە بۆ ناوەڕۆك دەبینین کە: هەرچی شیری وشك و لە قوتوکراوە. بەشێکی سەرەکی پێکهاتەکەی لە شیری سروشتی وەرگیراوە و ئەمجا کۆمەڵێ شــتی تری تێکــراوە و ئاڵوگۆڕی بەســەردا هێنراوە و لــە بەرگێکی ســەرنجڕاکێش کراوە و پێشــکەش کراوە. بە هەمان شــێوە، هەموو بەرنامە دەســتکردەکانی مرۆڤیش، بەشی هەرە گەورەی پڕەنسیب و بنەماکانیان، بڕگە بنچینەکانی یاساکانیان هەر لە ئیسلام وەرگیراوە

و ئەمجــا شــتی تری لەگەڵ تێکەڵ کــراوە و داڕێژراوەتەوە و ئەوەی لــێ دروســت کراوە!!.. بــەڵام ئایا: هەر ئەوانەی کە شــیری ڤوتو بۆ منالّەکانمــان ئامادە دەکەن و لە تــەواوی جیهانەوە هاوردەی وڵاتان دەکرێ، ئایا هەمووی لە ســەری نەنوسراوە: شیری دایك باشترینە و هیچ شــتێ نیە جێگەی شیری دایك بگرێتەوە. مەگەر کەسێك دایکی لەدەســت دابێ و لە ناچاریدا، پەنا بۆ ئەم شــیرە دەستکردە ببات و ژیانی خۆی پێ ڕزگار بکات. دەی بە خوا بە هەمان شێوە، هیچ شتێ نیە. هیچ بەرنامە و ئایدۆلۆژیا و پەیڕەوو پرۆگرامێك نییە لەســەر زەویدا، کە جێگرەوەی ئاینی حەقی خوا بێ کە ئیســلامە. بە ڕاستی ئەم عەلمانیەت و فلان و فیســارە. بۆ ئەو کەســانە باشــە کە دینی حەقیــان لەدەســت داوە، وەکو گاور و جولەکــەکان. کە دینی حەقی خۆیان لێ شــێوا. دایکی ڕاســتەقینەیان مرد. ئەمجا بۆ بەڕێوەبردنی ژیانیان پەنایان بۆ عەلمانیەت و دیموکراســی و سۆسیالیستی و فلان و فیســار برد!! بەڵام توخوا دایکێك هەردوو مەمکی پڕ بێ لەشیر و لێی بچوڕێتەوە، منالّەکەی بە ئاسانی و بە پوختی لە شیری خاوێنی بێوێنــەی دایکی تێر بخوات. کەچی ئەم مالّە بچن شــیری ڤوتوی بۆ بکرن و نەهێلّن ئەم منالّە پاکە شیری دایکی خۆی بخوات، کە لەگەڵ خولــەك بە خولــەك و ڕۆژ بــە ڕۆژی ژیانیدا گونجــاوە و لەگەڵیدا دەڕوات، ئایا لەلایەن هەموو دکتۆر و پسپۆڕان و شارەزایان و خەڵکی ئەکادیمــی و بلیمەتــەوە ســەرکۆنە ناکرێ و کارەکەی بە شــێتانە و گەمژانە و لاساییکردنەوەی کوێرانە ناونابرێ؟!!

دەی سـوێند بەخوا. هەرکەسـێکیش لە ناو موسـڵماناندا، کە ئەو قورئان و سوننەت و شەریعەتە پاکەی ئیسلام هەیە. بچێ پەنا بباتە بـەر مەنهەج و ڕێبازێکی تر و ڕازی بێ بە شـوێنکەوتنی کەسـێکی تر غەیری (محمد المصطفى) (ﷺ) ئەوە حاڵی لەو کەسـە خراپترە کە ناهێڵێ منداڵەکەی شـیری دایکی بخوا و بە شیری قوتوو بەخێوی دەکات و نەك هەر بە ڕۆشنبیر و پێشکەوتوخواز ناناسرێ. بەڵکو لە لایەن پسـپۆڕان و شـارەزایان و خوێندەوارانەوە بە گێل و گەمژە و لاساییکەرەوە دەناسرێ و سەرگەردان و سەرلێتێکچووە..

بەڵـێ بەڕێزان: لەفەرمودەکەدا باسـی (عەرەق و شـەراب -خمر-یشی) کرد، کە نیشانەیە بۆ ئەو پەیڕەو و پڕۆگرامەی کە مرۆڤێك بۆ مرۆڤەکانی تری دادەنێ و لە جیاتی مەنهەجی خوای خالیق کە -الله-یە، دەیەوێ ئەو خەڵکە لەسەر ئەو بیروبۆچوونەی ئەو بڕۆن! باشە چ لێکچونێك لە نێوان عەرەق و بەرنامە دەستکردەکانی مرۆڤدا هەیە؟!

ئیمانداران: هەروەکو چۆن عەرەق و شـەراب مرۆڤ سـەرخۆش و بێهۆش دەکەن و ئەو عەقڵەی کە جیاکەرەوەی نێوان مرۆڤ و ئاژەڵە، لادەبـەن و پەردەی بە سـەردا دەدەن و ناهێڵـن کاربکات. وە مرۆڤ کە سـەرخۆش بوو. ئاگای لە خوای خۆی نامێنێ نازانێ نوێژ چییە و عیبـادەت و یـادی خوا چییە و چی بکا و چـی بڵێ کە خوا پێی ڕازیە. یان لە چی خۆی بپارێزێ کە خوا پێی ناخۆشە. ئەمانەی ئاگا لێنامێنێ بە هۆی سەرخۆشـییەکەیەوە. وە پاشان مرۆڤی سەرخۆش شـتێك ناناسـێ بە ناوی حەڵاڵ و حەرام و نازانێ هێڵی سـور چییە

و کامــە ســنوری ئازادی ئەوە و لــە کوێدا کۆتایی دێــت. بە هەمان شــێوە بەرنامەی دەســتکردیش کە لە شــوێنی شــەریعەتەکەی خوا دانرا و حیســابی بۆ پەیامی خوا نەکــرد. ئەوە هەروەکو عەرەقەکە، ئــاوا مرۆڤایەتــی دوور دەخاتەوە لە پــەروەردگاری و لە بەندایەتی خوای دروســتکەر و بەدیهێنەر و ڕۆزیدەرەوە. دەیبات بۆ بەندایەتی بەندەیەکی وەکو خۆی!! ئەگەر کەسێك بڵێ: باشە چۆن مرۆڤ ئەگەر لــە بەندایەتی خوا دوور کەوتەوە دەبێتــە کۆیلەی خەڵکی. خۆ ئەو هەموو خەڵکە لەسەر بەرنامەی دەستکرد دەڕۆن و کەسیشیان کۆیلە نین؟! لە وەڵامدا دەڵێیــن: کۆیلایەتی و بەبەندەکردنی جاران تەنها بەســەر لاشە و جەستەی مرۆڤەکەدا دەسەڵات و توانای هەبوو. کاری پێ دەکرد، شەڕی پێ دەکرد، دەی فرۆشت، دەی کڕی. بەڵام نەیدەتوانی دەســت بەسەر عەقڵ و بیروبۆچوون و بیرکردنەوەی ئەو کۆیلەیەدا بگرێ. شتێکی بەڵگەنەویستە کە بیلالی حەبەشی و صوهەیبی ڕۆمی و خەبابی کوڕی ئەرەت. کۆیلە بوون. بەڵام ئومەیە و ئەبوجەهلەکان بــەو هەموو زەبــر و زەنگەی کە هەیان بوو. نەیان دەتوانی دەســت بەسەر بیروهۆش و بیرکردنەوەکەیاندا بگرن و وەکو بوونە خاوەنی لاشە و جەستەیان بشبنە خاوەنی عەقڵ و بیرکردنەوەیان. ئەو کۆیلە بێکەســانە، ســوور بوون لە ســەر بیروباوەڕەکەیان. بەڵام ئەمڕۆ بە پێچەوانــەوە لە بەرنامەی دوور لەخواییدا. مرۆڤ جەســتەی ئازادە، گیرفانــی ئــازادە، بەرهەمی کاری خۆی هــی خۆیەتی، بەڵام لەولاوە عەقڵــی، دیــد و بۆچوون و بیرکردنــەوەی کۆیلەی کەســێکی وەکو

خۆیەتـــی! ئەویـــش بەوەی ئەم هەموو کار و جـــوڵان و چالاکیەکانی بە بۆچوون و هەنگاو و هەڵوێســـتی ئەو کەســـەوە بەندە کە بەرنامە و یاســـا و ڕێســـای ژیانی بۆ دادەنێ. شـــەڕی پێ دەکات و پرســـی پێ نەکردوە. پەیمانی ئاشـــتی دەبەســـتێ و دیسان پرســـی پێ نەکردوە، لە هیچیشـــیاندا، نە شەڕەکە و نە ئاشتییەکە. ئەم کەسە کە کۆیلەی عەقڵە، نازانێ بۆ شەڕ بوو. لەسەر چ بنەمایەکیش ئاشتی بوو! دەیان ساڵ دەڵێن ئەم مەنهەج و پەیڕەو و پڕۆگرامە باشە و خەڵکی لەسەر پـــەروەردە دەکرێ. کەچی دوای ئەوە دەڵێن، ئەوە بەســـەرچوو. باوی نەماوە لە جیهاندا و کتێبەکان لەناو بەرن و لەبیر خۆتانی بەرنەوە!! دیسان ئەم کەسە شوێن کەوتوە. هەر نازانێ بۆچی وا بوو. هەر بەڵێ و قوربانی لەســـەر بوو. ئایا ئەمە کۆیلایەتی نییە؟!! پاشـــان کۆیلەی زەمانی پێشـــوو، کە هەر جەســـتە و لاشـــەی کۆیلە بوو. بەردەوام لە هەوڵی خۆڕزگارکردندا بوو، شەو و ڕۆژ بیری لە لای ئەوە بوو چۆن ئەو تەوقی کۆیلایەتییە لە ملی داکەنێ و نیری کۆیلەیی لەسەر شانی لابەرێ، پارەی کۆدەکردەوە و خۆی دەکڕیەوە، یەکێکی وەکو (وەحشی حەبەشـــی) ئامادە بوو لە پێناو ئازادبوونیدا لە کۆیلایەتی، حەمزەی پاڵەوانی ئیسلام بکوژێ و جەرگی دەربێنێ!! کەچی ئەمڕۆ لە سایەی بیردۆزەی مرۆڤکردا، کە لە جێگای شەریعەتی خوایان داناوە، مرۆڤی عەقڵ کۆیلە ڕۆژ بەڕۆژ تەوقی کۆیلایەتیەکە لەگەردنی توندتر دەکات و وەکو مەدالیا دەیکات بەیەخەی خۆیەوە! سبحان الله چ دەربڕینێکی بەهێزە، (شیر و شەراب)، شیر ڕەمزی فیطرەت و پاکی و خواناسی و

بنیاتنان و پێگەیاندن و تێگەیاندن و بالآبوون و بەبەرهەم گەیشتن، شــەڕاب و عەرەقیش ڕەمزی بوون بە کۆیلە و لەدەســـتدانی عەقڵ و ســفرکردنی بیروهۆشـــی خود و بیرکردنەوە و تێڕامان بە عەقڵ و فکری کەسانێکی تر کە وەکو خۆت مرۆڤن...

بەرێـــزان: عـــەرەق و عەرەقخانە یەکێ لـــە صیفاتەکانی ئەوەیە: هەندێ کەس لە سەری دەژین و لێی سودمەند دەبن لەباری دارایی و ماددییەوە، بە بازرگانی پێکردنی و کڕین و فرۆشتنی. بەڵام هەمووی لەســـەر حیســـابی گیرفان و عەقڵ و هۆشـــی هەزاران کەس کە ئەو عەرەقە دەخۆنەوە.

بە کورتی: عەرەق هەندێ دەوڵەمەند دەکات و بە هەزارانیش سەر بەقوڕدا دەکات و بێدین و بێژینیان دەکات. تووشی بێفەرمانی خوایان دەکات. کـــە خوا دەفەرموێ: عەرەق پیســـە و مەیخۆ، ئەم دەیخوات. تووشـــی کێشـــەی خێزانی دەکات و بەدەمی بۆگەن و وەکو کەلاك لە نیوەشـــەودا خۆی دەکاتەوە بە ماڵدا و بەســـەر ژنی بێتاوان و منالی چاوگەشی بەســـەر زماندا دەرشێتەوە و دەگرمێنێ و وڕێنە دەکات و ژیانیان لێ تاڵ دەکات، چەند ماڵ هەیە موحتاجن بە ژەمێ خواردنی بـــاش کەچی کابرا لە ســـەر مێـــزی عەرەق مووچـــەی مانگێکی بۆ هاوڕێکانی دەکات بە دەعوەتی نادی!!! زۆرجار ژنە تەحەمولی نامێنێ و بە تەلاق و جیابوونەوە خۆی ڕزگار دەکات.. ئەی ئەو هەموو کێشەی ڕێگاوبان و کارەساتی ئوتومبێلە بە هۆی سەرخۆشەکانەوە ڕوودەدات. ئەی ئەو هەموو ژینگە و ســـەیرانگا جوانانە، بەهۆی شوشەی عەرەق

و پاشماوەی عەرەقخۆرانەوە پیس دەبێ و کەسانی خاوەن کەسایەتی و بەڕێز لە ســەیران و گەشتی حەلاڵ بێبەش دەبن.. باوەڕ بکەن کە بەرنامەی دەســتکردیش کە لە جێگای شــەریعەتی پاك و بێگەردی ئیســلام دادەنرێ، ڕێك وەکو عەرەق، ئــاوا کۆمەڵێك پێی دەوڵەمەند دەبــن و بــەرز دەبنەوە و هەزاران کەس دەکەن بە پەیژە و بەســەر کەللەســەر و خوێن و ماندووبوونی ئەواندا دەچنە ســەرەوە. یاسای مرۆڤکرد خەڵکانێك دەکات بە گەورە و خەڵکانێکیش بە خزمەتکار. ئەمە لە کاتێکا لە ئیســلامدا خەڵکی هەموو یەکســانن. پێغەمبەری ســەروەر فەرموویەتی: (النّاسُ سَواسِـيَةٌ كَأَسْنانِ المِشْـطِ)، خەڵکی وەکو دانەکانی شانە یەکسانن.. بەڵێ بەرنامەی دوورلەخوایی و پێچەوانەی شــەریعەت، وەکو عەرەق و مادەی هۆشــبەر خەڵکی پێ بەنج دەکرێ و ئەمڕۆ ئەوە باشــە و بەیانی بــە کەڵك نایەت. ئای چەندین کەس کــە عەرەقیان نەخواردۆتەوە. (وَماهُمْ بِسُــكارى) کەچی لە ئاهەنگ و حەفلەی حیزبەکاندا وەکو سەرخۆش هەر خەریکی چەپڵەلێدان و هەڵپەڕین و سوڕدانە و نازانێ چ باشە و بۆچی باشە!.. (خوای گەورە بمانپارێزێ).

ئیمانــداران: بانگــەوازی خوای پــەروەردگار بۆ ئێمــەی ئیماندار ئەمەیــە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ يَحُولُ بَيۡنَ ٱلۡمَرۡءِ وَقَلۡبِهِۦ وَأَنَّهُۥٓ إِلَيۡهِ تُحۡشَرُونَ ﴿٢٤﴾ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةٗ لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةٗۖ وَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ شَدِيدُ ٱلۡعِقَابِ ﴾ الانفال: ٢٤-٢٥

بەڕێزان: ئەم ئایەتە قورئانیە هاوکێشەیەکمان دەداتێ بەم شێوەیە:
وەلامدانــەوەی خوای پەروەردگار (بە گوێکردنی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) = زیندویەتی = بەختەوەری..
بــە پێچەوانەشــەوە: ژیــان بە بــێ دین = مردوویی بە حیســاب زیندوو!..

چونکە: کە دین نەما، ڕەوشــتە بەرز و بالاکان یان کەم دەبنەوە، یــان کاڵ دەبنەوە، ویــژدان ئەمرێ، چونکە ویژدان وەکو پاتریەك لە ناخی هەموو کەســێکدا هەیە. بەلام ئەگەر دین و ئیمان ڕۆژانە ئەم ویژدانە لە ناخی مرۆڤدا شــەحن نەکاتــەوە، ئەوا دەمرێ. هەروەکو پاتــری ئەگەر شــەحن نەکرێتــەوە دەمرێ. ئەگەر دیــن و ئیمان و خواناسی لە دڵەکاندا نەما، ڕەحم و بەزەیی و سۆز نامێنێ، سیاسەت و بەڕێوەبردنــی وڵات ئەبــێ بە درۆ، شــەرم و شــکۆ کاڵ دەبێتەوە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ لِكُلِّ دِينٍ خُلُقًا، وَخُلُقُ الإِسْــلاَمِ الْحَيَاءُ). هەموو ئاینێك ڕەوشــتێکی تایبەت بە خۆی هەبوە، ڕەوشــتی ئیســلام بریتییە لە شــەرم و شــکۆ ئەگەر دین و ئیمان لە مەیدانی ژیاندا نەما، ســیلەی ڕەحم و پەیوەندیــە کۆمەلایەتییەکان نامێنن.
لە (پشووی کوردستانی نوێ)دا نوسرا بوو: لە وڵاتی (مەکسیك) ژنێك کە خاوەنی (٤٠٠) هەزار دۆلار بوو، لە دادگادا وەســیەتی کردبوو، کە ئەگــەر مرد، ئەو ماڵ و خانوەی تێیــدا دەژی، لە لایەن حکومەتەوە بدرێ بە (٤) سەگ و (١٢) پشیلەکەی و لە خەرجی خواردن و دەرمان و دکتۆر و ژیانی ڕۆژانەیان!!!!

بەڵام سوپاس بۆ خوا لە سایەی ئیماندا، لە ناو خێزانی موسڵماندا، کاتـێ دایە گەورەیەك، باوە گەورەیـەك نەخۆش دەکەوێ، لە ماڵەوە بـێ یان لە نەخۆشـخانە، پەنجا کوڕ و کچ و کـوڕەزا و کچەزای بە دەورەوەیـە و هەمووی لە خزمەتیایەتی و خەمی دەخوا و دڵنەوایی دەکات. وا دەکات کە ئەم بە تەمەنە سەرسـپییە، ڕیشسـپییە. هەست بە غەریبی و بەساڵاچویی نەکات. هەست بە ئازاری نەخۆشی نەکات. دڵشاد بێ، کامەران بێ، خۆی بە پاشا بزانێ لە نێوانیاندا.. هەموومان شـایەتین ئا لەم کوردستانەی خۆماندا هەتا ئیمان بەهێز بوو لە ناو دڵەکانـدا، هەرچەندە خەڵکـی هەژار بوون. بێپارە بـوون. بێپارە و پارووی چەور بوون. ماڵ و خانویان کەم و بچکۆلە بوو. بەڵام توخوا بیستراوە بەساڵاچویەك بخرێتە خانەی بەساڵاچوان. کە هەر نەبوو. چونکە پێویست نەبوو ببێ، بەڵام بەداخەوە، سەدجار بەداخەوە، کاتێ ئیمان و ئەم بیروباوەڕە ئیسـلامەتیە جوانە لە دڵەکان و ماڵەکان و ڕەوشت و ئەخلاقەکەماندا کز و کاڵ بۆوە. ویستمان چاو لە ڕۆژئاوا و بێدینەکان بکەین، بۆ ئەوەی ئاسودە بین و پێشکەوین نەك هەروەکو ئەوان لـە لایەنی مادییـەوە پێش نەکەوتین، سـەرمایە گەورەکەی خۆمـان کـە بریتییە لە بیروباوەڕی خاوێن بـە خوا و پێغەمبەر و قورئان و شـەریعەتی ئیسلام و بوونی قیامەت و بەهەشت و دۆزەخ، کـە بەرهەمی ئەم ئیمانەش بریتی بوو لە ڕەحم و بەزەیی و سـۆز و میهرەبانی و دڵنەرمی و خۆشەویسـتی و خەڵکویسـتی و ئاشتی و تەبایی و ڕێزگرتن لە گەورە و بەزەیی بە بچوك و ساوا و خۆشەوستی

نیشتمان و خاك و ئاو و ژینگەی وڵات و ئارامی دڵ و دەروون و لەشی ساغ و دڵی پاك و بیری ڕووناك. بە داخەوە ئەمانەشمان لە دەست دا و خانەی بە ساڵاچوان خەریکە جێگای نامێنێ. لەبەر دایك و باوکی پیـــر و پەککەوتـــە کە خاوەنی چەندین کـــوڕ و کچن و کەس ئامادە نییە بەخێویان بکات. لە گۆڤارێکدا ئامارێکی ســـاڵی (٢٠١١)ی تێدا بوو دەربارەی بەساڵاچوان، نوســـرابوو لەو ساڵەدا: (٢١) پیاوی بەساڵاچوو لــــە لایەن ژن و منداڵەکانیەوە لەماڵ دەرکراون!! واتە: ئەوەشـــیان پێ ڕەوا نەبینیون کە تەســـلیم بە خانەی بە ساڵاچوانیان بکەن. لە ماڵ دەریـــان کردوونەتە ئەودیو دەرگا و ئیتر لێیان نەپرســـیونەوە! دەی ئەگـــەر بڕۆی و بە دواداچوون بکـــەی دەبینی ئەم ماڵانە هەزار نین و دەوڵەمەنـــدن. خانووی گەورەی وایان هەیە، جێگای چەند خێزانی تریش دەبێتەوە تێیدا. خوێندەوارن و چەند خاوەن بڕوانامەی بەرز لەو ماڵانەدا دەژین. خۆیان بە ڕۆشـــنبیر و پێشکەوتووخواز دەزانن. لـــە هیچیان کەم نییە. تەنها لە یەك شـــتیان کەمە، ئەویش ئەوەیە: ئیمان و خواناســـییان یان هەر نەماوە، یان زۆر کز بوە، وزەی ئەوەی نەماوە بەرهەم و کردەوەی جوان لە دڵی خاوەنەکەیدا دروست بکات. چونکـــە ئیمـــان و ئیســـلامەتییە پێمان دەڵێ: لـــە دوای مافی خوای گەورە، کە لە نەبوونەوە دروســـتی کردووی و ژیانی پێ بەخشـــیوی و ڕۆزیـــت دەدات و دەتمرێنـــێ و زیندووت دەکاتـــەوە. لە دوای مافی ئـــەو پەروەردگارە، مافی دایك و باوکت لە ســـەرە و لە پێش هەموو کەســـەوەن بـــۆ تۆی ئـــەولاد. قورئانە وا پەروەردەی کـــوڕ و کچەکان

دەکات کە بەرامبەر دایك و باوکی بەســاڵاچوویان. کە وەکو مناڵیان لێ هاتۆتەوە لە بێدەســەڵاتی و دڵناسکی و عاجزبوون و هەڵچووندا. نابێ لــە بەرامبەریانــدا نارەزایی دەرببڕی ئەگەر تەنها بە وشــەی (ئۆف)یــش بێ، نابــێ و حەرامە بڵێی (ئۆف لە دەســتت). جا ئەگەر ئۆفکردنێــك بەرامبەری حەرام بێ، ئەی دەبێ لێدان و دەرکردنی لە ماڵ و پشتتێکردنی و ناردنی بۆ خانەی بەساڵاچوان، کە لە غوربەت و تەنیایــی خۆیدا. هەر خەریکی فرمێسکرشــتن بــێ، بۆ غەریبی و لێقەوماوی و ڕەنجبەخەســاری خۆی، کــە چۆن ئەو هەموو ئەرك و ماندوبونەی کێشــا لە پێنــاوی ئەولادەکانیدا. لە پێناوی پێگەیاندنی کوڕ و کچەکانیدا. شــەونخونی، سەرما و گەرما، ئەم ئیش و ئەو کار، ئەم شار و ئەو گوند، ئەم بەردەرگای نامەرد و ئەو بەرپرسی خراپ بۆ ئیمزایەك. ئەمە هەمووی بۆ ئەوەی ڕۆڵەکەی ئاســودە بێ. کەچی ئێستا وا دەریان کردە دەرەوە و وەکو میوانێکی نەناسراویش کە ڕووی کردبێتــە قاپــی و ماڵیان قبووڵیان نەکرد!! جــا کە خوای گەورە بە نەصی قورئان فەرموویێتی (وَلاَتَقُلْ لَهُما أَفّ) دەی ئەبێ سزای سەختی ئەوانە چۆن بێ، کە ئاوا سوکایەتی بە دایك و باوکی پیریان دەکەن؟! بەڵــێ کاتێك دایك حورمەتی هەیە، ئــەوە بەرهەمی ئیمانە، چونکە دینــە پێی وتوە (الجَنَّةُ تَحْتَ أَقْدامِ الأُمَّهاتِ).. بۆیە دەبێ هەموومان ئەو ڕاســتییە بزانین: ئەگەر کەســێك هات و بە زۆر و ســتەم. دەســتی کوڕەکەت، یان کچەکەتی گرت و بردی هەڵی واسی و گوللەبارانی کرد بــە ناحەق و نــاڕەوا، ئەم خوێنڕێژە زاڵمە، چەنــدە خراپە و دەبێ

ڕووبەڕووی ببینەوە بۆ ئەوەی ڕۆڵەکانمان نەکوژێ و ڕەنجبەخەسار نەبین. دڵنیا بن دەبێ زۆر زیاتر لە دژایەتی و بەربەرەکانیدا بین لەگەڵ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێ. کوڕ و کچەکانمان بێدین بکەن و لە ئیسلام و دینداری دووریان بخەنەوە. بۆچی؟! چونکە: ئەو کەسەی کوڕەکەت یان کچەکەت بە ناحەق دەکوژێ. ئەوە کوڕ و کچەکەت پلەی شەهیدی وەردەگرێ و هەتا هەتایە لە بەهەشتدا لە ئاسودەییدا دەژی. بەڵام تۆ جەرگسوتاو بووی وەکو دایك و باوك و تۆ خەمی ئەوەتە کە ڕۆڵەکەت لە دەست دا کە ئومێد و هیوای دوارۆژت بوو، کە لە کاتی بە ساڵاچوون و لێقەومانی پیریدا، داری دەستت بێ و ئەوجا ئەو خزمەتی تۆ بکا و تۆ وەکو مەلیك و پاشایەك لە ماڵەوە دانیشی و فەرمان بدەی و جێبەجێ بکرێ، ئەو پیاوکوژە زاڵمە، خوانەناسە ئەو ئەولادەی کوشتی بۆیە دەبێ بەرەو ڕووی ببیەوە. هەموو هەوڵ و تێکۆشانێکی خۆت بەکاربێنی بۆ ئەوەی کوڕ و کچەکەتی لەدەست بپارێزی و نەهێڵی بکەونە بەردەستی.. دەی سوێند بە خوا. ئەو کەسەش، ئەو فکر و مەنهەجەش، ئەو دەزگا و جێگایەش کە دەیەوێ کوڕ و کچەکەت بێدین بکات و بیکات بە مولحید و خوانەناس، دەبێ زیاتر لە پیاوکوژە زاڵمەکە بەرەو ڕووی ببیتەوە، چۆن ئەولادەکەت لە دەستی دەشاردەوە و هەوڵی ئەوەت دەدا بە هیچ شێوەیەك دەستی نەیگاتێ، بەخوا دەبێ بۆ ئەم بێدین کارەش ئاوا کوڕ و کچەکانت پەنا بدەی. نەهێڵی ئەو ژەهرەی بێدینکردنە بگاتە دڵ و دەروونیان، نەهێڵی لەو جێگایانە نزیك ببنەوە کە خەڵکی فێری خوانەناسی و

سوکایەتی بە دین و دینداران دەکەن. چونکە کاتێ منداڵەکەت بێدین بوو، زۆر لەوە قورســـترە کـــە بکوژرێ، دەزانی بـــۆ؟! چونکە. ئەگەر منداڵەکەت، گەنج و لاوەکەت، لە دین دابڕاو پەنا بەخوا کافر بوو. بەو حاڵەوە مرد. ئەوە هەتا هەتایە لە جەهەنەمدا سزا دەدرێ و هەموو چرکەیەکی بەکوشتنێکە و خراپتریش!!.. وە بۆ تۆی دایك و باوکیش منداڵەکەت، جگەرگۆشەکەت، کە ئومێد و هیوا و ئاواتی دوارۆژت بوو. کاتـــێ کە بێدین بـــوو. دڵنیابە نەك هەر خزمەتت ناکات، بەڵکو هەر ئەوەنـــدە دەیەوێ تا خزمەتی خۆیـــت پێ بکا و کە زانی لە هەوڵ و هیمەت و کار و کەسابەت کەوتووی و پارەی بۆ پەیدا ناکەی و نانی بـــۆ ئامـــادە ناکەی وە دەبێ خزمەتت بـــکا و بەخێوت بکات. دڵنیابە فڕێت دەداتە سەرجادە و یان ئەگەر زەرەیەك ڕێزی مابێ بتگەیەنێتە خەڵوەتگـــەی پیـــری!! کە ئەو کاتە ڕۆژی هەزار جـــار ئاوات بۆ ئەوە دەخوازی کە هەر منداڵت نەبوایە! چونکە ئێشی ناودڵت کەمتر دەبوو. هـــەر بۆیە واجبە چۆن بەرەو ڕووی زاڵم و ســـتەمکار بووینەتەوە و شـــۆڕش و خەباتمان کرد و شـــەهیدمان دا و گوند و باخ و دێبەرمان وێـــران بوو لـــەو پێناوەدا. تا بە ڕۆژی ســـپی سەربەســـتی و ئازادی گەیشـــتین. ئاواش دەبـــێ وریایانە، ژیرانـــە، چاوکراوانە، ڕووبەڕووی هەر تەوژمێکی بێدینکردنـــی خۆمان و ڕۆڵە و نەوەکانمان ببینەوە. چونکە ژیانی بێدینی یانی فەوتان و ڕیسوابوونی دونیا و قیامەت. بە تەعبیری قورئانی (خَسِرَ الدُّنيا وَالآخِرَة. ذالِكَ هُوَ الخُسْرانُ المُبين)..

بەڕێـــزان؛ وەرن بـــا بچینە خزمەت شـــاعیری خواناس و بەڕێزی

کورد. (پیرەمێرد)ی شاعیر کە باسی بەرهەمی دوورکەوتنەوە لە دین و بێدینی دەکات، کە نیشانەی ئاخرزەمانن و پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) لە چەندین فەرمــوودەدا ئاماژەی پێ کردوون و پیرەمێردیش کۆی کردوونەتەوە لە شیعرێکدا و دەفەرموێ:

(ئەوی پێغەمبەر خەبەری داوە .... لە باســی کاری دونیا و عوقباوە.
فەرمووی نیشانەی تێکچوونی جیهان .... بێباوەڕییە و زەعیفی ئیمان.
زۆر کەم ئەمێنێ نوێژ و جەماعەت .... لە ئەمانەتیش دەکەن خیانەت.
عیـــززەت ئەچێتە لای پیاوی زاڵم .... قەدر و قیمەتی نامێنێ عالم.
برەو ئەســتێنێ شــەراب و قومار .... ماڵ گران ئەبێ لەشار و بازاڕ.
کوشــتن و دزی و تــاڵان و درۆ .... فەقیـــر و هـــەژار دەخاتە ڕۆڕۆ..
دەوڵەمەند زەکات نادات بە ئیحسان .... ڕاستی نامێنێ زۆر ئەبێ بوختان..
گۆرانی ســوك و قسەی ناڕەوا .... پەســەندتر ئەبێ لە زیکری خوا.
پیاو بە ئەمری ژن ئەچێت بەڕێوە .... لە مەجلیسدا نان ئەخۆن بە پێوە.
پیاو دائەنیشێ و ژنان ئەگەڕێن .... شەرم نامێنێ ژن و پیاو هاوڕێن.
دایك و باوك قەدریان لای کوڕ نامێنێ .... کەس لە مەکتەبدا قورئان ناخوێنێ.
پیت و بەرەکەت ئەڕوا لە ئەرزی .... کوڕ و کچ پێك دێن لە ڕووی بێ عەرزی.
ئەمە نیشــانەی ئاخر زەمانە .... وادەی دەجالە و فیتنەی شەیطانە.

* * *

بەڵێ ئیمانداران: ئەوە ڕەحم و بەزەیی ئیمان و ئیســلام بوو. کە ئــەو ویژدانە زیندوەی لە ناو دڵی ئافرەتێکی بێ هاوســەری خاوەن کۆمەڵێ منالی چاوگەشــی، بێ پارە و پول و ســەرمایەدار، درووست

کردبــووو. کە کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بــە هاوەڵی بەڕێزی (ئەبو هورەیرە) دەفەرموێ: ئەم گۆشــتە ببە بۆ ماڵی فلان کەس کە باوکی منداڵەکان نەماوە و کۆمەڵێ منداڵی نازداری بێباوکیان هەیە و دایکیان وەکو شێرە ژنێك. قارەمانانە قۆڵی مەردایەتی لێ هەڵکردوە و دەوری باوك و دایکیش دەبینێ بۆیان. بڕۆ ئەم گۆشتەیان بۆ ببە، بەڵێ کاتێ ئەبو هورەیرە لە دەرگای ماڵەکە دەدات، دایکی منداڵەکان زۆر بە ئەدەب و حورمەتــەوە، دەرگا دەکاتەوەو بەخێرهاتنی ئەبو هورەیرە دەکات، ئەویش دوعای خێری بۆ دەکات و دەڵێ خوشــکم، ئەمە پێغەمبەری خــوا (ﷺ) بــۆ تۆ و منداڵەکانتــی ناردووە. ئافرەتەکــەش دەڵێ: خوا پاداشــتی پێغەمبەری خــوا (ﷺ) بداتەوە. بەڵام بە خوا ئێمە نانمان خــواردوە و منداڵەکانمان ئەم ژەمە بە تێری خەوتوون. بەڵام بە خوا لــەوە دەچێ منداڵەکانی ئەو ماڵەی تــر، کە ئەوانیش باوکیان نەماوە و هەژارن، هێشــتا نانیان نەخواردبێ، چونکە دەنگی منداڵەکانیان دێ، ئەگەر عەزیەت نیە، براکەم ئەبو هورەیرە. بەڵکو پاداشتێکی تریشت دەســت بکەوێ و بیبە بۆ ئەوان!! ئەبو هورەیرە دەچێتە ئەو ماڵەش و دایکی منداڵەکان دەڵێ: سوپاس بۆ خوا ئەم ژەمە زۆر تێرن و ئەوە لە خۆشی و تێر و تەسەلیدا ناخەون و یاری دەکەن، توخوا بیبە بۆ ئەو ماڵەی پشــتەوەمان ڕەنگە ئــەوان منداڵەکانیان لە ئێمە هەژارتر و برســیتر بن، با بۆ ئەوان بێ. بەم شــێوەیە لەم ماڵ بۆ ئەو ماڵ، ئەبوهورەیرەی دڵســۆز (حەوت) ماڵ بە گۆشتەکە دەکات و سەرەنجام دەیهێنێتەوە بۆ یەکەم ماڵ. کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ڕاســتەوخۆ بۆ

ئەوێی ناردبوو!!... بەڵێ ئەمە تەنها و تەنها ئیسلام و ئیمان لە ناو دڵی مرۆڤدا دروستی دەکات.

ئەوە پەروەردەی ئیسلامەتییە کە کاتێ کوڕێکی گەنج لەگەڵ باوکە بە ساڵاچووەکەیدا لە سەر ئەوەی ملکەچی کاربەدەستی زاڵمی ئەو کاتە نەبوون. زیندانی دەکرێن، کاتەکەشی زستان دەبێ و زۆر سارد دەبێ. ئەم کوڕە گەنجە دەزانێ. باوکی لە ماڵەوە بە ئاوی گەرم نەبێ لەبەر نەخۆشی ڕۆماتیزمەکەی ناتوانێ بە ئاوی سارد دەستنوێژ بگرێ و خۆی پاك بکاتەوە. ئێ خۆ ئێرەش زیندانە و ئاگری لێ نییە تا ئاوی پێ گەرم بکرێ، بۆیە ئەم کوڕە گەنجە هەڵدەستێ ئەو دەبە ئاوەی لە لایان دەبێ و ئاوی ساردی تێدایە. هەر لە ئێوارەوە دەیخاتە سەرسکی بە ئومێدی ئەوەی بەڵکو هەندێ ئاوەکە گەرم بکات!! چەندە سەرمایەتی، بەو ئاوە ساردەی سەرسکی ئەوەندەی تر سەرما و لەرز دەچێتە ناو سکییەوە. بەڵام ئەمە هەمووی قبووڵە و بە ئومێدی ئەوەیە کە هەندێ لە ساردی ئەو ئاوە کەم ببێتەوە و باوکی بۆ بەیانی بە ئاسانی بتوانێ تارەتی پێ بگرێ و دەستنوێژی پێ بشوات!!!

ئەمە لە کوێ و ئەوە لە کوێ، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: لە نیشانە بچوکەکانی ئاخر زەمان ئەوەیە: (أَنْ تَلِدَ الأَمَةُ رَبَّتَها).

بە خوا کوڕمان بینیوە بە باوکی دەڵێ: حاجی، حاجی وای کرد و حاجی هاتەوە و حاجی ڕۆیشت. یەکێ ئەگەر نەزانێ ئەمە کوڕی فلان کەسە، وا ئەزانێ حاجی خزمەتکاری ماڵی باوکیەتی!! لە جیاتی باوکە گیان، باوکی شیرینم (حاجی) بەکاردێنێ و خۆشی بە ڕۆشنبیر دەزانێ!...

لە ڕۆژنامـــەی (کۆمـــەڵ)دا، چاوپێکەوتن لەگەڵ سەرپەرشـــتیاری (خانەی بە ســـالاچوانی شاری هەولێر کرابوو، وتبووی: بە سالاچووی وامان لایە، (٩) کوڕی هەیە!! کەچی کەســـیان ئامادە نەبوون بەخێوی بکەن و هێناویانە لە خانەی بەسالاچوان فڕێیان داوە، لە ڕوویان نایە بە ڕۆژ سەردانی بکەن!!... وە ئەو بەڕێوەبەرە بەڕێزە وتبووی: کەسی وا هەبوە لەم خانەی بە سالاچوانەدا مردوە و پەیوەندیمان بە کەس و کارییەوە کردوە، نەهاتوون بۆ ناشـــتنی، خانەی بەسالاچوان خۆیان کفنیان کردوە!.. ئەمە لە ڕۆژنامەی کۆمەڵ ژ: (٣٩٢)دا هاتووە!...

بەڵـــێ بەڕێزان: کە دین و ئیمان لە گۆڕەپانی ژیان دوور خرایەوە سیاســـەت ئەبێ بە درۆ، کوا شـــێخ سەعیدی پیران و شێخ مەحمودی حەفیـــدو قازی محمـــد، ڕۆژێ لە ڕۆژان بچووکتریـــن خیانەتیان بە میللەتیان.. بە دینیان.. بە نیشتمانیان کرد؟! نەخێر چونکە ئیمان و خواناسی پەروەردەی کردبوون.

بەڕێزان: هەمووومان ئەزانین کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماوەی (١٣) ساڵ هەوڵی ئەدا بۆ ئیسلامەتی، سی و ئەوەندە کەس باوەڕی پێ کرد. پاشان بڕیاری دا کە مەڵبەندی بانگەوازەکەی بگوێزێتەوە بۆ مەدینە. ئەو ســـەرکردانەی کە دژ بە پێغەمبەر وەســـتابوون و ئەشـــکەنجەی هاوەڵانیان ئەدا، ئەوانەی کە پێیان ئەوت شـــاعیرە، ســـاحیرە، شێتە (پەنا بەخوا) ئەمانەتیان هەبوو لە لای پێغەمبەر (ﷺ)، حەزرەت (ﷺ) ئەو دوو شـــتەی تێکەڵ نەکرد، باوەڕنەکردنی ئەوان بە ئیســـلامەتی، وە بـــە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ)، تێکەڵی نەکرد لەگەڵ ئەو مافی

ئەمانەتیەیان کە هەیانە لە لای ئەو، بۆیە عەلی هێشتەوە بۆ ئەوەی ئەو ئەمانەتانە بگێڕێتەوە بۆ ئەوان. ئەمەیە سیفەتی ئەمین و ئومانی لە موسـلماندا!!.. هەر لـە خزمەت ژیاننامـەی پێغەمبەردایـن (ﷺ) باوك و کوڕێك کە ئیماندار بوون و لە هاوەڵان بوون، کۆچیان کرد بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە مەدینە. لە ڕێگادا کەوتنە کەمینی کافرەکانەوە و گیران. ئەو کۆمەڵەی ئەوانیان گرت، خزمی ئەم باوك و کـوڕە ئیماندارە بـوون، نەیان دەزانی چیان لـێ بکەن. بیانکوژن، خزمی نزیکی خۆیان کوشتوە و مایەی دڵنیگەرانییە. خۆ ئەگەر بیان گێڕنەوە بۆ مەککە، سبەینێ لە شوێنێکی ترەوە ڕائەکەنەوە و خۆیان دەگەیەننە مەککە. بەڵام ئەم کافرە دڵڕەقانە، لە یەك شت دڵنیابوون ئەویـش ئەوەیە کە ئەم صەحابانـەی حەزرەتی محمد (ﷺ) خاوەن مەبدەئو خاوەن ڕەوشـتی بەرزن، هەر پەیمانێك بدەن دەیبەنە سەر و نایشـکێنن، بۆیە داوایان لێ کردن کە وەعد و بەڵێنیان بدەنێ کە ئەگەر چوونە مەدینە و گەیشـتن بە محمد، لەگەڵیا نەچن بۆ شـەڕ و دژایەتی ئەمان نەکەن و جەنگیان دژ نەکەن. ئەو باوك و کوڕەش بەڵێنیان دا و ئازادیان کردن. چونکە پێشتر ئەم کافرانە هەواڵیان بۆ هاتبوو کە پێغەمبەر (ﷺ) خەریکی کۆکردنەوەی سوپایە و پێویستی بە هەر ئیماندارێك هەیە کە بەشداری ئەو سوپایەی پێ بکات. بۆیە ئەمان ویسـتیان لانی کەم دوو کەسـیان لێ کەم بکەنەوە. بۆیە بەم باوك و کوڕە موسـڵمانەیان گوت: ئەگەر پەیمانمان بدەنێ بەشداری ئەو سـوپایە نەکـەن، ئێمە بەرەڵاتان دەکەیـن، ئەوانیش پەیمانیان

دانێ و ڕۆیشــتن. کاتێك کە گەیشتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو کاتەدا خەریکی ئامادەکردنی ســوپاکە بوو. ئەم دوو هاوەڵە ئەم ڕوداوەیان بۆ گێڕایەوە، لەو کاتەدا کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێویستی بە هەموو موسڵمانێك هەبوو، بەڵام فەرمووی: پەیمانی خۆتان ببنە ســەر لەگەڵیان و بەشدار مەبن لەم شــەڕەدا!! ئەمەیە خوورەوشتی موسڵمانانە. بەڵام کاتێ ئیمان لە دڵەکاندا نەما، خەڵك هەبوە خەڵكی دەعوەت کردوە. لەســەر ســفرە و خوانی خۆی کە نیشــانەی ئەمان پێدان و دڵنیاکردنە، کوشتوویەتی، یان ژەهرخواردی کردوە!!

کەواتە: پێویســتە ئیســلامەتی و دینداری بچێتە هەموو بوارێکی ژیانــەوە، ژیانــی تــاك، ژیانی خێــزان، ژیانی حکومــی و دەوڵەت و سیاســەت، وە پاراستنی بەها باڵاکانی ئەم ئیسلامە واجبی سەرشانی هەمووومانە. چونکە ئەگەر دیندار و خواناس خلیسکا و تووشی گوناه و تاوانێکیش بوو، زوو بە ئاگا دێتەوە و تەوبە دەکات و ناهێڵێ لێی ببێتە خوو، زوو خۆی لێ دادەبڕێ.

لەبەر ئەوە کەس نەڵێ حەقی کەســم نییە، نابێ دایك عەبای بە سەرەوە بێ و کچەکەشی ڕووت و قووت لە بازاڕ لەگەڵیا بگەڕێ، باوك دەم بە زیکر و دوعا و کوڕەکەی نوێژنەکەر بێ و نەشڵێ بۆ نوێژ ناکەی و بە زمانی شیرین و حیکمەت ئامۆژگاری نەکات! چونکە ئایەتەکەی کە لە ســەرەتای وتارەکەوە خوێندمانەوە، بەشێکی فەرمووی: (وَاتَّقُوا فِتْنَةً لا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً).. ئەی ڕێگای سەرفرازی کامەیە؟! ڕێگای سەرفرازی و ڕزگاری بریتییە لە شوێنکەوتنی پێغەمبەر (ﷺ)،

گەنجێكــی مەدینەیی هاتە خزمــەت پێغەمبەری خوا و عەرزی كرد: ســوێند بەخوای تاك و تەنها ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە ڕاســتی من تۆم خۆشــتر دەوێت لە نەفســی خۆم و خێزان و منداڵ و ماڵ و موڵكم. ئەمجا گەنجەكە دەستی كرد بە گریان. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمــووی: بۆ دەگری؟! گەنجەكە وتی: بۆیە دەگریم چونكە من بیر لە مردنی خۆم دەكەمەوە و دەزانم منیش دەمرم و جەنابیشــت هەر ڕۆژێ دەمــری. جا دڵنیام ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆ لە قیامەتدا لەگــەڵ پێغەمبەرانــدای و پلــەی هەرە بەرزی بەهەشــت بۆ تۆیە و بەویستی خوا منیش هەردێمە بەهەشت و ئومێدەوارم بەڕەحمی خوا، كە بەڕەحمی خۆی بمخاتە بەهەشــتەوە. بــەڵام بە خوا من زۆر زۆر لە خوار پلەی تۆوەم و خەمی ئەوەمە كە لە قیامەتا، لە بەهەشــتی بەریــندا نەتوانــم بە خزمەتت بگەمەوە و لێت دابڕێم. بە خوا جگە لــەو خەمە هیچ شــتێكی تر منی نەهێنایە گریــان. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێدەنــگ بوو. هەر لەو جێگایــەدا نەجووڵا بوون. كە جوبریلی ئەمیــن لە لایــەن (رب العالمین)ەوە. ئەم ئایەتــەی هێنایە خوارەوە:

﴿ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَٱلرَّسُولَ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ وَٱلصِّدِّيقِينَ وَٱلشُّهَدَآءِ وَٱلصَّٰلِحِينَۚ وَحَسُنَ أُوْلَٰٓئِكَ رَفِيقٗا ﴾ النساء: ٦٩.

ئیماندارانی بەڕێز: بە ڕاستی چۆن كاتی خۆی بە ناوی پێشكەوتن و ڕزگاربوون لە كۆنەپەرستی و ڕزگاربوونی ئافرەت لە كۆت و زنجیری ماڵــەوە و بەخێوكردنــی منداڵ. لە جیهاندا (شــیری قوتو) داهێنرا و منداڵان لە شیری دایكیان بێبەش كران. تەنانەت وای لێهاتبوو ئەوەی

شیری خۆی بدایە بە منالەکەی پێی شەرم بوو لە هەموو جێگایەك باســی بکات، لە ترســی ئەوەی نەوەکو پێی بڵێن کۆنەپەرســت. بە داخەوە دایکانێکی زۆر بە بێئاگایی و چاولێکەرانە شوێنی ئەم دەهۆڵە دراوە کەوتن و ماوەی چەند ســاڵێکی زۆر منالان لە شــیری دایکیان بێبەش کران و تەنانەت ئێستاش هەندێ دایك بە بیانووی ناڕاستەوە منالەکەیــان لــەو هەموو خێر و بەرەکەتەی شــیری خۆیان بێبەش دەکەن. بەلام: هەر دوای چەند ســالێ جارێکی تر ڕاستیەکان ئاشکرا بوونەوە و هەر ئەوانەی پێشــتر مۆدی شیرپێدانی فوتوویان داهێنا. ئەمجارەیان دەســتیان کرد بە باســکردنی فــەزڵ و چاکە و بەهرەی شیری دایك و لە هەموو دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە هانی خەڵکیان دەدا بۆ ئەوەی کە شیری خۆیان بدەن بە کۆرپەکانیان. تەنانەت ئێستا لە سەر فوتوەکە نوســراوە: هیچ شتێ جێگای شیری دایك ناگرێتەوە و تکایە منالەکانتان لە شیری خۆتان بێبەش مەکەن.. دەی بە خوا کاتی ئەوەش هاتوە، بە ڕاشــکاوی لە لایەن ئەو کەســانەی کە بانگەشەیان کردوە و دەکرد بۆ بێدینی و وازهێنان لە ئیســلام، کەوا پەشــیمانی خۆیان دەرببڕن و بە دەنگی بەرز بڵێن: ئەی خەڵکینە هیچ بەرنامە و دەســتور و پرۆگرامێك نیە کە جێگای ئیســلام و شــەریعەتەکەی بگرێتــەوە بۆ بەڕێوەبردنی ژیانێکی بەختەوەرانەی ســەربەرزانە بۆ مرۆڤ. تکایە خۆتان لەو خێر و بەرەکەتەی ئیســلام بێبەش مەکەن و پەنا بۆ بەرنامەی دەستکردی مرۆڤ مەبەن.. بەڵێ بە ڕاستی کاتی ئــەوە هاتــوە و هەر لە کۆنەوە تا ئێســتا ژیران و ویژدان و زیندوان

دانیان بەم ڕاســـتییەدا ناوە و بە ئاشــکرا خۆیـــان بێبەری کردوە لە خوای دروســـتکراو و بەرنامەی مرۆیی دروســـتکراو کە وایان دەزانی جێگای دینی حەقی خوای پەروەردگار دەگرێتەوە.

مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە کە: کابرایەکی ئەعرابی هەبوو، لەو دەشت و بیابانە دەژیا. بتپەرست بوو. بتی دەپەرست. بتێکی هەبوو لە بەرد دروســـتکرابوو، ئەم ئەعرابیە دەنگوباسی یەکتاپەرستی و پڕوپوچی بتپەرســـتی بیستبوو. بەڵام هەر ســـوور بوو لەسەر بتپەرستییەکەی خــۆی و ئامــادە نەبوو وازی لێ بێنـــێ. جا ئەم بتپەرســـتە، ئەگەر خواردنێکـــی لێ زیاد بوایە ئەوا ئێوارە دەیخســـتە بەردەم بتەکەی و بەیانـــی دەیخوارد. بە ئومێدی ئەوەی کە بەرەکەتی خواکەی کە ئەو بتەیە بە ســـەردا برژێ، بەڵام ماوەیەك ســـەیری کرد ئەو خواردنەی ئێوارە خســـتوویەتیە بەردەم بتەکەی نەماوە و خوراوە و بتەکەشـــی تەڕە و بۆنێکی پیســـی ناخۆشی لێ دێ. لە دڵی خۆیدا وتی: تۆ بڵێی بتەکەم خواردنەکەی خواردبێ و میزی بە خۆیدا کردبێ؟!!

کە چەند جارێك ئەمە دووبارە بۆوە، ناچاربوو کە شـــەوێکیان لە پەنایەکـــدا خۆی حەشـــار بدات و بزانێ ئـــەم خواردنەی بۆ بتەکەی (خوایەکـــەی) دانـــاوە چـــی لێ هاتوە! بەڵێ دانیشـــت و ســـەرنجی دا لـــە نیوەشـــەودا ڕێویەك هات (بیابـــان ڕێـــوی زۆرە)، ڕێویەکە بۆنی خواردنەکـــەی کردبوو. هات خواردنەکەی خـــوارد و کە تێری خوارد چـــوە سەرشـــان و ملی بتەکە و لە ســـەرەوە بۆ خـــوارەوە میزی پێ داکرد!! کابرای بتپەرست کە ئەوەی بینی داچڵەکا، بە هۆش هاتەوە،

ئەمجا زانی ئەمەی ئەم چەند ساڵە عیبادەتی بۆ دەکا و هانا و هاواری بۆ دەبا و لێی دەپارێتەوە، خۆ هیچ نیە و هەر ئاگاشی لەوە نییە چۆن ڕێوی میزی پێدا دەکات! بۆیە پەلاماری بتەکەی دا و شکاندی و پارچە پارچەی کرد و فڕێی دا و دلێرانە و بوێرانە ڕای گەیاند کە وازی لە بتپەرستی هێناوە و بڕوای بە خوای تاك و تەنها و درووستکەری ئاسمانەکان و زەوی و هەموو بوونەوەر، هێناوەو بەو زمانە سادەی بیابان، پارچە هۆنراوەیەکی گوت. کە هێندە جوان و بەهێز بوو، لاپەڕەکانی مێژوو تۆماریان کرد و تا قیامەت دەخوێنرێتەوە. هەروەکو چۆن ئێستا ئێمە دەیخوێنینەوە، بەڵێ هەر کە لە بتپەرستی ڕزگاری بوو. عەقڵیشی کرایەوە و ئەم وشە جوانانەی هاتە سەردەم. کەدەڵێ:

(رَبٌّ يَبُولُ الثّعْلَبانُ بِرَأْسِهِ
لَقَدْ ذَلَّ مَنْ باكَتْ عَلَيْهِ الثَّعالِبُ.
فَلَو كانَ رَبَّاً. كانَ يَمْنَعُ نَفْسَهُ
فَلا خَيْرَ في رَبٍّ نَأَتْهُ المَطالِبُ.
بَرَّأْتُ مِنَ الأَصْنامِ في الأَرْضِ كُلِّها
وَآمَنْتُ باللهِ الّذي هُوَ غالِبُ)...

* * *

بەڵێ ئیسلام عەقڵی مرۆڤی لە ژەنگ و ژار پاك کردەوە و تێی گەیاند کە (وَاللهُ غَالِبٌ عَلَى أَمْرِهِ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ).

خوای پەروەردگار داوات لێ دەکەین بەرچاومان ڕۆشنتر بکەی

بۆ زیاتر ناسینی ئیسـلامەکەت دامەزراو و ڕاگیراومان بکەی لەسەر ڕێبازی ئیسلام، ••(رَبَّنا لاتُزِغْ قُلُوبَنا بَعْدَ إِذْ هَدَيْتنا وَهَبْ لَنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً إِنَّكَ أَنْتَ الوَهّاب) اللّهُمَّ آمين

* * *

**سەرچاوەکان:**

١. السلسلة الذهبية – محمود المصرى، ج٣ ص٣٢٠.

٢. کۆباسەکانی میحراب، شەماڵ موفتی. ئامادەکردنی: عادل شاسواری، ب١ ل٢٧.

٣. نداءات الرحمن لاهل الإيمان، محمد عبدالعاطي بحيري، ص٣٧١.

٤. نداءات الرحمن لاهل الإيمان، محمد المحمدى الصالح، ج٣ ص١٧٢.

وتاری دووەم بۆمانگی شەعبان

# شەوی پانزەی – نیوەی شەعبان – شەوی بەرات

الحَمْدُلله رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدنا محمد وَعلى آلهِ وَصَحْبِه أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: یەکێ لەو شتانەی کە لە کوردەواریدا هەیە و ساڵانە یادی دەکرێتەوە و بەرز و پیرۆز ڕادەگیرێت، بریتییە لە شەوی (بەرات). کە لەو بڕوایەدام ئەو وشەی (بەرات)ە، لە وشەی (برکة) بە ڕەکەت و فەڕ و پیرۆزی و خێر و بێرەوە وەرگیرابێ و وردە وردە کورت کرابێتەوە و ببێتە بەرات. ئەمەش بەو مانایەی کە لەو شەوەدا بەرەکەت و ڕەحمەت و خێر و بێر بەسەر مرۆڤەکاندا دابەش دەکرێت و هەر کەسە داواکار و ئومێدەوار بێت لە خوای گەورە، کە زۆرترین بەرەکەت و ڕەحمەت و خێر و خۆشی بەسەردا بڕێژێ. کە شەوی بەرات دەکەوێتە نیوەی مانگی شەعبانەوە. واتە پانزەی مانگی شەعبان. با بزانین قورئانی پیرۆز لەو بارەیەوە چی دەفەرموێ:**

﴿ حمٓ ﴿١﴾ وَٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾ إِنَّآ أَنزَلْنَٰهُ فِى لَيْلَةٍ مُّبَٰرَكَةٍ ۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ﴿٣﴾ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴿٤﴾ أَمْرًا مِّنْ عِندِنَآ ۚ إِنَّا كُنَّا مُرْسِلِينَ ﴿٥﴾ رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦﴾ ﴾ الدخان: ١ – ٦

**واتە: سوێند بەم قورئانە ڕوون و ئاشکرایە، بەڕاستی ئێمە لە شەوێکی بەفەڕ و پیرۆزدا کە (شەوی قەدرە) دامان بەزاندۆتە خوارەوە.**

بێگومان ئێمە هەمیشــە بێدارکەرەوەی بەندەکانمانین. لەو شــەوەدا هەمــوو کار و کــردەوە و بەرنامەیەکی پڕ لــە حیکمەت و دانایی لە یــەك جیا دەکرێتەوە. ئەمەش فەرمان و بڕیارێکە لە لایەن ئێمەوە، بێگومــان ئێمەیــش پێغەمبــەران دەنێرین. ڕەوانەکردنــی قورئانە، ڕەحمەتی پەروەردگاری تۆیە بۆ ئادەمیزاد. تا لە سەرگەردانی ڕزگاری ببێت. بە ڕاستی هەرئەویشە کە بیسەر و زانایە بە هەمووشتێك.

بەڵێ بەڕێزان، خوای پەروەردگار باســی شەوی پڕ بەرەکەتی کرد ﴿لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ﴾، ئیمامــی قورطوبی لە تەفســیرەکەیدا دەفەرموێ: (ووصف اللَّيلَة بالْبَرَكَةِ بِما يُنَزِلِ الله فيها عَلى عِبادِهِ مِنَ البَرَكاتِ وَالخَيْراتِ وَالثَّوابِ). واتە: خوای گەورە وەصفی ئەو شەوەی کردوە بە (بەرەکەت) لەبەر ئەو هەموو بەرەکەت و خێر و خەڵات و بەخشش و پاداشتەی کە خوای گەورە لەو شەوەدا بە سەر بەندەکانی خۆیدا دەبارێنێ..

بەڵێ ئەوشــەوە بۆیە پیرۆزە چونکە لەو شــەوەدا قورئان هاتۆتە خوارەوە، دەی ئاشکرایە هیچ شتێ گەورەتر و پیرۆزتر و بە بەرەکەتتر نییە لە قورئانی پیرۆز، لە قورئانی پڕ بەخشش. واتە ﴿لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ﴾ بە ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ﴾ موبارەکە، بەراتە، پڕ بەرەکەتە.. وە لە گەورەیی ئەو شەوە کە ﴿فِيهَا يُفۡرَقُ كُلُّ أَمۡرٍ حَكِيمٍ﴾. صەحابەی زانا و پایەبەرز إبن عباس دەفەرموێ: (يَحْكم الله أَمْرَ الدُّنيا إلى السَّنَة القابِلَة ماكانَ مِــنْ حَيــاةٍ, أَوْ مَوْتٍ, أَوْ رِزْقٍ). واتە: خوای گەورە بڕیار لە ســەر هەموو کاروبارەکانی دونیا دەدات و دەدرێت بە لایەنی پەیوەندیدار لە مردن و لــە دایکبوون و ڕزق و ڕۆزی بەندەکانی ســەرزەوی. موفەســیرین

دەفەرموون: (حَتَّى إِنَّ الرَّجُلَ لَيَمْشِي فِي الأَسْوَاقِ وَينكحُ وَ يُلَدُ لَهُ. وَقَدْ وَقَعَ إِسْمُهُ فِي المَوْتَى)..

واتە: زۆرکەس هەیە کە لە بازاڕدا دێ و دەچێ و خەریکی معامەلە و کڕیــن و فرۆشــتنە و ژن دێنێ و منداڵ لــە دایك دەبێ. کەچی لەو شەوەدا ناوی لە لیستی مردواندا تۆمارکراوە، ئەمەش مانای ئەوە نیە کە ئێمە بترســین و لە هەوڵ و هیمەت بکەوین و تووشی قەلەقی و ڕاڕایی ببین کە دەبێ ناوم لە مردوانی ئەو ساڵە تۆمار کرابێ یان نا، نەخێــر. تۆ هەوڵی خۆت بدە. جوان بــژی. بە پاکی بژی. بۆ ئەوەی هەرکات مردی بە پاکی بمری. بە ئیمانەوە بمری. ئەمە هۆشــیارمان دەکاتــەوە کە بێئاگا نەبین، وا نەزانین جارێ وا زوو نامرین. نەخێر هیچ دوور نییە لە لیســتی مردوانی ئەو ســاڵەدا ناوت تۆمار نەکرا بــێ. خۆ بە چــاوی خۆمان چەنــد گەنجمان بینی پار ئــەم کاتانە لەگەڵمــان بوون لە مزگەوت. لە قوتابخانــە و زانکۆ و پەیمانگاکان. چەنــد دڵیان خۆش بوو. لەشــیان ســاغ بوو. پــڕۆژە و بەرنامەیان بۆ داهاتووی چەندین ســاڵی داهاتــوو هەبوو. کەچی کتوپڕ مردن و چوونەوە باوەشــی دایکیانــەوە کە خاکە. لەبەر ئەوە شــەوی بەرات فێری بەخۆداچوونەوەمان دەکات، کە بە لاپەڕەکانی ساڵی ڕابردوودا بچینەوەو تەوبە بکەین و لەو هەموو لاپەڕەیەی کە بە خراپەو گوناە لە نێــوان خۆمان و پەروەردگارماندا یان لە نێوان خۆمان و هاوژین و هاوولاتی و هاونیشتمانی و هاوزمان و هاوپیشەکانماندا ڕووی داوە. تەوبەی لێ بکەین. مافی خەڵکی بگێڕینەوە. دڵمان پاك بکەینەوە لە

ڕق و قین. بە دڵێکی پاك و دەروونێکی پڕ لە خۆشەویســتییەوە بۆ خوای پەروەردگارمان و پێغەمبەری ئازیز و دڵســۆزمان و ئیســلامی نوری چاومان و خودی خۆمان و دایك و باوك و منداڵ و هاوسەرمان و تێکڕای ئیمانداران، پێشوازی لەساڵی تازەی تەمەنمان بکەین و لەو شەوی بەرەکەتەدا، لە خوای گەورە بپاڕێینەوە کە عاقیبەت خێرمان بــکا و ئەگەر لە ســاڵی داهاتودا لە لیســتی مــردوان بووین، ئەوا بە جۆرێــك بمریــن. کە ئەو مردنە بۆمان ببێتە مایەی حەســانەوە لە نارەحەتــی و ئازارەکانی دونیا و گەیشــتن بە ڕەحمەت و میهرەبانی خوا. وە خوای گەورە بمانپارێزێ لەو مردنەی کە دەبێتە هۆی ئەوەی هەمــوو خەڵکــی و دار و بــەرد و باڵندە و گیاندارەکان، لە دەســتی ئەو مردوە ڕزگار دەبن و ئیســراحەت دەکەن و لە شــەڕ و خراپەی ڕزگاریــان دەبێ و مردوەکەش بە ســەرەنجامی خراپەکانی دەگات لە عەزابــی قەبــر و دۆزەخ (خوای گەورە بەلوتف و کەرەمی خۆت، لەو جۆرە مردنانە بمانپارێزە).

پاشــان لە بارەی ئەوەوە کە ئەو شــەوە کام شەوی ساڵە. زۆربەی زانایان لەســەر ئەوەن کە ئەو شــەوە شەوی قەدری مانگی ڕەمەزانە. (هەروەکو شــێخ محمــد علی الصابونی، لە (صفوة التفاســیر)ەکەیدا. فەرموویەتی، ئەو شــەوە شــەوی قەدری ڕەمەزانــە. هەندێکیش لە زانایان پێیان وایە کە شەوی نیوەی مانگی شەعبانە. (شەوی بەراتە). بــەڵام زانایان هێنــدە گرنگیان بەوە نەداوە. کــە کامیانە. لە مانگی ڕەمەزاندایە، یان لە مانگی شەعباندایە. چونکە لە هەر کامیاندا بێت،

هیــچ لەوە کــەم ناکاتەوە کە گرنگییەکەی لە چــی دایە. بە کورتی: گەورەیی ئەو شــەوە لە هاتنە خــوارەوەی قورئاندایە. کە بەرنامەی ژیانــی مرۆڤــە، وە لەوە دایە کە بەرنامەڕێژی ســاڵی داهاتووی تێدا دەکرێ. ئەمە حیکمەتەکەی گەورەیی ئەو شەوەیە.

بەڕێزان: لێرەدا پرســیارێك دروست دەبێت. ئەویش ئەوەیە: باشە بۆچی خوای گەورە بۆمان باس دەکات؟! باشە بۆچی خوای گەورە کە پێویستی بە هاوکاری و یارمەتی کەس نیە، بێ ئیحتیاجە لە هەموو شــتێ. (اللّه الصَّمَد). ئــەی بۆچی کاروبارەکان دەدات بە فریشــتەکان و هەریەکــە و کاروبــاری خۆی دەزانــێ، بۆچی بە (کُــنْ فَیَکون)ێك هەمووی بۆخۆی -سُبْحانَهُ وَتَعالی- جێبەجێ ناکات؟!

لــە وەڵامدا دەڵێیــن: واللّه أَعْلَــم، ئێمە کە بــڕوای تەواومان بە کاربەجێیــی پەروەردگارمــان هەیــە، هیــچ گومــان و دوودڵیەکمان نیــە لەوەی کە ئــەوەی خوای پەروەردگار بــی کات هەمووی پڕە لە حیکمەت و تەنانەت پێویســتی بە پرســیار و لێکۆڵینەوە نیە. بەڵام بــۆ ڕەواندنەوەی گومانێك ئەگەر وەکو وەسوەســەی شــەیطانی، یان ناحەزانی ئیســلام بی خەنە مێشــکی ئەهلی ئیمانەوە و ئەم پرسیارە بورووژێنــن، ئەوا لە وەڵامدا دەڵێیــن: وَاللّه أَعْلَم، خوای گەورە بۆیە ئەم دابەشکردنەی کاروبارانەی بە سەر فریشتەکاندا دەبەش کردوە و پاشان باسی ئەو بەرنامەڕێژیەی ساڵانەی بۆ کردووین، بۆ ئەوەیە کە ئێمەی عەبدی خۆی تێ بگەیەنێ، کە پێویستە ژیانتان لەسەر نیظام و بەرنامە بەڕێوە بچێ و ژیانتان بێ بەرنامەبێ. ئەوەتا: ساڵانە خوای

گەورە بەرنامەی ئەم گەونە دەسپێری بە فریشتەکان، دەبێ موسڵمان ئاماری ســاڵانەی هەبێ. هەروەها هەر فریشتەیەك کاروباری تایبەتی خۆی پێ سپێردراوە و کەس دەستکاری ئیشی فریشتەیەکی تر ناکات. کە ئەمەش ئەوەمان فێر دەکات کە دەبێ پسپۆڕی لە کاروباردا هەبێ و کەسی شیاو لە شوێنی شیاودا دابنرێ و کەسێك شارەزایی و پسپۆڕی لەکارێکدا نییە نابێ کاری تێدا بکا و کارەکە سەقەت بکات و خەڵکیش تووشی مەینەتی بکات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموی: لە نیشانەکانی ئاخرزەمان ئەوەیە کە: کەسی ناشارەزا و هیچ و پوچ (واتە وەکو نەبێ وایــە، هیچــە لە ئەصڵــدا، وە تەنها ناوی هەیــە و مێزێك و مۆرێکی داگیرکــردوە، ئەینا لە نــاوەڕۆك و بەڕێوەبردنی کاردا، پوچە و نیە). کە پێغەمبەری خــوا (ﷺ) بە (الرُّوَيْبِضَة) ناوی بردوە، دەبێتە ڕابەر و قسەکەری خەڵکی (يَتَكَلَّمُ فِي أَمْرِ العامَةِ).

بەڕێزان: خوای پەروەردگار باسی (شەو)مان بۆ دەکات، باشە بۆچی لــە ڕۆژدا ئەم کارەی نەکــرد؟! وَاللهُ أَعْلَم، تاوەکو ئێمەی بەندەکانی خــۆی تــێ بگەیەنێ کە کات بــە فیرۆ مەدەن و نرخــی کاتەکانتان بزانن کە ســەرمایەی ژیانتانە، ئەی موسڵمان شەو بە دیار بەرنامەی بێسودەوە بەسەر مەبە و شەوان ئەو کاتە پیرۆزەت بە فیرۆ مەدە و شــەو بەرنامەی ژیانی بەیانیت دانێ و پلان دانێ بۆ کاروبارەکانت و بە ڕۆژ جێبەجێی بکە.. کەواتە: ئەم ئایەتە قورئانیە و ئەم شــەوی بەراتە دەبێ فێری ئەوەمان بکات کە ژیانمان بە نیظام و بە بەرنامە بەرین بەڕێوە و دوور بین لە فەوزا و بێ بەرنامەیی.

ئیماندارانی بەرێز: پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئیسرا و میعراجمان بۆ دەکات و بۆمان دەگێڕێتەوە کە: لە هەموو ئاسـمانەکان، جوبریل لە دەرگای ئەو ئاسـمانەی دەدا. فریشـتەی پاسەوان دەی گوت کێیە؟ دەی فەرموو: جوبریلم. فریشتەی پاسەوان دەی پرسی: کێت لەگەڵە؟ جوبریـل دەی فەرمـوو: محمدم لەگەڵـە. ئەمجارەیان پاسـەوانەکە دەیپرسـی: لە لایەن خوای پەروەردگارەوە بانگهێشت کراوە؟ جوبریل دەیفەرمـوو: بەڵێ. ئەمجا رێـگای بەرزبوونەوەیان پێ دەداین. جا بە راستی دەبێ لە ئاستی ئەم فەرمودەیەدا هەڵوێستەیەکی گەورە بکەین و بیر بکەینەوە باشـە خۆ هەرچی فریشـتەیە لە ئەرز و ئاسـماندا، سـەربازی جوبریلن و جوبریل سـەرکردە و سەرپەرشـتیاری هەموو فریشـتەکانە. ئەو جوبریلەی ئەمینی وەحـی خوایە، ئەو جوبریلەی ناوی لە قورئاندا هاتوە. وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) -محمد- لە هەموو ئاسمانەکان و لای هەموو فریشتەکان ناسراوە و نامۆ نییە. ئەی بۆچی ئەم هەموو پرسیار و وەڵامدانەوە دەبێ بکرێ لە لایەن سەربازێکەوە لەگـەڵ فەرماندەکەی؟! ئەمە ئەو وانـە گەورەمان فێر دەکات کە بۆ هیچ کەس نییە کە بێ وەستان و پشکنین و پرسین لەخاڵی پشکنین -سـیطرة التفتيش- تـێ بپەڕێ و بە ئارەزووی خـۆی بێ و بڕوات. نەخێر دەبێ سـەرکردە کە گەیشتە خاڵی پشکنین بوەستێ لە بەردەم سەربازەکەیدا. وە وەفد و میوان چەند گەورە بێ و لە جێگایەکی ترەوە هاتبێ، نابێ بەبێ لێپرسـین بێتە ناوە و بڕوات. دەبێ هەمووشتێ بە یاسـا و نیظام بڕوات بەڕێوە، جا ئایا ئێمەی موسـڵمان لەسەر زەویدا

پەیــڕەوی ئەم فەرمودەمان کردوە؟! ئایا کە لە ئەوروپا و ئەمریکادا، کــەس بۆی نییە بە بێ وەســتان و پشــکنین لە خاڵی پشــکنین یان ســنووری وڵات بێ و بڕوات. با سەرکردەی هەموو وڵاتەکەش بێ. ئایا ئەمە هەر ئەوە نییە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆی باس کردووین و ئەو بە کــردەوە جێبەجێی دەکات؟! بەڵێ هەرچی نیظام و ژیانی بە بەرنامەیە لە ئیسلامەوە سەرچاوەی گرتووە..

وە پاشــان هــەر لەم فەرموودەیــەوە ئەوەش فێــر دەبین کە: لە کاتی ســەردان و چوونە ماڵانەوە ڕاســتەوخۆ، بە بێ لە دەرگادان و پرســکردن و ئیــزن خواســتن و ڕێگاپێدان لە لایەن خــاوەن ماڵەوە نەڕۆینە ژوورەوە. کە بە ڕاســتی جێگای داخ و نیگەرانیە کەســی وا هەیە وا تەمەنی کۆتایی هات، کەچی تا ئێســتا شــێوازی لە دەرگادان و ئیزن وەرگرتن نازانێ. بچێتە هەرماڵێك. هەتا نەچێتە سەرســەری خاوەن ماڵ و بەشی دواوەی ماڵەکە، کەس هەستی پێ ناکات و دەبێتە مایەی دڵگرانی و ناڕەحەتی بۆ ئەو ماڵە!!.

بەڵێ بەڕێزان: پێویستە لە هەموو شتێکدا نیظام و یاسا هەبێ. بۆ نمونە لە نوێژی جەماعەتدا نابێ هەرکەس چۆنی پێ خۆش بوو، ئاوا بوەستێ و نوێژ بکات، لەو بارەوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (سَوُّوا صُفُوفَكُمْ، فَإِنَّ تَسْوِيَةَ الصَفِّ مِنْ تَمَامِ الصَّلاةِ) رَواهُ البُخاريُّ وَمُسْلِم.

لــە فەرمودەی تردا هاتوە کە ئەو کەســەی لــە نوێژی جەماعەتدا شوێن ئیمام ناکەوێ و پێش ئیمام ڕکوع و سوجدە دەبات و ڕیزی نوێژ خوێنانی جەماعەتەکە تێك دەدات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو کەسەی

شوبهاند بە گوێدرێژ، چونکە گوێدرێژ یاسا و نیظام نازانێ و هەریەکەی بە لایەکدا دەڕوات!.. دەی ئەمەش دیسان جێگەی خەمخواردنە کە خوای پەروەردگار ڕۆژی پێنج فەرزەی نوێژی بۆ داناوین. پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی جەماعەتی بۆ بە سونەت کردووین. ئامۆژگاری کردووین کە ڕیزمان ڕێك بێ. بە یەکەوە لەگەڵ ئیمامدا هەڵسین و دانیشن. کەچی هێشتا زۆربەی جار ڕیزەکانی نوێژخوێنان نارێکە. هێشتا کەسانێك پێش ئیمام هەڵدەستنەوە لە ڕکوع و سوژدە و ئارام ناگرن. جا چونکە لە مزگەوتدا فێری جوان وەستان و ڕێزگرتنی جوان نەبووین. لە سەرەگرتنی کاروبارەکانی دونیایشدا، پێمانەوە دیارە کە چۆن خەڵکی سەرە ناگرێ و ڕیزی خوار و خێچ دروست دەکا و پشێوی دروست دەکات! کە بە ڕاستی ئێمەی موسڵمان ئەگەر تەنها لە نوێژی جەماعەت و ڕێکی ڕیزەکانی و ئەو هەموو فەرموودانەی پێغەمبەر (ﷺ) کە لەو بارەیەوە هاتوون، جێبەجێمان بکردایە. بەس بوو کە بە نیظامترین میللەتانی سەرزەوی بووینایە..

بەڵێ شەوی بەرات ﴿ لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ ﴾ فێری ئەوەمان دەکات ئەی مرۆڤەکان بەرنامەڕێژیتان هەبێ بۆ کاروبارەکانتان، لەسەر ئاستی تاك. با بەرنامەی ساڵانە هەبێ بۆ کار و کاسپیت. ڕزق و ڕۆزیت، ئامادەییت بۆ مردن.. ئای مردن!! چەند کەس لەو شەوەدا ناوی لە لیستی مردواندا تۆمارە و لەسەر زەوی بە تەمای ژیانێکی دوور و درێژە. بەڵام دەبێ هەر بچێتە ئەو جێگایەی کە مردنەکەی بۆ دیاری کراوە! زۆربەمان ڕووداوی سوتانی (ئوتێل سۆما)ی شاری

ســـلێمانیمان بیست. کە ژمارەیەك کەسی میوانی تێدا سوتان و مردن و ژمارەیەکیش برینداربوون. یەکێ لە مردووەکان لە دوای ســـوتانی لـــە نەخۆشـــخانە مرد و قســـەی کردبوو. وتبووی: مـــن لە دەرەوەی وڵات، لە ئەوروپاوە گەڕاومەتەوە -چەندین ســـاڵە لەئەوروپام. کاتێ کـــە لە (ئیبراهیـــم خەلیل)ەوە هاتمەوە کوردســـتان- چونکە ئەوکات فڕۆکەخانەی هەولێر و سلێمانی نەکرابوونەوە، کاتێ دەگاتە سلێمانی شـــەو زۆر درەنگ دەبێ، حەز ناکات بەو درەنگە بچێتە ماڵی باوکی. بۆیـــە دەڵێ: بڕیارم دا بچمە ئوتێل و شـــەو لـــەوێ بمێنمەوە و خۆم بشـــۆم و بەیانـــی بە ئیســـراحەت بچمە ماڵەوە و قـــەدەری خوا ڕێم کەوتە ئوتێل ســـۆما و شـــەو ئاگری گرت و ئەم کەســـەش سوتا و لە نەخۆشخانە مرد!!.

بەڵێ لە سەر ئاستی خێزان: پێویستە هەموو خێزانێك بەرنامەی ساڵی داهاتووی هەبێ، لێکی بداتەوە داهاتی چەندە، خەرجی چەندە، چی پێویستە، چەندی لە پێویستیەکان بۆ دەکرِدرێ. ئایا کوڕ و کچی وەختی شـــووکردن و ژنهێنانیان نەهاتووە! ئەمانە هەمووی پێویستی بە بەرنامەڕێژیە.. لەســـەر ئاســـتی حکومەت و دەسەڵاتدا: پێویستە حکومەت ئاماری ساڵانەی بۆ هەموو بوارەکان لە بەردەستا بێ. پلانی ســـاڵانەی هەبێ بۆ بواری دارایی و ئابوری، ڕۆشـــنبیری، کۆمەڵایەتی، سەربازی...هتد.

بەڕێـــزان: بـــە ڕاســـتی حەق وابوو کـــە ئێمەی موســـڵمان هەموو ژیانمان بە بەرنامە و نیظام بوایە، چونکە ئەوە قورئانەکەمانە. کەوا

باســی بەرنامەســازیمان بۆ دەکات. ﴿ فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ ﴾. هەر لەم بابەتەشــەوە پێویستە ئەوە بڵێین کە: (ئاینی ئیسلام هەر تەنها هەندێ طقوس و مەراسیم و یادکردنەوە و تێکستی ئاینی نیە، وەکو بێدینەکان دەیانەوێ ئیســلام وا بناسێنن، کە پەیوەندی نێوان خۆت و خــوای خۆتە. جــا کەیفی خۆتە ئاوەدانی دەکــەی یان وێران!! وە پاشــان هەندێ کلتور و داب و نەریتە، وەکو شەوی بەرات کە منالآن بە کۆلآندا بگەڕێن و شیرینی لە ماڵەکان وەرگرن!!.. نەخێر، ئیسلام زۆر لەوە گەورەترە و دوورە لە وانە. بەڵکو ئیسلام پەیوەندی مرۆڤە لەگــەڵ پەروەردگاریدا، وە پەیوەندی مرۆڤ درووســت دەکات لەگەڵ خۆیــدا، لەگەڵ دەوروبەریدا، لەگەڵ ژیان و ژینگەیدا، ئەوەتا بزانن هەر ئەم شەوی بەراتە فێری چ وانەیەکی گەورەمان دەکات لە بواری نەخشەسازی بۆ ژیان و پلان بۆ بەرنامەی کار و دووربون لە بێسەر و بەرەیی و هەرکەس بۆخۆیی)..

ئیمانداران: هەر کەســێ نیظــام و بەرنامەڕێژی لە ژیانیدا هەبێ، خــوای گەورە ڕێــزی لێ دەگرێ. با هەر ڕەنگێکــی هەبێ، با خەڵکی ڕێزی نەگرێ، بەڵام ئەو کەســەی بە نیظام و بەرنامە ژیان بە ســەر دەبات دەبێ ببێتە مامۆستا و پێشەنگی خەڵکانی تر. تەماشای قورئان بکەن. خوای گەورە باسی قەلەڕەش -غراب-مان بۆ دەکات و مەدحی دەکات و وەکو مامۆســتا و پێشــەنگ بۆ مرۆڤێکی سەرلێشێواو ناوی دەبات! ئەگەر کەســێکی بێدین قورئــان بخوێنێتەوە و بە چاویلکەی تاریك و ڕەشــەوە لێی بڕوانێ و بیەوێ بە حیســابی خۆی ڕەخنەی

لێ بگرێ. ڕەنگە بڵێ: باشـە بۆچی قورئان باسـی (غراب)ی کردوە؟! باشـە قەلەڕەشـە گەلێ زیانی بۆ مرۆڤ هەیە. ئەی بۆ قورئان باسی دەکات؟! لـە وەڵامدا دەڵێین: ئـەم قورئانە کەلامی خوایە و هەرچی کەم و کورتی و مایەی گومان و دوودڵی بێ تێیدا نیە. لە سـەرەتای قورئانەوە ئەم ڕاسـتیە چەسپاوە: ﴿الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَٰبُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٢﴾﴾ البقرة: ١ - ٢.

بەڵێ لە قورئاندا لە بەسـەرهاتی دوو کوڕەکـەی ئادەمدا، ناویان هەرچییەکە گرنگ نیە. قورئان دەفەرموێ: (نَبَأَ ابْنَيْ آدَمْ) بەسەرهات و دەنگ و باسی دوو کوڕەکەی ئادەم. ئیتر خوای گەورە ناوی نەهێناون، چونکـە ئەم باس و بەسـەرهاتەی ئەم دوو برایـە تا ڕۆژی قیامەت بەردەوام دووبارە دەبنەوە. سبحان الله لە جوانی ئەم قورئانە. سەرنج بدەن باسی هەر کەسێکی کرد و ناوی نەهێنا، مانای وایە ئەم بابەت و باسە جارێکی تر دووبارە دەبێتەوە. بۆنمونە (إِمْرَأَة نوح. إِمْرَأَة لُوط). ژن و هاوسەری نوح و ژن و هاوسەری لوط دوو پێغەمبەری بەڕێزی خوای پـەروەردگار بوون. هەردووکیان کافـر بوون. خوای گەورە نافەرموێ ناویـان چیـە. چونکە ژنی لەو نەوعە دووبـارە دەبێتەوە. بە چاوی خۆمان دەبینین پیاوی صاڵح و خواناس و بەڕێز، هاوسـەرێکی هەیە بێ دین و بێ ڕێز و دژ بەماڵ و مێرد. بەڵام هەر لەقورئاندا کە باسی (مەریەم) دایکی عیسا -سەلامی خوای لەسەر بێت- دەکات. ڕاستەوخۆ نـاوی دێنێ. چونکە جارێکی تر مەریەمەیەکی تر دووبارە نابێتەوە. کە ئاوا بە داوێنپاکی بژی بە بێ شووکردن منالی ببێ. ئەمە چونکە

دووباره نابێتەوە خوای گەورە ناوی هێناوه. بەڵام خێزان و هاوسەری فیرعەونـــی ناو نەهێنـــاوه، تەنها دەفەرموێ: (إمْــرَأَة فِرْعَوْن). چونکە هەتا قیامەت ئافرەتانێك هەن گرفتاری دەستی مێردێکی خوانەناسی کافــری، دڵرەقی، خوێنرێــژی، زاڵمن، چۆن فیرعەون تەنها لەســەر ئیمان و یەکتاپەرســتی ژنەکەی خۆی چوار مێخە کێشــا و کوشــتی، گەلێ ژنیش هەموو کاتێ هەن کە ڕۆژانە مێردەکانیان شــەلاقکاریان دەکەن و بێحورمەتیان پێ دەکەن. لە کاتێکا ئەم ژنە گوناهو تاوانێکی نەکردوە. بەڵام ڕەنگە یەکێ بپرســێ بۆچی خوای گەورە لە قورئاندا ناوی فیرعەونی هێنــاوه. خۆ فیرعەونیش تا قیامەت هەر دەبێت؟! لە وەڵامدا دەڵێین: لەبەر ئەوەی (فیرعەون) ناوی ئەصڵی ئەو کەسە نیــه. بەڵکو نازناوی فەرمانڕەوای میصری ئەو کاتە، کە بۆتە ڕەمزی دیکتاتۆریەت و ستەمی ئەو کاربەدەستانەی کە خۆیان بە خوا دەزانن و میللەتی خۆیان دەچەوسێننەوە، هەر بۆیە ناوی نەهێناوه.

لێرەشــدا نــاوی دوو کوڕەکەی ئــادەم ناهێنێ. تەنهــا دەفەرموێ: (واتْلُ عَلَيْهِمْ نَبَأَ ابْنَي آدَمَ بالْحَقِّ) دەنگ و باســەکە و بەسەرهاتەکەشیان ئــەوە بوو کە: قوربانیان کرد بەهۆی جوانی ئەو شــتەی کە یەکیان پێشکەشــی کردبوو. وە ئیخلاص و دڵسۆزی ناو دڵی بەرامبەر بەخوا. خوای گەورە لێی قبوڵ کرد. بەڵام ئەوی تریان چی شتی خراپ بوو. کــە خۆی حەزی پێ نەدەکرد ئەوەی بەخشــی بــۆ قوربانیەکەی. وە دڵــی بۆگەن و پیس بوو، بەرامبەر بەلوتفــی پەروەردگار. بەرامبەر بەدایك و باوکی (ئادەم و حەوا). بەرامبەر خۆشی. بۆیە خوای گەورە

قوربانیەکەی لێ وەرنەگرت.. ئیتر زیاتر ئاگری ئیرەیی و حەســودی لە دڵیا کڵپەی ســەند و بە براکەی گوت: (لَأَقْتُلَنَّكَ) ســوێند بێ بت کوژم و لەناوت ببەم و خوێنت بڕێژم. بەڵام برا سالار و سەنگینەکە برا دڵپاك و دڵســۆزەکە لە وەڵامدا وتی: بە خوا براکەم ئەگەر تۆش مــن بکوژی، من تۆ ناکــوژم، من چەکت بەرامبــەر ڕاناگرم. بە خوا ئەمــەش لە لاوازی و بێدەســەڵاتی و کزۆڵی و کلۆڵیمەوە نیە. بەڵکو تەنهــا هی ئەوەیــە: (إِنِّي أَخــافُ اللهَ رَبَّ العالَمينَ).. بەڕاســتی من لە پەروەردگاری جیهانیان دەترســـم و شـــەرمی لێ دەکەم کە بە تاوانی کوشــتنی براکەمەوە بچمەوە حزوری. ئەوە بوو سەرەنجام برا لاسار و خراپەکار و دڵ بۆگەنەکە، برا دڵسۆز و ڕەوشت بەرز و دڵپاکەکەی خــۆی کوشــت!! بەڵام هەر کە کوشــتی و لاشــەیەکی بێگیان کەوتە بەردەمی، ئەمجا شەیطان کە ماوەیەکی زۆر بوو نەخشەی بۆ دەکێشا و هانی دەدا و ختوکەی دەدا. کە کارەکەی کرد ئەمجا شەیطان وازی لێ هێنا و وتی: (إِنِّي بَرِئٌ مِنْكَ. إِنِّي أَخافُ اللهَ رَبَّ العالَمينَ).. ئا لەو کاتەدا ئەم بکــوژە خوێنڕێژە، دۆش دامابوو بەد یار جەنازەی براکەیەوە و نەیدەزانی چی لێ بکات ئەمجا پەشــیمان بوو. بەڵام تازە پەشیمانی چ دادێکی دەدات، نەیدەزانی لاشــەی براکەی چی لێ بکات. ئا لێرەدا خوای گەورە قەلەڕەشەیەکی کردە مامۆستا و ڕابەر و چاوساغی ئەم مرۆڤە سەرلێشــێواو و گومڕایە و قەلەڕەشەکە، لاشەی قەلەڕەشێکی مــردووی هێنا و لە بەرچاوی ئەم بکوژە، بە قاچ و دەنوك قەبرێکی بچکۆلانــەی بۆ هەڵکەند و لاشــەی قەلەڕەشــە مردوەکەی تێ کرد،

ئەمجا گڵەکەی بە سـەردا کردەوە. قورئانی پیرۆز ئەو مەشهەدەمان بـۆ تۆمار دەکات و دەفەرمـوێ: (فَبَعَثَ اللهُ غُراباً يَبْحَثُ فِي الأَرْضِ، لِيُرِيَهُ كَيْفَ يُوارِي سَوْءَةَ أَخِيه)..

جا بەرێزان لێرەدا با ورد بینەوە و تەماشـا بکەین. بۆچی خوای گـەورە لە ناو ئەو هەموو باڵندانەی کـە دەیان بینین، کە پاکن، بە سـودن، جوانن، و سـپی و سـۆڵن، گۆشـتیان دەخورێ، بۆچی خوای گـەورە هیچی لە وانە نەنارد و قەلەڕەشـی نارد و کردیە مامۆسـتا بـۆ ئەم نەفامە، نەزانە، نادانە، بۆ ئـەوەی فێری بکات چۆن تەرمی براکەی خۆی بشـارێتەوە. بەڵێ بوو بەمامۆسـتای (لِيُرِيَهُ). تانیشانی بـدات؟! لەوەڵامدا دەڵێین: واللّٰه أَعْلَـم خوای گەورە خۆی کاربەجێ و حەکیمـە و هەرچـی بیکات و ئەنجامی بـدات پڕە لە حیکمەت و کاربەجێیـی. بەڵام هەر بۆ بەرچاوڕوونی خۆمان. باسـی هەندێ لە نیظـام و بەرنامەرێـژی لەکاری (غُراب) بـاس دەکەین، کە هەدەف و ئامانج و بابەتەکەی ئێمە لەسـەر ئەوە بوو. کە هەرشـتێ بە یاسا و نیظام بەرێوە چوو. خوای گەورە رێزی لێ دەگرێ و دەیکاتە پێشەنگ و پێشـەوای کەسـانی تر. هەندێ لەو نیظام و کارجوانیانەی (غُراب) قەلەڕەشیش ئەمانەن:

١. زەوتکردنـی خۆراکـی بێچوەکان لە لایەن هەر قەلەڕەشـێکەوە ئەنجام بدرێ و بچێ خۆراکی بێچووە بێ پەڕ و باڵەکان بخوات، ئەوا هەرچی قەلەڕەشـە لێی کۆدەبنەوە و پەڕ و باڵی دەکەن و وەکو ئەو بێچوە سـاوایەی لێ دەکەنەوە و نیشانی دەدەن کە دەبێ بە کردەوە،

بـــە چاوی خۆی ببینێـــ کە خواردنی بەچکەی بێ پەڕ و باڵ چەند تاوانـــە و ئەوەتـــا خۆشـــی وەکو جوجکی بچوکی بێ پـــەڕ و باڵی لێ هاتووە. ئەگەر قەلەڕەشـــێکی گەورە بێت و خۆراکەکەی داگیربکات و بیخوات چ تاوانێکی گەورەی کردوە، با بە کردەوە ســـزاکە وەربگرێ، نەك هەر بە قسە و سەرزەنشت..

٢. داگیـرکردنـــی هـــەر هێلانەیـــەك یـــان ڕووخاندنـــی لـــە لایەن قەلەڕەشـــێکەوە دەربەدەرکـــردن و ئاوارەکردنی قەلەڕەشـــی خاوەن هێلانە.. سزاکەی ئەوەیە کە دەبێ ئەو هێلانەیە جارێکی تر دروست بکاتەوە و وەکو خۆی لێ بکاتەوە. ئەمجا کۆمەڵی قەلەڕەشـــەکان لێی خۆش دەبن. ئەینا نابێ بە ئاسانی بە سەریدا تێ بپەڕێ.

٣. هەر قەلەڕەشێك بچێتە سەر قەلەڕەشێکی مێینەی قەلەڕەشێکی تر و دەســـت درێژی جنســـی بۆ ســـەر بکات و زینا و داوێن پیسی و خیانەتی هاوســـەری بکات. ئەوە هەموو قەلەڕەشەکان لەو خراپەکارە کۆدەبنەوە و بە دەنووك لە سەری دەدەن هەتا مێشکی سەری دەردێنن و دەیکوژن. ئەمجا یەکێ لە قەلەڕەشـــەکان بە دەنووك هەڵی دەگرێ و دەیشـــارێتەوە. لە چاڵێکی وەکو قەبـــردا!!.. جا لەبەر ئەم نیظام و بەرنامەسازیەی ژیانە لە لای قەلەڕەش کە گەلێ لە مرۆڤەکان دوورن لـــەم حوکمـــە جوانانە و ژیـــان بەبێ بەرنامەیی و بێ لێپرســـینەوە ئەنجـــام دەدەن. هـــەر بۆیە خوای گەورە ناوی (غُـــراب)ی لە قورئاندا تۆمارکرد و کردی بە ڕێنیشاندەر بۆ مرۆڤی گومڕا و سەرگەردان..

کەواتـــە: هەر قەومێـــك، هەر گەل و نەتەوەیەك با ڕەشـــیش بێ

وەکــو قەلەڕەش. با پیســخۆریش بێ، با ڕەمزی ڕەشیشــی بێ، مادام ژیانی بە بەرنامەیە و دادپەروەری دەچەسپێنێ و حەقی ستەملێکراو دەســتێنێ و دەســتی زاڵم دەگرێ و ناهێڵێ ســتەم بکات. ئەوە ئەو کەســە دەبێ ببێتە مامۆســتای خەڵکانی تر، پێشــەنگی گەلانی تر، وەکو بە چاوی خۆمان دەبینین کە ئەو ئەمریکی و ئەوروپیانە. بەو ڕەشــی و پیسخۆری خۆیانەوە، بوونە ســەرکردەی جیهان، چونکە لە ناویانــدا یاســا و نیظام پەیڕەو دەکــرێ و تارادەیەکی زۆر پەیڕەوی یاسا بۆ هەموانە، بەڵام وڵاتی موسڵمانان چونکە لە شەرعەکەی خوای پەروەردگار دوور کەوتنەوە، ئیتر تووشــی سەرگەردانی و بێ نیزامی و یاســایی بوون و دەبێ قەلەڕەش مامۆستایان بێ. ئەمەش یەکێ لە هۆکارەکانی ژێردەستەیی موسڵمانان و زاڵبوونی کافر و بێبڕوایانە بە سەریاندا، قورئان بە وردی بخوێننەوە هەموو شتێکی تێدایە..

کەواتە: شــەوی بەرات یان قەدر و ڕێز، فێری ژیانی پڕ لە نیظام و یاســا و بە بەرنامەمــان دەکات. نەك بە تەنها هــەر نانخواردن و شیرینی بەخشینی بەرات و بە ڕۆژووبوون تێیدا..

بەڕێزان: لێرەدا پرســیارێك درووســت دەبێ و لە دێرزەمانەوە تا ئێستاشــی لەگەڵ بێ، لە لایەن کەسانێکەوە بۆ گومان دروستکردن لە عەقیدە و بیروباوەڕی خەڵکیدا دەوروژێنرێ و دەپرسن: باشە ئەگەر خوای گەورە لەو شــەوە پڕ بەرەکەتەدا هەموو شتێکی دیاری کردبێ بۆ من تاوەکو ساڵی داهاتوو کە چیم لێ دێ و چیم دێتە ڕێ و چیم بۆ دەبێ و چیم لە دەســت دەچێ. ئیتــر من بۆچی هەوڵ بدەم؟ بۆ

کاسپی بکەم؟، بۆ خۆ لەمردن و بەلا لادەم، ئەی هەمووومان لە چارە نەنوسراوە و چارەنووسمان دیاری نەکراوە؟!

بـــە کورتـــی لەم دەرفەتـــە کەمەدا بـــۆ وەلامی ئەو پرســـیارە کە وەلامێکـــی دوور و درێژی هەیە. بـــەلام لێرەدا هەر ئەوەندە دەرفەت هەیە کە بڵێین: یەك بەیەکی ئەو کەسانەی کە ئەو پرسیارە دەکەن، بـــۆ تەنها یەك ڕۆژیش ناتوانـــن قەناعەت بە خۆیان بکەن کە لەماڵ نەچنە دەرەوە و نەچن بۆ فەرمانگەکەیان، بۆ دوکان و بازاڕ و کار و کەسابەتەکەیان، بۆ خوێندن و زانکۆکەیان. بە ناوی ئەوەی کە خوای گـــەورە لە چارەی نووســـیون کە لەماڵ نەچنـــە دەرەوە و پارەکەیان بـــۆ بێتـــە ماڵەوە! یاخـــود ئازارێکیان هەبێ و نەچنـــە لای دکتۆر و بڵێن چیمان لە چارە نوســـرابێ هەرئەوە دەبێ. نەخێر دەشچێتە لای دکتۆر و دەرمانی بۆ دەنوســـرێ و لە دەرمانخانە وەری دەگرێ و بە کاری دێنێ. ئەمجا ئەگەر خوا مەیلی لێ بێ دەیکات بە شـــیفا و کە خوای پەروەردگار کە -الشـــافی-یە ویستی لەسەر نەبێ -بەحیکمەت و کاربەجێیـــی خۆی کە هەمووی لە بەرژەوەنـــدی بەندەکانیەتی با دەست بەجێش هەستی پێ نەکەن- نابێ بە شیفا و نەخۆشی وا هەیە هەمـــوو دکتـــۆری دونیای پێ دەکەن و چـــی دەرمانی چاك و باش و پێشکەوتوە بۆی بەکار دێنن سودی لێ نابینێ. کەواتە: قەزا و قەدەری خوا و چارەنوســـی مرۆڤ پێویســـتی بە هەوڵ و تێکۆشان و هیمەت بەرزی و گەڕان و دەست گرتنە بە هۆکارەکانەوە کە خوای گەورە بۆ مرۆڤی داناون. ئەمجا مرۆڤ ئەگەر ئیماندار بێ، تەنها پشت بە خوا

دەبەســتێ و یەقینی هەیە. تەنها خوای گەورە ئەم هۆکارانە دەکاتە هۆی ســودپێگەیاندنی، یان نەگەیاندنی سود و کەڵك پێی.. هەروەها پوچی و بێ بنەمایی ئەم پرســیارە. جارێکی تر لە وەدا دەردەکەوێ، کە کەس لەوانە ڕازی نابێ کە ئەگەر ئازار درا و ماڵی خورا و مافی خورا لە لایەن کەســێکی ترەوە و چوونە دادگا. کەسی تۆمەتبار بڵێ: جەنابــی دادوەر مــن قەزا و قەدەری خوا و ئیــرادەی خوا وای کرد ئەو ئازارە بە فلان کەس بگەیەنم و چارەنوســمان وابوو پارەی فلان کــەس بخۆم و بدزم، بە دەســت خۆم نەبــوو!! ئایا کەس بەمە ڕازی دەبــێ؟! بێگومان نەخێر. کەواتە: هەر بوونی وەزارەتی داد و دادوەر و دادنوس و ئەو دەزگا بەهێزە، بە دەسەڵاتە. نیشانەی ئەوەیە مرۆڤ ئیختیاری چاکە و خراپە بە دەســت خۆیەتی و لەسەر چاکە پاداشت و لەسەر خراپە تاوان، تۆڵە و سزا وەردەگرێ.

بەڕێزان: ئەم جۆرە پرسیارە لە بارەی قەزا و قەدەر و چارەنوسەوە هەرلە کۆنەوە هەبوون، مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە: جارێکیان گەنجێك ڕۆیشت بۆ وڵاتێکی دوور لە وڵاتی خۆی، ماوەیەك لەوێ مایەوە، دوای تەواوکردنی خوێندن گەڕایەوە زێدی خۆی، داوای لە کەسوکاری کرد مامۆســتایەکی ئاینی بۆ بدۆزنەوە، تا وەڵامی سێ پرسیاری بداتەوە. کەسوکاری گەنجەکەش چوونە خزمەت مامۆستایەکی بەڕێزی ئاینی و داوایــان لێ کرد کە کوڕەکەیان لــەو وڵاتە دوورە خوێندوویەتی و ئێســتا هاتۆتەوە و داوای وەڵامی سێ پرسیار دەکات. بەڵکو بەڕێزتان لەو گومانە ڕزگاری بکەن. جەنابی مامۆستای خەمخۆری دین و ژینی

خه‌ڵکـــی، به‌ ڕوویه‌کـــی خۆش و دڵێکی گـــه‌وره‌ و فراوانه‌وه‌ کاتی بۆ دیـــاری کردن و ئاماده‌ بوو به‌ پێی زانســـتی خۆی وه‌ڵامی بداته‌وه‌ و سه‌ره‌نجام ئه‌م گفتوگۆیه‌ له‌ نێوان مامۆستا و گه‌نجه‌که‌دا ڕووی دا:

گه‌نجه‌کـــه‌: تـــۆ کێیت، ئایـــا ده‌توانـــی وه‌ڵامی پرســـیاره‌کانی من بده‌یته‌وه‌؟!

مامۆستا: من به‌نده‌یه‌کی خوام، پشت به‌خوا، هه‌وڵ ده‌ده‌م وه‌ڵامت بده‌مه‌وه‌..

گه‌نجه‌کـــه‌: دڵنیایت که‌ ده‌توانیت وه‌ڵامـــم بده‌یته‌وه‌. چونکه‌ به‌ر له‌تـــۆ ئه‌م پرســـیارانه‌م لـــه‌ زۆر که‌س کردوه‌ و که‌ســـیان نه‌یانتوانی قه‌ناعه‌تم پێ بکه‌ن و دڵم به‌ وه‌ڵامه‌کانیان ئارام بێ.

مامۆستا: هه‌وڵ ده‌ده‌م پشت به‌خوا وه‌ڵامت بده‌مه‌وه‌.

گه‌نجه‌که‌: ئه‌م سێ پرسیاره‌م له‌تۆ هه‌یه‌:

١. ئایـــا به‌ڕاســـتی خودا -الله- هه‌یه‌؟ ئه‌گـــه‌ر هه‌یه‌ ئه‌ی چۆن نه‌ ده‌یبینم، نه‌ بۆنی ده‌که‌م، نه‌ ده‌توانم ده‌ســـتی لێ بده‌م، نه‌ گوێم له‌ قسه‌ و ده‌نگیه‌تی. ئه‌گه‌ر ڕاسته‌ خوا له‌ واقیعدا بوونی هه‌یه‌، شێوه‌یم نیشان بده‌؟!

٢. ئایا قه‌زا و قه‌ده‌ر چیه‌؟

٣. ئه‌گه‌ر شه‌یطان له‌ ئاگر دروستکراوه‌، بۆچی ده‌خرێته‌ ئاگره‌وه‌؟! له‌ کاتێکا خۆی له‌ ئاگر دروست کراوه‌ و هیچ کاری لێ ناکات. چونکه‌ ئاگر ئاگر ناسوتێنێ؟!

دوای ئه‌و سێ پرسیاره‌ گه‌نجه‌که‌ بێده‌نگ بوو. مامۆستاش بێده‌نگ

بوو. خامۆشـــی باڵی بەســەر مەجلیســەکەدا کێشـــا، لە پڕا مامۆستا زللەیەکی بەهێزی لەگەنجەکە دا.

گەنجەکە بە دەم ئازارەوە گوتی: بۆ زللەت لێدام، ئایا لێم تورەیت؟ پرسیارەکانم نابەجێ بوون؟!!

مامۆســتا: نەخێر، من لێت تووڕە نیم و پرسیارەکانیشت نابەجێ نین و لێدانی ئەو زللەیە وەڵامی هەرسێ پرسیارەکەت بوو!!

گەنجەکە: چۆن؟! من تێناگەم؟

مامۆستا: هەست بەچی دەکەیت دوای ئەوەی ئەو زللەیەم لێ دایت؟

گەنجەکە: بێگومان هەست بە ئازار دەکەم.

مامۆستا: ئایا دڵنیایت کە ئەو ئازارە بوونی هەیە؟ شێوەکەم نیشان بدە؟!

گەنجەکــە: ناتوانم، بەڵام خۆ هیچ گومانــم لە بوونی ئەو ئازارە نییە و هەستی پێ دەکەم.

مامۆســتا: دەی ئــەوە وەڵامی پرســیاری یەکەم بــوو. هەموومان هەســت بە بوونی خوای گــەورە دەکەین. بــەڵام ناتوانین بیبینین. هەستکردنیشمان بە بوونی خوای گەورە لە ڕێگای دروستکراوەکانییەوە، کە بە چاوی خۆمان، خۆمان و ئەو گەردوونە دەبینین. کە عەقڵمان ڕێگامان پێ نادات، ئەو جلوبەرگەی لە بەرماندایە، هەر لە خۆوە بە بێ مواد و کەرەســـتە و کارگە و کرێکار و وەستاو بەرگدروو، هەر لە خۆیەوە دروســت بووبێ و هاتبێتە بەرمـــان، لە کاتێکا نە کارگەمان بینیوە، نە وەستای دروستکاری، بەڵام یەقینمان هەیە کە ئەم قوماشە

دروســـتکەرێکی هەیە و لە بینینی بەرهەمەکەوە هەســت بە بوونی دروســتکارەکە دەکەین. دەی خوای گەورە دروســتکەرو بەدیهێنەری ئێمەیە و لە ڕێگەی خانە بەخانەی لاشەمانەوە کە ئەوپەڕی جوانی و ڕێکوپێکی و کاربەجێیی پێوە دیارە. وە بە نەبوونی هەر ئەندامێکی لاشــەمان هەر لە خۆیەوە بگرە خانەیەکی لاشــەمان، هەست بە کەم و کــورِی دەکەین، ئەی دەبێ ئەم لاشــەیە هەر لە خۆیەوە دروســت بووبــێ؟ نەخێر. کەواتە: بە بینینی دروســکراو یەقینمان هەیە کە دروستکار هەیە و هەستی پێ دەکەین..

ماموٚســتا: ئایا دوێنێ خەوت بە وەوە بینی، کە زللەت لێ دەدەم؟ ئایا بە خەیاڵتا هات ئەمڕۆ زللەت لێدەدەم؟!!

گەنجەکە: نەخێر.

ماموٚستا: ئەوە قەزا و قەدەرە.

ماموٚستا: ئایا دەستی من لە چی دروست بووە؟ ئەی ڕوخساری تۆ لەچی دروست بوە؟

گەنجەکە: بێگومان لەقوڕ دروست بوە.

ماموٚســتا: دەی ســەرنج بدە. وێڕای ئــەوەی هەردووکیان لە قوڕ دروســت بوون، بەڵام دەســتی من بوو بە مایەی ئازار بۆ ڕووخساری تۆ. کەواتە: ئاگری دۆزەخ شوێنێکی پڕ ئازارە بۆ شەیطان.

بەم شــێوەیە گەنجەکە قەناعەتی کرد و ئــەو گومانەی لە لایەن بێدینانەوە بۆی دروست کرابوو. وە ئەو هەمبانەی پڕ فووی ناحەزان کرابوو. بە یەك دەرزی ماموٚستایەکی ئیسلامخواز فش کرایەوە و پوچ

بۆوە. کە بە داخەوە لەم سـەدەی بیسـت و یەکەدا هێشتا خەڵکانێك هەر ئەم پرسیارانە دەکەن!.

ئیماندارانی بەڕێز: دەبێ ئەو ڕاسـتیە بزانین کە ڕاستە هەر شتێ ئیرادەی خوای گەورەی لە سـەر نەبـێ نابێ. بەڵام دەبێ لێمان تێك نەچێ، مەرج نییە، هەرچی خوای گەورە ئیرادەی پێ بێ، پێشی ڕازی بێ. خۆ ئاشـکرایە خوای گەورە ئەگەر توانای قسـەکردن لە مرۆڤ بستێنێتەوە، ئەو مرۆڤە ناتوانێ وشەیەك بڵێ. کەواتە: هەموو قسەیەك بـە ئیرادەی خوا لە دەمی مرۆڤ دێتە دەرەوە. ئەی ئەگەر کەسـێك بەو زمانە کوفری کرد و دژایەتی خوای کرد. ئایا خوا پێی ڕازیە؟ بە بێگومان نەخێر. هەروەکو لە قورئاندا فەرموویەتی: (وَلا يَرْضَى لِعِبادِهِ الكُفْـرَ). یان دوو نموونەی سـادە و جوان بخەینە بەرچاو: دووکەس دەچنە سەرکانی و ئاوێکی سازگاری ئەم کوردستانە بەهەشت ئاسایە، هەردوو کەسەکە یەکی سوراحیەکیان پێیە. هەردووکیان دەچنە سەر کانی و ئاوەکە و سوراحیەکانیان پڕ دەکەن لە ئاوێکی پاك و خاوێن و خـۆش، کە هەتا بڵێی جوان و پاك و خاوێنە و بە تەماشـاکردنی دڵ ئـارام دەبـێ.. ئەمجا لـە کانیەکە دوور دەکەونـەوە و یەکێکیان شەربەتێکی جوان و پاك و بەتام دێنێ و دەیکاتە سوراحیە ئاوەکەوە و تێکی وەردەدا و دەبێتە شەربەتێکی بەتام و خۆش. ئەوی تریشیان دەچێ مشـتێ پاشـەڕۆی ئاژەڵ و زبڵ و زاڵ هەڵدەگـرێ و دەیخاتە سـوراحیە ئاوەکەوە و تێکی وەردەدا و دەبێتە زبلاوێکی ناشـیرینی بۆنناخـۆش کە مرۆڤ قێزی لێ دەکاتـەوە.. دەی ڕێك ئیرادەی خوا

وەکــو ئاوەکە وایــە. کە پاك و بێگەرد و بێ خەوشــە. ئیرادەی خوا وەکــو ئاوەکە لەگــەڵ هەردووکیانە. بەڵام ئەمیان بە ویســتی خۆی و بە دەســتی خۆی کردی بە شــەربەتێکی بەتام. ئەوی تریشیان بە دەستی خۆی و بە ویستی خۆی کردی بە زبلاوێکی بێزراو. بێگومان نە شــەربەتەکە و نە زبلاوەکە هیچیان بەبێ بوونی ئاوەکە دروســت نەدەبوون. بە هەمان شــێوە هیچ شــتێ بەبێ ئیــرادەی خوا نابێت. بــەڵام ئەوە مرۆڤە ئەگەر چاکەکار بێ، ئەم ئیرادەی خوایە بۆ چاکە بەکاردێنــێ و دەبێتە خێر و بەرەکەت بۆ خۆی و دەوروبەری وە بە پێچەوانەشەوە ئەگەر مرۆڤێکی خراپەکار بێ -پەنابەخوا- ئەوا ئەو ئیــرادەی خوای گەورە بەکاردێنــێ بۆ خراپە و خۆی و دەورووبەری تووشی گرفت دەکات.

نموونەیەکــی تر: ئامێــری (ئوتو) لە زۆربــەی ماڵەکاندا هەیە و جلوبەرگــی پــێ ئوتو دەکرێــت و جلوبەرگەکانمان جــوان دەکات و ئامێرێکی سودبەخش و خزمەتگوزارە. دەی هەر ئەم ئامێرە لە لایەن جەلادەکانی بەعسەوە زۆربەی دیکتاتۆرەکانی وڵاتانی عەرەبییەوە بە گشــتی بۆ ســوتاندن و داخکردنی پشــتی بەندیەکان بەکار دەهات و پشــتیان و لاشــەیان پێ داخ دەکردن، بۆ ئەوەی إعترافیان پێ بکەن لەسەر ئەوەی خۆیان داوایان لێ دەکەن.. جا سەرنج بدەن ئەم ئوتوە بە پلاکی کارەبایەکەوە بەستراوە. ئەگەر کارەباکە نەبێ ئوتومکە کار ناکات. کەواتە: هەم جلوبەرگ ئوتوکردنەکە، هەم پشت داخکردنەکە، هــەر بە هۆی کارەباکەوە بوو. بەڵام کێ چاکە و خراپەی بەو ئوتوە

کـــرد؟! بێگومـــان مرۆڤ خۆی. نـــەك كارمباكە كـــە ئوتوەكەی گەرم كردوە!. دەی كارمباكە وەكو ئیرادەی خوای گەورە لەگەڵ كارەكەدایە. بـــەڵام ئەوە مرۆڤە بـــۆ چاكە یان بۆ خراپە بـــە كاری دێنێ و هیچ خراپـــەی ئیرادەكـــەی تێدا نیە. هەر بۆیە دووبـــارەی دەكەینەوە كە هیچ شتێ بە بێ ئیرادەی خوای گەورە نابێ، بەڵام مەرج نیە هەرچی خوا ئیرادەی لە ســـەر بێ پێشـــی ڕازی بێ. كە ئـــەوەی پێی ڕازیە و ئەوەشی پێی ناڕازیە، لە قورئاندا تۆماركراوە..

بەڕێزان: لەسەر (قەزا و قەدەر) بەسەرهاتێكی جوان و شیرین و پڕ ئامۆژگاری هەیە كە ئەمەیە: كاتێك ئیمامی عومەری كوڕی خطاب لە مەدینەوە بەرەو شام بەڕێ كەوت و لەڕێگادا بیستی كەوا (طاعون) لە وڵاتی شامدا بڵاوبۆتەوە گەڕایەوە و نەچوو بۆ شام. (ئەبو عوبەیدەی جـــەرڕاح) گەورە هاوەڵی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، كە سەرپەرشـــتیاری وڵاتی شـــامی دەكرد. فەرمووی: ئەی ئەمیری ئیمانداران ئەوە بۆچی گەڕایتەوە؟! ئایا لە ترســـی نەخۆشـــی طاعون ڕا دەكەی و لەقەزا و قـــەدەری خوا دوور دەكەویتـــەوە؟! ئیمامی عومـــەر فەرمووی: ئەی ئەبا عوبەیدە دەبوایە تۆ ئەوەت نەوتایە. چونكە تۆ زۆر لە ئیســـلام شارەزای. ئەی گوایا نازانی كە: (فَرَرْنا مِنْ قَدَرِ اللّٰهِ. إلى قَدَرِ اللّٰهِ). ئەی ئەبا عوبەیدە. ئایا ئەگەر تۆ حوشترێكت پێ بێ، لە شیوو دۆڵێكیشدا بـــی كـــە دوو لاپاڵی هەبێ. ئەگەر تۆ لە هـــەر كام لەو دوو قەدپاڵەدا حوشترەكەت بلەوەڕێنی. ئایا هەر بە قەدەری خوا نەبووە؟! بێگومان بەڵێ. كەواتە: لەبەر قەدەری خوا ڕاكە ئەگەر نەخۆشـــی و ناخۆشـــی

بوو. بۆ لای قەدەری خوا. کە خۆپارێزی و لەشساغی و تەندروستیە.

خوای پەروەردگار بە ڕەحم و میهرەبانی بێسنوری خۆی ڕەحممان پــێ بــکات و چــی چاکە و خۆشــییە پێمان ببەخشــێ و لە هەموو نەگبەتــی و ناهەمــواری و نارەحەتیەکیش بمانپارێــزێ. (رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ) اللّهُمَّ آمين

## سەرچاوەکان:

١. صفوة التفاسير، محمد علي الصابوني.

٢. تەفسیری ئاسان - بورهان محمد أمين.

٣. گۆڤاری چرای ڕووناکی. ژ: ٢٣، ل٤٤.

٤. موسڵمانی کامڵ. بەرگی یەکەم. م.عەلی باپیر.

٥. وتارێکــی، د.عبداللطيــف أحمد. دەربــارەی قەزا و قەدەر لە (المســائل الجاهلية)دا.

٦. گۆڤاری بڕیار: ژمارە ٣٩. ل٢٩.

وتاری سێیەم بۆمانگی شەعبان

# جۆرەکانی نەفس

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدنا محمد وَعلى آلهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز: بەرە بەرە و سات بە سات بە ویستی خـوا وا لە مانگـی پیرۆز و پڕبەرەکەتی ڕەمـەزان نزیك دەبینەوە، ئـەو مانگەی کە هەموو چرکەیەکی بەرەکەتێکە، خەڵاتێکە لە لایەن خوای پەروەردگارەوە پێشـکەش بە ئوممەتی محمد المصطفی (ﷺ) کـراوە. جا یەکێ لەو بەرەکەتانـە ئەوەیە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە فەرموودەیەکدا باسـی کردوە و فەرموویەتی:** (وَصُفِدَتِ الشَّياطينُ). **شـەیاطینیەکان کـۆت و زنجیـر دەکرێـن و ئوممەتم لە شـەڕیان پارێـزراو دەبێت** إنْ شـاءَ الله. **بەڵام لێرەدا پرسـیارێك درووسـت دەبێـت. ئەویش ئەوەیە: ئەی باشـە بۆچی هەندێ کەس لە ناو ئەو مانگە پڕبەرەکەتەشدا. لە ناو مانگی ڕەمەزانیشدا هەر واز لە کردەوە ناشـەرعی و خراپەکان ناهێنن؟! نوێژ ناکـەن و ڕۆژوو ناگرن. ئەی خۆ شـەیاطینیەکان کۆت و زنجیر کراون لەو مانگەدا و دەسـەڵاتیان بە سـەر مرۆڤدا نییە. ئەی چۆنە ئـەو مرۆڤە هەر خراپە دەکات؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو جۆرە کەسـانەی کە لە مانگی ڕەمەزانیشـدا دەست لە خراپە هەڵناگرن و ڕوو لە خوا ناکەن یان هەر لە بناغەوە**

ئیمانیان بە خوا و ئاینی ئیسـلام نییە و تەنها بەبێ ویسـتی خۆیان لە سـەر ناسنامەی باری کەسایەتیەکەیان نوسـراوە، ئاین: موسڵمان -مسـلم-. وە هەر بڕوایان بە مانگی ڕەمەزان و ڕۆژوو نییە. یاخود: موسـڵمانن، بەڵام ئەوە نەفسـی پیسیانە کە ئەو کارە ناشەرعیانەیان لـەو مانگـەدا پێ دەکات و هانیان دەدات بـۆ خراپە. جا لەبەر ئەوە بە پشـتیوانی خوا، بۆ ناسینی جۆرەکانی نەفس. ئەم وتارە تەرخان دەکەین بۆ ناسینی جۆرەکانی نەفس، کە بەم شێوەیە دابەش بوون:

١. النَّفْسُ الأَمّارَةُ بالسُّوءِ: ئەو نەفسەی بەردەوام هانی خاوەنەکەی دەدات بۆ خراپەکاری.

جا بەڕێزان: پێویستە ئەوە لەبەر چاومان ئاشکرا بێ کە: شەیطان دەیـەوێ گوناهت پێ بکات. بەڵام بە لایەوە گرنگ نییە. کام گوناهە بکەی. گرنگ ئەوەیە گوناه و بێشـەرعی بکەی. بەڵام نەفس سـوور دەبـێ و وڕك دەگرێ لە سـەر گوناهێکی دیاریکراوو دەڵێ هەر دەبێ ئەو گوناهە بکەی. وەکو منالی ساوا کە وڕك بگرێ لە سەر خواردنی مەمکـی دایکـی ئەگەر دەیان شـتی بدەیتێ هەر ئـەوەی بوێ. وەکو شاعیر فەرمویەتی:

(وَالنَّفْسُ كالطِّفْلِ إنْ تَهْمِلْهُ شَبَّ عَلى
حُبِّ الرِّضاعِ وَإنْ يَفْطِمْهُ يَنْفَطِمُ)

جیاوازیەکـی تر: ئەو گوناهەی کە شـەیطان پێت بکات، لەزەتی کاتی لـێ دەکـەی. بەڵام گوناهی نەفس لەزەتیشـی نییە و هـەر حەز دەکەی بـی کـەی. هیچ خۆشـیەك لەو گوناهـەدا نییە کە نەفـس پێت دەکات،

کەچی هەر وازیشــت لــێ ناهێنێ تا گوناه و تاوانەکــەت پێ نەکات. ئەو گوناهەی شــەیطان بە مرۆڤی دەکات. وەکو: زینا، نەزمری حەرام... هتد. کــە مرۆڤەکە بــۆ چەند چرکەیەك لەزەتی لــێ دەکات، ئەگەرچی دوایی هەمــوو ژیانی لێ تاڵ دەکات. بەڵام ئەو گوناهە و ئەو تاوانەی نەفس بە مرۆڤی دەکات، هیچ تام و چێژ و لەزەتێکی نییە. وەکو ئەوەی کەســی وا هەبــوە بە بێ ئەوەی فلان کەس هیــچ خراپەیەکی بۆی هەبووبێ، کاتێ بینیویەتی ئۆتۆمبێلەکەی لەبەر دەرگا وەستاوە و ئوتومبێلێکی گرانبەهایە و شەویشــە و کەس چاوی لێی نییە. ئەم کەسە خراپەکارە دێت و چەند شــوختێك لەو ئوتومبێلە دەکات و عەیبداری دەکات، باشە خۆ ئەم گوناه و تاوانــە گەورەیە هیچ لەزەت و خۆشــیەکی چرکەییش بە خاوەنەکەی نابەخشــێ. جگە لە دڵەکوتێ و ترس و خۆ لەبەرچاو سوکبوون لە ناخی خۆدا. کەواتە: ئەمە گوناهی نەفسە، نەفسی فەرمانکار بە خراپە و تاوان..

٢-جــۆری دووەمی نەفس (النَّفْــسُ اللَّوامَّة): نەفســێکە کە لۆمە و ســەرکۆنەی خاوەنەکەی دەکات کە بۆچی و لەســەر چــی ئەو گوناه و بێشەرعیەی کردوە. وەکو لێپرسراوێك، لێپرسینەوە لە خاوەنەکەی دەکات و سەرزەنشــتی دەکات و بە ئاگای دێنێتەوە. خــوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ لَآ أُقْسِمُ بِيَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ ﴿١﴾ وَلَآ أُقْسِمُ بِٱلنَّفْسِ ٱللَّوَّامَةِ ﴾ القيامة: ١ - ٢.

واتە: سوێند دەخۆم بە ڕۆژی قیامەت، سوێند دەخۆم بە ویژدانی زیندوو نەفسی ڕەخنە لەخۆگر کە لۆمەی خۆی دەکات. ئەو نەفسەی کە سەرکۆنەی خاوەنەکەی دەکات کە بۆچی ئەو خراپە و بێشەرعیەت کرد. ئەی بۆچی ئەو خواپەرستی و طاعەتەت نەکرد.

ئیمانداران: سبحان الله لەسورەتی -القيامة-دا، باسی (ئەم نەفسی رەخنە لەخۆگرە) هاتوە. چونكە: ئەوەی نەفسی (اللّوامَة) دروست دەكات، بڕوابوون بە قیامەتە!.

زانستی كۆمەڵناسی نوێ دەڵێ: ئەوەی خراپە و تاوان لە كۆمەڵگەدا كەم دەكاتەوە ئەوەیە:

أ. الحاكِمُ المُسَيطِر: كاربەدەستی بەدەسەلآت و زاڵ. كە بەهۆی جێبەجێكردنی یاسا بەسەر هەمواندا دەتوانێ خراپە و سەرپێچی و لارەملێ زۆر كەم بكاتەوە.

ب. كۆمەڵگا خۆی چاودێرە بەسەر یەكەوە و خراپە قبوڵ ناكات، وەكو لە ئیسلامدا (فەرمان بە چاكە و بەرگری و ڕێگرتن لە خراپەكاری) بە بەشێكی گەورە لە ئیسلامەتی و دینداری دانراوە و نابێ كەس بڵێ، حەقی كەسم نییە. نەخێر واجبە هەموو ئیماندارێك دەستی هاودینەكەی خۆی بگرێ بۆ ڕێگای چاكە و ئەگەر بینی تووشی خزان و لادان بوو. ئامۆژگاری بكات و ڕاستی بكاتەوە و ئامۆژگاری بكات بە زمانی شیرین و دڵی پڕ لە خۆشەویستی و دڵسۆزی..

ج. نەفسی مرۆڤ خۆی ئامۆژگاری خۆی بكات. لە ناخی خۆیدا چاودێرێك هەبێ كە كاتێ تووشی خراپە و لادانێك بوو، زەنگێكی ورياكەرەوەی بۆ لێ بدات و پێی بڵێ دەبوایە ئەو كارەت نەكردایە و وازی لێ بێنە و تەوبە بكە. كە قورئان ناوی ناوە. (النَّفْسُ اللَّوامَة). جا ئیسلام، لەم سیانەدا، لە هەموان زیاتر گرنگی بە پەروەردەی نەفس داوە، چونكە ئیسلام دەیەوێ تاوانەكە هەر ڕوو نەدات نەك دوای ڕوودانی بەری پێ بگرێ.

٣.جۆری سـێیەمی نەفس (النَّفْسُ المُطْمَئِنَّة): کە قورئان باسـی کـردووە و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيَّتُهَا ٱلنَّفْسُ ٱلْمُطْمَئِنَّةُ ۝٢٧ ٱرْجِعِىٓ إِلَىٰ رَبِّكِ رَاضِيَةً مَّرْضِيَّةً ۝٢٨ فَٱدْخُلِى فِى عِبَٰدِى ۝٢٩ وَٱدْخُلِى جَنَّتِى ۝٣٠ ﴾ الفجر: ٢٧ - ٣٠

واتـە: ئـەی خاوەنـی دڵ و دەروونی پڕ لە ئارامی، ئەی ئەو نەفسـەی دڵنیا بووی لە هاتنی قیامەت و چوونەوە بەر بارەگای خوا و خۆت بۆ ئەم ڕۆژە ئامادە کردبوو. کە دونیا بەجێ دێڵی و دەگەیتەوە قیامەت و حزوری پەروەردگارت. ئەی نەفسی دڵنیا، کە لە تەمەنی کورتی دنیادا، پەروەردگاری خۆتت ناسی و بە جوانی پەرستت. بگەڕێرەوە بۆ لای پەروەردگارت کە تۆ لەو ڕازیت و ئەویش لە تۆ ڕازیە. (موسڵمانی بەڕێز: ئەم پێوەرەت بەردەوام با لەبەرچاو بێ: ئەوەی لەم دنیایەدا بە شەرعی خوا ڕازی بێ، خوای گەورە لە قیامەتا لێی ڕازی دەبێ. وە فریشتەکان لە سەرەمەرگدا موژدەی ئەوەی پـێ دەدەن کە خـوا لێی ڕازیە).. وەرە بچۆرە ڕیـزی بەندە چاکە نازدار و بەڕێزەکانمەوە بچۆرە بەهەشتە خۆشە ڕازاوەکەمەوە.

بەڵێ (نەفسـی دڵنیا و دامەزراو) ئەو نەفسـەیە، ئەو دڵەیە کە لە سـەر ئەم دینداری و خواناسـییەی هێندە سوورە. کە ئەگەر هەموو دونیا قسەی خراپ لە سەر ئیسلام و قورئان و پێغەمبەر و صەحابە بکات و بیەوێ لەکەدار و ناشیرینیان بکات و گومان لە دڵی بڕوادارانـدا درووسـت بکات، ئەم نەفسە دامەزراوە. ئەم دڵە دڵنیایە، هەر گوێشی لێ نییە و زەرڕەیەك گومانی لە دڵدا بۆ درووست نابێ. ئەم نەفسەش، ئەم دڵەش، بە چی دەست دەکەوێ؟! بەوەی کە مرۆڤ زۆر یادی خوا بـکات، بـە زمان زیکری خوا بکات بە دڵ زیکری خوا بکات و بیر لە

گەورەیی و دەسەڵاتی خوای پەروەردگار بکاتەوە، بە چاو زیکری خوا بـکات و لەو هەموو دروسـتکراوەی خوای گـەورە ورد ببێتەوە و لە هەر مەخلوقێکدا. گەورەیی و عەظەمەتی -الله- ببینێ، خوای گەورە فەرموویەتی: ﴿أَلا بِذِكْرِ اللهِ تَطْمَئِنُّ الْقُلُوب﴾ الرَّعد: ٢٨

واتە: ئاگادار بن، دڵەکان هەر بە قورئان و یادی خوا و پابەندبوون بە ئاینەکەیەوە خۆشنوود دەبن و دەحەوێنەوە..

ئیمانداران: نەفسێکیش هەیە، کە خوای گەورە باسی نەکردوە، لەبەر بێرێـزی و بێنرخی ئەو نەفسـە. کە ئەویش: (النَّفْـسُ الغافِلَة). ئەو نەفسەی لە سەر یەك بار ناوەستێ، لە یەك ڕۆژدا چەند جار دەگۆڕێ، بەیانیان کە لەخەو هەڵدەسـتێ دڵنیایـە (مُطْمَئِنَّة)یە، کە دەڕوات بۆ بازاڕ و کڕین و فرۆشـتن. (أَمّارَةُ بالسُّـوءَ). لە شەودا ئەمجا پەشیمانە لـەو خراپانەی لەو ڕۆژەدا کردوونی و لۆمـەی خۆی دەکات و دەبێتە (اللَّوامَة). کەچی بۆ بەیانی هەمان دەستوور دەست پێ دەکاتەوە. ئەمە نەفسـی غافڵە و لەسەر بارێك جێگا ناگرێ، خاوەنی ئەم جۆرە نەفسە غافڵیە. کە دەبێتە پەڵەیەکی ڕەش و چڵکن بەسەر ئیسلامەوە.

نوێـژ دەکات، کەچـی لە بـازاڕ و معامەلەدا دەسـتبڕە. لە کاتی گوێگرتن لە مەوعیزە و ئامۆژگاریشـدا دەگری و فرمێسـك دەڕێژێ، لەسەر هیچیان مانەوەی نییە..

جا ئیمانداران: پێویسـتە ئەم نەفسـە بەربەرەکانی و تێکۆشـانی بەرامبەر بکرێ و هەروا بەرەڵا نەکرێ. کە لە تەزکیەی نەفسدا پێی دەوترێ: (مُجاهَدَةُ النَّفْس). کە لە ڕاستیدا (جیهاد) (١٤) بەشی هەیە.

بەشــی هــەرە گەورەیان بریتیە لــە: (جیهادی نەفــس). پێغەمبەری خــوا (ﷺ) لەماوەی (١٣) ســاڵی پێغەمبەرایەتیــدا لە مەککە، خۆی و هاوەڵانــی پایەبــەرزی لە جیهادا بوون. بــەڵام جیهادی چەکداری نا. بەڵکــو جیهادی نەفس، پاککردنەوەی دڵ و دەروون. ئەمجا ئەوە بوو لە دەرەنجامی ئەم جیهادە گەورەدا کە دڵ و دەروونی پاك کردنەوە، بــەم کۆمەڵە کەمە، بەم کۆمەڵە پاکە، نەفس پاکە. ویژدان زیندووە، قیامەت لەبەرچاوە، بناغەی دەوڵەتی مەدینە دامەزرا..

لە فەرمودەی سەروەرماندا (ﷺ) هاتوە کە: جیهادی نەفسی بە جیهادی گــەورە ناو بردوە و جیهادی شمشــێر و قیتالــی بەجیهادی (أَصْغَر) ناو بردووە. چونکە هەرکەس نەتوانێ بە ســەر داواکاریە نارەواکانی نەفسی خۆیدا. کە لە لاشــە و سینەی خۆیدایە. زاڵ بێت و ڕووبەڕوو ببێتەوە، ئیتر چۆن دەتوانێ ڕووبەڕووی دوژمنی دین و ژینی ببێتەوە؟!

بەڕێزان: با بزانین ناپلیۆن پۆناپارت لەم بارەیەوە چی دەڵێ!:

هەموومــان ناپلیۆن پۆناپارت دەناســین، ئــەو مرۆڤەی کە هەموو تەمەنی لە جەنگ و کوشــتاردا بەســەر برد. دوای ئەزمونێکی زۆر و بەدەستهێنانی زنجیرەیەك سەرکەوتن. ئاماژە بە گەورەترین سەرکەوتن دەکات، کە پێویســتە هەمووومان سوود لە وتەکەی وەربگرین. هەڵبەت دیاریکردنی گەورەترین سەرکەوتن لە لایەن کەسێکی وەکو ناپلیۆنەوە گرنگــی خــۆی هەیە.. ناپلیۆن دەڵێــت: گەورەترین جەنگ کە مرۆڤ دەتوانێت گەورەترین ســەرکەوتنی تێدا بەدەست بهێنێت، بێ ئەوەی کــەس زەرەرمەند بێت و دڵۆپە خوێنێکیــش بڕژێت، جەنگی مرۆڤ

لەگەڵ دەروونی خۆیدا و ســەرکەوتنی مرۆڤە بەسەر خودی خۆیدا!!، کەواتە: کاتێك مرۆڤ دەتوانێت جڵەوی نەفســی خۆی بکات و بیخاتە ژێر کۆنترۆڵی خۆیەوە، دەتوانێت بەســەر هەموو بەربەستەکاندا زاڵ بێت و ســەرکەوتن بەدەســت بهێنێت.. بەڵام کاتێك مرۆڤ کۆنترۆڵی خــودی خۆی پێ نەکرێــت و بە پێچەوانەوە ببێتە پاشــکۆی نەفس و ئارەزووەکانــی خــۆی و نەتوانێت ســەرپێچی بکات. ئــەوا بەوپەڕی لاوازی و بێتواناییــەوە ڕووبــەڕووی ژیــان و ڕووداوەکانی دەبێتەوە. بەڵێ، ئەم جیهادی نەفســە، گۆڕانکاری بەســەر کۆمەڵگــەدا هێنا. با تەماشــای مێژوو بکەین: پێش هاتنی نور و ڕوناکی ئەم ئیســلامە و ئــەو پێغەمبەرە ئازیزە (ﷺ) لەشــاری مەککەدا، ماڵی تایبەت هەبوو. کە ئاڵای ســوری لە ســەر بانەکەی هەڵکرابوو. وەکو ڕەمزێك کە ئەم ماڵە بە ئاشکرا کاری داوێنپیسی تێدا دەکرێ!! پەنا بە خوا خەڵکانێك هەبوون لەو جاهیلیەتەدا ژنەکانیان بۆ چەند شەوێك دەگۆڕیەوە!!، وە لە بواری دزیکردندا دزیەکی زۆر دەکرا، بەڵام کاتێ کە ئیســلام هات و بە پەروەردە ناوازەکەی خۆی موسڵمانانی شوێنکەوتەی ئەم ئاینەی پــەروەردە کرد، دەبینین هەر لەناو هەمان کۆمەڵگە و هەمان خەڵکی جاراندا. داوێنپیســی کۆتایی پێ هات، ئەوە بوو لە ماوەی (١٠٠) ســاڵی حوکمڕانی ئیسلامدا تەنها (٦) حەددی زینا جێبەجێ کراوە. وە تەنها (٤) کەس لەســەر دزی دەســتیان بڕدراوە!! دەبینین کاتێك هەمان ئەو مرۆڤانەی پێشوو. کاتێ نەفسیان پاك کردەوە لەو بۆگەنی و چەپەڵیە. بوون بە کەسێکی نوێ. (خَلْقاً آخَر، فَتَبارَكَ اللهُ أَحْسَنُ الخالِقينَ).

ئیمانــداران: بۆ ئه‌مــڕۆی ئێمه لــه‌م ســه‌رده‌مه‌دا، ده‌توانین به‌م ڕێگایانه جیهادی نه‌فسمان بکه‌ین:

١. هــه‌رکات نه‌فســت فه‌رمانی پێ کردی بۆ ئه‌وه‌ی بێشــه‌رعیه‌ك بکــه‌ی، به قســه‌ی نه‌که‌ی. خــۆت ڕاگره و ته‌ســلیمی مه‌به و به دڵ بیرمه‌که‌وه و به عه‌قڵ بیربکه‌وه و سه‌رمنجامه‌که‌ی ببینه.

٢. به‌ربه‌ره‌کانی له‌گه‌ڵ نه‌فســت بکه به وه‌ی که ڕای بێنه له ســه‌ر فێربوونی زانســتی شــه‌رعی. چونکه نه‌فسی پیس حه‌ز به فێربوون و گوێگرتن له زانستی شه‌رعی ناکات. ئه‌وه‌تا هه‌ندێ جار که ئه‌م نه‌فسه له ســه‌رخه‌ت بێ، (١٠) ده‌قیقه‌ی خوطبه‌ت لێ ده‌کات به یه‌ك سه‌عات.. شه‌وانی ڕه‌مه‌زان، یان دوای نوێژی عه‌سران، له زۆربه‌ی مزگه‌وته‌کاندا وتار ده‌خوێنرێته‌وه. ئه‌بینی نه‌فس هانت ده‌دات بۆ ئه‌وه‌ی له مزگه‌وت بڕۆیتــه ده‌ره‌وه و گــوێ لــه وتاره‌که نه‌گری و پێــت ده‌ڵێ: ماندووی. پێویســتت به پشــوه، له وانه‌یه ئــه‌و وتاره‌ت جارێکی تر بیســتبێ و بیزانی، به‌م شــێوه‌یه قه‌ناعه‌تت پێ ده‌کات که تۆ ئه‌و کۆڕه زانیارییه شــه‌رعییه به‌جێ بهێڵی و له‌و چه‌ند وشــه زێڕینــه بێبه‌ش ببی.. که به ڕاســتی پێشــینانی ئێمه، له‌م بواره‌دا زۆر سه‌رکه‌وتوو بوون به‌سه‌ر نه‌فسدا و له‌هه‌ر جێگایه‌ك وشه‌یه‌کی خێر بوترایه. ئه‌وان له‌وێ حازر ده‌بــوون و بــه دڵ و به‌گیــان گوێیان بۆ ده‌گــرت، چه‌ند مامه حاجی ئاخرخێری ڕیش سپیمان هه‌بوو. که ئه‌وه‌نده به وردی گوێی بۆ وتاری مامۆســتای مزگه‌وت گرتبوو. زۆرجار له مامۆستاکه جوانتر و به‌تام و چێژتر ده‌یگێڕایه‌وه. ئه‌مه هه‌موو به‌رهه‌می ده‌روون پاکیان بوو..

یەکێ لە زانا گەورەکانی ئەم کوردســتانەی ئێمە، کە وەفاتی کرد. خوای گەورە لێی خۆش بێت و پاداشــتی چاکەی بداتەوە، کە هەموو تەمەنی لە خزمەت زانســتە شــەرعیەکاندا بەســەر برد. ناوی (مەلا عبداللــە ی فەرهــادی) بــوو. کە خەڵکی شــاری هەولێــرە. لە یەکێ لــە چاوپێکەوتنەکانیــدا بیرەوەری کاتی فەقێیەتــی خۆی گێڕابۆوە فەرمووبــووی: لە شــاری (کەرکوك) فەقێ بووم. لــەوێ دەم خوێند. ماوەی (٦) مانگ زیاتر بوو سەردانی ماڵی باوکمم نەکردبوو. چاوم بە دایکم نەکەوتبوو. زۆر تامەزرۆی دیداریان بووم (٥٠) فلسم کۆکردبۆوە و بە تەمای ئەوە بووم کە بە (پاص) کە تازە داهاتبوو. لە کەرکوکەوە بڕۆمەوە بۆ هەولێر. بەڵام پێش ڕۆیشتنم بۆ شوێنی پاصەکە چوومە بــازاڕ و لەکتێبخانەیەکدا کتێبێکم بینی و تەماشــام کرد. ئەوەندەم بەدڵ بوو. نەمتوانی وازی لێ بێنم و نەیکڕم. لەبەرئەوە (٥٠) فلسەکەم دا بە کتێبەکە و لەبەر بێپارەیی نەمتوانی بە پاص بڕۆمەوە و ناچار لە کەرکوکەوە هەتا هەولێر بە پێ ڕۆیشتم!!..

٣. مُجاهَــدَةُ النَّفْــسِ فــي العَمَــلِ بِمــا تَعَلَّمَ: کە فێری زانســتە شەرعیەکە بووی ئەمجا نەفس حەز بە جێبەجێکردنی ناکات. دەبێ بەربەرەکانــی نەفس بکەی کاتێ حەزی لە جێبەجێکردنی نییە. لە مەیدانی کرداردا جێبەجێی بکەی، تا سەرەنجام مرۆڤ لە لای ئاسان دەبێ و ئەو قورسییەی لەسەر نەفس نامێنێ.

٤. مُجاهَدَة النَّفْس في دَعْوَة النّاس إلى العَمَل بِما تَعَلَّمْتَهُ أَنْتَ وَعَمِلْتَ بِهِ.. بەرەبەرەکانی لەگەڵ نەفســت بکەی لەوەدا کە حەز ناکات ئەوەی

کــە خۆت فێری بووی لە زانســتی شــەرعی و کاری پــێ دەکەی بە خەڵکیشــی بگەیەنی، نەفســت پێت دەڵێ: تۆ حەقــی خەڵکت چییە و خــۆ تــۆ زانای ئاینی نــی، خۆ تۆ مەلای مزگــەوت نی، تۆ حەقت چییە بە ســەر گەیاندنی ئەم ئاینەوە. بەڵام نابێ بە قســەی نەفست بکەی، چونکە پێغەمبەری پێشــەوامان (ﷺ) نەك هەر بێخەم نەبوە بەرامبــەر بە بێباوەڕان. بەڵکو بــەردەوام لە خەم و پەژارەی ئەوەدا بوو. کە ئەو خەڵکە چۆن ئیمان بهێنن. بەڵکو ئەوەندەی خەم خوارد کــە خەریك بوو لــە خەم و مەراقدا لە ناو بچێت، ســەیری قورئان بکەن کە ئەو مەشــهەدەمان بۆ تۆمار دەکات و دەفەرموێ: ﴿ فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا ﴾ الکهف: ٦.

واتە: جا تۆ لەوانەیە لە خەم و پەژارەدا لە ســەرەنجامی ڕەشــی ئەوانــەی کە باوەڕ بــەم قورئان و فەرمودەیــە ناهێنن، خۆت لەناو بەریت و لە داخ و خەفەتدا بمریت.

ئایا تۆی موســڵمان چەند جار غەمبار بووی و خەفەتت خواردوە بۆ ئەو هەموو گومڕا و سەرلێشێواوەی کە ڕوو لە دین نییە، کە پشتی هەڵکردوە لەم دینە. ئایا بە پێی زانین و توانینی خۆت کارت کردوە بۆ بانگکردنیان بۆ لای کانیاوی ســازگاری ڕەحمەتی ئەم ئیســلامە؟! کــە بێگومــان بانگەواز بۆ دینــی خوا نەفس پێی ناخۆشــە و دەبێ بەربەرەکانی لەگەڵ بکەی تاڕادێت و ملکەچ دەبێت.

٥. الصَّبْرُ عَلى مَشــاق الدَّعْوَة: ئارامگرتن لەسەر ئازار و کۆسپەکان کە لە کاتی بانگەوازدا دێنە بەردەمت. کە ڕێگای بانگکردنی خەڵك بۆ

لای خوا، ڕێگای پێغەمبەرانە، ڕێگای پێغەمبەرانیش بە گوڵ و گوڵزار نەڕازاوەتەوە. بەڵکو زۆر کۆسپ و تەنگەژە و دەربەدەربوونی لە ڕێگادا بووە. ئایا چەند جار دونیا هاتۆتە بەردەمت، بەڵام لەسەر حیسابی قیامەتت، کەچی تۆ هەر دڵت لای قیامەتە؟! هەروەکو صەحابەی پایەبەرزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) (ڕەبیعەی کوڕی کەعبی ئەسلەمی) دەفەرموێ: شەوێکیان نەچوومە ماڵەوە و لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (ﷺ) مامەوە. (أَعَدُّ لَهُ وُضُوءَهُ) ئاوی دەستنوێژم بۆ ئامادە دەکرد و لە خزمەتیا بووم. بۆ بەیانی پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمووی: (ياربيعَةَ سَلْني) ئەی ڕەبیعە، ئەی گەنجی دڵسۆز. بڵێ بزانم داواکاریت چییە تا بۆت بکەم. (فَقُلْتُ: يارَسُولَ الله دَعْني أَفْكُرُ). ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وازم لێ بێنە با بیری لێ بکەمەوە. ئەمجا لە خزمەتتا داواکاریەکەم پێشکەش دەکەم، تکایە ماوەیەك مۆڵەتم بدە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: زۆرباشە بە جوانی بیری لێ بکەوە، ڕەبیعە دەفەرموێ: (فَجَلَسْتُ أَتذكر الدُّنيا وَزَوالها، فَقُلْتُ: لاأَطْلُبُ إلاّ الآخِرَة). دانیشتم بیرم لەم دونیایە کردەوە کە چۆن ڕۆژێ هەر بە جێی دێڵین. هەر دەبێ بمرین و کۆتایی پێ بێ، خۆم بە خۆمم گوت: بە خوا قیامەت نەبێ هەڵی نابژێرم. حەیف نییە ئەو لوتفەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ داواکاریەکی دونیایی بەکار بهێنم. (فَعُدْتُ إِلَيْهِ وَقُلْتُ: أَسْأَلُكَ مُرافَقَتَكَ فِي الجَنَّة). چوومەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرزم کرد: تەنها دەمەوێ و داواکاریم هەر ئەوەیە کە هاوڕێی تۆ بم لە بەهەشتدا. چۆن لە دنیادا لە خزمەتتام ئاواش لە بەهەشتا لە خزمەتتدا بم.. ئەوەیە

نەفسی پاکوخاوێن و دڵنیا، لە ناو هەموو پارە و پول و زەوی و پۆست و پلــە و پایــەدا، هەمووی بە لاوە ناو ڕەفاقەت و هاوڕێیەتی (رَسُــولُ اللّه)ی هەڵبژارد لە بەهەشتدا.. ئایا چەند خوشکمان واز لە جلوبەرگی ناشــەرعی و تەوقەی حەرام و ڕەشــبەڵەك و تێکەڵی ناشەرعی دێنێ، تاوەکو ڕەفاقەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەهەشتدا بە دەست بێنێ؟!

چەند کوڕی گەنجمان واز لە پەیوەندی ناشــەرعی و عەرەق و شوێنە خراپەکان دێنێ و هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵدەبژێرێ؟! چەند کاسبکار و بازرگانمان، خاوەن پیشە و بەڵێندەرمان، واز لە غەش و ناپاکی دێنێ و دڵسۆزانە کار دەکات و بەرهەمی جوان و پوخت پێشکەش دەکات و هاوڕێیەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە دەست دێنێ لە قیامەتدا؟! بێگومان زۆری حەز دەکات ئەوە بکات و ئەو شەرەفە گەورە کە لەگەڵ هیچ شتێکی ماددی و دونیاییدا بەراورد ناکرێ، هەڵ دەبژێرێ. بەڵام جیهادی نەفســی دەوێ، دەبێ تەواوی بەربەرەکانی لەگەڵ نەفســت بکەی. بۆ ئەوەی ڕازی بێت بەوەی کە واز لەو خراپە و بێشەرعی و حەرامە هەڵگرێ.

بەڵێ، ڕەبیعە دەفەرموێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەنها هاوڕێیەتی تۆم دەوێ لە بەهەشتدا. پێغەمبەری خواش (ﷺ) دەفەرموێ: (يارَبِيعَةَ أَوَ غَيْرَ ذالِكَ)؟! ئەی ڕەبیعە، ئایا هیچی ترت ناوێ جگە لەم داوایەت؟! (قُلْــتُ: هُــوَ ذاكَ)، ڕەبیعــە دەفەرموێ وتم: تەنها ئــەوەم دەوێ ئەی پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) کــە هاوڕێی تــۆ بم لە بەهەشــتا و هیچی تــرم ناوێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (فَأَعِنِّي عَلى نَفْسِــكَ بِكَثْرَةِ السُّجُودِ). رَواهُ مُسْلِمْ (٤٨٩)

واتە: مادام وایە تۆش ئەی ڕەبیعەی دڵسۆز و چالاك. یارمەتی من بدە بەسەر نەفسی خۆتدا، بە وەی کە زۆر سوژدە بۆ خوا ببە. نوێژی فەرز بکە و ســوننەتی زۆر ئەنجام بدە و با شــوێن سوجدەی زۆر لە قیامەتا شاهیدیت بۆ بدات و بە هەموو سوژدەیەك کە سەر دەخەیتە ســەرزەوی بۆ خوا، پلەیەك لە بەهەشــتا بەرز دەبیتەوە، تا دەگەیتە پلە هەرە بەرزەکانی بەهەشت.

بەڕێزان: هەرکەســێ بتوانێ بەم (پێنج) شــێوەیە جیهادی نەفسی بکات، ئەوە إنْشـاءَ اللّٰه دەبێت بە دۆستی خوا، دەبێت بە وەلی خوا، ئەو کاتەش (لَوْ أَقْسَـمَ عَلـى اللّٰهِ لأَبَرَّهُ) خوای گەورە ڕێزی تایبەتی لێ دەگرێ و وەڵامی داواکانی دەداتەوە و ئاواتەکانی دێنێتە دی.

ئیماندارانــی بەڕێــز: بــا بە یەکەوە ســەرنجی ئەم بەســەرهاتە بدەیــن، بە ناونیشــانی (وام دانا خواردم) مزگەوتی ســوڵتانەکان لە ئەســتەنبوڵ بەناوبانگــن، ئەمانــە ئــەو مزگەوتانەن کــە لە لایەن ســوڵتانەکانی عوسمانیەوە دروســتکراون.. مزگەوتی (فاتح) لە ڕووی مێژووییەوە کۆنترینیانە و مزگەوتەکانی (ســولەیمانیە) و (بایەزید) و ....هتد، بە دوایدا دێن.. ئاســاییە ســوڵتانێك کە فەرمانی بە ســەر نیــوەی جیهاندا شــکاوە، بتوانێ مزگەوتێك درووســت بــکات. بەڵام ســەیر لە وەدایە. (حەماڵێك) بتوانێ بەم کارە هەڵسێت. سەیرتریش ئەوەیــە، مزگەوتەکە ناوبنێــت: (Sanki yedim) - وام دانا خواردم!!

بــا بزانین چیرۆکی ئەم مزگەوتە چییە؟! ئــەم مزگەوتە دەکەوێتە کۆڵانی (کرباجی) لە گەڕەکی (سینان ئاغا)ی شارۆچکەی (فاتح)ی سەر

بە شـــاری ئەستەمبوڵ. مێژووی دروســـتبوونی بۆ سەدەی هەژدەیەم دەگەڕێتەوە. لەو دەورووبەرە حەماڵێکی بۆ خواسوڵحاو هەبوو. ناوی (کەچەجـــی خەیرەدین) بووە. ئاواتی ئەوە بووە ڕۆژێك دابێت بتوانێ ماڵێك بۆ پەرستشـــی خوای تاك و تەنهـــا بنیات بنێت، ئەمە بۆ ئەو کارێکی گەلێك زەحمەت بووە. بەڵام ئەو پێی وا بوە کە ئەگەر مرۆڤ نیـــازی پاك بێت و چۆك دانەدات هیچ شـــتێك لە بەردەمیدا مەحاڵ نییە. بڕیاری داوە بکەوێتە (حەرەکەت) و چاوەڕێی (بەرەکەت)ی خودا بکات. کاکەی حەماڵـــی ورەبەرز بڕیاری داوە بە قەناعەتەوە بژیێت. هـــەر جارەی کە بە بەردەم خواردنگەیەکدا گوزەری کردوە و دڵی بۆ شتێك چووە، چۆتە خواردنگەکەوە بەڵام دانەنیشتوە و لەبەرخۆیەوە وتویەتـــی: (Sanki yedim) بـــە واتای: وام دانا، یان وا بزانە خواردم) و هاتۆتـــە دەرەوە!! — ئەمەیە زاڵبوون بەســـەر نەفســـدا، حەماڵ بە ماندوویی و هەژاری و هەموو تامەزرۆییەکەوە بۆ خواردنێکی خۆش، ئـــاوا بتوانـــێ وازی لێ بێنێ و نەیخوات - ئەمجـــا ئەو برە پارەیەی پێویســـت بووە بەو ژەمە خواردنەی بدات، خستویەتیە سندوقێکەوە. هەرچەندە ئاتاجیش بووبێت ئەو ســـندوقەی نەکردۆتەوە. تا ئەوەی چەند ســـاڵێك تێپەڕی کردوە، ئەمجا کردوویەتیەوە. بینیویەتی بایی ئەوەندەی تێدایە ئاواتەکەی پێ بێنێتەدی. ئینجا دەستی بە دروستی مزگەوتەکەی نێو ئاوات و ئومێد و خەونەکانی کردوە و بەناوی ئەو شێوازەوە ناوی ناوە کە پێی دروست کردوە. (وام دانا خواردم)!.. دوای ســـاڵانێکی زۆر ئەو مزگەوتە داڕوخاوە و پەنجا ســـاڵ بەو حاڵەیەوە

ماوەتەوە. تا ئەوەی خێرخوازان دەست و بردیان لێ کردوە و دووبارە بنیاتیـــان ناوەتـــەوە. تا ئەو وانەیە بۆ نەوە یـــەك لەدوای یەکەکانی موســـڵمانان بـــە زیندویەتی بمێنێتـــەوە.. دەی بزانیـــن ئێمەش بەم (وام دانـــا خواردم)ەکانمـــان، چ خزمەتێك بـــە مرۆڤایەتی دەکەین و چ تویێشـــوویەك بـــۆ دوارۆژمان هەڵدەگرین؟ من ناڵێـــم با وەکو ئەو حەماڵە بە هیمەتە زۆرشـــت لە خۆمان بگرینـــەوە. بەڵکو دەڵێم: با هەندێ لەوەی کە خۆمان لەســـەر ســـفرە و لە کانتـــۆری جلوبەرگدا دڵمان بۆی ناچێ و کڕیومانە و ئامادەمان کردوە، کەمی بکەینەوە و ئـــەو پارەیەی کە ئاوا بە بێســـود خەرجی دەکەین، کۆی بکەینەوە و بیخەینە پڕۆژەیەکی خەیرییەوە. بە دڵنیاییەوە دەتوانین زۆر شـــتی باش و جوانی پێ بنیات بنێین.

خوای گەورە پشت و پەنای هەموو لایەکمان بێت.

(أللهم آتِ نُفُوسنا تَقواها وَزَكِّها أَنْتَ خَيْرُ مَنْ زَكَّاها، أَنْتَ وليُّها وَمْولاها)

أللّهُمَ آمين..

**سەرچاوەکان:**


١. قورئانی پیرۆز.

٢. إصلاح القلوب. عمروخالد، ج٢ ص٢٢٣، ص٢٤١، ص٢٣٣.

٣. گۆڤاری بڕیار: ژ: ٢٦، ل٤٨.

٤. گۆڤاری (ئاونگ) ژمارە: صفر، ئەیلولی ٢٠٠٩ ل١٥.

٥. خطب الجمعة والعيدين، عبدالقادر أحمد عطا. ص٢٩٨.

وتاری چوارەم بۆمانگی شەعبان

# پاراستنی زمان

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدنا محمد وَعلى آلهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: قسـەکردن ئەو موعجیزە سەرسـوڕهێنەرەیە کە تا ئێستا زاناکان لە ئاستیدا سەرسامن و لێکدانەوەیەکی زانستییانەیان بۆ ئەو دیاردە سەرسوڕهێنەرە نەدۆزیوەتەوە. بەڵام قورئانی پیرۆز ئاماژەی بۆ ئەو موعجیزە سەرسـوڕهێنەرە کردووە، دەی با لەم وتارەدا بە پشتیوانی خوای تاك و تەنها و بێشـەریك لەم موعجیزە و لەم بەڵگە و نیشـانە گەورەیەی کە خوای پەروەردگار بە مرۆڤی بەخشیوە ڕابمێنن.. إن شاء الله.**

**زانـاکان دەڵێن: مـرۆڤ تەنها بوونەوەرە پێکهاتە و دارشـتەی بە جۆرێك دارێژراوە بتوانێت قسە بکات. مرۆڤ بە پرۆگرام و هۆکار و ئامێری زیندوو ساز کراوە. بە هۆیەوە دەتوانێت زۆر بە ئاسانی قسە بکات. لەبەر ئەوە ئەم کردەیە بە تیۆری پەرەسەندنی گوماناوی ملکەچ ناکات. ئەگەر قسـەکردن و فێربوونی زمان لە ڕێگەی پەرەسەندنەوە بێت، هەندێك لە گیانداران توانای قسەکردنیان دەبوو، وەکو مەیمون..**

**زانایان پرسیارگەلێکی زۆر ئاڕاستە دەکەن، بۆ نموونە: بۆچی تەنها مرۆڤ دەتوانێت قسـە بکات؟ (کە مەبەسـت لە قسەکردن دەربڕینی وشە و ڕستەکانە، واتە توانای دارشتن، چونکە وەك دەزانین، هەندێك**

گیانلەبەر، وەك توتی و دۆلفین دەتوانن وشــە و ڕســتە لەبەر بکەن و بیلێنەوە، واتە تەنیا ئەو وشــە و ڕستانە دەڵێنەوە کە فێری بوون، بەڵام ناتوانن داڕشتن بکەن و ئەوەی لە ناخیاندایە دەری ببڕن، هەر بۆیــە ئەمە بە قســەکردن دانانرێ). جا بۆ وەڵامی ئەو پرســیارە کە ئایا بۆچی تەنها مرۆڤ دەتوانێ قســە بکات؟! وەڵامی ئەو پرســیارە لە قورئانی پیرۆزدا دەبینین، کاتێك باســی ئەو ڕێزە دەکات کە خوا لە مرۆڤــی ناوە، ﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴾ الإسراء: ٧٠

زاناکان بە درێژایی ســەد ســاڵ هەوڵیان دا مەیمونی (شەمبانزی) فێــری هەندێك لە پیتەکان بکــەن. بەڵام هەوڵەکانیــان بە تەواوی شکستی هێنا، هەرچەندە مۆخی ئەم گیاندارە گەورەیە. قەبارەکەشی گونجــاوە و زۆرباشــە بۆ فێربوون، لەگەڵ ئەوەشــدا مەیمون توانای قســەکردنی نییە، تەنانەت ناتوانێت لاسایی قســەکردنیش بکاتەوە. لــە ئاژەڵەکانــدا ئامێــری دەنگ هەیــە. مرۆڤ قوڕقوڕاگــەی هەیە، ئاژەڵەکانیش قوڕقوڕاگەیان هەیە، بۆ وێنە: سەگ، قوڕقوڕاگەی سەگ بە هەمان شێواز و ئالەتی قوڕقوڕاگەی مرۆڤ کاردەکات. بەڵام مرۆڤ دەتوانێت بە کردارێکی خۆنەویســتانە بە ئاســانی قســە بکات. لەو نێوەندەدا گیانداران دەستەوەســانن و ناتوانن ئەو کارە ئەنجام بدەن. واتە: ناتوانن قسە بکەن.

ئیمانداران: خوای گەورە ســوڕەتێکی گەورەی لە قورئاندا ناردۆتە خوارەوە، کە تاکە سوڕەتە بە ناوی یەکێك لە ناوە جوانەکانی خوای

گەورەوەیە. ئەویش سورەتی -الرحمن-ە. خوای گەورە لەو سورەتەدا دەفەرمویێت: ﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۝١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ۝٢ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ﴾ الرحمن: ١-٤

واتە: خوای میهرەبان کانگای سۆز و ڕەحمەت و بەزەییە، قورئانی فێری ئادەمیزاد کردووە، (فێربوون و زانینی قورئان و تێگەیشتن لە فەرمودەی خوای میهرەبان پیرۆزترین خەڵاتی خوایە کە ئیماندار لێی بەهرەوەر ببێت، لەم تەمەنە کورتەی ژیانی دونیادا، هەر خودا ئادەمیزادی درووست کردوە. بە جوانترین شێوە و شێواز، هەر ئەویش فێری دەربڕین و گوفتار و ئاخاوتنی کردووە - خوای گەورە زمانی پێ بەخشی بۆ ئەوەی مەبەستەکانی خۆی بە جوانی و بە فەرهەنگ و کەلتورێك کە خوا پێی بەخشیوە ڕابگەیەنێت... ئەم ئایەتە فێرمان دەکات چۆن خوای گەورە منەت دەکات بە سەر مرۆڤدا بە بەهرەی (البیان). خوای گەورە نەیفەرموە. (عَلَّمَهُ الكَلام). لەبەر ئەوەی فێرکردنی مرۆڤ بە زمان، یان بە قسەکردن بەس نییە، بەڵکو پێویستە وشەکان پێکەوە ببەستێتەوە و لە کاتی پێویستدا بیان گێڕێتەوە. واتە: بە شێوەیەکی ڕێك و پێك لە شوێنی خۆیدا بەکاریان بهێنێت.. مرۆڤ مەڵبەندێکی زۆر گرنگی هەیە، بە بێ ئەو مەڵبەندە ناتوانێت خواستەکانی دەرببڕێت، ئەویش مەڵبەندی گەڕانەوەی وشەکانە و دانانیانە لە ناوچەی نێوچەواندا لە پێشە سەردا، لەبەر ئەوەیە دەبینین پێغەمبەر (ﷺ) جەخت دەکاتەوە لە سەر گرنگی ئەو مەڵبەندە، لە نزاکانیدا ڕادەستی خوای گەورەی

دەكات و دەفەرموێت: (ناصِيَتي بِيَدِكَ). نێوچەوانم بە دەســـتی تۆیە. هەر كات ئەو مەڵبەندە لە كار كەوت، مرۆڤ توانای قســـەكردنی ون ناكات، بەڵكو هەر دەتوانێ قسە بكات، بەڵام ناتوانێت وشەكان پێكەوە گـــرێ بدات،!! كەواتـــە: توانای دەربڕین و ڕوونكردنـــەوە ون دەكات. لەبەر ئەوەیە خوای گەورە دەفەرموێ: (عَلَّمَهُ البَيان). پاكو بێگەردی بـــۆ خوای گەورە.. پاكو بێگەردی بۆ ئەو دروســـتكارە گەورەیەی بەم شـــێوەیە ڕێزی لە مرۆڤ گرتوە و ئەو توانایەی پێ بەخشیوە، بەڵام زۆر بـــە داخـــەوە مرۆڤ وشـــەكان دەخاتـــە پاڵ یەك و ئەو وشـــانە بەكار دەهێنێت بۆ دژایەتیكردنی دروســـتكارەكەی و تێكدانی ئارامی سەرزەوی و فیتنە و ئاژاوەنانەوە و درۆ و بوختان پێكردن!!.

بەڵێ بەڕێزان: لە كاتێكدا زمان و قسەكردن ئاوا خەڵاتێكی گەورەی تایبەتـــی بن لە لایەن خـــوای پەروەردگارمانەوە، ئایا حەیف نییە ئەو زمانە لە چاكەدا نەبێ بەكار بهێنین؟! ئایا حەیف نییە قســـەی جوان و شـــیرین نەكەین؟! لە كاتێكدا خوای گەورە فەرمانمان پێ دەكات بە وتە و قسەی چاك: (وَقُلْ لِعِبادي يَقُولوا الَّتِي هِيَ أَحْسَنُ). وشە وەك بارانە. لە هەر جێگایەك ڕووەك و گوڵ و ســـەوزاییت بینی دڵنیای لە بوونی ئاو لەو شـــوێنەدا. هەر كاتێكیش ڕەوشـــتێكی مرۆڤانـــە و چاكەیەكت بەدی كرد، دڵنیای وشـــەیەكی پاك و كاریگەر بەســـەر ئەو دەروونەدا باریـــوە و پێـــی كاریگەر بووە و هانی داوە بۆ ئـــەو چاكەیە. جا هەتا وشـــە كاریگـــەرەكان لە دەروونـــدا زۆر بـــن، بەرهەمەكانیش لە ژیانی ئەو كەســـەدا زیاتر دەبن.. وشە زۆر گرنگە بۆ دونیا و قیامەت. خوای

گەورە بە (عیســی) پێغەمبەر دەفەرموێت: (إنَّما المَســيحُ ابنُ مريم رَسُولُ اللهِ وكَلِمَتُــهُ) بە -کەلیمە- ناوی بردوە. واتە: بە وشــە و فەرمانی خوا -ببە- هاتە بوون. ئیسلامیش هەمووی وشەی خوایە. (وَتَمَّتْ كَلِمَةُ رَبِّكَ صِدْقاً وَعَدْلاً).. مرۆڤیش تا بە وشــەکانی باوەڕی ڕانەگەیەنێت ناچێتە بازنەی ئیمانداران. کەواتە شــایەتی یەکتاپەرستی وشەیە.. پاڕانەوەش کە گەورەترین پەرستش و خواپەرستییە، هەر وشەیە. چەندیش باوەڕ و متمانەمان لەگەڵدا بێت لای خوا زووتر قبوڵ دەکرێ. هەروەك دوعای پێغەمبەران -ســەلامی خوایان لێ بێت- تادەگاتە ئەوەی خوایەك کە (فَعّــالٌ لِمــا يُريد) لە ئیرادەی خۆی بۆ لای ئیرادەی تۆ دێت و داواکانت بۆ جێبەجێ دەکات بە ویستی خۆی، وە ڕەحمەتی فراوانی..

پاشان پەیمانی هاوســەرگیری، هەر بە وشە ئەنجام دەدرێ، پێش ئەو وشــەیە ســەیرکردنی ئــەو کوڕ و کچە بۆ یەکتــر قەدەغە بوو. بەڵام بەو چەند وشــەیە بوونە حەڵاڵی یەکتر، ئەو وشــە و پەیمانی هاوسەرگیریەش هەر بە وشە هەڵ دەوەشێتەوە. کە وشەی (تەڵاق) و هاوشــێوەکانیەتی. هەروەها سەرنج بدەن. تەسبیحات و ستایشی خوا هەر وشەیەکە، کە بە هەر وشەیەکی تەسبیحات و ئەوراد چاکەیەکت بۆ نوســراوە. (وَلَكَ بِكُلِّ تَسْــبِحَةٍ صَدَقَة) رَوَاهُ أَبُو داود. لە بەرامبەریشدا درۆ و بوختان و شــایەتی درۆ هەر وشــەیە!! لە قیامەتیشدا وشەکان شانبەشــانی کردارەکان لە تەرازووی خواییدا دەکێشرێن و پاداشت و سزایان بۆ دیاری دەکرێت (مايَلْفِظُ مِنْ قَوْلٍ إلاّ لَدَيْهِ رَقيبٌ عَتيد).

بەڵام زۆرجار ئێمەی مرۆڤی موسڵمان، وشە بە کەم دەزانین و زۆر

ســانایە لە لامان دەربڕین و وتنی، یەکســەر دەیوێژین، بەبێ ئەوەی، بیبێژین. (وَتَحْسَــبُونَهُ هَيِّناً وَهُوَ عِنْــدَ اللهِ عَظِيم). کەواتە: بە دڵنیاییەوە، وشــە یان ژەهــرە و خەڵك لەنــاو دەبات، یان هەنگوینە و شــیفا و چارەسەر دەکات و برین سارێژ دەکات..

بەڵــێ ئیمانداران: ناکۆکــی و دووبەرەکی نێــوان خەڵکی، بەهۆی زمانەوەیــە. هــەر زمانــە دەبێتە هــۆی ئەوەی کەســانێك ڕقیان لە کەسانێکی تر بێت و حەز بە بینینیان نەکەن. چەندین ئاژاوە لە ناو خێزانەکاندا، لە نێوان براکاندا، لە نێوان هاوڕێکاندا، کە ڕوویان داوە، بە هــۆی زمانەوە بووە. هەموو ئەمانە بە هۆی جنێوێکی زمان، یان بە هۆی غەیبەتێك، یان بە هۆی قسەگێڕانەوەیەکی زمانەوە، ڕوویان داوە... بە دڵنیاییەوە ئێمە دەتوانین بە هۆی زمانەوە، بە شــێوازێکی جوان بۆچوونەکانمان بە کەســانی تر بگەیەنیــن. ئیتر بۆچی پەنا بۆ هەڵســوکەوت و کردار و گوفتاری ناشــرین بەریــن؟! بەڵێ زمان گــەورەی گەورەکانە، لە واتای فەرمودەیەکی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە کە فەرموویەتی: کاتێك مرۆڤ بەیانی دەکاتەوە، هەموو ئەندامەکانی لاشەی قسە بە زمان دەڵێن و هاوار هاواریانە لە دەستی و پێی دەڵێن: ئەی زمان لە خوا بترســە، ئەگەر تۆ ڕێك و باش بیت، ئەوا ئێمەش بــاش دەبین. خۆ ئەگەر تۆ لار و لەوێر بیت، ئەوا ئێمەش وادەبین.. رَوَاهُ أَحمد وَالترمذي

بەڵێ بە ڕاســتی زمان وەك برا گەورە وایە و گەورەی مرۆڤە، لە وتــاری هەینیدا گەورە و بەڕێزە و ئامــۆژگاری خەڵکی پێ دەکرێت.

لە یەکخســتن و ڕێکخســتنی نێوان خەڵکیدا هەر گەورەیە، لە کڕین و فرۆشــتندا هەر گەورەیە، هەر بۆیە جاری وا هەیە مرۆڤ بە هۆی تەنها قســەیەکەوە، پــەروەردگار هەتا ڕۆژی دوایی خەشــم و قینی لــێ دەگرێت. هەر بۆیــە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئــاگاداری کردووین. کە بە شــێوەیەکی ڕەها قســە نەکەین و بیر لە ئەنجامی قسەکانمان بکەینەوە. کۆنترۆڵنەکردنی زمانیش، خاوەنەکەی بەرەو لە ناوچوون دەبات. شاعیر جوانی فەرموە کە دەڵێ:

(إحْفَظْ لِسانَكَ أَيُّها الإنْسان .... لايلد غنَّكَ إنَّهُ ثُعْبان.

كَمْ في المَقابرِ مِنْ قَتِلِ لِسانِهِ .... كانَتْ تهاب لِقاءَهُ الشُّجْعان)..

بەڵێ پێویســتە ئاگاداری زمانت بیت، نەوەکو پێتەوە بدات و بت گەزێــت. چونکە زمان وەکو ماری ژەهراوی وایە و زۆر کەســیش بە هۆی زمانیەوە کوژراوە و ئێستا لە گۆڕدایە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەندە ئازا نەبوون، کەسانی ئازا و بەجەرگ لە ڕووبەڕووبونەوەیان ترساون و خۆیان لێیان لاداوە...

چەندین ئافرەت بە هۆی زمانیەوە، خۆیان بە تەلاقدان داوە، کاتێك ئافرەتێك لەگەڵ هاوســەرەکەیدا دەبێتە دەنگەدەنگیان و خێراخێرا دووبــارەی دەکاتــەوە و دەڵێــت: تەلاقم بدە، دەی ئەگــەر دەتوانیت تەلاقــم بدە، دەی ئەگــەر پیاوی تەلاقم بدە، هاوسەرەکەشــی داوای لــێ دەکات و پێی دەڵێــت: بێدەنگ بە.. ئافرەتەکەش بێدەنگ نابێت و کێشــەکەیان گەورەتــر دەبێت و ئەو پەیوەندیەی چەندین ســاڵە خەریکی درووست کردنین، لە ماوەی چەند چرکەیەکدا دەیڕووخێنن

و ئافرەتەکــە خۆی بە تەلاقدان دەدات. هەر بە هۆی زمانیەوە. بۆیە پێغەمبەری خــوا (ﷺ) داوامان لێ دەکات لە کاتی توڕەییدا بێدەنگ بیــن و قســە نەکەین.. بەڵــێ، بێدەنگ بین. لەبەر ئــەوەی لە کاتی توڕەییدا، ناتوانین کۆنتڕۆڵی زمانمان بکەین و لەوانەیە قسەی هەڵە بکەین!.

بەڵێ گەنجی زۆر بەهێز و بەتوانا هەیە، کاتێك قاچی دەخزێت و دەکەوێت، هیچی لێ نایەت، بەلام هەڵەیەکی بچوکی زمانی لە وانەیە ببێتە هۆی کوژران و لەناوچونی!

بانگخوازی بەناوبانگ و نوســەری بەتوانــا، (د.محمد عبدالرحمن العریفی) دەفەرموێ: جارێکیان بەشــداری ڕێککەوتنی کێشەی نێوان دوو بنەماڵەم کرد، کێشــەکەش بەم شــێوەیە بوو: پیاوێکی ژیری بە تەمەنی گەورە. گومان دەبەم تەمەنی لە ســەروو شەســت ساڵییەوە بووبێت. لەگەڵ چەند هاوڕێیەکی هاوتەمەنیدا دەچن بۆ ڕاو.. لە ڕێگە قسە و باسی ڕابردوو بۆ یەك دەگێڕنەوە و یادگاری سەردەمی لاوی بە بیری یەکتری دێننەوە. پاشان لە بارەی زەویوزاری باپیرەیانەوە قسە دەکــەن و ناکۆکی دەکەوێتە نێوان ئــەم پیاوە و یەکێکی تریانەوە و هەریەکەیان دەڵێن: ئەو زەوییە زەویوزاری باپیرەی منە. ناکۆکیەکەیان زیــاد دەکات و یەکێکیان بەوی تریان دەڵێت: ســوێند بە خوا ئەگەر ببینم لەو زەویانە نزیك دەبیتەوە، چی فیشــەك لەم تفەنگەدا هەیە لە مێشــکتدا خاڵی دەکەمەوە. پاشان بە چەکەکەی دەستی فیشەکێك بەســەر هاوڕێیەکەیدا دەتەقێنێت و دواتریش بەیەکدا هەڵدەپژێن و

خەریك دەبێت یەکتری بکوژن، بەڵام برادەرەکانیان لێکیان دەکەنەوە و هەریەکەیان بۆ ماڵی خۆیان دەگەڕێنەوە... ئەوەی کە فیشەکەکەی بەسەردا تەقێنرا بوو، لە ڕق و کینەدا خەو نەدەچووە چاوی. هەر کە خۆر هەڵهات خۆی کۆکردەوە و چەکەکەی هەڵگرت و کەوتە چاودێری هاوڕێکەی، هاوڕێکەی پیاوێکی خانەنشین بوو، کاری شۆفێری دەکرد و ڕۆژانە چەند مامۆستایەکی ئافرەتی دەگەیاندە قوتابخانەکەیان. هەندێك ئۆتۆمبێلی هاوشێوەی ئەم پیاوەش هەمان کاریان دەکرد و مامۆستایان و قوتابیان دەگەیاند، پیاوە چەك بەدەستەکەش لە دوای درەختێکەوە و لە دوورەوە خۆی شاردبۆوە، بۆ ئەوەی پێی نەزانن و ئاشکرا نەبێت. لە دوورەوە شوفێری یەکێك لە ئوتومبێلەکان دەبینێت. لەبەر ئەوەی چاوی کز دەبێت، وا دەزانێت ئەو کەسەیە کە فیشەکەکەی بەسەردا تەقاندوە. هەر بۆیە سێ فیشەك دەنێت بە سەریەوە!!... خەڵکەکە دەشڵەژێن و قوتابیەکان هەموو دەترسن و هاوار بەرز دەبێتەوە و پۆلیس دەگاتە شوێنی ڕووداوەکە. لەبەر ئەوەی فیشەکەکان چووبوونە سەری شوفێرەکەوە، یەکسەر دەمرێت. پیاوکوژەکەش زۆر بە هێمنی و لە سەرخۆییەوە، دەچێت بۆ بنکەی پۆلیس و ڕووداوەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە و پاشان دەڵێت: من فلانە کەسم کوشت. ئێستا دڵم ئاوی خواردەوە. ئیتر دەمکوژنەوە، دەمسوتێنن، دەمخەنە بەندیخانە.. چی دەکەن بیکەن!.

بە شێوەیەکی کاتی بەندی دەکەن. ئەفسەری لێکۆڵینەوەش کاتێك سەیری ناسنامەی کوژراوەکە دەکات، دەبینێت ئەمە ئەو کەسە نییە، کە

بکوژەکە مەبەستی کوشتنی بووە، بەڵکو کەسێکە کە هیچ پەیوەندی و ناسیاوییەکی بە بکوژەکەوە نییە!!! ئەفسەری لێکۆڵینەوەکە، ئەو پیاوە لەگــەڵ خۆی دەبات. کە بکوژەکە وا دەزانێت کوشــتوویەتی و تۆڵەی خۆی لــێ کردۆتەوە. کاتێك دەگەنە لای بکوژەکە، ئەفســەرەکە پێی دەڵێت: ئەی تۆ نەتوت فلان کەسم کوشتوە؟! بەڵام خۆ فیشەکەکانت کەســێکی تری پێکاوە و کوشتویەتی!! بکوژەکە هاوار دەکات و چەند رۆژێك بێهۆش دەکەوێت. پاشــان دێتەوە هۆشــی خۆی، دواتر دادوەر بڕیاری کوشــتنەوەی بــۆ دەردەکات!! ئەمە هەمــووی تەنها بە هۆی چەند قسەیەکی بێسودەوە ڕووی دا. لە ئەنجامی بەڕەڵاکردنی زماندا. بە ڕاستی ئیمامی ئەبوبەکر ڕاستی فەرموە. کاتێك دەفەرموێت: هیچ شتێك ئەوەندەی زمان پێویستی بە بەندکردن نیە!!

زانای گەورە (إبن الجوزي) دەفەرموێ: سەرسامم لە هەندێك کەس، کاتێــك دەتوانن خۆیان لــە خواردنی حەرام بە دوور بگرن. هەروەها دەتوانن خۆیان لە دزی و داوێنپیســی بپارێزن. بەڵام ناتوانن دەســت بەســەر جوڵەی زمانیاندا بگرن و باســی ئەم و ئەو نەکەن و زمانی خۆیان بــۆ ناگیرێت... زانایەکیش دەفەرموێ: ســەیرە، ئاژەڵ زمانی درێژە و قســە ناکات. بەڵام مرۆڤ زمانیشــی کورتە. کەچی بێدەنگ نابێت..

بەڕێــزان: بێگومان مرۆڤەکان لە پێناو دەرکەوتنیان بە جوانترین شێوە، هەردەم لە خەمی هەڵبژاردنی پۆشتەترین جلوبەرگ و پۆشاك و پێــڵاودان. بــە جۆرێك هەوڵ دەدەن هەماهەنگــی ڕەچاو بکەن لە

نێــوان ئەو جلانەی کە دەیپۆشــن. تەنانەت ڕەنگی بۆینباخ، لە کۆت و شــرواڵ و پشتێنیش لە جلی کوردیدا بە هەند وەرگیراون. هەموو ئەمانە بۆ خاتری سەلماندنی کەسایەتیەکی هاوسەنگ و ڕێزلێگیراوە، بەڵام لەوانە گرنگتر هەڵبژاردنی وشە جوان و شیرینەکانە. لە پێناو دروستکردنی جوانترین ڕستە و دەربڕینی بە ڕووی بەرامبەردا.

دروســتکردنی جوانترین ڕســتە و دەربڕینی بە ئارامی و شکۆوە، نەك هەر تەنها کاریگەرە، بەڵکو باشترین پێوەرە بۆ دەرخستنی هێز و توانای هونەری و ژیری و بیرکردنەوەت و سەلماندنی کەسایەتیەکی بەهێز و ڕێزلێگیراو، بۆ ئەم مەبەســتە ســوود لــەم کورتە چیرۆکە وەردەگرین: پاشــایەك شــەو لە خەونیدا هەموو ددانەکانی دەکەون.. کەوتنی ددانیش لە خەودا لە کۆن و ئێســتادا وا لێك دەدرێتەوە کە مانــای مردن و لە دەســتدانی خزم و کەس دەگەیەنێت. بۆیە پاشــا بــە دوای هەمــوو ئەوانەدا دەنێرێت کە لە بواری شــرۆڤەی خەوندا شارەزان، بەڵێنیش دەدات هەر کەسێك بە شێوەیەکی جوان ڕاڤەی ئەو خەونەی بۆ بکات، خەڵاتێکی باشــی پێ دەبەخشــێت، چەند کەسێك بۆ ئەو مەبەســتە ئامادە دەبن. هەریەك بە نۆرەی خۆی دەچنە لای پاشــا و لــە ڕاڤەی خەونەکەیدا چەند جارێــك دەڵێن: پەنا بەخوا... پەنــا بەخوا.. جەنابی پاشــا ئەم خەونە ئــەوە دەگەیەنێت کە ماڵ و منداڵ و کەســوکارت هەمــوو دەمرن و تەنها خــۆت دەمێنیتەوە!.. پاشــا کاتێك گوێی لەم قســانە دەبێــت، زۆر تــووڕە دەبێت و هاوار دەکات و دەڵێــت: بی بەن دارکاری بکەن و بی خەنە زیندانەوە! بەم

شـــێوەیە هەموو ئەوانەی مانای خەونەکەی لێك دەدەنەوە دەخرێنە زیندانـــەوە و دارکاری و فەلاقەیەکـــی باش دەکرێـــن!!، بەڵێ دەنگۆی ئەم خەونەی پاشـــا زیاتر بلاو دەبێتەوە، تا ڕۆژێکیان کەســـێکی ژیر دێتە کۆشکی پاشایی و دەڵێت: من ڕاڤەی ئەو خەونە بۆ پاشا دەکەم. گەرچی پاســـەوانەکان بە گوێچکەیـــا دەچرپێنن ئەگەر وەلامی تۆش وەك ئەوانـــی تـــرە، ئەوا زینـــدان دەبێتە جێگات، بـــەلام پیاوەکە بە متمانە بە خۆبوونەوە دەچێتە بەردەم پاشـــای خەمناك. کاتێك پاشا ســـەر هەڵدەبڕێ و پێی دەڵێت: ها کابرا تۆش دەڵێیت خزم و کەس هەموو دەمرن و منیش نەگبەت و بێ چارە دەبم؟! خەو گێڕەوەکەش بە ڕوویەکی خۆشەوە بە پاشا دەڵێت: موژدە بێت پاشا، شوکر خێرە، مانـــای ئەم خەونە ئەوەیە: تەمەنـــت ئەوەندە درێژ دەبێت، لە دوای هەموو کەســـوکار و ماڵ و منداڵەکانت دەمریت و هەر بە پاشـــاییش دەمێنیتەوە!! پاشا ڕووی دەگەشێتەوە و فەرمان دەکات کە دیاریەکی گەورە و گرانبەهای پێ ببەخشن.

بەڕێـــزان: ئەگـــەر بە وردی لە قســـەی هـــەردوو خەوگێڕەکە ورد بینەوە دەبینین قســـەی هەردووکیان، هەریەك قســـە بوو. هەر یەك ماناو واتاو مەبەستی دەبەخشی، بەلام شێوازی دەربڕینەکەیان جیاواز بوو، یەکەمیان بێ گوێدانە هەســـت و شـــعوری پاشاو ڕاست و ڕەوان خەونەکەیـــان لێك دایـــەوە، دوەمیان بە دەربڕینێکـــی ژیرانەی ورد هەست و شـــعوری پاشای ڕاگرت و پەیامەکەشی پێ گەیاند و دڵیشی ئازار نەدا و خەلاتیشـــی وەرگرت. دەی با ئێمـــەش لێکدانەوەمان بۆ

ڕووداو و پێشـــهاتەکان پڕ بێ لە ئومێد و گەشبینی، بۆیە دەکرێ بە پشتبەســـتن بە هونەری بەکارهێنانی وشـــە جوانەکان، خەڵاتی ژیان وەربگرین.

بەڵـــێ ئیماندارانی بەڕێز: کەســـانی ژیر و بلیمەت کۆکن لەســـەر ئـــەوەی کـــە گرنگترین خاڵی بەهێزی فرۆشـــیاری زیـــرەك بریتییە لـــە: زمان شـــیرینی و قسەخۆشـــی... کاتێك کڕیارێـــك دێت بۆ لای، خێرا خێـــرا دووبارەی دەکاتـــەوە و دەڵێت: چاوەکـــەم فەرموو... لە خزمەتتـــام.. کە کڕیـــار پارەی دەداتێ، بە ڕوویەکی خۆشـــەوە دەڵێ: وازی لێ بێنە با لەســـەر خۆمان بێـــت، دوکانی خۆتە.. کە کڕیاریش ئـــەم ڕێز و حورمەتە دەبینێت لە ڕۆیشـــتندا خواحافیزی لێ دەکات و بـــە ڕوویەکی گەشـــەوە وەکو ئەوەی هیچ پـــارەی نەدابێت دەڵێت: عەزیەتمان دای، خوا ڕزقت بدات. ئەم فرۆشیارە دەڵێ: ماندوو بوون بـــۆ بەڕێـــزت مایەی کامەرانییە. خوا ڕزقی هەمـــوو لایەك بدات. بەم شـــێوەیە ئەم فرۆشـــیارە هەم پارەی خۆی وەرگرت و سودمەند بوو. هەم بەم زمانە شـــیرین و قســـە جوانانە ئەم کڕیارەی وا لێ کرد کە بەردەوام ســـەردانی بکاتەوە و وا بزانێ لەو هەموو بازاڕ و دوکانەدا تەنها ئەم شـــتی لادەســـت دەکەوێ و زۆرجار موشـــتەری تریشـــی بۆ دەنێرێ. بە پێچەوانەوە دوکاندارو فرۆشیاری تریش هەیە. شتەکانی بە هەرزان دەفرۆشـــێ و قازانجی کەمی دەخاتە ســـەر، کەلوپەلەکانی ئەصڵ و چاکن، ڕاســـتگۆیە، بێ فێڵە، بەڵام ئەوەی یەکجار شـــتی لێ بکـــڕێ و بچێتە دوکانەکەی مەگەر ناچار بێ، ئەینا دواجاری دەبێ و

جارێکی تر ڕوو ناکاتەوە ئەو دوکانە!! بۆچی؟! تەنها لەبەر زمانتاڵی و قســەڕەقی فرۆشــیارەکە کە ئەگەر ســەلامی لێ بکەی وا وەڵامت ناداتەوە کە گوێت لێ بێ.. هەروەکو ئامێرێکی ڕۆبۆت ڕەفتار دەکات. نەك وەکو مرۆڤێکی زیندوو، بۆیە هەر ئەو زمانە بۆ ئەمیان دەبێتە هۆکاری کەم بازاڕی و نەبوونی موشتەری..

بەڵێ زمانی شیرین و قسەی خۆش، وەکو دەرزی بەنج مرۆڤ بەنج دەکات و بەرامبــەر ئالودەی خۆی دەکات. جــاری وا هەیە ئافرەتێك لە ڕادەبەدەر هاوســەرەکەی خۆی خۆش دەوێت. تەنها لەبەر ئەوەی قســەی خۆش و زمانشــیرینە، هەرچەندە هاوســەرەکەی کەســێکی ســیما و شــێوە جوانیش نەبێت و سەخی و بەخشندەش نەبێت.. بە پێچەوانەشــەوە زۆر ئافرەت سکاڵا لە مێردەکەی دەکات و گلەیی لێی هەیە و لێی وەڕســە، دەڵێ: باشــە خۆ قســە پارەی تێ ناچێت!! دەبا گوێمان لە قســەیەکی خۆشیش بێت!! ڕاســتە هاوسەرەکەی خواردن و جلوبــەرگ و هەموو پێداویســتییەکانی بۆ دابیــن کردبوو، بەڵام لەگەڵ خێزانەکەیدا قسە شیرین نەبوو.. شارەزایی لە هونەری وتەی خۆشــدا نەبوو. دەی هــەوڵ بدە بە جوانترین وشــە بەرامبەرەکەت بدوێنە. کاتێك کەســێك پێت دەڵێــت: فلانە کەس داوای کارێکت لێ دەکەم. بڵێ: فەرموو.. خزمەتی کەســانێکم کردوە و کارم بۆ کردوون هاوتای پێڵاوەکەی بەرێزت نابن.. ئەم شێوازە جوان و وتە شیرین و خۆشانە، لەگەڵ دایك و باوك و هاوسەر و مناڵ و هاوڕێکانتدا بەکار بهێنــە، لەبەر ئەوەی هەرگیز زیانت پێ ناگات و هەروەکو جادووگەر

(ســاحیر) دەتوانێت بەکارهێنانی شــێواز و گوفتار و ڕەفتاری جوان، جادوو لە خەڵکی بکەیت..

دەگێڕنــەوە: لە وڵاتــی میصر. پیاوێکی ســتەمکار هەبوو بەناوی پاشــا (....) ئەم پیاوە چەند کێڵگەیەکی کشتوکاڵی هەبوو. کارگوزار و ڕانجبەر و خزمەتگوزارەکانی بەردەســتی، زۆر ئازار دەدا و زۆر کاری پێ دەکردن.. ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆیی، پاشا زەویوزار و کشتوکاڵەکەی لە دەســت چوو. لە دوای دەوڵەمەنــدی هەژار کەوت و ماڵ و منداڵەکەی ڕووت و ڕەجاڵ و برسی بوون و هیچ سەرچاوەیەکی بژێویشی نەبوو. جگە لە کاری کشتوکاڵیش، هیچ سەرچاوەیەکی بژێوی نەبوو، جگە لە کاری کشتوکاڵیش هیچ کارێکی تری نەدەزانی!... پاشا هەستا و کەوتە گــەڕان بــە دوای دۆزینەوەی کارێکدا، بــەڵام چ کارێك؟! ڕووی کردە کێڵگەی یەکێك لەو کەســانەی ســەردەمانێك لە لای کاریان کردبوو. زۆریش ئازاری دابوو، زۆر بە داماویەوە، چوە بەردەم خاوەن کێڵگەکە و داوای کــرد کاری لــەلا بــکات. جا میوەڕنین بێــت، داربڕین بێت، بژارکــردن بێــت، یان هەر کارێکی تر، کابرای خــاوەن کێڵگە، کاتێك پاشــای بینی، بە ڕوویدا هەڵشــاخا و وتی: تۆ لە لای من کار بکەیت. ئــەی ئاغای ســتەمکاری زاڵم؟!! تۆی خۆبەگەورە زان و ســتەمکاری دڵڕەق!! ســوپاس بۆ خوا کە دوعاکانی وەرگرتین و ئەوا سەرشــۆڕ و زەلیلــی کردوویت و داوای کرێکاری دەکەیت... پاشــان لە کێڵگەکەی دەری دەکات.. پاشا بە دڵتەنگیەوە دەڕوات و قاچەکانی بە دوای خۆیدا پەلکێش دەکات. هەتا دەگاتە کێڵگەی یەکێکی تر لە وانەی پێشتر زۆر

ئازاری دابوون. ئەویش بە هەمان شێوەی خاوەن کێڵگەی یەکەم دەری دەکات!! پاشــا بۆ لای کەســی ســێیەم دەڕوات و دەیەوێت ئەمیشیان تاقی بکاتەوە. کاتێك خاوەن کێڵگەی ســێیەم پاشــا دەبینێت سەرسام دەبێت، ئەمیش بە دەســت پاشاوە ستەم و ئازارێکی زۆری چەشتبوو. بە هەرحاڵ پاشــا هاتە قســە و گوتی: منداڵەکانم زۆریان برسییە و بــە دوای کارێکــدا دەگەڕێم. خاوەن کێڵگەکە ویســتی زۆر زیرەکانە تۆڵەی خۆی لە پاشــا بسەنێتەوە. هەر بۆیە زۆر بە گەرمی پێشوازی لێ کرد و پێی وت: یاخوا بەخێر بێیت پاشــا، بە ڕاســتی کێڵگەکەت ڕووناك کردەوە، پاشــای گــەورە هاتووە بۆ کێڵگــەی من؟! زۆری بە پاشــادا هەڵدا تا فریوی دا و بەم قسە بریقەدارانە، سری کرد. پاشان وتی: تەنها یەك کارم هەیە. بەڵام نازانم لەگەڵ تۆدا دەگونجێت یان نا؟! ئەمڕۆ کێڵگەکەم دەکێڵم، دوو گا گاســنەکانیان ڕادەکێشا، گایەکی ڕەش و یەکێکی ســپی، بە داخەوە ئەمڕۆ گا ڕەشــەکەیان نەخۆشــە و ناتوانێت کار بکات. گا ســپیەکەش ناتوانێت بە تەنها گاســنەکان ڕابکێشــێت. دەمەوێت ئەمڕۆ لە جێگەی گا ڕەشەکەیان کار بکەیت!! تۆ زۆر بەهێزیت پاشا، تۆ سەرکردەی، تۆ هەمیشە پێشڕەومانی.. پاشا کاتێــك گوێی لەم پیاهەڵدانانە دەبێت، زۆر بە شــانازییەوە، دەچێت بۆ لای گا ســپیەکە و بە یەکەوە دەست بە کێڵانی کێڵگەکە دەکەن!! خاوەن کێڵگەکەش لەگەڵ گا سپیەکەدا پاشا دەبەستێتەوە و زوو زوو دوبارەی دەکاتەوە و دەڵێت: ئەی باشترین پاشای جیهان، ئەی بەهێز و پاڵەوان.. پاشــان خاوەن کێڵگەکە ســواری گاســنەکان دەبێت و بە

قامچیەکەی دەستی بە گا سپیەکەدا دەکێشێ، گا سپیەکەش کاتێك دەجوڵێ و هێز دەداتە خۆی پاشاش لەگەڵ خۆیدا ڕادەکێشێ... بەڵێ، پاشا هەر لەبەیانیەوە تا ئێوارە وەکو کەسێك عەقڵ و ژیری لە دەست دابێت، لە جێگای گا ڕەشەکە جووت دەکات. کاتێك ئێوارە دادێت، خاوەن کێڵگەکە حەبلەکان لە مل و شانی پاشا دەکاتەوە و دەڵێت: بە ڕاستی کارێکی زۆر باشت کرد.. ئەی پاشا: ئەمڕۆ خۆشترین ڕۆژی تەمەنمە!!... پاشان پاشا کرێکەی وەردەگرێت و دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە. شان و ملی بریندار ببوون، خوێن لە قاچەکانی دەچۆڕاو عارەق هەموو گیانی داگرتبوو، بەڵام هێشتا بەنجەکە بەری نەدابوو -بەنجی زمان و پیاهەڵدان و قسەی خۆش-.. کاتێك دەگەڕێتەوە، منداڵەکانی پرسیاری لێ دەکەن، دەڵێن: کارت دۆزیەوە؟! پاشاش زۆر بە شانازییەوە دەڵێت: بەڵێ، من پاشام، پاشا!!، چۆن کار نادۆزمەوە؟! منداڵەکانی دەڵێن: دەی چ کارێکت کرد ئەمڕۆ؟! پاشاش لە وەڵامدا دەڵێت: ها ... چ کارێکم کرد؟! ئیتر بەرە بەرە خەریك بوو بەنجەکەی بەری دەدا و بیری کەوتەوە، ئەمڕۆ چیان بەسەر هێناوە.. کەمێك بێدەنگ بوو، پاشان وتی: ئەمڕۆ لە جێگەی گا ڕەش کارم کرد.!!

ڕەحمەتی خوا لەو دانایە بێت کە فەرموویەتی: مرۆڤ نە گۆشتی دەخورێت و نە پێستەکەشی لەبەر دەکرێت و سوودی لێ دەبینرێت. دەی هیچ نەبێت با زمانی شیرین بێت.!

ئێمەش وا بەخزمەتی مانگی پڕ ڕەحمەت و بەرەکەتی ڕەمەزان دەڕۆین و دەبێ لەو مانگەدا لەو خولە گرنگ و گەورەی ساڵانەدا،

هەوڵــی ئەوە بدەین کە لــە هەموو کات زیاتر پارێزگاری لە زمانمان بکەیــن، چونکە ڕۆژوو مانای خۆڕاگرتنە. دەی گەورەترین خۆڕاگرتن و بەســەرخۆدا زاڵبوون ئەوەیە مــرۆڤ بتوانێ زمانی بگرێ. چونکە مرۆڤ بە ئاسانی دەتوانێ واز لە خواردن بێنێ و ئاویش نەخواتەوە. ئەوەتا بە هەزاران کەس لە مانگی ڕەمەزاندا هەر لە بانگی بەیانییەوە، هەتــا بانگی ئێوارە، دەتوانن هیچ نەخۆن و نەخۆنەوە. تەنانەت خۆ دەپارێــزن لە ئاولەدەموەردان. بەڵام ئایا ئەوانەی کە زمانیان دەگرن لە غەیبەت و بوختان و دووزمانی و باسی ئەم و ئەو زۆرن؟! نەخێر. ئەوانە کەمن.

کەواتــە: مــەرد و پاڵــەوان و بەغیــرەت ئەو کەســەیە کە ئاگای لــە زمانی خۆیەتی. کاتێك پێویســتە قســەی پــێ دەکات و بێدەنگ نابێت. (فَلْيَقُلْ خَيْراً) ئەگەر شــوێنی وتنی قسەی چاك و جوان و خێر بوو. نابێ زمانت بگری. پێویســتە قســە بکــەی. چونکە پێغەمبەری خۆشەویســتمان (ﷺ)، هەمــوو بێدەنگی و قســەنەکردنێکی مەدح و ستایش نەکردوە، بە پێچەوانەوە بێدەنگبوون لە کاتی وتنی حەق و ڕاستی و خێر و چاکەدا، تاوانە. مرۆڤ دەباتە ڕیزی شەیطانەوە، بەڵام شەیطانێکی کەڕو لاڵ، هەروەکو فەرمویەتی: (السّاكِتُ عَنِ الحَقّ شَيْطانٌ أَخْرَسٌ). بەهەمان شێوە دەبێ لە ئاستی خراپەدا، لە ئاستی بەزاندنی ســنورەکانی خوا و خەڵکدا. زمانمان بگرین و بپارێزین پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ صَمَتَ نَجا). هەرکەس بێدەنگ بێ و زمانی بپارێزێ لە قســەی خراپ ئەوە ڕزگاری بووە. مامۆســتا

نوری فارسیش فهرموویهتی:

زمان داسه. یا دهی بری یا دهت برێ.

نانت دهبرێ. جهرگت دهبرێ. سهرت دهبرێ.

زمان گوێزان پاکو دهدا ههردوو جیهان.

جا ناچاری یا دهی گری یا دهت گرێ..

(اللّهُمَّ إنّا نَسأَلُكَ مُوجباتِ رَحْمَتِكَ، وَعَزائِمَ مَغْفِرَتِكَ، وَالسّلامَةَ مِنْ كُلِّ إثْمٍ. وَالغَنيمَةَ مِنْ كُلِّ بِرٍّ، وَالفَوْزَ بالجَنَّةِ وَالنَّجاةَ مِنَ النّارِ).

پهروهردگارا، ئێمه داواخوازی سۆز و میهر و بهزهیی و لێخۆشبوونی بێپایانتین. لهگهڵ پارێزراوی له گوناهو تاوان و دهستکهوت و خێرۆمهندی له هەموو چاکهیهك و به دهستهێنانی بهههشت و قوتاربوون له ئاگری دۆزهخ.. اللّهُمَّ آمین..

## سهرچاوهکان:


١. بهختهوهر بژی. د.محمد عبدالرحمن العریفی. و: هێمن محمد علی. ل٣٥٣، ل٣٥٦، ل٣٤٢.

٢. ههیف، ژماره: ٢٣. ل١٥.

٣. گۆڤاری: (دوانگه) ژ: ٤٣. ل١٧.

٤. گۆڤاری (بڕیار) ژ:١٤: ل٤٠.

وتاری یەکەم بۆمانگی رەمەزان

# پێشوازی مانگی رەمەزان و سوودی رۆژوو

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانـــی بەرێــز: هەزاران ســوپاس بۆ خوای تــاك و تەنها و بێشەریك، وە هەزاران سەلات و سەلام لەسەر پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ). کە خوای گەورە رەحمی پێ کردین و ئەمســاڵیش گەیشتینەوە بــە خزمەت مانگی پــڕ رەحمەتی خوایی مانگی لێخۆشــبوونی خوا لــە بەندە گوناهبارەکانــی، مانگی هاتنە خــوارەوەی قورئان. مانگی نوێکردنــەوەی ئیمان، مانگی هەموو جوانیەکان، مانگی دڵخۆشـــی و کامەرانی، مانگی رەمەزانی پڕ بەرەکەت. ئەو مانگەی کە تاقە مانگە لەناو هەر دوانزە مانگەکەدا کە ناوی لە قورئاندا هاتوە (شَهْرُ رَمَضانَ الَّذي أُنْزِلَ فيهِ القُــرْآن).. هەربۆیە لە ناخی دڵمانەوە بەخێرهاتنێکی گەرمی ئەو مانگە پڕ خێر و بەرەکەتە دەکەین و دەڵێین:**

**بەخێرهاتی مانگی پڕ نوور.**

**شەمعی دەستمان بۆ رێگای دوور.**

**بەخێرهاتی سونبولی واتای خواناسی.**

**هەوێنی بۆ خوا سوڵحان.**

**مەرحەبا بارانی رەحمەت.**

**کلاو رۆژنەی ماڵی دڵمان..**

**بەخێرهاتی یوسفی نێو دوانزە برا.**

**لە دەیجور و یەڵدای ساڵدا، بووی بە شەمع و بووی بەچرا..**

**بەخێرهاتی لە ئێستاوە ژیلەمۆی ئیمانی دڵمان**

**چاوەڕوانی باوەشێنی، شاپەڕی پڕ سۆزی تۆیە.**

**بەخێرهاتی کەناری ئارام بەخشی دڵ.**

**کەشتی هیوا، دەریای ئیحسان.**

**بەخێرهاتی لەگەڵ خۆتدا، جوانترین دیمەنت هێنا.**

**تەپڵی پارشێو، سەلای بەیان، سفرەی بەربانگ.**

**ئاپۆرای نوێژی تەراویح**

**دوعای بەکوڵ، خەتمی قورئان...**

**بەخێرهاتی کەژاوەی قافڵەی خواناسی.**

**بەخێرهاتی مانگی غوفران.**

**بەخێرهاتی مانگی قورئان...**

* * *

**بەڵێ ئیمانداران: داوا دەکەین لە خوای گەورە کە ئەم مانگی بەخێر و خۆشی بە سەرماندا بێ و بڕوا و دوعاکەی پێغەمبەری سەروەرمان (ﷺ) دەکەین، کە هەر کاتێ مانگی یەك شەوەی دەبینی پەنجەی بۆ مانگەکە رادەکێشا و دەیفەرموو:** (اللَّهُـمَّ أَهِلَّهُ عَلَيْنَا بِالأَمْنِ والإِيمَانِ، وَالسَّلامَةِ والإِسْلامِ، رَبِّي ورَبُّكَ اللَّه، هِلالُ رُشْدٍ وخَيْرٍ). رَواهُ أحمد في مُسْنَدِهِ (١٣٩٧) حَدِيْثٌ حَسَنٌ

کەواتــە: ئیمــان و دینداری و خواناســی و موســڵمانیەتی وا لەو شوێنەیە کە ئەمین بێ، سەلامەت بێ، شەڕ و ئاژاوەی لێ نەبێ، ماڵی ئەمیــن و پڕ ئاشــتی و ڕێــز و حورمەت و دوور لە ئــاژاوە، گوند و شارۆچکە و شاری بێدەنگ و هێمن و دوور لە ئاژاوە و ناکۆکی و شەڕ، وڵاتــی پڕ لە هێمنی و ئارامی و دڵنیایی و تەبایی و خۆشەویســتی، دینداری و خواناســی بە جوانی لێ دەکــرێ. چونکە مرۆڤ کاتێ لە شەڕ و ئاژاوە و کوشتن و ڕق و قین و دووبەرەکی و ناکۆکیدا ژیا، ئەو کاتــە ناتوانێ هاتووچۆی مزگەوتیــش بکات. جومعە و جەماعەتیش بکات، خێر و خێراتیش بکات، چونکە کە خەریکی شەڕ بووی، دوور دەبــی لە خێر. هەر بۆیە خۆشەویســتمان (ﷺ) ئەمانی پێش ئیمان خست. سەلامی پێش ئیسلام خست.. بە ڕاستی هەر ئەم دوعایە و ئەم فەرمودەیە بەســە بۆ ئەوەی کە بە ناحەزانی ئیسلام بڵێین: ئیسلام دینی ئاشتی و ئەمان و ماڵ و شار و وڵاتی بێدەنگ و هێمن و دوور لە شەڕ و هەرا و خوێنڕێژیە و دوورە لە هەموو تەقاندنەوە و تیرۆر و ئیرهابێك.. دەی خوایە لەم ســەرەتای مانگی ڕەمەزانەوە داوات لێ دەکەین کە ماڵی موسڵمانان، گەڕەك و گوند و شار و وڵاتی موسڵمانان پــڕ بێ لە ئاشــتی و هەموو ناکۆکــی و دووبەرەکیەکان کۆتاییان پێ بێت. اللهم آمین.

خۆشەویســتان: ئێمە ئەمڕۆ لە لایەنــی مادییەوە باش چوینەتە پێشــەوە، کۆشك و تەلارمان چۆتە ئاسمان، ئوتومبێلی وا پێشکەوتوو لــە شــەقامەکانماندان، لە یابان خــۆی ئاوا زۆر نییــە. ئامێرەکانی

تەکنەلۆجیای نوێ، بە هەموو بوارەکانییەوە لە پێشکەوتوترین جۆری بە دەستمانەوەیە. بەڵام: هەموو ئەمانە پێشکەوتنە لە بواری ئاگر و ئەلکترۆن و ئاسن و چیمەنتۆدا.. لە بەرامبەردا: ویژدان، سۆز، بەزەیی، بەدەم یەکەوە بوون. دراوسێیەتی، خەمخۆری، قەناعەت، شوکری خوا، ئەمانەت پارێزی. ئەگەر نەشـڵێم تــەواو کەم بوونەوە، دەتوانم بڵێم بە تەواوی کاڵ بوونەتەوە.. کەواتە پێویســتمان بە بەخۆداچوونەوە هەیە. پێویستمان بە خولێکی گەورەی ڕوحی و دەروونی و جەستەیی بەهێز هەیە. چونکە بەڵگەنەویســتە کە مرۆڤ دروســتکراوێکی زۆر ئاڵۆزە و فرە ڕەهەندە و فرە خواســتە. پێویســتیەکانی هەمەچەشنە و هەمەلایەنە. ســاتێك غەمبــار دەبێت و بێهیوایی ڕووی تێ دەکات، زەمەنێك لە بیری ڕامکردن و دەستەبەرکردنی هەموو دروستکراوەکانی تــرە بۆ خزمەتی خــۆی. هەندێك جار کاری چاك و داهێنانی گەورە ئەنجــام دەدات. هەندێك جــار بڕیاری خراپ و وێرانکەر دەدات. ئەم دروســتکراوەی خوا چۆن بتوانرێت، بە شــێوەیەك ئاراســتە بکرێت کــە هەموو هەنــگاو و کارەکانی بە بارێکی پۆزەتیڤــدا بکەونەوە و هیــچ لاوازی قەیرانێکــی ڕۆح و ماندووبوونێکی دەروونی ڕووی تێ نەکات. جا باشــترین کەسێك کە بتوانێ ئاراستەی بکات، تەنها خوای گەورەیە. ئەو خوایەی هەر خۆی درووستی کردوە و خۆی لە هەموو کەس باشــتر دەتوانێت ئاراســتەی بکات. ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیش یەکێکە لەو خواپەرســتیانەی کاریگەری گەورە و دیاری لەســەر ڕۆح و دەروون و ئیــرادە و ئاراســتەکردنی مــرۆڤ هەیــە... بەڵێ مانگی

ڕەمەزان خولێکی ساڵانەیە و بانگەوازکردن بۆ بەشداری لەو خولە و ئامانج لە خول و دەورەکە لە ئایەتێکی قورئاندا تۆمار کراوە. کە دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ البقرة: ١٨٣ ﴿ أَيَّامٗا مَّعۡدُودَٰتٖ ﴾ البقرة: ١٨٤ ﴿ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ ﴾ البقرة: ١٨٥

سبحان الله قورئان چەند بە وردی ئاماژە بە شتەکان دەکات. ئەوەتا لەم ئایەتەدا، بە ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ﴾ بانگەوازی هەموو ئیمانداران دەکات کە وەرن بەشداری ئەم خولە بکەن. مەرجی بەشداربوونتان تەنها (ئیمانداری)یە و تەواو. ئیتر ناوت چییە خەڵکی کوێی، تەمەنت چەندە، ڕەنگ و دەنگت چۆنە، لە کام نەتەوەی، کام ڕەگەزی، بە چ زمانێ دەدوێی، خوێندەواری یان نا، شەهادەت هەیە یان نا، وەزیری یان کرێکار، پاشای یان حەماڵ. ئەمانە هیچی إعتباری نییە و تەنها ئیماندار بی ئەتوانی بەشدار بی، ئەم خولەش ئارەزوومەندانە نیە. بەڵکو ساڵی جارێك واجبە بەشداری تێدا بکەی، چونکە پێویستیت پێیەتی لە دوو لاوە. یەکەم: دین و ئیمانت پێی نوێ دەبێتەوە و زیاد دەکات. دووەم: ئەو کەموکوڕی و کەلێن و درزانەی کە کەوتوونەتە بواری دینداری و خواناسیتەوە بۆت پڕدەبنەوە. وەکو دەرزی کوتانی ساڵانە وایە. کە تا ماوەی یەك ساڵ کاریگەری لە سەر جەستە و ڕوحت دەمێنێ و لەو هەموو ڤایرۆسی شەهەوات و شوبوهاتە دەتپارێزێ کە ڕوو دەکاتە ڕۆحت. دینت. ئیمانت. جەستەت لەو کاریگەرییە خراپانە دەت پارێزێ . دەفەرموێ:

خولەکــە واجبە ئامادەی بی ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ﴾ ﴿فَلْيَصُمْهُ﴾.. خۆ ئەگەر کەسێك پرسیاری بۆ دروست بوو. وتی: باشە پێش ئێمە کەسی تر بەشداری ئەم جۆرە خولەی کردوە؟! خوای گەورە وەڵام دەداتەوە و دەفەرموێ: بەڵێ ئوممەتانی پێش ئێوەش بەشداریان کردوە ﴿كَمَا كُتِبَ عَلَى الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ﴾. وە مــاوەی خولەکەش دیاری دەکات و دەفەرموێ: ﴿أَيَّامًا مَّعْدُودَاتٍ﴾.. وە پاشــان ئامانجی خولەکەش دیــاری دەکات و دەفەرمــوێ: ﴿لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾.. کەواتــە: ئامانجی ئەم دەورەی مانگی ڕەمەزانە، بوونی مرۆڤە بە موتتەقی و خواناسی ڕاستەقینە، ئەگەر بشچینەوە خزمەت قورئان هەر لەسورەتی (البقره) دا لە ســەرەتاوە صیفاتی موتتەقین باس دەکات و دەفەرموێ: ﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ الْكِتَابُ لَا رَيْبَ فِيهِ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ﴾ البقره: ١ -٢.. ســبحان الله، ڕەمەزان مانگی قورئانە (شَهْرُ رَمَضانَ الَّذى أُنْزِلَ فِيهِ القُرْآن). قورئانیش ڕێنمایی و ڕێنیشاندەرە بۆ ئەو کەسانەی کە موتتەقین. جا صیفاتی موتتەقین باس دەکات و دەفەرموێ:

١. الَّذيــنَ يُؤْمِنُونَ بالْغَيْبِ: بە ڕاســتی لــە ڕۆژوودا ئیمان بە غەیب دەدرەوشــێتەوە، چونکــە تۆ دەتوانی نوێژ بکەی بــۆ ئەوەی خەڵکی چاویان لێت بێ و مەدحت بکەن. حەج بکەی بە هەمان شێوە خەڵکی دەتبینن. صەدەقە و خێر و خێرات دەکەی و زەکاتی ماڵ دەردەکەی، هەر کەســانێك ئاگادارن پێــی. تاکە عیبادەتێك کــە مرۆڤ غەیری -اللــە- کــەس نازانێ بە ڕاســتی ئەنجامی داوە یان نــا. بریتییە لە (ڕۆژوو) چونکە تۆ دەتوانی زۆر بە ئاسانی ئاو بخۆیتەوە و نان بخۆی

و لە شـوێنێکی وا پەنهانـدا ئەنجامی بدەی، کە هیچ کەس پێشـت نەزانـێ. بەڵام تـۆی ئیماندار کاتێ بـە ڕۆژووی. تەنها بە ئیمان بە غەیـب، بە وەی کە یەقینت هەیە کە خوای گەورە چاوی لێتە. نەك هـەر ناخۆی و ناخۆیتەوە، خۆت دەپارێزی لە کاتی ئاولەدەموەردانددا قەترە ئاوێك بپەڕێتە قورگتەوە!. هەر بۆیە بە ڕاسـتی خاڵی یەکەم لـە صیفاتـی موتەقین کـە ( الَّذينَ يُؤْمِنُـونَ بالْغَيْبِ) لـە ڕۆژوودا بۆ ڕۆژوەوان دێتە دی. کە بە ڕاسـتی هەر ئەم بیروباوەڕەشە کە مرۆڤ پێدەگەیەنێ. مرۆڤ دروست دەکات. کە یەقینی هەیە ئەگەر کەسیش چـاوی لێـی نەبێ کە ئەو کارە دەکات. خوای گـەورە چاوی لێیەتی، لەبـەر ئەوە ناڵێ: ئـەو نانە نانە ئەمڕۆ لە خوانـە. چونکە دەزانێ سـبەینێ لێپرسـینەوەی هەیە.. ناڵێ حازر بە قـەرز مەدە، چونکە دەزانێ سەرەنجام حازرەکەشی دەفەوتێ!!

٢. دوەم صیفەتـی موتەقین: (وَيُقِمُونَ الصَّلاةَ). لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕاسـتی نوێژ گرنگی هەرە گەورەی پێ دەدرێ، هی وا هەیە پێش ڕەمەزان نوێژی نەکردووە، کەچی لە ڕەمەزاندا یەك نوێژی نافەوتێ، ئـەوەی پێش ڕەمەزان بـۆ نوێژی بەیانی نەی دەتوانی هەڵسـێ. لە ڕەمەزانـدا، بە هۆی پارشـێوەوە، یەك نوێـژی بەیانی نافەوتێ: ئەو کەسـانەی کە لە پێش ڕەمەزاندا، کەم هاتووچۆی مزگەوتیان کردوە. لە مانگی ڕەمەزاندا بەشداری نوێژی تەراویح و هەموو جەماعەتەکان دەبن. کەواتە: صیفەتی دوەمی موتتەقین لە ڕۆژوەواندا دێتەدی.

٣. صیفەتی سێیەمی موتتەقین: (وَمِمّا رَزَقْناهُمْ يُنْفِقُونَ). خۆبەخشین

و بەخشـــندەییش لـــە مانگـــی پڕ ڕەحمەتـــی ڕەمەزانـــدا یەکێکە لە سـیما گـــەش و جوانەکانی مانگـــی پڕ بەرەکەتی ڕەمـــەزان. هەر لە دەرکردنی زەکاتی ســـەروەت و ســـامانەوە، تا وەکو زەکاتی ســـەرفترە و بەربانگکردنـــەوە بۆ هـــەژاران و یارمەتیدانی نازداران و داماوان و نەخۆشان.

کەواتە: هەرسێ سیفاتی موتەقین کە لە سەرەتای سورەتی -البقرة- وە هاتبوون و لەهەر کەسـێکدا هەبن قورئان بۆی دەبێتە مامۆستا و ڕێنیشاندەر.. هەرســێ سیفەتەکە لە ڕۆژووەواندا دێنە جێ و ئەمەش مـــوژدەی ئەوەمان پێ دەدات کە (إن شـــاء الله). ئێمـــەی ڕۆژووەوانانی مانگی ڕەمەزان، قورئان بۆمان دەبێتە (هدی) و ڕێگا ڕۆشـــنکەرەوەی دونیا و قیامەتمان و قورئان دەبێتە تکاکاری مەیدانی مەحشەرمان.

ئیمانداران: هەر شـــتێ، هەر عیبادەتێ خوای پەروەردگار لەســـەر بەندەکانـــی خـــۆی نووســـیبێ، بە دڵنیاییـــەوە پڕە لـــە حیکمەت و هەمـــووی لە بەرژەوەندی مرۆڤدایە. چونکە هەر دروســـتکەر (خالق) دەزانێ چی لە بەرژەوەندی دروستکراو (مخلوق)ەکەیدایە.. لە ڕۆژووی مانگی ڕەمەزانیشـــدا، کە ڕەنگە یەکێ بپرسێ: باشە بۆچی ئێمە لەم گەرما بەهێزەدا بە ڕۆژوو دەبین کاتێ کە ڕەمەزان دەکەوێتە وەرزی هاوینـــەوە؟! بۆ وەڵامی ئەو پرســـیارە و لابردنی گومان و دوودڵیەك ئەگەر هەبێ، دەڵێین: هەروەکو وتمان هەرچی خوای گەورە لەســـەر بەندەکانـــی واجـــب کردوە کە بی کەن، یـــان فەرموویەتی مەیکەن و خۆتانی لێ بپارێزن. بێ هیچ شك و گومانێك هەمووی لە بەرژەوەندی

خۆماندایە و پەروەردگارمان بێ ئیحتیاجە لە بەندەکانی. (إِنَّ اللهَ لَغَنِيٌّ عَنِ العالَمِينَ). بەڵام چەند خاڵێك لە حیکمەتەکانی ڕۆژوو دەخەینەڕوو:

١. ڕۆژووی مانگـــی ڕەمـــەزان. یەکێکـــە لـــە پێنـــج ڕوکنەکـــەی ئیســـلامەتیەکەمان. هەروەکـــو پێغەمبـــەری خۆشەویســـتمان (ﷺ) فەرموویەتی: (بُنِيَ الإِسْلامُ عَلى خَمْسٍ) ئیسلام لەسەر پێنج پایە و پێنج کۆڵەکە بنیات نراوە، کە ئەوانیش: شایەتمان و نوێژ و ڕۆژووی ڕەمەزان و زەکات و حەجی ماڵی خوایە بۆ کەســێ توانای هەبێت. کەواتە: بە گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان یەکێ لە پایەکانی ئیســلامەتیەکەمان کامڵ دەبێت..

٢. ڕۆژوو باشـــترین پەروەردەکارێکی بـــە کردەوەیە. کە مرۆڤ وا لێ دەکات کە بڵێ: من کەماڵی حەڵاڵی خۆم نەخۆم. ئیتر چۆن ماڵی حەرامی خەڵکی دەخۆم!.

٣. ڕۆژوو یەکســـانی بـــە کردار نەك هەر بە دروشـــم و گوفتار لە ناو کۆمەڵدا دەچەســـپێنێ. ئەوەتا هەمووومان دەبینین چۆن پاشـــا و حەمـــاڵ. پیر و گەنج، ژن و پیـــاو، گەورە و هەرزەکار، دەوڵەمەند و هەژار هەموویان لە یەك کاتدا پارشێوو دەکەن و لەیەك دەقیقەدا واز لە خواردن و خواردنەوە دێنن و ئێوارەش لە یەك ئان و ساتدا ڕۆژوو دەشـــکێنن.. هیچ خاوەن پلە و پایە و ســـەرمایەدار و دەسەڵاتدارێك بۆی نییە یەك دەقیقە پێش کەســـانی دیکە ڕۆژوەکەی بشکێنێ. یان لە بەرەبەیاندا درەنگتر واز بێنێ لە خواردن. ئەمەش یەکسانییە کە خەڵکی داوای دەکەن. پاشان ڕۆژوو دەورەیەکە و خولێکە بە یەکسانی

بــۆ هەموو مرۆڤەکانە. ئەوەتا: ســنووری جوگرافی بەربەســت نییە و مانگــی ڕەمــەزان هەموو وڵاتان دەگرێتەوە. پاشــان ڕەنگ و زمان و نەتــەوە جیا ناکاتەوە و هەمووی تێیدا بەشــدارە. ڕۆژووی مانگی ڕەمــەزان دەورەیەکــە هەمــوو تاکێك بە جیاوازی ڕەگــەز و تەمەن و خوێنــدن و پلــە و پایە و گوند و شــارەوە، تیایدا بەشــدار دەبێ. ئایا غەیری ئەم ئیســلامە ئازیزە هیــچ بەرنامەیەك و پڕۆگرامێکی مرۆڤکــرد، توانای کردنەوەی خولێکــی یەك مانگی ئاوای هەیە؟! بێ هیچ گومانێك نەخێر. چونکە بینیومانە و زۆرجار بەشداریمان کردوە تیایاندا. دەورەیەك ئەگەر بۆ گەنج بکرێتەوە، بۆ پیر و بە ساڵاچوو نابێ بەشــداری بکات. ئەگەر بۆ ئاســتی زانکۆ بێ، ئەوە بنەڕەتی و ئامادەیی بۆی نییە تیایدا بەشــدار بێ، ئەگەر خولەکە ســەربازی و سیاســی بێ، ئەوە تەنها کۆمەڵە خەڵکێکی کەم بۆیان هەیە بەشداری تێــدا بکەن کە پەیوەندیدارن بەو بابەتــەوە. تەنها و تەنها ڕۆژووی ڕەمەزانە کە ئاوا گشــتگیرە و ئاوا بە یەکسانی بەسەر بەشداربوانیدا دەچەسپێ و جیاوازی کەس ناکات.

٤. ڕۆژوو بە دەوڵەمەند و دەستڕۆیشــتوو دەڵێ: ئازاری برســیەتی هەژار هەســت پێ بکە. چونکە مرۆڤ هەتا خۆی برسی نەبێ نازانێ برســیەتی چەنــد بە ئــازارە. بۆیە (یوســف) پێغەمبەر کــە بوو بە خەزێنــەداری میصــر، زۆر زۆر بــە ڕۆژوو دەبوو. کە لێیان پرســی: بۆچــی ئەوەنــدە بە ڕۆژوو دەبــی؟! فەرمووی: بۆ ئــەوەی بەردەوام هەژارەکانــم لــە یــاد بن کە چۆن برســیانە و ســکیان خاڵییە. ئەم

ڕۆژووگرتنەی خۆم، برسی و تینووم دەکا و هەژار و نەدارانم دێنەوە بەرچاو و وام لێ دەکات زیاتر کاربکەم و کارا بم و نەخشەی جوانتر دابنێــم بۆ بووژاندنەوەی بــواری ئابووری وڵات و لابردنی هەژاری و نەداری و گرانی، بۆ ئەوەی هەژارەکان تێر و تەسەل بن..

٥. ڕۆژوو مــرۆڤ فێــری هیممەت بــەرزی دەکات. چونکە مرۆڤێك نەتوانــێ بۆ مــاوەی چەند کاتژمێرێــك، ڕۆژێك، نــان نەخوا و ئاو نەخواتــەوە، ئیتــر چۆن لە تەنگانــەدا. بەرامبــەر دوژمن خۆی بۆ دەگیــرێ؟! لەبەر ئەوە ڕۆژوو مــرۆڤ فێری هیممەت بەرزی دەکات و منداڵێکــی بچکۆلە، چۆن ئەوەندە هیمەتی بەرز دەبێ کە لەو ڕۆژگارە درێــژەدا نە نان دەخوا نە ئاو. کەچی کەســێکی گەورە و بە تەمەن کــە بــە ڕۆژوو نابێ ناتوانێ وەکو ئەو منداڵــە خۆڕاگر بێ، ئەگەر بە ڕۆژوو نەبێ.

بانگخواز (عمرو خالد) دەفەرموێ: لە بەریطانیا لەگەڵ ئیسپانیەك قسەم کرد. باسی ڕۆژووی ڕەمەزانم بۆ کرد، وتی: ماوەی ڕۆژوەکەتان چەنــدە؟ وتــم: بەیانی تا ئێــوارە. وتی: یەعنی لــە بەیانیەوە هەتا ئێــوارە هیــچ ئاو و نانێك ناخۆن؟! وتم: نەخێر نەك هەر نان و ئاو ناخۆین. خۆمان دەپارێزین لە وەی کە لە کاتی ئاولەدەمومرداندا ئاو بچێتە قورگمانەوە. وە لە خێزانی حەلاڵی خۆشــمان نزیك نابینەوە تا ئەو کاتەی کە بە ڕۆژووین.. ئیســپانیەکە لێی پرسیم: کام تەمەن بە ڕۆژوو دەبێ؟! وتم: هەموو ئاســتەکانی تەمەن، هەر لە منداڵێکەوە کە شــەش حەوت ســاڵانە و توانای ڕۆژووگرتنی هەیە. هەتا دەگاتە

پیرێکی بە تەمەنی پشـــت چەماوە.. وە هەردوو رەگەزی نێر و مێ، بـــە رۆژوو دەبن. مەگەر ئافرەت لە کاتی بێنوێژی مانگانە، یان دوای منالبوون و نەخۆشـــی بە رۆژوو نەبێـــت.. وتی: ئەو ولاتە گەرمەتان هەیـــە و بەرگەی تینویەتی و برســـیەتی دەگــــرن؟! وتم: بەلێ. وتی: ئێمەی ئیسپانی ئەو هیممەتەمان هەبوایە، هێزی گەورە دەبووین لە دونیادا..

٦. هەموو ئەو برســـیەتی و تینویەتیەی لە کاتی بە رۆژووبووندا تووشـــمان دێت. ســـوودی تەندروســـتی زۆری تێدایە بۆمـــان، جا لە سوودەکانی برسیەتی ئەمانەن:

(بارســـیلیوس) کە پزیشـــکێکی سویســـریە وتویەتی: برســـیەتی و برســـیبوون بۆ ماوەیەکـــی دیاریکراو، چەند جارێك بەســـوودترە لە بەکارهێنانی دەرمان.

هەروەها (تۆم بروز) لە فوتابخانەی رۆژنامەگەری (کۆلۆمبیا) دەلێ: هەرچەندە من بۆ دابەزاندنی کێشـــی لەشـــم بـــە رۆژوو بووم، بەلام دواتر بۆم ئاشـــکرا بوو کە رۆژوو زۆر بە ســـوودە بۆ چالاککردنەوەی بیروهـــۆش، رۆژوو یارمەتـــی بینین بە روونی زیاتر دەدات، هەروەها فکرەی نوێ و هەروەها حازربوونی فکر و هۆش زیاتر دەکات..

بەلـــێ، لە کاتی بە رۆژووبووندا کۆئەندامی هەرس پشـــوو دەدات. چونکـــە دڵ کە پاڵ بە خوێنەوە دەنێت بۆ هەموو بەشـــەکانی لەش، کۆئەندامی هەرســـیش (١٠٪)ی ئـــەم خوێنەی بۆ دەچێت، جا لە کاتی بە رۆژووبووندا ئەم بەشـــە خوێنەی کە بۆ هەرســـی خۆراك بەکاری

دەهێنێ، زۆر پێویســـتی پێی نابێت. بەم شــێوەیە گەدە و کۆئەندامی هەرس بە گشتی پشوویەکی باش دەدەن..

ســـوودی نینوویەتی لە کاتی ڕۆژوودا: تینوویەتی کاتێ خراپە کە گـــەدە (معیدە) تێر بێ و ئـــاو نەخۆیتەوە. بەڵام کە گەدە خاڵی بوو، ئەمجا تینووت بوو. سوودی زۆرە، لەوانە:

١. زیادکردنی ماددەی (پرۆســـتاگلاندین) بە جۆرێك کە لێهاتوویی خانەکانی خوێن چاك دەکات.

٢. لەش لەبرینی گەدە (قرحە المعدە) دەپارێزێت..

٣. هاوبەشی لە چارەسەری نەزۆکیدا.

٤. یادەوەری (زاکیرە)ی مرۆڤ بەهێز دەکات.

٥. میکانیزمەکانی کاری گورچیلە چالاك دەکات.

٦. دڵەڕاوکێ لە کاتی خوێندندا کەم دەکاتەوە.

بەڕێزان: هەندێ جار لە لایەن نەیاران و نەزانان بە حیکمەتەکانی ئیســـلام، پرســـیارێك دەکرێ. ئەویش ئەوەیە: باشە ئەگەر لەکاتی بە ڕۆژووبووندا ڕێگە بە ئاوخواردنەوە بدرایە، کە مرۆڤ بۆی هەبوایە تا ئێوارە یەك دوو پەرداخ ئاوی بخواردایەتەوە و ڕۆژوەکەشی نەشکایە. چـــی دەبوو؟! ئایا باشـــتر نەبوو؟! زانایان دەڵێـــن: ئاوخواردنەوە لە کاتی بە ڕۆژووبووندا دەبێتە هۆی دروســـتبوونی چەندین جۆر زیان بـــۆ لـــەش، وەك دەرچوونی ئاوی زۆر لەگەڵ میزدا و لە دەســـتدانی خوێ بە ســـوودەکانی وەکو: سۆدیۆم، کە ئەگەر شوێنی ئەو خوێیانە پڕ نەکرێتەوە. ئەوا مەترســـی لەسەر ژیانی مرۆڤ درووست دەکات..

دەبێت ئەوەش بزانین، کە خوای گەورە توانای درووســتکردنی ئاوی لە ڕێگەی کار و گۆڕانە کیمیاییە جۆراوجۆرەکانەوە بە لەشی مرۆڤ بەخشیوە، ئەمەش لە هەموو خانەکانی لەشدا ڕوودەدات. کە لە کاتی پرۆســەی گۆڕانـــی خۆراکیەکاندا گەردی ئاو پێــك دێت. هەروەها لە کاتی پێکهێنانی وزە لە جگەر و گورچیلە و مێشك و خوێن و....هتد. زانایــان ئەنــدازەی ئەو ئاوەیان لە ڕۆژێکدا بە (ســێ یەك) یان (نیو) لیتــر خەملاندوە و بە ئاوی خۆیی، یــان ناوەکی (intrinsic water) ناو دەبرێت..

٧. ئەگــەر ڕۆژوو نەبێ، نرخی خواردن و ئاوی خواردنەوە نازانین و هەرگیز ئەو تام و چێژەی لێ ناکەین.. هەتا لە گەرمادا بە ڕۆژوو نەبیت قەدر و نرخی ئاوی سارد نازانی.

٨. بۆ ڕۆژی قیامەتمان ڕۆژوو فریامان دەکەوێت: با بچینە خزمەت ئەم چەند فەرمودەیە:

- عَنْ أَبِي أُمامَةَ، قُلْتُ: يارَسُولَ الله، مُرْنِي بِعَمَلٍ أَدْخُلُ بِهِ الجَنَّةَ، فَقالَ: عَلَيْكَ بالصَّوْمِ فَإِنَّهُ لامِثْلَ لَهُ). رَواهُ إِبْنُ حَبّان وَأَحْمَد وَالنَّسائي

واتە: صەحابی بەڕێز. ئەبی ئومامە دەفەرموێ: عەرزی پێغەمبەری خــوام کرد و وتم: ئەی پێغەمبەری خــوا (ﷺ) فەرمانم پێ بکە بە کردنــی کارێك، کــە ئەگەر ئەو کارەم ئەنجام دا بچمە بەهەشــتەوە. پێغەمبــەری خوا (ﷺ) فەرمووی: بە ڕۆژوو بە. وەصیەتت بۆ دەکەم کە زۆر بە ڕۆژوو بە. چونکە ڕۆژوو هاووێنەی نیە!.

بــە ویســتی خوا ئیمانــداران، ئێمەش بــەم ڕۆژووگرتنەی مانگی

ڕەمەزانمــان، بەهەشــتی خوا بە دەســت دێنین. لەبەر ئــەوە بازۆر دڵخۆش و شادمان بین بە ڕۆژووگرتنەکەمان..

٢. ئەگــەر دەڵێی ڕۆژگار درێــژە و گەرمایەکی بە تینە. تینویەتی زۆرمــان بــۆ دێنێ، ئەوە بزانە لە قازانجــی خۆمانە، با گوێ بۆ ئەم فەرمودە موژدەبەخشە بگرین. خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ قَضَى عَلى نَفْسِهِ، أَنَّ مَنْ عَطَّشَ نَفْسَهُ للهِ فِي يَوْمٍ حارٍّ، كانَ حَقّاً عَلى اللهِ أَنْ يَرْوِيَهُ يَوْمَ القِيامَةِ) حَديْثٌ صَحيح، صَحَّحَهُ الألْباني في (صَحيح التَرغيبُ الترتيب) (٩٧٥)

واتە: خوای گەورە کردوویەتی بە بڕیار بە سەر خۆیەوە و بەڵێنی داوە، هەر کەســێ کە خۆی تینوو بــکات لەبەر خوا -بە ڕۆژوو بێ- لــە ڕۆژێکی زۆر گەرمادا و هەموو لاشــەی هــاوار بکات بۆ پەرداخێ ئاوی ســارد کەچی ئەم لەبەر خوا نــەی خواتەوە. چونکە بە ڕۆژوە، ئەوە خوای گەورە -ســبحانە و تعالی- کردوویەتی بە حەق بە سەر خۆیــەوە کە لــە ڕۆژی قیامەتا تێراوی بکات!! اللــە أکبر لەو موژدە گەورەیــە. ئــەم تینویەتیــە زۆرەی ئەم مانگی ڕەمەزانــە. کە لەبەر خوا و فەرمانی خوا، ئەو ئاوە ســاردە ناخۆیتەوە. خوای گەورە دەی کاتــە زەمانەتــی ڕزگاربوونت لە تینویەتی مەیدانی مەحشــەر. لەو ڕۆژەدا ئەگــەر هەمــوو دونیــا و ئــەوەی تیایەتی هی تــۆ بێ و بی بەخشــی پەرداخێك ئاوی ســارد ناهێنێ. کە لە تینویەتی و گەرمای ئــەو ڕۆژە ڕزگارت بکات. دەی بــا زیاتر دڵخۆش بین بە ڕۆژوەکەمان و کــە تینویەتی زۆری بۆ هێنایــن. با بیری ئەم فەرمودە بکەینەوە. پاشان گڕی تینویەتی بەوە لەسەر خۆمان کەم بکەینەوە کە بزانین،

**خۆشەویسـترین کەسـی ئێمە، شـەفیعی مەحشـەری ئێمە، محمدی مصطفـی (ﷺ). لە مانگـی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو بـوە و تینویەتی و گەرمـای زۆر ئەوەندە تینی بۆ هێناوە. تاوەکو داوای کردوە کە ئاوی بۆ بێنن و ئەو ئاوە ساردەی بەسەر خۆیدا کردوە. بۆ ئەوەی هەندێ لـە تینویەتیەکەی کەم بکاتەوە. ئەمـەش دەقی فەرمودەکەیە:** (كانَ رَسُـولُ اللهِ (ﷺ)، يَصُبُّ الماءَ عَلى رَأْسِهِ وَهُوَ صائِمٌ مِنَ العَطْشِ أَوْ مِنَ الحَرّ) رَواهُ البُخاري. فتح الباري ج٤ ص١٩٢.

**دەبا ئێمەش بەم تینویەتیەمان بەشـدار بین لەو ناڕەحەتیەی کە خۆشەویسترین خۆشەیستمان دوای پەروەردگارمان. حەزرەتی محمد (ﷺ).**

**٣. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:**(مامِنْ عَبْدٍ يَصُومُ يَوْماً في سَبيلِ اللهِ تَعالى، إلاّ باعَدَ اللهُ بِذالِكَ اليَوْمِ وَجْهَهُ عَنِ النّارِ سَـبعينَ خَريفاً). رَواهُ البُخاريُّ رَقم (١٩٠١) وَمُسْلِم (١١٥٣)

**واتە: هەر بەندەیەك لە پێناوی خوای گەورەدا، یەك ڕۆژ بە ڕۆژوو بێ، ئەوە خوای گەورە بە بەرەکەتی ئەو ڕۆژوەی ئەو تاکە ڕۆژوەوە. دەموچاوی ئەو ڕۆژووگـرە، حەفتا پایز لە ئاگری دۆزەخ دەپارێزێ). ئەی ئەگەر ئەو ڕۆژووگرتنە ڕۆژێك نەبێ و مانگێك بێ، ئەو مانگەش ڕەمەزان بێ، گەرماش بێ، ئەبێ پاداشـتی ئەمە چی بێ؟! ئەوە هەر لێی گەڕێ و هەر خوا خۆی دەزانێ پاداشتی چییە..**

**٩. نۆهـەم لە حیکمەتەکانی ڕۆژوو ئەوەیە: ڕۆژوو تەنها وازهێنان نییـە لە خواردن و خواردنەوە. بەڵکو پێویسـتە ئـەو ڕۆژووگرتنە**

کەسایەتی و شەخصیەتت بۆ درووست بکات. وات لێ بێ، چۆن خۆت لە خواردن و خواردنەوە دەپارێزی، ئاواش خۆت لە هەموو ڕەفتارێکی ناحــەز و دزێــو بپارێزی. وات لــێ بێ نەك هەر حەزت لە شــەڕ و جوێن و ڕووتاڵی و قسە زبری نەبێ، بەڵکو ئەگەر کەسێکیش قسەی ناخۆشــی بەرامبەر کردی، شەڕی پێ فرۆشتی، ڕووی تاڵی تێ کردی، تــۆ بڵێی، من بە ڕۆژووم. ئــەو دەمە پاکەی بە ڕۆژووبوونم ناخەمە ئەو بۆگەنەی تۆوە، من نەك هەر شەڕ نافرۆشم، شەڕیش ناکرم. من تــۆش بانــگ دەکەم بۆ ئەم خوێندنگای ڕەوشــتە بەرزانە، کە خولی مانگــی ڕەمەزانە. بەڵێ وەڵامی کەســی بە ڕۆژوو بــۆ نەیارانی هەر ئەوەندەیە: (إِنِّـي صـائِمٌ. إِنِّـي صـائِمٌ)..

لە فەرمودەیەکی تردا، پێغەمبەرمان (ﷺ) دەفەرموێ: (مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورِ والعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ لِلّهِ حاجَةٌ فِي أَنْ يَدَعَ طَعامَهُ وَشَرابَهُ). رَواهُ البُخارِيُّ (١٩٠٣)

واتە: هەر کەســێ واز لە قســەی نــاڕەوا و درۆ نەهێنێ و واز لە گێڕانەوە و هێنان و بردنی قسەی درۆ و بوختان و غەیبەت نەهێنێ، ئەوە خوای گەورە پێویستی بەوە نییە کە ئەو عەبدە واز لە خواردن و خواردنەوە بێنێ، چونکە نان و ئاو و خۆراك، هەموو کات حەڵاڵە و تەنهــا لە ماوەیەکی دیاریکــراوی نێوان بانگی بەیانی و مەغریبدا، حەرامە. بەڵام غەیبەت و درۆ و بوختان هەموو کات حەرامە. لەبەر ئەوە دەبێ ڕۆژووی ڕەمەزان ببێتە خولێکی مەشقکردن لەسەر ڕەوشت و ڕەفتارە بەرز و پەســندەکان و ئەگەر مرۆڤ توانی یەك مانگ ئاوا بە هێمنی و سالاری و زمانپاکی ژیا، لێی دەبێتە ڕەوشتێکی چەسپاو

و بــه ویســتی خوا مرۆڤێکی زۆر ڕێکوپێکی لــێ دەردەچێ بۆ ژیانی و بەم شــێوەیە کۆمەڵگا پڕ دەبێ لە خەڵکی بەڕێز و لە ســەرخۆ و زمانپاك و دوور لە شــەڕ و هەرا و دەنگەدەنگ. کە مرۆڤ ئەو کاتە هەست بە ئارامی و ئۆقرەیی دەکات، ئەمەش لە مەدرەسەی ڕۆژوودا فێری دەبین إن شاء الله..

١٠. ڕۆژوو دەبێتــە مایــەی ئاســودەیی دڵ و دەروون و لاچوونــی نەخۆشــیە دەرونیەکان، لە فەرمودەی پێغەمبەرماندا (ﷺ) هاتوە کە فەرمویەتی:(لِلْصائِــم فَرْحَتانِ يَفْرَحُهُما: إذا أَفْطَرَ فَرِحَ بِفِطْرِهِ، وَإذا لَقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِهِ). مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

واتە: بۆ ڕۆژووەوان دوو خۆشی و فەرەحی هەیە. کە پێیان دڵخۆش و شــادمان دەبێ، ئەوانیش، هەر کاتێ کــە دەگاتە ئێوارە و بەربانگ دەکاتەوە، زۆر شــادمانە بە ڕۆژووەکەی و ئای چ کاتێکی خۆشــە ئەو چەنــد دەقیقــەی پێش بانگــی ئێوارە، کە هەمووان بــە دەوری ئەو ســفرە و خوانەوەن و چاوەڕێی بانگن، ئەمجا کە بانگ دەدرێ و ئەو پەرداخە ئاوە و خورما و خواردنە چ تام و چێژێکی عەجیبی هەیە و چــۆن مرۆڤ شــادمان دەکات و زۆر گرفت و گرێی دەروونی هەیە دەکرێتەوە و ڕۆژووی ڕەمەزان باشــترین چارەســەرە بۆ نەخۆشییە دەروونیــەکان. خۆشــی دوەمیــش ئەوکاتەیە کە بەنــدەی ڕۆژووەوان دەگاتەوە بە پەروەردگاری و ئای لەو کاتەدا چەند شــادمان دەبێ کە ئەو هەموو چاکە بێ شــومارەی بۆ نوســراوە و تای تەرازووی خێر و چاکــەی وا قورس کــردوە، هیچ خراپەیــەك ناتوانێ بی جوڵێنێ.

نەك هەر بەرامبەری لەگەڵ بکات، پاداشتی ڕۆژوو هیچ کەس نازانێ چەنــدە. خوا نەبێ -چونکە تەنها خوا دەزانێ کە تۆ بە ڕاســتی بە ڕۆژووی یان نا- هەروەکو لە صەحیحی بوخاری و مســلمدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: خوای گەورە خۆی فەرموویەتی (كُلُّ عَمَلِ ابْنِ آدَمَ لَهُ إلاّ الصِّيام، فَإِنَّهُ لِي وَأَنا أَجْزي بِهِ).

بەرێزان: لە مانگی پڕبەرەکەت و ڕەحمەتی ڕەمەزاندا، کەســانێك هەن کە ناتوانن بە ڕۆژوو بن، وەکو:

١. کەسانی پیر و بە تەمەن و بە ساڵاچوو. ئەم کەسە خاوەن قەدر و حورمەتانە، کە خوای گەورە خۆی ڕێز لە مووی سپی و چاوی کز و پشتی چەماویان دەگرێ. ڕوخصەت و مۆڵەتی پێ داون کە لە مانگی ڕەمەزاندا بە ڕۆژوو نەبن. بە تایبەت ئەو بە ســاڵاچوانە کە دەزانن کە ئەگەر بە ڕۆژوو بن. زیاتر بێتاقەت دەبن و چاوکزی و گوێ گرانی و نەخۆشــییەکانیان زیاد دەکات، ئەوە ئەو کەســانە بەرۆژوو نابن و کەفــارەت دەدەن. خــۆ ئەگەر نەبوو نەدار بــوو. خەڵکی خێریان پێ دەکرد. ئەوە لای هەندێ لە زانایانی شەرع کەفارەتیشی لەسەر نییە.

٢. نەخۆش: کە ئەمیش چەند جۆرێکە:

- نەخۆشــی وا هەیە کاتییە، ئەم نەخۆشە پێویستە پارشێو بکات و بە ڕۆژوو بێ، جا هەر کات هەستی کرد کە بێتاقەتە و ڕۆژوەکەی نارەحەتی دەکات، ئەو کاتە با بی شکێنێ.

- نەخۆشی وا هەیە عیلاج و چارەسەری سێ ژەمەی هەیە. ئەمە هــەر بە ڕۆژوو نابێ چونکە ناتوانێ بە هــۆی دەرمان و عیلاجەوە،

ئەم نەخۆشە دوای مانگی ڕەمەزان دەی گرێتەوە هەرکات چاك بۆوە و خوای گەورە شیفای بۆنارد..

- نەخۆشـیش هەیە درێژخایەنە و ساڵ دوانزەی مانگ نەخۆشە. ئەم کەسـەش بە ڕۆژوو نابێ، چونکە نەخۆشییەکەشـی بەردەوامە، قەزای لە سەر نییە و تەنها کەفارەتەکەی دەدات.

ئەی ئەو نەخۆشـانەی دڵتان غەمبارە و چاوتان پڕ لە فرمێسـکە لە تاوی ڕۆژووەکانتان. ئەوە ئێوە (إن شـاء الله) خوای گەورە خۆشـی دەوێن کە بە نەخۆشـی بە سـەری کردنەوە. وە موژدەشـتان لێ بێ، هەر کەسـێ؛ لـە کاتی لەشسـاغیدا، ڕۆژووی ڕەمەزانـی نەخواردبێ ئـەوا لـە کاتی نەخۆشـییەکەیدا ئەجـر و پاداشـتەکەی ناپچڕێ و وەکو کاتی سـاغییەکەی ئاوا لەم نەخۆشییەدا، خوای گەورە پاداشتی تـەواوی ڕۆژوەکـەی ڕەمەزانی بـۆ تۆمار دەکات. لـە فەرمودەیەکی خۆشەویسـتماندا (ﷺ) هاتوە کە فەرموویەتی: (إذا ابْتَلَى اللهُ العَبْدَ بِبَلاءٍ فِي جَسَدِهِ، قالَ اللهُ عَزَوَجَلَّ: أَكْتُبُوا لَهُ صالِحُ عَمَلِهِ). رَواهُ أَحمد في مُسْنَدِهِ (١٢٤٤٢) وَحَسَّنَهُ الأَلْباني في صَحيح الجامع

ئەی ئەو نەخۆشانەی کە ئێستا لەم مانگی ڕەمەزانەدا لە سەر جێگا کەوتوون و ناتوانن هاتووچۆی مزگەوت بکەن، بەڵام تاوەکو ساغ بوون بەشـدارمان بوون لە تەراویح و مەوعیزە و کۆڕی مزگەوت ئەوە بە ویسـتی خوا، لە ماڵی خۆتانەوە، لە سەر جێگای نەخۆشیەکەتانەوە، بەشـدارمانن لە هەر عیبادەتێك کە برا و خوشـکانتان لە مزگەوتا ئەنجامی دەدەن. چونکە ئێوە بە دڵ ئاواتەخوازی مزگەوتن. هەروەکو

کاتێــك کــە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لــە غەزای تەبــوك دەگەڕایەوە، فەرمووی: لە مەدینەدا خەڵکانێك بە جێ ماون، لە هەموو هەنگاوێك کــە ئێوە بڕیوتانە. لــە هەر ئازار و ناڕەحەتیەك کــە لەم غەزایەدا تووشتان هاتووە. لە هەر بەخشینێکدا کە بە ماڵی خۆتان کردووتانە، ئەوانیش کە ئێســتا لە ماڵەوەن و یەك هەنگاو لەگەڵمان نەبوون. لە هەموو ئەجر و پاداشــتێکی لای خوا وەکو ئێمە بەشــدارن و بۆیان نوســراوە. صەحابەکان بە سەرسوڕمانەوە فەرموویان: چۆن چۆنی؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (حَبَسَــهُمْ المَرَضُ) ئەوانە نەخۆشــی وای لێ کــردن کــە نەهێڵێ لەگەڵمان بێن و بەشــدارمان بن ئەینا لە ســەر جێگای نەخۆشــیەکەیانەوە بــە دڵ ئاواتەخواز بــوون کە لەگەڵمان بن. وە فرمێســك دەڕێژن لە پەرۆشــیاندا بۆ هاتنیان بۆ ئەم غەزای تەبوکــە. بەڵام نەخۆشــی دەرفەتی نەداون، لەبەر ئــەوە وەکو ئێمە بەشــداری هەمــوو ئەجــر و پاداشــتێکی لای خوای پــەروەردگارن. لەســەر ئەم فەرموودەیە: ئەی نەخۆشەکان کە بە ساغی هاتووچۆی مزگەوتتان کردوە و تەراویحی ڕەمەزانتان لە مزگەوتا بە جەماعەت کردوە. موژدەتان لێ بێ ئەجر و پاداشتەکەتان وەکو ئەهلی مزگەوت مسۆگەرە و ئێوەش سوپاسی خوای لەسەر بکەن و (إن شاء الله) ڕۆژێ دادێ کە چاکیش دەبنەوە و خوای گەورە شیفاتان دەدات و بەشداری جومعە و جەماعەت و تەراویح و مەوعیزەی مزگەوت دەکەنەوە...

ئەی ئەو کەسانەی کە لەشتان ساغە و توانای ڕۆژووگرتنتان هەیە و هاتووچــۆی مزگەوتتان پێ دەکرێ، توخوا بە فرســەتێکی زێڕینی

بزانن، له عیبادەت و خواناسی و هاتووچۆی مزگەوت کەمتەرخەمی مەکـــەن. بۆ ئەوەی کە ئەگەر ڕۆژێك نەخۆش کەوتی و توانات نەما، ئەجر و پاداشتت هەر بەردەوام بێ، چونکە بە دڵنیاییەوە ژیان هەر گەنجیەتـــی نابێ، هەر لەشســـاغی نابێ، هەر دەســـتبەتاڵی و بۆکران نابێ، دەی بە فرسەتی بزانە و تا لە دەستت نەچوە، باش بچێنە بۆ ئەوەی دوارۆژ باش بدووریتەوە.. وە تۆش ئەی نەخۆش: کە ڕۆژووت پێ ناگیرێ، مانای وا نییە کە لە هەموو خێرێ بێ بەشی. بەڵکو کە شەرع ڕوخصەتی داوی بە ڕۆژوو نەبی، بەلاّم ئاگاداری ئەمانە بە:

١. لە بەرچاوی ئەندامانی خێزانەکەت خواردن و خواردنەوە مەخۆ و هەوڵ بدە چاویان لێ نەبێ.

٢. هاتووچـــۆی مزگەوت بکـــە بۆ تەراویـــح و جەماعەت. چونکە مـــەرج نییە، هەر کەس نەیتوانی ڕۆژوو بگرێ، پەککەوتەی ناوجێگا بێ، نەخێر. زۆر نەخۆش هەیە، بۆ هاتووچۆ عەیبی نییە، بەلاّم بە هۆی نەخۆشـــی گورچیلە و شـــەکرە و فشاری خوێن و گەدە و..هتد، دکتۆری پســـپۆڕی موســـڵمان پێی وتوە نابێ بە ڕۆژوو بی. بەلاّم خۆ پێی نەوتوە هاتووچۆی مزگەوت نەکەی!!

٣. زیکری خوا بکە و صلاّوات لەسەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدە و قورئان بخوێنە یان گوێی لێ بگرە.

٤. دوعا زۆربکە کە خوا شیفات بدات و بتوانی ڕۆژوەکانیش بگری..

ئیمانداران: بابەتێکی گرنگی تر کە پێویســـتە ئاماژەی پێ بکەین ئەوەیە، کە لە ناو دایکان و خوشکانی ئیماندارماندا. ئافرەتی دووگیان

(حامیلــە) هەیە. لەگەڵ ئافرەتی شــیردەر کە منداڵی ســاوای هەیە و شــیری خۆی دەداتێ و شــیری قوتــوی نەداوەتێ، ئــەم ئافرەتانەش حوکمی شــەرعیان لە بارەی ڕۆژووی ڕەمەزانەوە بەم شــێوەیەیە: لە کاتی ســکپڕیدا: ئافرەتی دووگیان لە ســەرەتای سکەکەیدا تاوەکو (٣) مانگــی لە وانەیە تووشــی دڵتێکەڵاتن و ڕشــانەوە ببێت. لەو کاتەدا دەتوانێــت بــە ڕۆژوو نەبێت، تاوەکو حاڵی بــاش دەبێت. بەڵام زۆر ئافرەتــی دووگیــان، لە مانگی (٤ و ٥ و ٦)ی ســکەکەیدا دەتوانێت بە ئاســایی خــۆی بە ڕۆژوو بێــت، چونکە هیــچ کاریگەرییەکی خراپ لەســەر کۆرپەکــەی نابێت.. وە لە مانگــی (٧ و ٨ و ٩)دا، بە تایبەتی لــە وەرزی هاوینــدا، ئافرەتی دووگیان وا باشــترە بە ڕۆژوو نەبێت. چونکە برسیەتی و تینویەتی کار دەکاتە سەر کۆرپەکەی و دەتوانێت لە کاتێکی تردا قەزای بکاتەوە.. بە نیسبەت ئافرەتی شیردەرەوە. کە شــیری خۆی دەدات بە کۆرپەکەی. ئەم ئافرەتەش دەتوانێ بە ڕۆژوو نەبێــت. لە فەرموودەی پێغەمبەری خۆشەویســتمان هاتوە (ﷺ) کە فەرموویەتی:(إِنَّ اللهَ تَبارَكَ وَتَعالى، وَضَعَ عَنِ المُسافِرِ شَطْرَ الصَّلاةِ، وَعَنِ الحامِلِ وَالمُرْضِعِ الصَّوْمَ، أَوِ الصِّيامَ) رَواهُ أَحمد

واتــە: خــوای گەورە بە ڕەحــم و لوتف و بەزەیــی خۆی، نیوەی نوێژی لەســەر کەسی سەفەری لابردوە، لە سەفەری درێژدا. موسڵمان بۆی هەیە نوێژەکانی کورت -قصر- بکاتەوە. نوێژە چوار ڕکاتیەکان دەکات بــە دوو ڕکات. وە خوای گەورە بە لوتف و مەرحەمەتی خۆی لەسەر ئافرەتی حامیلە و شیردەر ڕۆژووی لابردوە).

بەنسـبەت ئـەو ئافرەتە دووگیان و شـیردەرەوە، دوای ئەوەی کە کۆرپەکەی دانا و پاشـان لە شیر بڕایەوە، لە بارەی ڕۆژووەکانییەوە، زاناکانی ئیسلام ئاوایان فەرموە:

- لای پێشـەوا ئەبوحەنیفـە: تەنها قەزای ڕۆژوەکـە دەکاتەوە و ڕۆژوەکان دەگرێتەوە.

- لای پێشەوایان (شافعی و مالك و ئەحمەد). هەم ڕۆژوەکەی قەزا دەکاتەوە و هەم پێویستە ئەگەر هەی بوو، لە جیاتی هەر ڕۆژوویەك فیدیەیەکیش بدات. بە پارە یان بە خۆراك.

- لای (إبـن حزم) هەروەکو لـە کتێبەکەیدا (المحلى) ج٦ ص١٨٤ دا هاتوە، قەزاشی لەسەر نییە و کەفارەتیشی لەسەر نییە!..

کەواتـە: بە پێی تەندروسـتی و توانای لاشـە و بـواری دارایی و ماددی ئافرەتەکە حوکمەکە دەگۆڕێ. جا ئەگەر ئافرەتێکی لەشساغ و بەتوانا و دەوڵەمەند بوو. چاك وایە هەم قەزای ڕۆژوەکانی بکاتەوە و هەم فیدیەش بدات. وە ئەگەر لە ڕووی جەستە و لاشەوە بەهێز بوو، بەڵام ماڵ و سـامان و پارەی نەبوو. ئـەوە با هەر قەزای ڕۆژوەکانی بکاتـەوە و فیدیە نـەدات و ئەو پارە بۆ خۆی و ماڵ و منالی خەرج بکات. وە ئەگەر دوای منالبوونەکە و لە شیربڕینەوەی منالەکەی، لە ڕووی تەندروسـتییەوە وەزع و حالی باش نەبوو، نەخۆش بوو. یان ئەگەر قەزای بکردنایەوە تووشـی نەخۆشی خراپتر دەبوو. وە ماڵ و سامانیشی هیچ نەبوو کە بی دات بە فیدیە، خۆی موحتاج بوو پێی، ئەوە هیچی لەسەر نییە و خوای گەورە (إن شاء الله) لێی دەبورێ.

وە پێویستە ئاماژەش بەوە بکەین، کە هەموو ئەو کەسانەی کە لە ڕووی شەرعەوە ڕێگایان پێ دراوە کە بە ڕۆژوو نەبن، وا چاکترە و وا خێرترە کە ڕوخصەتەکەی شەرع قبوڵ بکەن و بە ڕۆژوو نەبن. نەك خۆیان بخەنە ناو ئازار و ناڕەحەتی و زیادبوونی نەخۆشیەکەیانەوە بـــە هــۆی بـــە ڕۆژووبونـــەوە. چونکـــە خوای گـــەورە پێی خۆشـــە بەندەکانی ڕوخصەتەکانی لێ وەربگرن. پێغەمبەری پێشەوامان (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّ الله تَعالى يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى رُخَصُهُ، كَما يُحِبُّ أَنْ تُؤْتَى عَزائِمُهُ).
رَواهُ أَحمد (١٠٨/٢) وَصَحَّحَهُ الألْباني في صَحيح الجامِع (١٨٨٥)

وە فەرموویەتی (ﷺ) (لَيْسَ مِنَ البِرِّ أَنْ تَصُومُوا في السَّـــفَرِ). رَواهُ البُخاري (١٩٤٦) وَ مُسْلِم (١١١٥)

واتە: بە کاری چاکە و شـــەرعی دانانرێ کەســـێك لە ســـەفەرێکی حەلاڵـــی، زەرووری، دوور و درێـــژ و کاتی گەرمـــا و ناڕەحەتیدا، بە ڕۆژوو بێ. چاك وایە بە ڕۆژوو نەبێ و دوایی قەزای بکاتەوە.

بەڕێزان: خەڵکانێکیـــش هەن، هەر پێش ڕەمەزان نیەتی ئەوەیان هێنـــاوە کە بـــە ڕۆژوو نەبن (خۆیـــان لە موســـڵمانان جیادەکەنەوە) خراپترینی ئەوانەش ئەو کەســـانەن کە بە ئاشکرا جگەرە و خواردن لـــە بازاڕ و دوکانەکان لە بەرچاوی موســـڵمانان دەخـــۆن. ئەمانە لە ڕووی ئەدەبەوە بەرامبەر موسڵمانان و دینی پاکی ئیسلام لە جولەکە خراپتـــرن. چونکە جولەکە کاتی خۆی ڕێـــزی ڕەمەزانیان گرتوە. لە یەکێك لە ڕادیۆ ناوخۆکانی پارێزگای ســـلێمانی هەرێمی کوردستانی خۆماندا گوێم لێ بوو، کە پیاوێك کە تەمەنێکی زۆری هەبوو، باسی

بیرەوەریەکانــی خۆی دەکرد ســەبارەت بە مانگی ڕەمەزان. لە یەکێ لە قسەکانیدا وتی: لە سـلێمانی جولەکەیەك دراوسـێمان بوو، ئەو زەمانە (مطبغ) نەبوو. هەر لە حەوشــەدا چێشـتیان لێ دەنا. بە دار و چیلکە ئاگر دەکرایەوە و خواردنەکە لە حەوشــەدا لێ دەنرا، ئەو جولەکەیەی دراوســێمان، تــا مانگی ڕەمەزان تەواو دەبوو، چێشــتی نیوەڕوانیان لە ماڵ و حەوشــەی خۆیان لــێ نەدەنا!! ئێمەش لێمان دەپرسین: باشە خۆ ئێوە موسڵمان نین و بە ڕۆژوو نین، ئەی بۆچی ئاگر ناکەنەوە بۆ چێشــت لێنانێن و نانی نیوەڕوان ناخۆن؟! دراوسێ جولەکەکەمــان دەی گــوت: لەبەر حورمەتی ئێوەی موســڵمان، چۆن دەبێ ئێوە برسی و تینوو بن و ئێمەش بۆنی چێشت و نانمان بڕوات بە ســەرتاندا و بەوە ئازارتان بدەین! بۆ ئێوەی موسڵمان کەم ڕێز و حورمەتــی ئێمەتان گرتوە، تا ئێمەش لە ڕوومان بێ بێحورمەتی بە خۆتان و مانگی ڕۆژووتان بکەین؟! هەتا ئێوە جەژن نەکەن، ئێمەش نانــی نیوەڕۆ ناخۆین!! بەڵام بێدینەکانــی ئەمڕۆ هەرچی حورمەت بــێ نیانە بەرامبەر ئــەو مانگە پڕ بەرەکەت و خاوەن ڕێزە، دەبینی وەکو گاڵتەپێکردن نوســراوە: بە بۆنــەی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزەوە، چێشــتخانەکەمان بە ڕۆژ کرایەوە و پێشوازی لە میوانەکانی دەکات. واتــە نیوەڕۆ نــان ئامادەیە! ئەمانە پەردە دەگرنــەوە، بەم پەردەیە بــە زمانی حاڵیان دەڵێن: ئێمــە گوناهبارین و خەجاڵەتبارین، ڕووی ڕەشــمان بەو پەردەیە تۆزێ داپۆشیوە، ئەم چینە بێحورمەتە، دەبێ حکومــەت بێحورمەتیان بکات و ســجنیان بــکات و تا دوای ڕەمەزان

بەریـــان نەدات. بۆ ئـــەوەی کەس نەتوانێ بێڕێــزی بەرامبەر مانگی ڕەمەزان، مانگی هاتنە خوارەوەی قورئان بکات. وە هەســـت و ســـۆزی موسڵمانان بریندار بکات..

خـــوای پەروەردگار هیدایەتمان بـــدەی و ڕۆژوو نوێژ و طاعەت و عیبادەتـــی ئەم مانگە و هەموو کاتەکانمان بە لوتف و کەرەمی خۆت لێ قوبڵ بفەرموی.

(رَبَّنـــا تَقَبَّل مِنّا إِنّكَ أَنْتَ السَّـــميعُ العَليم، وَتُبْ عَلَيْنـــا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوابُ الرَّحيم). اللّهُمَّ آمين.

## سەرچاوەکان:


١. قورئانی پیرۆز.

٢. یەکگرتوو. ژ: ٦٠٨، ل٨. شعری، عوسمان سەنگاوی.

٣. منهاج الصالحين في الآداب الإسلامية. محمد عبدالعاطي بحيري. ص١٩٦.

٤. قصص القرآن، عمرو خالد، ص١٨٤.

٥. ڕۆژنامەی کۆمەڵ، پاشکۆی (ماڵ) ژ: ٤، ل٢، ل٣.

٦. گۆڤاری هەیف، ژ: ١٩، ل٣٣.

٧. جُبْريل يَسْأَلُ وَالنَّبيُّ يُجيبُ. الشَّيْخ محمد حَسّان. ج١ ص٥٠١. ص٥٣٧. ص٥٤٣.

٨. مِفْتاحُ الخطابَة وَالوَعْظ. محمد أَحمد العدوي. ص٢٤٤.

وتاری دووەم بۆمانگی ڕەمەزان

# ڕەمەزان مانگی دابەزینی قورئانە

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز: لەناو دوانزە مانگەکەی ساڵدا، تەنها ناوی مانگی پڕ ڕەحمەت و بەرەکەت هاتووە. هەر بۆیە باسی مانگی ڕەمەزان و قورئان کە ناوی مانگی ڕەمەزانی تێدا هاتووە، بە یەکەوە باس دەکرێن. هەرکە وتت مانگی ڕەمەزان یەکسەر قورئان و هاتنە خوارەوەی قورئانت دێتە بەرچاو. وە کە باسی قورئان کرا یەکسەر باسی مانگی ڕەمەزان دێتە بەر دیدە و بیروهۆشی ئیمانداران، خۆ ئاشکرایە گەورەیی مانگی ڕەمەزان لە ناو هەموو مانگەکانی ساڵدا هی ئەوەیە کە قورئانی تێدا هاتۆتە خوارەوە.** ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ ﴾ البقرة: ١٨٥.

**بەڵێ قورئان** ﴿ هُدٗى لِّلنَّاسِ ﴾ **هەموو خەڵکی ڕێنمایی دەکات بۆ زانست، بۆ کردەوەی جوان، بۆ ئاشنابوون بە ڕابردوی گەلان و میللەتان. بۆ شارەزابوون لە داهاتووی گەردوون و زەوی و هەسارەکان و مرۆڤایەتی و سەرجەم بوونەوەران. بۆ بەرچاوڕوونی دەربارەی قیامەت و مەیدانی مەحشەر و بەهەشت و دۆزەخ.. هەرچی زانستە**

و تا قیامەت لە سەر زەویدا دەخوێندرێ و باس دەکرێ لە قورئاندا هاتووە. لەبەر ئەوە گەورەترین و پڕبەرەکەتترین باس کە مرۆڤی ئیماندار لە خزمەتیدا بێ باسی قورئان و باسی ڕەمەزانە. لەبەر ئەوەی:

١. لە ڕۆژی قیامەتدا، ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان و ڕۆژوە سوننەتەکان، لەگەڵ قورئاندا دەبنە شەفاعەتکار و تکاکار بۆ ئەو کەسەی بە ڕۆژوو بوە یان قورئانی خوێندوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (الصِّيامُ وَالقُرْآنُ يَشْفَعانِ لِلْعَبْدِ يَوْمَ القِيامَة، يَقُولُ الصِّيامُ: أَي رَبِّ مَنَعته الطَّعامَ وَالشَّهَوات بالنَّهارِ، فَشَفِّعْني فيه، يَقُولُ القُرْآن: رَبِّ منعته النَّوْمَ باللَّيْلِ فَشَفِّعْني فيه، فَيَشْفَعانِ). حَديْثٌ صَحيح، رَواهُ أَحمد (٦٥٨٩٩) وَصَحَّحَهُ الأَلْباني في المِشْكاة (١٩٦٣)

واتە: لە ڕۆژی قیامەتدا، ڕۆژوو قورئان شەفاعەت و تکا دەکەن بۆ بەندە و ڕۆژوو دەڵێ: ئەی پەروەردگارم من بوومە هۆی ئەوەی کە ئەم بەندەیە. ئەم فڵان کەسە لە ڕۆژدا بە هۆی بە ڕۆژوبوونەوە، هیچ نەخوا و هیچ نەخواتەوە و هیچ ئارەزوویەکی جنسی لەگەڵ حەڵاڵی خۆیدا بەکار نەهێنێ، جا تکای بۆ دەکەم و تۆش ئەی پەروەردگارم تکام وەربگرە، قورئانیش دەفەرموێ: ئەی خوای پەروەردگار، منیش بە شەوان نەم دەهێشت بخەوێت و لە جیاتی پاڵکەوتن و خەوی زۆر و پشوو، ئەم بەندەیە هەڵدەستا منی دەخوێند و دەور دەکردەوە. تکای بۆ دەکەم و تکام وەربگرە. خوای گەورەش شەفاعەتی هەردووکیان وەردەگرێ و ئەو بەندەیە ڕزگاری دەبێ.

ئیمانداران: سەرنج بدەن لە باسی قورئاندا فەرمووی: (باليل) بە

شه‌و منی ده‌خوێنند، له‌به‌ر ئه‌وه هه‌وڵ بده‌ن به شه‌و قورئان بخوێنن. چونکه ڕۆژووه‌وانی تێگه‌یشـتوو، شــه‌وانی به قورئان خوێندن ده‌باته سـه‌ر، نه‌ك به دیــار فیلم و زنجیره ته‌مســیلیه‌وه. کــه به داخه‌وه زۆربه‌یان ده‌خرێنه مانگی ڕه‌مه‌زانه‌وه و وه‌کو ئه‌وه‌ی مانگی ڕه‌مه‌زان مانگی پێشکه‌شـکردنی زنجیره ته‌مسیله‌کان بێ. که زۆربه‌شیان شتی سودبه‌خش په‌خش ناکه‌ن له ناو کۆمه‌ڵدا!!

٢. قورئــان ده‌ریای ده‌ســکه‌وتنی چاکه‌یــه. پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ده‌فه‌رموێ: (مَنْ قَرأَ حَرْفاً مِنْ كِتابِ الله، فَلَهُ بِهِ حَسَـنَةٌ، وَالحَسَنَةُ بِعَشْرِ أَمْثالِها، لاأَقــولُ «الم» حَرْفٌ، ولكِنْ «أَلِفٌ» حَرْفٌ وَ «لامٌ» حَرْفٌ، وَ «مِيمٌ» حَرْفٌ). رَواهُ الترمذي (٢٩١٠) وَصَحَّحَهُ الأَلْباني فِي الصَّحيحَة (٦٦٠)

واته: هه‌ر که‌سێ یه‌ك پیت له کتێبی خوا، که قورئانه بخوێنێ، ئه‌وه چاکه‌یه‌کی بۆ ده‌نووســرێ. چاکه‌ش یه‌ك به (ده) پاداشت ده‌درێته‌وه، پێغه‌مبــه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی: ناڵێم «الــم» حه‌رفێکه، به‌ڵکو «ئه‌لف» پیتێکــه و «لام» پیتێکه و «میم» پیتێکه. هه‌ر به‌خوێندنی «ئه‌لف لام میمی» قورئان، مرۆڤی ئیماندار (٣٠) چاکه‌ی بۆ ده‌نوسرێ!!

زانای گه‌وره و به‌ناوبانگ (مامۆستا سه‌عیدی نه‌ورسی). ده‌فه‌رموێ: به‌رامبه‌ر خوێندنی یه‌ك پیت له قورئان (١٠) چاکه‌ت بۆ ده‌نووســرێ، بــه‌ڵام له ڕه‌مه‌زانــدا به‌رامبه‌ر خوێندنی یه‌ك پیتــی قورئان (١٠٠٠) چاکه‌ت بۆ ده‌نوســرێت. له شه‌وی قه‌دریشــدا به‌رامبه‌ر به خوێندنی یه‌ك پیتی قورئان (٣٠,٠٠٠) چاکه‌ت بۆ ده‌نووسرێت.. سبحان الله له‌م به‌ره‌که‌ته.

٣. خوای گەورە کەباسی قورئان دەکات دەفەرموێ: ﴿ الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴾ البقرە: ١-٢.

جا سەرنج بدەن نافەرموێ: (ذالِكَ القُرْآن). بەڵکو قورئان بە کتێب ناودەبـات. هەروەکو ئەوەمان تێ بگەیەنێ کە: هیچ نووســراوێك لە چاو قورئاندا شایەنی ئەوە نییە پێی بوترێ کتێب. کتێبی ڕاستەقینە تەنها و تەنها قورئانە.

شـێخ عبدالحمیـد کشـك، وتاربێـژ و دلێـر و بوێـری میصری فەرموویەتـی: خـوای گەورە قورئانی پیـرۆزی ناردۆتە خوارەوە کە گەورەتریــن و مەزنتریــن کتێبەکانیەتـی، وە لــە گەورەترین مانگا ناردوویەتیە خوارەوە کە مانگی ڕەمەزانە، وە لە گەورەترین شــەودا ناردوویەتیە خوارەوە کە شەوی قەدرە. (لَيْلَةُ القَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ). وە بە گەورەترین فریشتەدا ناردوویەتی کە جوبریلی ئەمینە. سەرۆك و سەرکردەی هەموو فریشتەکانی ئەرز و ئاسمانە، وە ناردوویەتی بۆ ســەر گەورەترین پێغەمبەر. لە ناو هەموو پێغەمبەرانی (أولوا العزم) دا کە پێغەمبەری پێشەوا، حەزرەتی (محمد المصطفی)یە (ﷺ). وە لە گەورەترین شاری سەرزەویدا ناردوویەتیە خوارەوە کە شاری مەککەیە (لا أُقْسِمُ بِهذا البَلَد). کە شاری مەککە، چەقی هەموو زەوییە لە ڕووی وشـکانییەوە. وەکو ئەوەی کە بسەلمێ قورئان بۆ گشت جیهانە و بۆ هەموو مرۆڤەکانی سەر زەویە.. وە بە مەزنترین زمان ناردوویەتی کە زمانی عەرەبییە. (ڕەنگە کەسـێك بڵێ: خۆ زمانی ئینگلیزی، یەکێکە لە هەرە دەوڵەمەندترین زمانەکانی جیهان. بەڵام زمانی عەرەبی لەو

دەوڵەمەندترە، زمانی عەرەبی خاوەنی نزیکەی (دوو ملیۆن) وشەیە. (هەشـــت) ئەوەندەی زمانی ئینگلیزی وشـــەی تێدایە. زمانی عەرەبی دەوڵەمەندترین زمانە لەناو هەموو زمانەکانی جیهاندا، کە ژمارەیان لە (٥) هەزار زمان زیاترە..

٣. لـــە بەرەکـــەت و گەورەیـــی قورئانە کە هیچ کـــەس لە خێر و بەرەکەتـــی مەحروم نابـــێ، ئەوەی کە خوێندەواریشـــی نییە. ئەوەی کە نازانێ قورئان بخوێنێتەوە. بەڵام خۆ دەزانێ ســـورەتی -الفاتحە- بخوێنـــێ. هەر کـــەس نوێژ بکات دەزانێ فاتحـــە بخوێنێ، وە زۆربەی زۆری موســـڵمانان ســـورەتی -الإخـــلاص- (قُلْ هُوَ اللهُ أَحـــد) دەزانن و لەبەریانە. دەی سورەتی -الفاتحە- دایکی هەموو قورئانە، هەروەکو لە فەرمودەی پێغەمبەردا هاتوە. گەورەترین ســـورەتی قورئانە، سورەتی (الفاتحـــە). وە هەروەهـــا (قُلْ هُوَ اللهُ أَحـــد) گەورەیی و عەزەمەتی ئەو ســـورەتە لە باســـکردن نایـــەت.. دایکـــی ئیمانداران (خاتوو عائیشـــە) بۆمـــان دەگێڕێتـــەوە و دەفەرمـــوێ: پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) پیاوێکی کـــرد بەســـەرکردەی کۆمەڵێك لەصەحابەکان و ناردنی بۆ شـــوێنێك. ئـــەم پیاوە ئیمامەتی نوێژیشـــی بۆدەکردن. جا لە هەموو نوێژەکاندا، لەدوای ســـورەتی -الفاتحە- سورەتی (قُلْ هُوَ اللهُ أَحد)ی دەخوێند. هەر ئەو ســـورەتەی دەخوێند، کاتێ گەڕانەوە صەحابەکان بۆ پێغەمبەری خوایان (ﷺ) باس کرد. کە چۆن ئەم صەحابەیە بەزۆری هەر سورەتی -الاخـــلاص-ی خوێندوە لە هەموو نوێژەکانـــدا، لە کاتی ئیمامەتیدا. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سَـــلُوهُ لأَيِّ شَـــيْءٍ يَصْنَعُ ذالِكَ، فَسَأَلُوهُ،

فَقالَ: لأَنَّها صِفَةُ الرَّحْمنِ، فَأَنا أُحِبُّ أَنْ أَقْرَأَ بِها). واتە: جارێ برۆن پرسیاری لێ بکەن، بزانن بۆ چی ئەمەی کردوە. لە کاتێکدا قورئانی زۆر لەبەرە، کەچی لە هەموو نوێژێکدا هەر (قُلْ هُوَ اللهُ أَحد)ی خوێندوە؟! ئەوانیش چوون بۆ لای و لێیان پرسی بۆچی هەر ئەو سورەتەی دەخوێند؟ صەحابە سەرکردەکە فەرمووی: چونکە ئەو سورەتە صیفەتی خوای هەرە بە بەزەیی -الرحمن-ی تێدایە، بۆیە من حەزدەکەم زۆر ئەو سورەتە لە نوێژەکانمدا بخوێنم.. ئەوانیش هاتنەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا و وەڵامەکەیان بۆ باس کرد. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (أَخْبِرُوهُ أَنَّ اللهَ يُحِبُّهُ) دەبرۆن موژدەی بدەنێ، کە بە ڕاستی خوای گەورەش ئەوی خۆش دەوێ.! الله أكبر، لەو مژدە گەورە و خۆشە. کەسێك لەسەر زوبانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) موژدەی ئەوەی پێ بدرێ کە خوا خۆشی دەوێ، ئەوەش لە بەرەکەتی خۆشویستی ئەو صەحابە بۆ سورەتی (الاخلاص) سوپاس بۆ خوا میللەتی کوردی موسڵمان زۆر باش لەوە تێ گەیشتوە کە سورەتی (قُلْ هُوَ اللهُ أَحد) چەند گەورەیە و لەسەر بنەمای ئەم فەرموودەیە و بە نیەتی ئەوە دەیخوێنین بە بەردەوامی، کە خوا خۆشی بوێن، کە هەرچی کوردی موسڵمانە، بەژن و بەپیاویەوە، بە گەورە و بچووکیەوە، هەمووی سورەتی -الاخلاص-ی لەبەرە و ڕۆژی چەندین جار دەیخوێنێ. هەر لە بەرەکەت و گەورەیی سورەتی (الاخلاص) کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ قَرَأَ قُلْ هُوَ اللهُ أَحَد) عَشْرَ مَرَّاتٍ، بَنَى اللهُ لَهُ بَيْتاً فِي الجَنَّةِ)

حَديْثٌ صَحيح، رَواهُ أَحمد (١٥١٨٣) وَصَحَّحَهُ الأَلْبانِي فِي صَحيح الجامِع: (٦٤٧٢)

واتە: هەرکەسێ (١٠) جار (قُـلْ هُوَ اللهُ أَحَدٌ) بخوێنێ، خوای گەورە خانوویەکی لە بەهەشتا بۆ دروست دەکات!! بەڵێ خانوویەك. کە ئەمڕۆ هیــوا و ئاواتی هەرە گــەورەی خەڵکی خانوویەکی باش و پوختە لە شوێنێکی پاك و گران و بەها و بەنرخدا. بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) زەمانەتــی خانوویەکی بۆ کردووین، بەڵام ئــەم خانوچکانەی دونیا نــا، بەڵکو دەفەرموێ: خانوویەك لە بەهەشــتا، بەڵێ لە بەهەشــتا!! کە هەرچی دونیا هەیە و ئەوەش کە لەم ســەرزەوییە و لە ناو ناخی ئــەو زەویــەدا هەیە لەو هەمــوو نەوت و مەعادنە گــران بەهایانە، هــەر هەمووی بایی نرخی جێگا گۆچانێك نییە لە بەهەشــتا!! واتە خانوویەك لە بەهەشــتا بە هیچ شــتێ لەسەر زەوی و هەموو زەوی بــەراورد ناکرێ! دەی لە بەرەکەتــی ئەم قورئانەیە. بەخوێندنی (١٠) جار ســورەتی (الاخلاص) خانوویەك لە بەهەشــتا بۆ خۆت بەدەست دێنی و تاپۆکەی دەخەیتەوە گیرفانتەوە..

ئیمانــداران: صەحابەیەکی بەڕێز هەبــووە، ناوی (معاویەی کوڕی معاویەی موزەنی) بووە. صەحابەیەك بوو، ناو ناوبانگی دیاری نەبوو. کــە هەموو کەس بیناســێ. وەکو ئەبوبەکر و عومــەر. بەڵام ئەوەی پلەی بەرزی ئەم صەحابەیەی دەرخســت لای خوا، ڕۆژی مردنەکەی بــوو. جــا با بە دڵ گوێ بۆ بەســەرهاتەکەی بگریــن: ئەم صەحابە لەگەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەشــداری غەزاکانی کردوە و گوێڕایەڵ و دامــەزراو بووە. لــە ڕۆژی غەزای تەبووکدا، تووشــی گرانەتایەکی قورس دەبێت و چی هەوڵی چارەســەری بۆ دەدەن، چارەسەری نابێ،

بۆیــە پێغەمبەری خۆشەویســت فەرمانی پــێ دەدات، کە لە مەدینە بمێنێتــەوە. پــاش ماوەیەك بەر لــەوەی پێغەمبەری خــوا (ﷺ) لە غــەزا بگەڕێتەوە و بگاتە مەدینە. ئــەم (معاویە) وەفات دەکات! هەر ئەو شــەوە، جوبریلــی ئەمین دەچێتە خزمــەت پێغەمبەری خوا و لــە خێمەکەیدا هەواڵی دەداتێ کە معاویــە وەفاتی کردوە و فەرموو وەرە لــە دەرەوەی خێمەکــە نوێژی -غائب-ی لەســەر بکە. چونکە دوو ڕیز مەلائیکەت لە ئاســمانەوە دابەزیون، کە هەر ڕیزەی (حەفتا هــەزار) مەلائیکەتە و چاوەڕێی تــۆن ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئیمامەتیان بۆ بکەیت و ئەو حەفتا هەزار مەلائیکەتەشی دەیانەوێ، نوێژی -غائب-ی لەســەر بکەن. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: باشە بە چی گەیشتە ئەو پلە و پایە؟! جوبریل فەرمووی: ئەو پیاوە سورەتی (قُلْ هُوَ الله أَحد)ی زۆر خۆش دەویست و هەمیشە دەیخوێند و دەیوت: ئەو سورەتە سیفەتی پەروەردگاری تێدایە!.

ئیماندارانی بەڕێز: ئەمڕۆ زۆر شتی ئاسانکاری پەیدابووە، بۆ بەهرە وەرگرتن لەقورئان. لەڕێگەی کاسێت و CD و DVD و کۆمپیوتەرەوە. زۆر بەئاســانی فێردەبی. خۆ ئەو کەسەش کە دەڵێ زۆر بە زەحمەت فێردەبم و شتەکانم بیردەچێتەوە، ئەوە (إن شاء الله) دووجار ئەجر و پاداشــتی بۆ دەنوسرێ. هیچ قەیدی نییە ئەگەر وشەیەکیش هەڵە بکەی. چونکە بە ئەنقەســت نییە و لە هەوڵی فێربووندای، گوناهت ناگات. خۆشەویســتمان (ﷺ) فەرموویەتی: (وَالَّذي يَقْرَؤُهُ وَيَتَعْتَعُ فيهِ وَهُوَ عَلَيْهِ شاقٌ، لَهُ أَجْران) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

ئیمانــداری به‌ڕێز: هه‌وڵــی ته‌واوی خۆت بده بۆ ئــه‌وه‌ی بتوانی قورئان بخوێنیتــه‌وه. خۆ ئه‌گه‌ر هه‌وڵت داو فێر نه‌بووی، ئه‌وه گوێ لــه قورئان بگره، به‌مه‌رجێ به‌دڵ و به كوڵ گوێی بۆ بگری ئه‌وه به ویســتی خوا وه‌كو ئه‌وه‌ی خۆت قورئانه‌كه‌ت خوێندبێ، ئاوا پاداشتت بۆ ده‌نوســرێ. صه‌حابه‌ی به‌ڕێزی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) (عه‌بدوللای كوڕی مه‌ســعود) ده‌فه‌رموێ: ڕۆژێكیــان پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) بانگی كــردم و فه‌رمــووی: (إِقْــرَأْ عَلَيَّ). وه‌ره قورئانم بــۆ بخوێنه و منیش گوێت لێ ده‌گرم. منیش وتم: (يارَسُولَ الله أَقْرَأُ عَلَيْكَ وَعَلَيْكَ أُنْزِلَ؟!) ئه‌ی پێغه‌مبــه‌ری خوا (ﷺ) من قورئانت به ســه‌ردا بخوێنــم. له كاتێكا قورئــان بۆ تۆ نازڵ بوه و هاتۆته خــواره‌وه و ئێمه له تۆوه وه‌رمان گرتــوه؟!! فه‌رمووی: به‌ڵێ بۆم بخوێنه. منیش ســوره‌تی -النســاء-م به‌سه‌ردا خوێند، هه‌تا گه‌یشتمه ئه‌م ئایه‌ته:(فَكَيْفَ إذا جِئْنا مِنْ كُلِّ أُمَّةٍ بِشَــهِيدٍ، وَجِئْنا بِكَ عَلى هؤلاءِ شَهِيداً). له‌وكاته‌دا پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) فه‌رمووی: (حَسْــبُكَ الآن). ئێســتا بابه‌س بێت. (فَالْتَفَــتُّ إِلَيْهِ فَإِذا عَيْناهُ تَذْرِفانِ). مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ – بُخاري (٥٠٥٠) وَمُسْلِم (٨٠٠)

واته: سه‌رم هه‌ڵبڕی و ئاوڕم به لای پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) دایه‌وه. بینیم چاوه‌كانی فرمێســك ده‌ڕێژێ. به‌ڵــێ پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) وا له‌گه‌ڵ قورئانه‌كه تێكه‌ڵ ببوو، دیمه‌نه‌كانی قیامه‌تی ده‌هاتنه به‌رچاو لــه‌و كاته‌دا فرمێســك به چــاوه موباره‌كه‌كانیدا ده‌هاتــه خواره‌وه.. ئه‌وه‌نده قورئان خوێندنه‌كه‌ی (ئیبن مه‌سعود) كاری تێكردبوو.

ئیمانداران: به ڕاســتی قورئان به‌ره‌كه‌ته و هه‌ر دانیشــتنێك، هه‌ر

کۆڕ و مەجلیسێك، هەر وتارێك لە سەرەتاوە قورئانی تێدا بخوێندرێ، بە ڕاستی بەرەکەتی تایبەتی بەسەردا دەڕژێ. (دکتۆر مصطفى سعيد الحنـــن) مامۆســـتای زانکۆی دیمەشـــق دەڵێ: بانگەوازکـــردن بۆ خوا خۆئامادەکردنێکـــی ڕوحـــی دەوێ، شـــەونوێژ و خەڵوەتی دەوێت. لە خزمـــەت خـــوادا، تاوەکو قســـەکان لە دڵەوە بێنـــە دەرەوە و لە دڵی بەرامبەرەکەدا جێگیر ببێ، من منداڵ بووم بەیانیان دەهاتم بۆ نوێژ و پاشان لە دوورەوە گوێم دەگرت لە وتاری مامۆستای مزگەوتەکەمان لە دیمەشـــق کە پاش نوێژی بەیانی لە مزگەوتێکی بچووکدا قســـەی خێـــری بۆ ئامادەبوان دەکـــرد. مزگەوت جمەی دەهات و ســـەرجادە و کۆڵانەکانیـــش پڕ دەبوون. ئەگەر یەکێ جێی هەڵتروشـــکانێکی لە نزیکەوە دەست نەکەوتایە. ئەوا ناچار هەر لە دوورەوە دەوەستا و بە بینینی ڕووی نورینی مامۆســـتا فرمێسکی دەڕشت. ئەو مامۆستایەش (شـــێخ علی الدقر)ە، خوا بە بەهەشـــتی بەرین پاداشتی بداتەوە. کە یەکێك بوو لە پیاوچاکانی دیمەشـــق و خوای گەورە تەوفیقی دابوو. بۆ بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلامی لە ئەردەن و لوبنان و فەلەسطین و تورکیادا. ڕۆژێك قوتابیەکی لێی پرســـی: مامۆســـتا ئێمە زۆر وانە بە خەڵك دەڵێینەوە و ئەو کاریگەریە نابینین لەسەر خەڵکەکە وەك وتارەکانی جەنابتان، وە ئەو پەرۆشـــیەی خەڵکی نابینین کە دێن بۆ لای تۆ؟! مامۆســـتاش فەرمووی: کوڕم ئەگەر پێویســـت نەبوایە نەم دەوت، ئەم دەرســـەی من کە دەیبینی بە خوێندنی (١٠) جزم قورئان پاڵپشـــتی کـــراوە، کە لە پێش نوێـــژی بەیانییـــەوە خەریك دەبم تا

كاتى وتاردانەكە و دەڵێم سا بەڵكو بە فەزڵى خوێندنى قورئانەكە موسڵمانان سوود لە وتارەكەم وەرگرن و كاريگەرى هەبێت لە سەريان!!

ئيماندارانى بەڕێز: قورئان دەبێتە خێر و بەرەكەت بۆ دايك و باوكى ئەو كەسەش كە قورئان خوێنە. پێغەمبەرى خوا (ﷺ) فەرموويەتى: (وَيُكْسَى وَالِدَاهُ حُلَّتَيْنِ لا يَقُومُ لَهُمَا أَهْلُ الدُّنْيَا، فَيَقُولان: بِمَ كُسِينَا هَذَا؟ فَيُقَالُ لَهُمَا: بِأَخْذِ وَلَدِكُمَا الْقُرْآنَ). حَديثٌ حَسَنٌ لِغَيْرِه، أَخْرَجَهُ الحاكم (١/٧٥٦) وَحَسَّنَهُ الأَلْبَانِي فِي صَحيح الترغيب (١٤٣٤)

واتە: هەركەسێ قورئانخوێن بێ، لە ڕۆژى قيامەتدا، دوو پارچە قوماشى تايبەت دەدرێ بە دايك و باوكى، كە ئەوەندە بەنرخە، ئەگەر هەموو دونيا لە نرخيان دابنرێ، هێشتا پێيان ناكڕدرێ. ئەوانيش دەڵێن: باشە بە هۆى چييەوە ئێمە ئەم دوو پارچە جلوبەرگ و خشڵە تايبەتيە. ئەم مەدالياى ڕێزلێنانە بە تايبەت بەخشرا بە ئێمە و نەدراوە بە كەسانى تر؟! پێيان دەوترێ: بە هۆى ئەوەوە ئاوا لە لايەن خواوە خەڵاتى تايبەتتان پێ بەخشرا كەمناڵێكى -كچێكى يان كوڕێكى- قورئان خوێنتان هەبوو لە دنيادا!.. دەى وەرن موسڵمانينە با مناڵەكانمان فێرى قورئان بكەين. با كوڕ و كچەكانمان كە هەموويان خوێندەوارى باشيان هەيە، با بياننێرينە ئەو مزگەوتانەى كە وانەى قورئانيان تێدا دەوترێتەوە و لەوێ فێرى قورئان ببن. با بە هۆى ئەو كچ و كوڕە قورئانخوێنانەمانەوە خواى گەورە بە ڕێزلێنانى تايبەت لە قيامەتدا ڕێزمان لێ بگرێ إن شاءالله.

ئيماندارانى بەڕێز: سەرنج بدەن، سبحان الله غەيرى قورئان، هيچ

کتێبێکــی ئاســمانی نییــه، که خه‌ڵکی له بــه‌ری بــێ، وه‌ره ئینجیل هیچ قه‌شه‌یه‌ك به بێ کتێبه‌که نیو لاپه‌ڕه‌ی له‌به‌ر نییه. که‌چی قورئان له منداڵی (٤) ســاڵییه‌وه، تا ته‌مه‌نی (ســه‌د) ساڵی، له ژن و له پیاو، له کوڕ و له کچ، له خوێنده‌وار و نه‌خوێنده‌وار، به ملیۆنه‌ها که‌س هه‌موو قورئانی له‌به‌ره.

جێگای تێڕامان و ســه‌رنجه: ئه‌وه‌نده‌ی دکتۆر و مهندس و کرێکار و خوێنــدکار و ژن و منــاڵ قورئانیان له‌به‌ره، جوزئێکی ئه‌وه مه‌لاو ئیمامــی مزگه‌وت قورئانیان له‌به‌ر نییه!! تا خوای گه‌وره نیشــانمان بدات که ئه‌م قورئانه وه‌کو مه‌سیحیه‌ت و یه‌هودیه‌ت نییه. هه‌ر قه‌شه و زانا ئاینیه‌کانیان هه‌ڵگری بن. له ئیسلامدا زیاتر له مامۆستا و زانا ئاینیه‌کانی، خه‌ڵکان و توێژه‌کانی تری کۆمه‌ڵگا له سینه‌یاندا هه‌ڵیان گرتــووه!! که‌واته ئه‌ی خه‌ڵکینه بزانن ته‌نهــا قورئانه که به که‌ڵکی هه‌مــوو کۆمه‌ڵــگا و هه‌موو که‌س و هه‌موو ته‌مــه‌ن و توێژێك دێت. (هُــدًى لِلْنّاس) نه‌ك هــه‌ر (لِلْعُلَماءِ الدِّيــن)!! وه ده‌بێ ئه‌وه‌ش بڵێین: که دوژمنانی ئیســلام زۆر له‌وه ده‌ترسن ئه‌م قورئانه حوکمی جیهان بــکات. بۆیــه ده‌یانه‌وێ (که بۆیان لاناچــێ و نافه‌وتێ -وه‌کو کابرای ئینگلیــز قورئانه‌که‌ی دڕی- گه‌وره‌که‌ی پێــی وت: مه‌ی دڕه، چونکه موســڵمانان زیاتر شــه‌یدای ده‌بن. به‌ڵام با وای لێ بکه‌ین ته‌نها وه‌کو کتێبێکی پیرۆز ته‌ماشا بکرێ و له‌ناو خۆیاندا کاری ڕۆژانه و حوکمی وڵاتــی پێ نه‌کــه‌ن. بۆیه له شــه‌رعدا ده‌فه‌رمــوێ: (حه‌رامه قورئان له‌سه‌ر کێلی ســه‌ر گۆڕ بنووسرێ!). ته‌نانه‌ت: (وَقَدْ مَنَعَ كَثيرٌ مِنْ أَهْلِ العِلْمِ نَقْشُ جدرانِ المَساجِدِ بِآياتٍ مِنَ القُرْآن الكريم!!). واته: زۆرێك له

زانا گەورەکانی شــەرع، مەنعیان کردوە و ڕێگەیان نەداوە کە دیواری مزگەوتەکان بە ئایەتەکانی قورئان نەقش بکرێ و بڕازێندرێتەوە!!

هەروەها (قاپ قورئانی ئاڵتون) کە لەسەر شێوەی قورئانێکی بچوك لە ئاڵتوون دروستکراوە و ئافرەت وەکو خشڵی تری ئاڵتوون لە ملی دەکات، کــە زۆرجار ئــەو ئافرەتەی ئەو قاپ قورئانــە لەبەر دەکات هەموو جلوبەرگی لاشەی ناشەرعییە!!

یاخود کۆبوونەوە و دانیشتنەکان زۆربەی جار بە چەند ئایەتێکی قورئانــی پیرۆز دەســت پــێ دەکات، کەچی هەموو دانیشــتنەکە و بنەماکانی موخالەفەی قورئانە..

یان: قورئانی بچووك بە زنجیرێکەوە بە ئاوێنەی ناوەڕاســتی ناو ئوتومبێلدا دەکرێ و هەر لەو سەیارەشدا تا ئێوارە گۆرانی ناشەرعی تێدا لێ دەدرێ و قســەی ناشــەرعی تێدا دەگوترێ. هەروەها ئەگەر دەچینــە خزمەت قورئان دەبینین خوای گەورە فەرموویەتی: (لِيُنْذِرَ مَنْ كَانَ حَيًّا) کەچی بۆ مردوان دەخوێندرێ!!

بــەڵام بەڕێــزان: بەخوا قورئـــان بۆ ئەوە هاتــوە کاری پێ بکرێ و مــرۆڤ هەمــوو کار و کردەوەیەکی بە پێــی قورئان بێ، هەروەکو پێغەمبەری پێشــەوامان (ﷺ) تەعامول لەگــەڵ قورئاندا بکەین. کە دایکمان (عائیشــە) دەفەرموێ: (كَانَ خُلُقُهُ القُرْآن).. هەزاران ڕەحمەت لــە مامۆســتای گەورە و جێگای شــانازی میللەتی کوردی موســڵمان (مامۆستا سەعیدی نورسی)، کە ستایشی قورئان دەکات و دەفەرموێ: (هــەروەك قورئانی پیرۆز کتێبی زیکرە، هەروەها کتێبی فیکریشــە،

هەروەك کتێبی حوکمە، کتێبی حیکمەتیشە، هەروەك کتێبی دوعا و پاڕانەوەیە، کتێبی دەعوە و بانگەوازیشـــە، هەروەك کتێبی عیبادەتە، کتێبی شەریعەتیشە)!!.

بەڕێزان: گەورە زانایان ئاوا لە خزمەت قورئاندا بوون:

١. ئیبن ســینا: نووســەری (٢٥٠) کتێبە، یەکەم کەس بوو کە باسی پیســبوونی هەوای کردوە و یەکەم کەســە کە باسی نەخۆشی (سیل) ی کــردوە. ئەوروپا پێی دەڵێن: (ئەمیری پزیشــکان) و لە زانکۆیەکی فەڕەنسیشــدا، پەیکەریان بۆ کردوە. ئیبن ســینا دەفەرموێ: من زۆر ســودم لە ئایەتی: (وَكَذالِكَ جَعَلْناكُمْ أُمَّةً وَسَطاً) کرد و لێیەوە فێربووم کە هەموو شــتێ ئەمسەر و ئەوسەری هەیە و (وَسَـط)یشی هەیە. بە گەڕان بە دوای (وَسَـط)دا، زۆر ئەنجامی باشم بە دەست هێناو، ئەگەر شتێکم لێ عاسی ببوایە دوو ڕکات نوێژم دەکرد دوعام دەکرد تیایدا و دەم گــوت: ئەی ئەو خوایەی کە منــت کردوە بەئوممەتی (محمد) کە ئوممەتی (وَسَــط) و میانڕەوە، هیدایەتم بدە. ســبحان الله، پاش کەمێك ئەو گرێیەم بۆ دەکرایەوە و تێی دەگەیشتم..

٢. عەبباســی کوڕی فیرناس: لە منداڵییەوە لە خزمەت قورئاندا بوو، زۆر وەســتا لە خزمەت ئایەتی ﴿ يَٰمَعۡشَرَ ٱلۡجِنِّ وَٱلۡإِنسِ إِنِ ٱسۡتَطَعۡتُمۡ أَن تَنفُذُواْ مِنۡ أَقۡطَارِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ فَٱنفُذُواْۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلۡطَٰنٖ ﴾ الرحمن: ٣٣.

عەبباسی کوڕی فیرناس پرسیاری کرد: کەس ئەم ئایەتەی هێناوەتە دی؟! وتیان: کەس شــك نابەین. وتی: مــن دەمەوێ یەکەم کەس بم

کە ئەمە بهێنمــە دی. کەوتە بیرکردنەوە و هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی هۆکارێــك بۆ فڕینی ئادەمیزاد و لەســەر خۆی تاقی کردەوە، ڕۆژێك خەڵکی (قُرْطُبە)ی کۆکردەوە و لە بەرزاییەکەوە وەستا و پەڕ و باڵی بۆ خۆی دروســت کردبوو. پێی وتن: ئێوە شــایەتم بــن لە قیامەتا کــە هەوڵم داوە ئــەو ئایەتە بهێنمــە دی!! هەرچەنــدە هەوڵەکەی ســەرکەوتوو نەبوو، نەیتوانی بفڕێت و قاچی شکا. بەڵام تا تەمەنی (٨٠) ســاڵی ژیا و هەوڵەکەی بوو بە بــەردی بناغەی بیرکردنەوە بۆ فڕینی ئادەمیزاد، پاشان فڕۆکە درووست کرا..

بە ڕاســتی ئەمە لە خزمەت قورئاندا بوونە، کە ئاوا ژیانی خۆتی بۆ تەرخان بکەیت.

٣. ئیبــن خەلدون: ئــەم زانــایەش زانســتی کۆمەڵنــاســی (عِلْم الإجْتِمــاع)ی دامەزراند و دەڵێت: ئایەتــی ﴿ قَدْ خَلَتْ مِن قَبْلِكُمْ سُنَنٌ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ ﴾ آل عمران: ١٣٧

دەفەرمــوێ: ئــەم ئایەتە وای لێ کردم کە هەوڵ بدەم جێبەجێی بکەم و ئەم زانستی کۆمەڵناسییەی لەسەر دابمەزرێنم..

دەبــا ئێمــەش ئەمڕۆ لەم ســەردەمی کۆمپیوتــەر و دەزگا پڕ لە وردەکاری و زانســتیانەدا، هــەوڵ بدەیــن کەمێك لــە خزمەت ئەم ئایەتــەدا بیــن: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ وَلَوْ كَانَ مِنْ عِندِ غَيْرِ اللَّهِ لَوَجَدُوا فِيهِ اخْتِلَافًا كَثِيرًا ﴾ النساء: ٨٢

ئیمانداران ســەرنج بــدەن، نافەرموێ: (أَفَلا يَقْــرَأُونَ القُرْآن) بەڵکو دەفەرموێ: ﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ الْقُرْآنَ ﴾، چونکە خوێندنەوە ئەوەیە کە

تۆ هەموو قورئان بخوێنیتەوە، بەڵام دڵت ئاگای لێی نەبێ و لێی ورد نەبیتەوە. بەڵام (تەدەبور) ئەوەیە لەســەر ئایەتێك بوەستیّ. زۆر بە وردی لێی بکۆڵیتەوە، زانستەکانی سەردەمی بخەیتە خزمەت، ئەمجا زیاتــر لە جاران دڵئارامی ڕووت تێ بکات. جا بە ڕاســتی ئەوەی کە قورئان دەفەرموێ: بە وردی لە قورئان ورد ببنەوە و ئەمجا دەگەنە ئــەو قەناعەتــەی کە ئەگەر ئــەم قورئانە لە لایــەن غەیری خواوە بنێردرایــە، ئەوا خیلاف و جیــاوازی زۆری لە ناو خۆیدا تێدا بەدی دەکرا. بە ڕاســتی ئەم ئایەتە و ئەم داواکاریەی خوای پەروەردگار لە بــارەی قورئانەوە، گەورەترین و بەهێزترین بەڵگەیە لەســەر ئەوەی کە ئەم قورئانە دەستی هیچ مەخلوقێکی تێدا نییە چونکە ئەگەر هی بەشەرێك بوایە. ئەوا دەیگوت: واجبە لە سەرتان ئیمانی پێ بهێنن و نەچن لێکۆڵینەوەی لەســەر بکەن و وردی بکەنەوە. لە ترسی ئەوەی نەوەکــو کــەم و کورتیەکی تێــدا دەرکەوێ. چونکە هیچ نوســەرێك نییــە کــە ئەوەندە بە دڵنیاییــەوە بڵێ: ئەم کتێبــە و دانراوەی من خاڵییــە لە هەمــوو هەڵەیەك. بەڵکو جار بۆجار کە ئەو کتێبە چاپ دەکرێتەوە گۆڕانکاری بە ســەردا دەهێنرێ و لێی زیاد دەکرێ و لێی کەم دەکرێ و هەڵەکانی ڕاست دەکرێنەوە و ڕەخنە و نەقدی ئەدەبی و زانستی لەسەر دەکرێ. بەڵام قورئانی پیرۆز، هەر ئەو قورئانەیە و نوقتەیەکی لێ زیاد و کەم ناکرێ و هەر لە سەرەتاوە، خوا فەرمووی: (ذالِــكَ الكِتابُ لارَيْبَ فيه) هەرچی جێگای گومان و دوودڵی و هەڵە و کەم و کوڕی بێ. لەم قورئانەدا نییە.. لێرەشدا لەم ئایەتەی سوڕەتی

(النساء: ٨٢)دا، بە داواکردنەوە، داواکردنێکی پێداگرانە، (أفلا).. داوامان لــێ دەکات کە لێکۆڵینــەوە و لێوردبوونەوەی زۆر وردی لە خزمەتدا بکەیــن و ئەمجا بۆ هەموو کەس بســەلمێ، کە ئەم قورئانە تەنها و تەنها کەلامی خوایە و قسە و گوفتاری هیچ دروستکراوێکی خوای تێدا نییە. دەبا هەندێ لەو بابەتانە سەرنج بدەین: لە زانستی جوگرافیادا باسی وشکانی و دەریامان هەیە. با بزانین قورئان چۆن باسی کردوە؟! وشــەی (البحر) دەریا و ئاوی ســەرزەوی (٣٢) جار لە قورئاندا هاتوە. وشــەی: (البر)یش کە مانای وشــکانییە، (١٣) جار لە قورئاندا هاتوە، جــا ئەگەر بێت و بە یەکــەوە کۆیان بکەینەوە، وشــکانی و ئاوی و بخەینە پاڵ یەکتر بۆ ئەوەی ســەرزەوی تەواو بکەن. دەبینین ٣٢ + ١٣ = ٤٥ جــار دەکات. جــا ئەگەر رێژەی ســەدی وەربگرین و بزانین لە ســەدا چەندی سەرزەوی ئاوە و لەسەدا چەندیشی وشکانییە. ئەوا ئــەم یاســایەی بــۆ بەکاردێنیــن (٣٢ ÷ ٤٥ * ١٠٠ = ٧١٫١١١١١) رێــژەی ســەدی ئــاوی ســەرزەوی. وە: (١٣ ÷ ٤٥ * ١٠٠ = ٢٨٫٨٨٨٨٨) رێــژەی وشــکانی ســەرزەوی. دەی لە پســپۆڕانی جوگرافیا بپرسن بزانن لە بارەی رێژەی رووبەری ئاوی و وشکانی سەرزەوی هەمان رێژەتان پێ ناڵێن؟! دەی باشــە ئەگەر ئەم قورئانە لە لایەن دروســتکەری زەوی و ئاو و وشــکانی ســەرزەوی نەبێ، کێ هەیە ئەم حەقیقەتە ئاوا بە وردی ئامــاژە پێ بکات!! هەر لە زانســتی جوگرافیادا: بابەتێك پێی دەڵێن: بەرز و نزمی رووی زەوی لە ئاســتی رووی دەریاوە، ئەوەندە و ئەوەندەیە. جا باشە ئەوا رووی بەرزی سەرزەوی بە لوتکەی هەرە

شــاخی بەرزی سەرزەوی دیاری کرا. ئەی نزمترین شوێنی سەرزەوی کوێیە. خۆ ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی چەندەها ساڵی و دەیان دام و دەزگا و کارمەند و نەخشە هەیە، هەتا دیاری دەکرێ. بەڵام قورئان بەیەك ئایەت دیــاری دەکات ﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ ﴾ الروم: ٢ - ٣ چەند ســاڵێك لە مەوبەر چەند موســڵمانێك چوون سەرێکیان دا لە گەورە پڕۆفیسۆری جیهانی (باڵمەر) کە پسپۆڕی زانستی جیۆلۆجییە. پێیان وت: ئێمەی موسڵمان باوەڕمان وایە کە نزمترین شوێن لەسەر ڕووی زەوی ئەو شــوێنەیە کە کاتی خۆی ســوپای ڕۆمەکان و سوپای فارســەکان خۆیــان دا بەیەکدا، ئەویش لەلای (بیــت المقدس)ەوەیە. بــە ئامــاژە و بەڵگەی ئەو ئایەتەی کــە دەفەرموێت: ﴿ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ﴿٢﴾ فِىٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ ﴾ الـروم: ٢ - ٣ کــە یەکــێ لــە ماناکانی (أدنی) بــە مانــای (أخفض) دێ. واتە: نزمترین شــوێن. کابرای پڕۆفیســۆر وتــی: نەخێر چەندین شــوێن هەیە لە جیهانــدا لەوێ زۆر نزمترە. موســڵمانەکان وتیان: ئێمە قورئانەکەمان دەفەرموێ: ئەوێ نزمترین شــوێنی سەرزەوییە. (باڵمەر) وتی: وەرن من ئەتڵەستان بۆ دێنم، کە زۆر شــوێن هەیە لەوێ نزمترە، ئەتڵەســەکەی هێنا. ئەو ئەتڵەسەی کە پڕۆفیســۆرەکانی دونیــا کۆبوونەتەوە ئینجا درووســتیان کردوە. بینیان سەهمێك هاتوە بۆ ناوچەی (بیت المقدس) لە لای دەریاچەی طەبەرییــەوە تێیدا نوســراوە: (world lowest point) نزمترین خاڵ لەسەر زەویدا!! پڕۆفیسۆر باڵمەر وتی: ئەم ئەتڵەسە تازەیە بە هۆی ئامێری زۆر زۆر وردەوە دۆزراوەتەوە، کە ئەو ناوچەیە لە فەلەسطین

نزمترین شــوێنە لە ڕووی زەویدا، باشــە ئێوە چۆن زانیتان؟! باشە محمــد (ﷺ) چــۆن زانی؟! کەواتە: خوای گەورە لە پشــت محمدەوە وەستاوە و ئەم قورئانە کەلامی خوایە..

ئیمانداری بەڕێز: وەرە سەرنجی قورئان بدە و بزانە چ وردەکاریەکی عەجیــب و سەرســوڕهێنەری لە بواری بەکارهێنانی وشــەدا تێدایە. تەماشــا دەکەی لە قورئاندا وشــەی (الشــهر) (١٢) جار لــە قورئاندا هاتووە. دەی ساڵیش (١٢) مانگی تێدایە!! وە وشەی (یوم) (٣٦٥) جار لە قورئاندا هاتووە. ڕۆژەکانی ساڵی شەمسیش هەر (٣٦٥) ڕۆژە.

وشــەی (الایــام) (٧) جــار لە قورئانــدا هاتوە، ژمــارەی ڕۆژەکانی حەفتــەش بریتییە لە حەوت ڕۆژ.. وشــەی — الصلــوات (٥) جار لە قورئاندا هاتووە. بە ژمارەی (٥) فەرزەی نوێژ!! باشــە ئەم وردەکاریە بە خوای پەروەردگار نەبێ چۆن ئەنجام دەدرێ؟!

بەڕێزان: با ســەرنجێکی ئەم وشــانە بدەین کە لــە بەکارهێنانی زمانەوانیــدا بەرامبەر یەکتــری دەوترێن. دەبینی لە ڕووی ژمارەوە، بە ئەندازەی یەکتر هاتوون لە قورئاندا: بۆ نموونە:

الدُّنیا - الآخِرَة. هەریەکەیان ١١٥ جار هاتوون لە قورئاندا.

الملائِکَة - الشَیاطین. ٨٨ جار.

صلاح - فَساد. ٥٠ جار.

إبلیس - الأسْتِعاذَة مِنْ إبْلیس. ١١ جار.

زَکاة - بَرَکَة. ٨٨ جار.

رَجُل - إمْرَأة. ٢٤ جار (ئاوا قورئان ژن و پیاوی بە یەکسانی تەماشا کردوە).

الحَياة - المَوْت، ١٤٥ جار.

المَحَبَّة - الطّاعَة، ٨٣ جار (ئەگەر خۆشەویستی هەبوو، گوێڕایەڵی دەبێ).

الشـدَّة - الصَّبْر، ١٠٢ جار.

المُصِبَة - الشُّكر، ٧٥ جار.

النّاس - الأَنبياء، ٥٠ جار.

بـەڵام سـبحان اللـه. هەر لـە قورئاندا ئەو وشـانەی لـە ڕووی زمانەوانییەوە بەرامبەر یەکتر هاتوون، وشـەی (خۆشـی و ناخۆشی) لە ڕووی ژمارەوە لە قورئاندا وەکو یەك نەهاتوون. وشـەی (الیسـر) ٣٦ جار هاتوە لە قورئاندا، لەبەرامبەریدا وشـەی (العسر) (١٢) جار لە قورئانـدا هاتووە. بۆچی؟! چونکە خوا خۆی فەرموویەتی: ﴿ فَإِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ۝ إِنَّ مَعَ ٱلْعُسْرِ يُسْرًا ﴾ الشرح ٥ - ٦

هەموو ناخۆشی و تەنگانەیەك دوو خۆشی بە دوادا دێ! کەواتە:

١٢ + (١٢ + ١٢) = ١٢ + ٢٤ = ٣٦!!

بەڵێ هەموو ناخۆشـییەك دوو خۆشـی بـە دوادا دێ، وە خودی ناخۆشـیەکەش بۆ خۆی، هەموو جارێ کـە مرۆڤ بە بیری هاتەوە. خۆشییەکە. ئەو نەخۆشەی کە دوای چەند ساڵ لە نەخۆشی و ئازار چاك دەبێتەوە. هەموو جارێ کە یادی ناخۆشـییەکەی و ئازارەکانی دەکاتەوە، خۆشییەکی نوێ بەدڵ و دەروونیا دێ. کەواتە: ئەم خۆشییە و دوو خۆشـیش کـە بە دوایا هاتـوە، دەکاتە سـێ بەرامبەری ئەو ناخۆشییەی کە ڕووی داوە!.

هەروەها وشـەی الابرار - چاکەکاران، (٦) جار لە قورئاندا هاتوە.

لــە بەرامبەردا وشــەی الفجار - خراپەکاران، (٣) جار هاتوە، باشــە بۆچی وەکو یەك نەهاتوون؟! والله أعلم لەبەر دوو هۆ:

١. چونکە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ القلــم: ٣٥ - ٣٦. یان دەفەرموێ: (أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجّارِ)؟! نابێ وەکو یەك بن.

وە پاشــان بۆیە چاکەکاران دوو بەرامبــەری خراپەکاران هاتوون لە قورئاندا، وانەیەکی گرنگە بۆمان کە فێرمان دەکات کە پێویستە مرۆڤی ئیمانداری چاکەکار، دوو قاتی مرۆڤی خراپەکار بە هەوڵ و هیمەت بێ، جارێکیــان خەریکی خۆی بێ و خــۆی چاك بکات، جارێکیش خەریکی چاککــردن و ئیصلاحی خراپــەکاران بێت. بە واتایەکی تر، پێویســتە ئیمانــداری چاکەکاری چاکەخــواز، کاتێ کە خراپەکارێــك ڕەفتارێکی نەشــیاوی بەرامبەر نواند، قســەیەکی بێ تام و بــێ بنەمای بەرامبەر کرد. ئەم موسڵمانە چاکەخوازە، نەك هەر خۆی نەخاتە ئاستی ئەوەوە و وەکو ئەو بێ ئەدەبی نەکات. بەڵکو پێویســتە، دان بەخۆیدا بگرێ و کەســایەتی خۆی بپارێزێ. پاشان هەوڵی چاککردنی ڕەفتارە دزێوەکانی ئەویش بدات، بۆیە دەبێ (الابرار) دوو چەندانەی (الفجار) بێت. ئەگەر وەکــو یەك بهاتنایە کەواتە دەبوایە، چاکەکاریش بە بینینی ڕەفتارێکی خــراپ، وەکو خراپەکارانی لێ بهاتایە. کە بە ڕاســتی ئەم وردەکاریەی قورئان، هەمووی بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە قورئان کەلامی خوایە.

ئیماندارانــی بەڕێــز: یەکێ لــە زانایانی (ریاضیــات) دەفەرموێ: خوای گەورە باســی شــاخی جــودی کردوە لە قورئاندا لــە ئایەتی ژمارە

(٤٤)ی ســـورەتی (هود)دا. ئەم زانایـــە دەڵێ: یەقینم هەبوو کە ژمارەی ئایەتەکانـــی قورئانیش زانســـتێکی گەورە و تایبەتیـــان تێدایە. بۆیە کەوتمـــە لێکۆڵینەوە لەســـەر ئایەتی (٤٤) و کێوی جودی. ســـەرەنجام دوای دیراسەیەکی زۆر بۆم دەرکەوت کە هەروەکو لە قورئاندا شاخی جودی لە ئایەتی ژمارە: (٤٤)دا هاتوە، لە سەرزەویش، شاخی (جودی) لەسەر هێڵی درێژی (٤٤) دایە!!! سبحان الله الخالق، ئەو خوایەی زەوی دروست کردوە، هەر ئەو خوایەش قورئانی ناردوە.

بەڵێ ئیمانداران: قورئان باسی دەریا و زەریاکان دەکات، کە ئاوەکان تێکەڵ نابن، (بَيْنَهُما بَرْزَخٌ لايَبْغيانِ).. باسی گەرد و گەردیلە و ئەلکترۆن و پرۆتۆن دەکات. قوئان ئەوەندە بە وردی باسی هەموو شتەکان دەکات. لەباســـی جاڵجاڵۆکـــەدا دەفەرمـــوێ: ﴿كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا﴾ العنكبـوت: ٤١ ئـــەو جاڵجاڵۆکەی تەنافـــەکان دادەنێ مێینەیە. چونکـــە نێرینەی جاڵجاڵۆکە دوای جووتبوون لە لایەن مێینەکەیەوە دەکوژرێ و مێینەکە دوای کوشـــتنی مێردەکەی لەگەڵ گەراکانی دای دەنێ، کاتێ کە گەراکان دەترووکێن لاشـــەی باوکیان دەخۆن. پاشـــان بێچوەکانیش دایکیان لەناو دەبەن!! ســـبحان اللـــە تەنها بە (إتَّخَذَتْ) ئەو هەموو زانیاریەی پێ بەخشین. باشە ئەگەر قورئان کەلامی خوا نەبێـــت کێ زانی کەوا ئەو جاڵجاڵۆکە تەنافکەرە، مێینەیە؟! پاشـــان ســـەرنجی: (أَوْهَنَ الْبُيُوت) بدەن، ســـبحان الله، مەبەســـتی لەوە نییە کـــە ئەو تەنافە بێهێز بێ، بەڵکو زانســـتی تازە ســـەلماندوویەتی کە تەنافی جاڵجاڵۆکە بەو باریکیە خەیاڵیەیەوە، لە بەهێزترین مادەیە:

تەنانەت پشـــتێنەی سەلامەتی ناو ئوتومبێل لەو تەنافی جاڵجاڵۆکەی تێ دەکرێ لەبەر بەهێزی و قایمی. بۆیە قورئان نافەرموێ: لاوازترین داو داوی جاڵجاڵۆکەیـــە بەڵکو باســـی (بیت) ماڵ و خێزان دەکات. کە ئاماژەیە بە وەی کە ماڵی جاڵجاڵۆکە ماڵێکە ڕێز و خۆشەویســـتی و ســـۆزی تێدا نییە. ژن بەزەیی بە مێردەکەیـــدا نایەت و بە قوربانی بەچکەکانی دەکات، بەچکەکانیش وەفایان بۆ دایکیان نابێت و لەناوی دەبەن. ماڵی مرۆڤیش کە ئاوا بوو. ڕێز و حورمەت و خۆشەویســـتی و گەورە و گچکەی تێدا نەما. با کۆشك و ڤێلاش بێ، هەروەکو ماڵی جاڵجاڵۆکە وایە و بێنرخە!! دەی قورئان لەو ڕێگەی باسی باسکردنی جاڵجاڵۆکە و ناونانی سورەتێکی قورئان بە ناوی جاڵجاڵۆکەوە (سُـورَة العَنْكَبُــوت)، لەگەڵ ئەوەی ئەو زانســـتەی پـــێ گەیاندین کە مێینە تەناف دادەنێ نەك نێرینە. ئەوەشـــی پێ ڕاگەیاندین کە ئاگادار بین، ماڵەکانمان ماڵی جاڵجاڵۆکەیی نەبێ، جا دیارە خێزانیش گەورەترین شتە لە کۆمەڵگادا و پێویستی بە گەورەترین باس و خواس هەیە. هەر بۆیە زۆر جێگای خۆیەتی سورەتێکی قورئان ناوی (العنکبوت) بێ، بۆ ئەوەی ماڵەکانمان نەبنە ماڵی جاڵجاڵۆکە، لەم سەردەمە پێشکەوتوەی مـــاددەدا. چونکە بە داخـــەوە زۆر باوك لە لایـــەن ژنەکەیەوە تەنها وەکو جووتبوون و نەوەخســـتنەوە و کاســـپیکردن تەماشـــا دەکرێ و کـــە کاریان پێی نەما، ژنـــی وا هەیە لایەنگـــری منداڵەکانی دەکات و باوکیان پشـــتگوێ دەخات و بەرماوەی منداڵەکانی دەداتێ! پاشان ئەم ئەولادانـــەش هیـــچ وەفایەکیان بۆ دایکیان نابـــێ و لەناوی دەبەن و

خۆشـــیان دەکەونە وێزەی خۆیان. کەواتە: کەســـی بێدین کە ڕەخنە دەگرێ و دەڵێ: بۆچی قورئان باســـی (جاڵجاڵۆکە) دەکات و ســـورەتی -العنکبـــوت-ی هەیـــە. ئەگەر ئـــەو بێدینە زانا بوایـــە و لە قورئان بگەیشـــتایە، هەرگیز تووشـــی ڕەخنەگرتن لە قورئـــان نەدەبوو. ئەو بێدینانەی ڕەخنە لە قورئان دەگرن، نیشـــانەی نەزانی و بێئاگاییانە لە زانستی زیندەوەرزانی و لە زانستی کۆمەڵناسی. بەڵام ئەم قورئانە ڕۆژبەڕۆژ ئیعجازەکانی زیاتر دەردەکەون بۆ زانایان.

ئیمانـــداران: ئێمە کە لە مانگی ڕەمەزانداین و ڕەمەزانیش مانگی قورئانـــە، قورئان لە بـــارەی ڕۆژووەوە دەفەرموێ: ﴿وَأَن تَصُومُواْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ البقرە: ١٨٤

واتـــە: بێگومان ئەگەر بە ڕۆژوو بن، چاکترە و پاداشـــتی زۆرترە ئەگەر بزانن و بتوانن..

تەماشـــاکەن: ﴿إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾ چەنـــد تەعبیرێکـــی جـــوان و سەرنجڕاکێشە، واتە: هەرچەندە ڕۆژووی ڕەمەزان بە ڕواڵەت ئازارە و توونیەتی و برســـیەتیە، بەڵام لە ناوەڕۆکدا هەمووی سود و قازانجە بۆ ڕۆژووەوان ئەگەر لە ڕووی زانستییەوە تەماشای بکەی.

هـــەر لـــە کۆنـــەوە: (ســـوقرات، ئەفلاتـــون، ئەرســـتۆ، جالینۆس) جەختیان کردۆتە سەر ئەوەی کە ڕۆژوو چارەسەرێکی سروشتییە بۆ نەخۆشیەکان..

دکتۆرێکی بەناوبانگیش کە بیانییە و موسڵمانیش نییە، بە ڕۆژوو نەخۆش چارەسەر دەکات و دەڵێت: ڕۆژوو بریتییە لە: کێشێکی کەمتر،

پێســتێکی جوانتر، نەمانی ژەهر، کەم بونەوەی ئــازار و ئیلتیهابات، زیادبوونی تەرکیزکردن، ژمارەی ئەو نەخۆشیانەی کە ڕۆژووان تیایدا پێویســتە بە ڕۆژوو بێ، یان باشــترە بۆی بە ڕۆژوو بێ، یان نەخۆش دەتوانێت تێیدا بە ڕۆژوو بێت، ژمارەیان زیاترە لە (٤٥) نەخۆشی..

دیراسەیەکی وڵاتی نەرویج ئاشکرای کرد کە: ڕۆژوو چارەسەرێکی باشــە بۆ ئیلتیهابی جومگەکان، بــە مەرجێ چوار هەفتە بخایەنێت، ئەمەش هەر هەمان ئەو ماوەیەیە کە ئیسلام دایناوە..

پاشــان ســەرنجی قورئان بدەن، چەند بە جوانی و ناســکی باسی ڕۆژووی ڕەمەزانمان بۆدەکات. کاتێ باسی هاتنی مانگی ڕەمەزان دەکات دەفەرموێ: (فَمَنْ شَــهِدَ مِنْكُمُ الشَّــهْرَ فَلْيَصُمْهُ) بە (الشَّهْر) یەك دانە مانــگ ناوی دەبات. بەڵام کە دێتە ناو مانگی ڕەمەزانەوە دەفەرموێ: (أَيّاماً مَعْدُودات) چەند ڕۆژێکی ژمێردراون!! ســەرنج بدەن چەند بە ناســکی باســی دەکات، هیممەتت بۆ دروســت دەکات، ئەی ڕۆژووگر هەرچەند ڕۆژێکە، تا دەیژمێری بە خۆت نازانی چۆن تەواو دەبێت!!

خۆئەگــەر لەجیاتــی: (أَيّاماً مَعْدُودات) بی فەرموایە (شَــهْراً كامِلاً) کە هەر هەمان کات و مانای دەگەیاند، هەر ســی ڕۆژەکەی دەگەیاند. بەڵام ترسێکی لە دەروونەدا درووست دەکرد کە مرۆڤ خۆی بە خۆی دەگوت: ئای یەك مانگی ڕێك دەبێ بە ڕۆژوو بم!! بەڵام کە دەفەرموێ: چەند ڕۆژێکی دیاریکراوە، مرۆڤ بە بیســتنی وشەی (ڕۆژێك) هەست بە بارســوکی و بە ئاســان وەرگرتن دەکات، (أَيّاماً مَعْدُودات) ئەو ماوە زۆرەت ناهێنێتە بەرچاو. ئەمەش لە جوانیەکانی دەربڕینی قورئانە..

لە کۆتاییدا: ئەی موسڵمانی بەڕێز،

گەر دەتەوێ

تینویەتی گیانت بشکێنێ.

گەر بە تەمای

تەمی ڕەشی دڵەڕاوکێ

لەسەر دڵت بتارێنێ.

ئەگەر شەیدایت

ئاسودەیی

کامەرانی

بۆخۆت و نەوە و گشت گەلت

بەدەست بێنی.

گەر پێت خۆشە

برایەتی، دادپەروەری

بچەسپێنی.

ئەوا برۆ

دیوەخانی دڵت چۆڵ کە و

تەنها قورئانی تیا دانێ....

– اللّهُمَّ اجْعَلْنا مِنْ أَهْلِ القُرْآن، الَّذينَ هُمْ أَهْلُكَ وَخاصَّتُكَ ياأَرْحَمَ الرَّاحِمينَ.
اللّهُمَّ اجْعَلْنا مِمَّنْ يُحِلُّ حَلالَهُ وَيُحَرِّمُ حَرامَهُ. وَيَعْمَلُ بِمُحْكَمِه وَيُؤْمِنُ بِمُتَشابِهِه وَيَتْلُوهُ حَقَّ تِلاوَتِهِ. اللّهُمَّ اجْعَلْهُ شاهِداً لَنا، لاعَلَيْنا ياكَريمُ يارَحْمن يارَحيم.. اللّهُمَّ آمين..

## سەرچاوەکان:

١. ڕەمەزانی پیرۆز و تایبەتمەندیەکانی، نعمان مصطفی حمە رحیم، ل٥٧، ل٥٥، ل١٢.

٢. یسألونك، د.حسام الدین عفانە، ج٣ ص٤٨٦.

٣. ژیانەوە، ئەندازیار عثمان، ل٢٠٩.

٤. الإعجاز العلمی فی القرآن والسنة، نایف منیر فارس، ص٥٢٣.

٥. حقائق علم الحدیث، عبدالرحمن العصافی ج٢ ص١٧٤، ص١٧٧، ص٣٢١.

٦. کۆباسەکانی میحراب، شەمال موفتی، ئامادەکردنی عادل شاسواری ل١٣٠، ل٩١.

٧. لەخزمەت قورئاندا. ئەندازیار عثمان محمد رشید ل٤٠٠، ل٥٣٧.

٨. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین ل٤٠١ (تەفسیری سورەتی - العنکبوت. ئایەتی: ٤١)

٩. بەرەو ئیسلام. ئەندازیار عثمان ل١٩٣.

١٠. شنەی سۆز. شعری جلال الدین نجم الدین ل٤٤.

وتاری سێیەم بۆمانگی ڕەمەزان

## بەخشین

الحَمْدُللّهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعلى آلِه وَصَحْبِه أَجْمَعِينَ:

**ئیماندارانـــی بەڕێـــز: ڕۆژووەوانانی مانگـــی ڕەمەزانی پڕبەرەکەت، سەلام و ڕەحمەتی خوای گەورە لە ئێمە و سەرجەم ئیمانداران بێت إنشاء الله.**

**خۆشەویســـتان: مانگی ڕەمـــەزان ئەو مانگە پیـــرۆزەی کە تیایدا دڵـــەکان ئارام دەگرێت و دەروونەکان ئاســـودە دەبن و مرۆڤەکان بە گشـــتی هەست بە هێمنی و سەکینە دەکەن، ڕەمەزان ئەو مانگەی کە گەردی دڵەکان لادەبات و دڵە ســـپییەکان ســـپیتر و چاوە میهرەکان بە فرمێســـکی تەوبە و سۆز و ئەوینی خودایی گەشتر دەکات. مانگی ڕەمەزان بۆ ئەوە هاتوە کە فێرمان بکات هەست بکەین کە کەسانێك هەن برسین، تینوون، ماندوون، مەحرومن لە زۆرێك لە خۆشیەکانی ژیـــان. بۆ ئەوەی ئێمەش دڵنەواییان بکەین و دەســـتی یارمەتیان بۆ درێـــژ بکەیـــن. بۆ ئەوەی ئەگەر بە درێژایی ســـاڵ لە بیرمان چوون، ئەوا لەم مانگە پیرۆزەدا بێنەوە خەیاڵمان و هەســـت بە ئازارەکانیان بکەین و باری سەرشانیان سووك بکەین.**

**مانگـــی ڕەمـــەزان قوتابخانەیەکی بـــەرزە، پەروەردەمان دەکات لە**

ســەر ئاكاری جوان و وانەی خۆشەویستی و رێزگرتن و میهرەبانی و بەزەیی و بەخشندەییمان فێر دەكات.

مانگی رەمەزان فێری ئابووری و رێزی خەڵاتەكانی خوامان دەكات و لە ئیســراف و دەســتبڵاوی دوورمان دەخاتەوە و پێمان دەڵێت: لە هەر شــوێنێك خواردن و خواردنەوە بە هەدەر دەبرا، ئەوا لە لایەكی تری ئەم زەویە، كەســانێك هەن بە برســیەتی سەر دەنێنەوە. یەكێ لە سیفە دەرەوشــاوەكانی پێشەوا و سەروەرمان حەزرەتی محمد (ﷺ) ســەخاوەت و بەخشــندەیی بووە، بەڵام بەخشــندەییەكەی لە مانگی رەمەزاندا بێوێنە بووە، هەموو لایەكی گرتۆتەوە. جا بۆ ئەوەی ئێمەش بە كردەوە بیســەلمێنین كە بە راســتی لە فەلســەفە و مانای رۆژوو تێگەیشــتووین با رەمەزانەكەمان بە بەخشــندەیی برازێنینەوە. ئەو بەخشــندەییەی كە بە راستی هەر ئەوە هی خۆمانە و بۆ خۆمانە. با بچینــە خزمەت قورئانی پیرۆز بزانین لەو بارەیەوە چی دەفەرموێ، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَنفِقُوا۟ مِن مَّا رَزَقْنَـٰكُم ﴾ المنافقون: ١٠. ببەخشن لەو ماڵەی كە پێمان بەخشیون. یاخود مانای ئایەتەكە وا جوانتر لێك دەدرێتەوە كە بڵێین: ببەخشن لەو رزقەی كە پێمان داون. جا لێرەدا. (إنفــاق) لە (نفق)ەوە هاتووە، واتە: گیرفانی موســڵمان چەند كونێكی تێدایــە. دانەخراوە و هیچی لــێ نایەتە دەرەوە، بەڵكو هەرجارەی بە جۆرێك شتێكی لێ دێتە دەرەوە و دەچێتە دەستی موستەحەقەكانەوە. هەروەها كە دەفەرموێ: (مِمّا رَزَقْناكُمْ) لەوەی كە رزق و رۆزیمان داون. كــە ئاگادارمان دەكاتەوە، ئەوەی دەیبەخشــین هی خۆمان نییە. ئەوە

خوا پێی بەخشـــیوین و لوتفی لەگەڵ کردووین. وە نافەرموێ: ماڵ و سامان و پارەمان پێ داون، بەڵکو باسی ڕزق دەکات کە ڕزق و ڕۆزیش پارە و ســـامان دەگرێتەوە، وخوێندەواری و زانست دەگرێتەوە، ڕێزو حومەرمەتـــی ناو خەڵکـــی دەگرێتەوە، جا خوای گـــەورە دەفەرموێ: چۆنی هەتانە، ئاوا ببەخشن لێی. ئەوەی ماڵی هەیە، با پارە و سامان ببەخشێ. ئەوەی ڕێز و حورمەتی هەیە و قسەی خێری بۆ دەکرێ با بەوە ببەخشێ و دەرگا داخراوەکان لەسەر داماوەکان بکاتەوە.... ئەمجا دەچینەوە خزمەت ئایەتەکە کە دەفەرموێ: ﴿ مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ فَيَقُولَ رَبِّ لَوْلَآ أَخَّرْتَنِيٓ إِلَىٰٓ أَجَلٍ قَرِيبٍ ﴾ المنافقـــون: ١٠. واتە: پێش ئەوەی کە مردن بێت بۆ لای یەکێك لە ئێوە و ئەمجا ئەو کەســـە کە دەزانـــێ ئیتـــر ژیانی تەواو بوو، دەڵێ: پـــەروەردگارا ئای ئەگەر دوات بخســـتمایە بۆ کاتێکی نزیك. هەر ماوەیەکی زۆر کەم مۆڵەتم ببوایە و جـــارێ نەمردمایە.. بۆچی؟! (فَأَصَّدَّقَ وَأَكُنْ مِنَ الصَّالِحِينَ). بۆ ئەوەی بمبەخشیایە و لە چاکەکاران بوومایە..

بەڕێزان: بە ڕاستی ئەم ئایەتە زۆر گرنگە. وە وانەی زۆر گەورەی تێدایـــە. زانایان دەفەرموون: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەســـەر ئەوەی کە بەخشین لە هەموو شتێ زیاتر مرۆڤ بۆی پەشیمانە لە کاتی مردندا.. جارێکـــی تر دەگەڕێینەوە خزمەت ئایەتەکـــە، دەبینین لە ناو تەنها یەك ئایەتدا خوای گەورە لە باســـی بەخشـــینەوە دەمانگوازێتەوە بۆ باسی مردن. بۆ کاتی سەرەمەرگ و لە دونیادەرچوون.. کە لەو کاتەدا مـــرۆڤ داوا دەکات: خوایە گیـــان هەر ئەم جارە کەمێکی تر مۆڵەتی

ژیانم پێ ببەخشەوە، وە یەکەم هەدەف و ئامانجیشی لەم گەڕانەوەیە بۆ ژیان ئەوەیە: (فَأَصَّدَّقَ). تاوەکو ببەخشـــم! ئەمەش لەبەر ئەوەی کە لە هەموو شـــتێ زیاتر کە مرۆڤ لە کاتی ســـەرەمەرگدا بیری لێ دەکاتەوە و خەمی بۆ دەخوات، ئەو ماڵ و سامانەیە کە لە دوای خۆی بەجێی دێڵێ. ئەو ماڵ و سامانەی کە هەموو تەمەنی خۆی بۆ تەرخان کـــرد، تاوەکو کۆی کردەوە و زۆری کرد. کە ئێســـتا بۆ میراتگرەکانی لـــە دوای خۆی بەجێ دەمێنێ، تا لە ژیاندا بوو. دڵی بە دونیا خۆش بـــوو. حەزی دەکرد ماڵ و ســـامانێکی زۆر بۆ منداڵەکانی کۆ بکاتەوە. بەڵام لە ســـەرەمەرگدا خۆی لە هەموو کەس بە لاوە خۆشەویســـتتر دەبێ، لە ژنی، لە منالی، بۆیە لەو کاتەدا بیر دەکاتەوە و دەڵێ: ئای چـــۆن ئەو هەموو ماڵ و ســـامانەم هەبـــوو کەچی نەچووم بی کەمە خێر و خێرات و بی بەخشم و لە تای تەرازووی چاکەکانی قیامەتمی دابنێم. ئای خۆزگایە بمبەخشـــیایە. خۆزگایە بگەڕامایەوە بۆ ژیانی دونیـــا و (فَأَصَّدَّقَ وَأَكُـــنْ مِنَ الصَّالِحِينَ). بمبەخشـــیایە و بچوومایەتە ڕیـــزی چاکەکارانەوە. کە لە مەشـــەوە ئەوە تـــێ دەگەین چاکەکار و بۆخوا صوڵحاوان ئەوانەن کە بەخشندەن.

دەی ئیمانداران با ببەخشین. پێش ئەوەی تووشی ئەو ڕۆژە ببینەوە. کە بە یەقینەوە هەر تووشـــی دەبین، ناشـــزانین کەی تووشـــی دەبین. چونکە مردن بە گەنج و پیری و ساغی و نەخۆشی نییە. ڕەمەزانی پار چەند کەســـمان لەگەڵ بوو لە لەم مزگەوتەدا، ئێستا وا لەژێر خاکدان.. دەی کێ دەڵێ ئێمەش ساڵێکی تر، بگرە، ڕۆژێکی تر ژیانمان ماوە!!.

ئیمانـــداران: با بە یەکەوە گوێ لەو فەرموودە زێڕینەی ســـەردار و ســـەروەرمان -محمـــد المصطفی- (ﷺ) بگرین، کـــە دەفەرموێ: (مَنْ تَصَـــدَّقَ بعَدْلِ تَمْرَةٍ مِنْ كَسْـــبٍ طَيِّبٍ، وَلا يَقْبَلُ اللهُ إلاّ الطَّيِّـــبَ وَإنَّ اللهَ يَتَقَبَّلُها بيَمينِـــهِ، ثُمَّ يُرَبِّيها لِصاحِبِهِ، كَما يُـــرَبِّي أَحَدُكُمْ فَلُوَّهُ، حَتَّى تَكُونَ مِثْلَ الجَبَلِ). رَواهُ البُخاري (١٣٢١)

واتە: هەر کەسێ ببەخشێ بە ئەندازەی دەنکە خورمایەك. لە کار و کەسابەتێکی پاك و حەڵاڵەوە پەیدای کردبێ. کە خوای گەورە خۆی پاکە و شتی پاك نەبێ قبووڵی ناکات. ئەوە خوای گەورە لێی وەردەگرێ و لێی قبووڵ دەکات بە ڕاســـتەی خۆی. پاشـــان بۆ خاوەن خێرەکەی گەورە دەکات، هەروەکو چۆن یەکێ لە ئێوە، جوانووماینێکی بچکۆلە گەورە دەکات و بەخێوی دەکات تا گەورە دەبێت. بەو شـــێوەیە خوای گەورە ئەو خێرە بۆ ئەو کەســـە بەخشـــندە گـــەورە دەکات و تاوەکو بـــە ئەندازەی شـــاخێکی لێ دێ!!. الله أكبر لـــە ڕەحم و بەزەیی خوا بەرامبـــەر بەندەکانی، لە گەورەیی بەخشـــش و صەدەقە لە پێناوی خوادا، کە ئەم فەرمووودەیە هیچ مەجالێك ناهێڵێتەوە بۆ کەسێك کە بڵـــێ مـــن ناتوانم صەدەقە و خێر بکەم، چونکە هیچم نییە، ئایا کێ هەیـــە نەتوانێ بە ئەندازەی دەنکـــە خورمایەك -پارەیەکی زۆرکەم- بـــکات بە خێر؟! بە مەرجێ ماڵەکەت حەڵاڵ بێت. لە ڕۆژی قیامەتا، لەسەر تەرازووی چاکەت یەك شاخ لە چاکە و حەسەنات دەبینی، کە بـــڕوا بە چاوت ناکەی کە ئەوە هەمـــووی چاکەی تۆ بێ، بەڵام پێت دەوترێ، ئەوە پاداشتی ئەو برە خێرە زۆر کەمەیە، کە لەبەر خوا بە

ئیخلاصەوە، لە ماڵی حەڵاڵی خۆت بەخشـــیت لە پێناوی ڕەزامەندی خوادا. ئاوا خوای گەورە بۆی پەروەردە کردی و بۆی چاودێری کردی و ئەو خێرە کەمەت ڕۆژ بەڕۆژ لە زیادبوون و گەشەکردندا بوو. هەتا بوو بەو شاخە گەورە لە حەسەنات و چاکەی قیامەتت..

وە چاك وایە، ئەو خێر و بەخشینە بەنهێنییەوە بدرێ بە هەژارەکە و کـــەس پێـــی نەزانێ. مەگەر مەبەســـتت ئەوە بـــێ خەڵکی تریش یارمەتی بدەن، چونکە تۆ ناتوانی بە تەنها هەموو پێداویســـتیەکانی دابین بکەی. خێرکردنی نهێنی زۆر گەورەیە. چونکە تۆ تەنها پاداشتی خۆتت لە خوا دەوێ و پێویستیت بە مەدح و پیاهەڵدانی کەس نییە، وە لەڕۆژی قیامەتدا یەکێ لەو (حەوت) کەســـەی کە لە ژێر سێبەری عەرشی خوادان، لەو ڕۆژەدا کە هیچ سایە و سێبەرێك نییە. سایە و ســـێبەری خوای گەورە نەبێ، کەســـێکە کە (تَصَدَّقَ بِصَدَقَةٍ فَأَخْفاها حَتَّى لاتَعْلَـــمَ شِمالُهُ ماتُنْفِقَ يَمِينُهُ) رَواهُ البُخـــارِيُّ (٦٢٠) خێری کردوە، ئەوەندە بە نهێنی بەخشـــیویەتی کە بە دەستی ڕاســـتی بەخشیویەتی و دەستی چەپی پێی نازانێ. کورد واتەنی: دەست بەدەست نەزانێ..

بەڕێزان: سوپاس بۆ خوا لەناو میللەتانی کوردی موسڵمانی خۆماندا گەلێ کەســـی ئاوامان هەبوە و هەیە کە بە ڕاستی ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریـــان (ﷺ) جێبەجـــێ کـــردوە و لە خێرکردندا دەســـت بە دەستی نەزانیوە. سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن: ئاوایی (تەنگی سەر) یەکێکە لە ئاواییەکی ژاوەر، بە قەدپاڵی شـــاخێکەوە درووست کراوە، ماڵەکان وەك پلەکان وان بەسەر یەکەوە، ئەوەی لە پشتەوەیە دەڕوانێ

بەسەر ئەوی تردا، ساڵێکیان کە گرانی و نەبوونی بڵاودەبێتەوە، نەك نانی گەنم و جۆ دەست ناکەوێ، بەڵکو نانی هەرزن و دێمێڵش دەست ناکەوێ. هەروەکو بە ناوبانگە ژاوەرۆ داری تووی زۆرە، خەڵکەکە بە هۆی توەوە ژیانێکی مەمرە و مەژییان بەســەر دەبرد. لەم ئاواییەدا، مامۆســتایەك دەبێ بەناوی (مەلا صالح) هاوسێیەکیان سەرنج دەدات لــە کاتی خــەودا، کە زۆربەی خەڵکی خەوتــوون و کەس بە دەرەوە نییە. مامۆســتا دەچێتە سەربانی ماڵەکەی بەردەمیان و ماوەیەك بە ســەر کلاوڕۆژنەکەوە دەبێت و دوایــی دەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆیان!! لەو سەردەمەدا ماڵەکان ڕۆشــناییان تەنها لەکلاوڕۆژنەوە وەردەگرت و پەنجــەرە و دەلاقــە و شووشــە نەبوو. دووکەڵی دار ســوتاندنیان لەو کلاوڕۆژنەوە دەردەچوە دەرەوە... کابرای هاوســێی مامۆستا، ئەم کارەی مامۆســتا مەلا صالح دەبینێ دەکەوێتە دڵەڕاوکێ و گومانەوە، بە تایبەت کە ئەم ڕووداوە شەوێك نییە و دوان نییە و بەشی زۆری شــەوەکان لە کاتی خەوتنا ئەمە پیشــەیەتی. لە دڵــی خۆیدا دەڵێ: مامۆستا پیاوێکی چاکە و دوورە لە هەندێ گومانەوە، ژنی ماڵەکەش پیرەژنێکە و جوان نییە. ئەگەر جوانیش بێت داوێن پاکە. مامۆستاش پیاوی کلۆگرتن نییە. ئەی بۆ دەبێ هەموو شــەوێ مامۆستا لە کاتی خەوتنا بچێتە سەر کلاوڕۆژنەکەی ماڵەکەی بەردەمیان؟! ئەم حاڵەتە وا دەکات، کابرای دراوســێی مامۆستا بڕوات لە ماڵی بەردەم مامۆستا بپرســێ: ئەرێ شــەو لە کاتی خەودا کەســێك دێ بۆ ماڵتان؟ دەڵێ: نەخێــر. دەڵێ: ئەی کەس قســەی لەگەڵ کردوویــت؟ دەڵێ: نەخێر.

دەڵــێ: ئەی لەم ماوەیەدا هیچ شــتێکی وا ڕووی نەداوە ســەرنجتان ڕابکێشــێ؟! دەڵــێ: بەڕێ وەڵڵا، دەڵێ: چ شــتێك؟! دەڵــێ: ماوەیەکە کــە بەیانیان لە خەو هەڵدەســتین، دەبینین لەبــەر کلاوڕۆژنەکەدا دوو کولێــرە دەبینیــن!! کە خــۆت دەزانی کولێرەی نــان لەم کاتەدا چەند بەنرخە. ئینجا هاوســێیەکەی ماموّستا حاڵی دەبێ ماموّستا چ پیاوێکە، دەیەوێ لە ڕۆژی قیامەتدا لە سایەی ڕەحمەتی خوادا بێت، لەو ڕۆژەدا کە هیچ پەنایەك نییە، جگە لە سایەی ڕەحمەتی خوا...

ئیمانداران: دەبا ئێمەش مانگی پیرۆزی ڕەمەزان بکەینە ژووانی خۆشەویســتی و بەخشــندەیی و میهر و تەبایی و خزمەتکردنی میللەتەکەمــان. با بی کەینە مانگی یارمەتیدان و دڵنەواییکردنی هەژاران و بێنەوایان. بۆ ئەوەی لە ئان و ساتی بەربانگ و پارشێودا، دەســتە بچکۆلەکان لە پەروەردگاری مەزن داوای لێخۆشبوونمان بۆ بکەن!..

بەڕێزان: پرســیارێك زۆر جار بیر و ناخی مرۆڤەکان، بە تایبەت موچەخــۆر و داهــات کەمەکانی ئــەم وڵاتەی خۆمــان دەهەژێنێت. ئەویــش ئەوەیــە: ئایا مرۆڤ چۆن بتوانێت پارێــزگاری لە مانەوەی پارە و مووچەکەی بکات و ســەرجەم پێداویستیەکانی ژیانی خۆی و خێزانی پێ دابین بکات و بە دڵخۆشی و کامەرانی ژیان بگوزەرێنێت و تا سەری مانگ پارەی پێ بمێنێت و نەکەوێتە ژێر باری قەرزەوە، لــە کاتێکا ئێمە زۆربەمان لەم وڵاتەدا موچەکەمان بەشــی تا نیوەی مانگ ناکات و هەر زوو ئیفلاس دەکەین و گیرفانمان خاڵی دەبێت!!

کارێکی زۆر سـاده و ئاسـان هەیە هەر کەسـێك ئەنجامی بدات، بە ویسـتی خودا ژیان و گوزەرانێکی باشـتر و خۆشـتری بۆ دەستەبەر دەبێت و لە دونیادا پیت و بەرەکەت بە سەر ماڵ و سامانیدا دەڕژێت و لە دواڕۆژیشـدا سەرفراز و سـەربەرز دەبێت. ئەو کارەش بریتییە لە خێر و خێرات و بەخشـین...!! چۆن؟! کەسـێك بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتـەوە و دەڵێ: من فەرمانبەری یەکێ لە فەرمانگەکان بووم و موچەی مانگانەکەم (٥٠٠) هەزار دینار بوو. بەڵام بە دەست بێپارەیی و بێدەرامەتـی و گرفتـی دارایی و قـەرزەوە دەم ناڵاند، پێم وا بوو تـا مـردن هەر بەو حاڵـەوە دەمێنمەوە و بـار و گوزەرانم بە هیچ شێوەیەك گۆڕانی بە سەردا نایەت. ئەوەی زۆریشی لێ دەترسام ئەوە بوو بمرم و ئەو هەموو قەرز و قۆڵەیەم لە سـەر بێت کە لە جیاتی ئـەوەی کەم بکات ڕۆژ بەڕۆژ زیـادی دەکرد. بە هەرحاڵ ئیدی ئەوە پێویسـتی ژیان و ماڵداریی و خێزانداریە. ئەگەرچی زۆر خۆشـحاڵ و ئاسـودە و کامەرانم لەگـەڵ خێزانەکەمدا و زۆر ڕەچاوی بارودۆخ و گوزەرانـم دەکات، بـەڵام ئـەو هەموو قەرزە زۆرە دەسـتی ناوەتە قورقوڕاگەمـان و ژیانـی لێ تـاڵ کردووین. ڕۆژێکیـان وەك هەموو جارێکی تر، چوومە دەرەوە بۆ پشوودان، سکاڵای حاڵی خۆم بردە لای دۆستێکم کە متمانەی زۆرم هەبوو بە ڕاو بۆچوونەکانی و قسەکانیم بە هەند وەردەگرت. ئامۆژگاری کردم کە مانگانە بڕێك لە موچەکەم بکەم بەخێر و بی بەخشم. منیش پێم وت: هیچ هەیە بیخۆم تاخێر بکـەم؟! کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵەوە، بەسـەرهاتەکەم بۆ خێزانەکەم

گێڕایــەوە، ئەویش وتی: تاقی بکەرەوە ڕەنگە خودا دەرگای خێرمان لێ بکاتەوە. منیش وتم: کەواتە لە مەودوا هەموو مانگێك (٥٠) هەزار دینار لە موچەکەم دەبەخشــم و دەی کەم بە خێر. ئەو کەسە دەڵێ: ســوێند بە خوا دوای ئەوە هەســتم بە گۆڕان کرد لە ژیانمدا، ئیدی ســەرباری قەرزاریش بوومە کەســێکی گەشبین و شــادمان و دەست کــراوە. مووچەکەم دابەش کرد و خێــر و بەرەکەتێك ڕووی تێکردم کە پێشــتر شتی وەهام نەدی بوو. دوای دوو مانگ ژیان و کاروباری خۆم بە شێوەیەك ڕێکخست کە دەمزانی کەی قەرزەکانم تەواو دەبن. بــە فەزڵی خودا، پاش ماوەیەك خزمێکم دەســتی دایە پشــکداری و کاروباری خانووبەرە و منیش بەشــدار و هاوبەشــم بۆ پەیدا دەکرد، هەرکات دەچوومە لای هاوبەشــێك کەســێکی تریشــی نیشان دەدام، ئیدی سوپاس بۆ خوا وام لێ هات هەستم کرد خەریکە قەرزەکانم لە کۆڵ دەبێتــەوە، منیش لە ئاکامی هەوڵ و تەقەلامدا، هەر پارەیەکم دەست بکەوتایە بەشێکیم دەکرد بەخێر..

بەڵێ، کەس تام و چێژی خێر و بەخشین ناکا و نازانێ تەنها ئەو کەسە نەبێ کە تاقی کردۆتەوە.

بەڕێزان: هەندێ جار کە کەسێك دیاریەك یان شتێکی سادەمان پێ دەبەخشــێت، هەست بە خۆشی دەکەین و لە دڵەوە سوپاسی دەکەین. بەڵام ئەگەر ئەو شتەی کە دەبەخشرێت یەکێك بوو لە پێویستیەکانمان کە توانای چنگکەوتنیمان نییە و ئاواتەخوازین بۆی. ئەوا زۆر ئاسودە و شــادمان دەبیــن. بە جۆرێــك ناتوانین و نازانین بــە چ ڕێگایەك

هەست و خۆشحاڵیمان دەرببڕین. ئەم هەستە لە لای کەسی بەخشەر زیاتــرە و کەمتر نییە لە هەســتی خۆشــی وەرگرەکە، جیاوازیکردن لەنێوان بەخشــین و وەرگرتن ئاســان نییە. لەبەر ئەوەی لە جیهانی ڕوحدا یەك مانا دەبەخشێت. کەسی بەخشندە خاوەنی دەستی سپییە و لــە هەمان کاتیشــدا خاوەنی دڵێکی ئاســودە و ویژدانێکی زیندوو خۆشــبەختی و کامەرانی باڵ بەسەر ڕوح و جەستەیدا دەکێشێت. لە کاتێکا وەرگرەکە ئەو هەســتەی هەستێکی مادیانەیە کە لە ئەنجامی دەســتکەوتن یان جێبەجێبوونی پێویســتیەکیدا هاتۆتە دی.. یەکێك لــە هۆکارەکانی بەختــەوەری ئەوەیە بتوانیت پێداویســتی نەدارێك یان بێدەســەڵاتێك پڕ بکەیتەوە. لە پێناوی خزمەتکردندا مۆم ئاسا بســوتێیت و دەورووبەرت ڕووناك بکەیتەوە، ئەگەر ئارەزوومەندیت ببیتە دەستێکی سپی ئەوا هەوڵ بدە یارمەتیدەر و هاوکار و هاوڕێی کەســانی تر بیت. ئەگەر خاوەنی ســەروەت و سامانێکی ئەوتۆ نیت تا پێیان ببەخشــیت، ئەوا بە وشــەی جوان و هیوابەخش بەسەریان بکــەرەوە. ئەگــەر ئەوەشــت لە توانــادا نەبوو، بێبەشــیان مەکە لە زەردەخەنەیــەك، کە زۆر ئاســانە و هەموو کــەس لە توانایدا هەیە. کاریگەری زۆریش لەســەر دڵــی بەرامبەر درووســت دەکات. (جۆرج بەرنادشۆ) دەڵێت: کامەرانی ڕاستەقینە لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هێزی ناوەکیت لە خزمەتی کەســانی تردا بتوێنیتەوە. نەك بگۆڕێت بۆ هێزێکی خۆپەرســت. کە سکاڵای ئەوە بکات. جیهان خۆی تەرخان کردوە بۆ بەختەوەرکردنت...

بەڵــێ بەڕێزان: زۆربەی کات کەســی بەخشــندە ســودمەنترە بە بەراورد لەگەڵ وەرگرەکە. ســەرەڕای خۆشبەختبوونی بە وەی بوەتە هــۆی ئاســوودەکردنی بەرامبەر لەگەڵ ئەوەشــدا، پــەروەردگار بە بەخششێکی گەورەتر بەسەری دەکاتەوە. با لەم بەسەرهاتە ڕابمێنین و بیکەینە نموونەی باسەکەمان: لەبەرنامەی (البیت بیتك)ی کەناڵی ئاســمانی میصری کە (محمد سعد) پێشکەشــی دەکات، لە یەکێك لە زنجیرەکانی ئەم بەرنامەیەدا باســی لــە منداڵێکی هەژاری نەخۆش دەکرد کە پێویستی بە نەشتەرگەری هەیە لە دەرەوەی وڵاتە بۆ ئەم مەبەســتەش پێویســتی بە (١٥٠) هەزار یۆرۆیە!! چونکە حاڵەتەکەی ترسناکە و دەبێت زۆر بەخێرایی و هەرچی زووترە فریای بکەون و لەو نەخۆشــییە ڕزگاری بکەن. لە کاتی پێشکەشکردنی بەرنامەکەدا، گەنجێــك بەناوی (شــەریف) پەیوەندی دەکات و بــڕی (١٥) جونەیهی میســری دەبەخشــێت بە خێزانی مناڵەکە و دەڵێت: دەزانم ئەو بڕە پــارەی مــن زۆر کەمە و شــایەنی ئەوە نییە. بەڵام بۆ کەســێك کە پێویســتی پێ بێت کەم نییە. ئەم لاوە دەڵێت: لە کەمی کۆمەکەکەم داوای لێبوردن دەکەم. چونکە لە ڕاســتیدا من نیوەی ســەروەتەکەم بەخشی!!.. ئەوەی جێی تێڕامان بوو ئەوە بوو کە لە هەمان بەرنامەدا ڕووی دا، ئەویــش هەر ئەو شــەوە کەســێك پەیوەنــدی کرد و پاش بەخشینی بڕێك پارەی باش بۆ نەخۆشەکە (١٠٠٠) جونەیهیشی کردە دیاری بۆ شــەریفی تازەلاو، پاش ئەو بە هەمان شــێوە کەســێکی تر پەیوەندی کرد و بڕێك پارەی بەخشــیە خێزانی مناڵە نەخۆشەکە و

بـــڕی (٥٠٠) جونەیهی کردە دیاری بۆ بەخشـــەری (١٥) جونەیهەکە!!..
لە زنجیرەی دواتردا، پێشکەشکاری بەرنامەکە میوانداری (شەریف)ی کرد، لە میانەی ئەو دیمانەیەدا ڕوون بۆوە کە وێنەگری تەلەفزۆنییە، بەڵام کاری نییە بی کات، بە هۆی ئەمەوە وەزیری ڕاگەیاندن بڕیاری دامەزراندنـــی دەدات بـــە وێنەگری هەمـــان بەرنامە لـــەو کەناڵەدا، شـــەریف بـــاس لەوە دەکات و دەڵێت: من شـــەرمم دەکـــرد کە بڵێم: ئـــەو (١٥) جونەیهە نیوەی هەموو ئەو ســـامانەیە کە خاوەنیم. بەڵام ناچـــار بـــووم هۆکارەکەی ڕوون بکەمەوە لەبـــەر کەمی بڕی پارەکە. شەریف لە قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: لە کاتێکدا کە سەیری بەرنامەکەم دەکرد باسی لە مناڵێکی هەژار دەکرد کە بۆ چارەسەری نەخۆشییەکەی پێویســـتی بە پارەیە بۆ چارەسەرکردنی لە دەرەوەی وڵات، منیـــش دایکم کە بە هـــۆی خەمخواردنی مردنی دوو برامەوە تووشـــی نەخۆشی دڵ هاتووە، لێم پرســـی: دایە گیان چەند پارەمان هەیـــە. ئەویـــش وتی: کەمتر لە (٣٠) جونەیهە و پارەی کارەباشـــمان نـــەداوە. پێم وت: ڕات چییە ئەگەر نیوەی ببەخشـــینە خێزانی ئەو مناڵـــە هەژارە؟! دایکم هەناســـەیەکی قووڵی هەڵکێشـــا و وتی: کوڕم کێ هەیە هەســـت بە ئازاری نەخۆشـــێك بکات زیاتر لەو کەسەی کە خۆشی بە دەست ئازارەوە دەناڵێنێت؟! بی بەخشە کوڕم، بی بەخشە!. دوای بەخشـــینی (١٥) جونەیهی میسری لە لایەن شەریفەوە، لە جێی ئـــەوە دەبێتە خاوەنی (١٥٠٠) جونەیهـــی و دەکرێتە وێنەگری هەمان بەرنامە کە چەند ساڵێك بوو خەونی پێوە دەبینی!! کەواتە: هەرگیز

ڕاڕاو دوودڵ مەبـــە، نائومێد مەبە لەوەی کە دەی بەخشـــیت. لەبەر ئەوەی هەر هیچ نەبێت دەبیتە خاوەنی دەســـتێکی ســـپی کە ئەوەش دەبێتە ئاوپرژێنێك بۆ دڵ و دەروونت و ئاسوودە دەبیت!! بۆ ئەوەی ئاســـوودەیی میوانی هەمیشـــەیی ڕۆحت بێت... بۆ ئـــەوەی دڵئارام و کامەران بیت... ببە خاوەنی دەستێکی سپی..

بەڕێزان: دەچینەوە خزمەت دوو فەرموودەی سەروەرمان (ﷺ) کە موژدە دەدات بە کەسە بەخشندەکان و دڵنیایان دەکاتەوە و زەمانیان دەداتێ کە: هەرگیز ماڵ بە بەخشـــین کەم نـــاکات. بەڵکو بەرەکەتی تـــێ دەکەوێت و فریشـــتەکان دوعـــا و نزا دەکەن بۆ ئەو کەســـانەی کـــە بەخشـــندەن و دڵی هەژاران و نەداران خـــۆش دەکەن. کە خوای گـــەورە زیاتریان پێ ببەخشـــێ، وە بە پێچەوانـــەوە ئەوەی ماڵ کەم دەکاتـــەوە و دەی پووکێنێتەوە و لە گـــەش و نمای دەخات، بریتییە لە دەستقونجاوی و چرووکی و ڕەزیلی، هەروەکو نموونەی بەرچاوی خۆمـــان: موبەریدەیەك کە هـــەوای فێنك دەخاتە ژوورێکەوە. ئەگەر کونێـــك لەو ژوورەدا بێ و هەندێ لەو هەوایە لەو کونەوە دەرچێت، ئایا لە هەوا فێنك و سوودبەخشەکە کەم دەکاتەوە، یان زیادی دەکات و زیاتر ســـوودی لێ دەبینـــرێ، بەبێ هیچ گومانـــێ دەرچوونی ئەو کەمـــە هەوایە لەو کونەوە دەبێتە هۆی جووڵانی هەواکە و بەرەکەت تێخســـتنی و سوود لێبینینی، بە پێچەوانەشەوە، ئەگەر ئەو ژوورەی هەوای موبەریدەکـــەی تێ دەچێ، دەرگا و پەنجەرەی داخرێ و هیچ هەوایەکی لێ دەرنەچێ بە مەبەستی ئەوەی هەوا فێنکەکە هەمووی

لەوێدا کۆببێتەوە و لێی خەســار نەبێ. ئایا سەرەنجامی چی دەبێ؟!
بێگومــان دوای ماوەیەکی کەم هەوای ژوورەکە گەرم دەبێ و بێکەڵك
دەبێ و ســوودی لێ نابینرێ. جا ئایا لێڕۆیشتنی ئەو هەوایە، کەمی
کــردەوە یان زیادی کرد؟! بێگومان پێی زیاد کرد. یان گوڵێك ئەگەر
بە دەرەوە بێ و خەڵکی جوانیەکەی ببینن و بۆنە خۆشــەکەی بۆن
بکــەن لــە دەرەوە بێ و هــەوا و خۆر لێــی بدات. گەشــە دەکات و
زیاد دەکات یان ئەو گوڵەی کە خاوەنەکەی لەبەر خۆشەویســتی بۆی
نەهێڵــێ هیچ کەس بــی بینێ و بۆنی بکات و لێی ســودمەند بێ و
لــە ژورەوە، لــە تاریکیدا، دای بنێ و لە ســندوقێکی تاریکدا بەندی
بکات؟! بێگومان ئەم دڵســۆزیە و نیشــاننەدانی کەســە و نەهێشتنی
ئەوەی کە کەس لێی سودمەند بێ، دەبێتە هۆی لەناوچوونی گوڵەکە
و فەوتانی و هەڵوەرین و پووکانەوەی.. دەی ماڵی دونیاش، ســەروەت
و سامانی دونیاش هەروایە. بە پێچەوانەوە و بەندکردن و شاردنەوە
و لەبەر نەڕۆیشتنی و نەهێشتنی ئەوەی کەس سودی لێ نابینێ، ئاوا
دەپووکێتەوە و نامێنێ. بە پێچەوانەشــەوە بە لێڕۆیشــتنی بەشێکی
دیاریکراو لێی وە سودبەخشــین بە کەســانی تر، بەرەکەتدار دەبێ و
گەشــە و نما دەکا و زیاد دەکات و ئەمجا خاوەنەکەی لێی ســودمەند
دەبــێ. هەروەکو پێغەمبــەری خۆشەویســتمان (ﷺ) وەعدی داوە و
فەرموویەتی: (مامِنْ يَــوْمٍ يُصْبحُ العِبادُ فيهِ إلاّ مَلَكانِ يَنْزِلانِ، فَيَقُولُ أَحَدُهُما:
اللّهُــمَّ أَعْطِ مُنْفِقاً خَلَفــاً، وَيَقُولُ الآخَرُ: اللّهُمَّ أَعْطِ مُمْســكاً تَكفاً) رَواهُ البُخاريُّ
(١٤٤٢) وَمُسْلِم (١٠١٠)

وه لــه فەرموودەیەکی تردا پێغەمبــەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مانَقَصَتْ صَدَقَــةٌ مِنْ مالٍ، وَمازادَ اللهُ عَبْداً بِعَفْوٍ إلاّ عِزّاً، وَما تَواضَعَ أَحَدُلله إلاّ رَفَعَهُ الله) (رَواهُ أحمد: رَقم: ٧١٦٥) وَمُسْلِم (رَقم: ٢٥٨٨).

ئیماندارانی بەرێز: بە ڕاســتی ئەو ماڵ و ســامانەی کە لە پێش خۆمانەوە دەی بەخشین، هەر ئەوە هی ئێمەیە. ئەینا ئەوەی تری بۆ میراتگران دەمێنێتەوە. میراتگرانێك کە زۆربەی کات، نەك هەر خێر و خێرات بۆ مردوەکانیان ناکەن. بەڵکو ئەوەی مردوەکە کە خۆشــی کردوویەتی دەی بڕن و کۆتایی پێ دێنن. با بە یەکەوە ســەرنجێکی ئەم بەسەرهاتە بدەین:

پیاوێکــی ناوداری خاوەن ماڵی دەشــتەکی، لــە ڕۆژێکی بەهاریدا دەچێتە دەرەوە و وشــترەکانی دەبینێ هەموو گوانیان پڕ لەشــیر و خێــر و بێــر بووە و بێچوەکانیان بە دەوریانــدا دێن و دەچن، ئا لە وێــدا ماڵە دراوســێکەیانی بیر دەکەوێتەوە. کە هــەژار و نەدارەو و خێزانێکی زۆری هەیە و تەنیا یەك وشتریشیان نییە. هات بە دڵیدا کە وشترێکیان بە بێچوەکەیەوە پێ ببەخشێ. لە مامۆستایانی ئاینی مزگەوتی بیســتبوو، ئەوەی مرۆڤ دەی بەخشــێ نابێ شتێکی خراپ و بێ ســوود بێ، چونکە خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: (لَنْ تَنالُــوا الــبِرَّ حَتَّى تُنفِقُوا مِمّــا تُحِبُّونَ) واتە: ناگەن بــە چاکەی دڵخواز، تا لە خۆشەویســتترینی ماڵتان نەبەخشن. ئەویش باشترین وشتریانی هەڵبژارد، کە لە هەموویان جوانتر و شــیردارتر بوو. تا پێشــکەش بە دراوسێکەیانی بکات.. ئەم پیاوچاکە ملی وشترەکەی و بێچوەکەی

دهگرێ و دهی بات بۆ ماڵی دراوسێ ههژارهکهی و پێشکهشیان دهکات و دهڵێ: فهرموو برا، ئهمه دیاری منه بۆ ئێوه.. ئای دراوسێی ههژار چهند دڵخۆش دهبێت. له خۆشـیدا نازانێت چی بڵێت!! بهڵێ شـیری وشترهکهیان بۆ خواردنهوه دهدۆشی و به پشتی وشترهکهش بارهداری دههێنـا و دهیفرۆشـت. چاوهڕوانیـان دهکرد تا بێچووهکهشـی گهوره دهبێت و بی فرۆشن. سوپاس بۆ خوا تووشی خێرێکی گهوره بوون. کاتی بههار کۆتایی هات و هاوین به خۆی و گڕه و گهرمایهوه هات. کۆچهرهکان ناچار بوون به شـوێن لهوهڕی ئاژهڵهکانیاندا کۆچ بکهن و بـه شـوێن ئاو و ئاڵفـدا بگهڕێن، ئهم پیاوچاکـهش یهکێك دهبێ لـه وانهی بار دهکات و به شـوێن ئاو و لـهوهڕدا دهڕوات. دهڵێ: لهو بیابانـهدا که من به شـوێن (دحوول)دا دهگـهڕام (دحوول) ئهو چاڵه بیرانهیه که له ههندێ شـوێندا لێ دراون و ئاویان تێدا کۆدهبێتهوه و کـون و کهلهبهری زۆریـان تێدا ههیه و که ئاو کهم دهبێتهوه بهو کون و کهلهبهرانهدا دهگهڕێن تا ههندێ ئاو بۆخۆیان و ئاژهڵهکانیان پهیدا بکهن. ئهو کۆچهره دهشـتهکیانه ئهو شـوێنانه دهزانن و ئاوی لێ دێنن.. کابرای بهخشـندهی پیاوچاك خـۆی دهگێڕێتهوه و دهڵێ: لهگهڵ ههرسـێ کوڕهکهمدا ڕۆیشتم به شوێن (دحوول)دا دهگهڕاین تا ئـاو بۆ خۆمان و ئاژهڵهکانمان پهیدا بکهین. یهکێ لهو (دحوول)انهم دیتـهوه و بـه کوڕهکانم وت: ئێوه له دهرهوه چـاوهڕێ بکهن تا من دێمـه دهرهوه، بـهڵام له ناو تووله ڕێ و لقی ناو کارێزهکهدا سـهری لێ دهشـێوێ و ڕێی لێ ون دهبێ و ناتوانێ بێته دهرهوه. کوڕهکانیشی

تــا مــاوەی (٣) ڕۆژ لــە دەرەوە چاوەڕوانی دەکەن. کــە هەر باوکیان نایەتــە دەرەوە دەڵێن: لەوانەیە باوکمان لەناو کارێزەکەدا مار پێوەی دابێ، یا ســەری لێ شــێوابێ و تیاچووبێــت. کوڕەکانیش تەماحیان کردبــووە مــاڵ و ســامانەکەی باوکیان و بە پەلە دێنــەوە و ماڵ و میراتەکــەی بەش دەکەن. کوڕە ناوەنجیەکــە بە براکانی تری دەڵێ: ئەو وشــترەتان لە بیرە کە باوکم بە خــۆی و بێچوەکەیەوە دای بە دراوسێکەمان؟! ئەو دراوسێیەمان شایەنی ئەوە نییە و با ئەو وشترە و بەچکەکەی لێ بسەنینەوە!! لەبەر حورمەتی قسەکەی باوکیشمان، وشترێکی گەڕی بدەینێ، بۆیە دەڕۆن بۆ گیانی دراوسێ هەژارەکەیان و پێــی دەڵێــن: کاکە وشــترەکە و بێچوەکەیمان بۆ بکــەرە دەرەوە.. ئەویش پێیان دەڵێ: کاکە گیان، باوکتان ئەو وشــترەی پێ بەخشیوم و ئێســتاش شــیرەکەی نان و ئاو و پێخۆرمانــە و خواردنی نیوەڕۆ و ئێوارەمانــە.. ئەوانیش پێی دەڵێن: تــا زووە بۆمان بکەرە دەرەوە، ئەم وشترەشــمان بۆ هێناویت لە جیاتی ئەو. ئەوە بۆ تۆ چاکترە تا دوامان بخەیت. دەنا بە زۆر ڕای دەکێشــین و هیچیشــت نادەینێ لە جیاتیــدا!! ئەویش پێیان دەڵێ: ســکاڵای خۆم لە لای باوکتان دەکەم، لای ئەو شــکاتتان لێ دەکەم.. کوڕەکان دەڵێن: بڕۆ شــکاتی لەلا بکە.. باوکمان مرد!! ئەویش دەڵێ: چۆن، هەر بە ڕاست مرد؟! ئەی بۆچی من نەمزانی؟! دەڵێن: لەو بیابانەدا ڕۆشتە ناو یەکێك لە کونەکانەوە و ئیتر ســەری نەهێنایەوە و دیار بــوو کە مردوە و نەماندۆزیەوە!! دراوســێ هەژارەکەیان دەڵێ: ئەوە وشــترەکەتان ببنــەوە بۆ خۆتان،

وشـــتری ئێـــوەم ناوێ. بـــەڵام تکاتان لێ دەکەم ئـــەو کونە (دحول)ەم پێ نیشـــان بدەن کە باوکتانی تێ چـــووە!.. ئەوانیش لەگەڵ خۆیاندا دەیبەن بۆســـەر ئەو چاڵەی باوکیانی تێچوو بوو. ئەوان دەڕۆنەوە بۆ خێوەتەکـــەی خۆیان و پیاوەی دراوســـێیان بەجێ دێڵن. ئەمیش ئەو چەند گوریسەی هێنابووی پێکیانەوە دەبەستێ و سەرێکی گوریسەکە لـــە دەم دەرچەی دحولەکەوە قایـــم دەکات و دادەبەزێتە خوارەوە و مۆمێـــك هەڵدەکات و لە سەرپشـــت و لە ســـەردەم دەڕوات تا دەگاتە جێگایـــەك، بـــە چنگەکڕێ دەڕوات و لە هەندێ شـــوێندا بە تلانەوە دەڕوات. پاشـــان بۆنی تەڕەشـــێ دەکات و ناڵەناڵێك دەبیســـتێ، لەناو ئـــەو تاریکە ئەنگوســـتە چاوەدا بە دەم ناڵەناڵەکـــەوە دەڕوات و لێی نزیك دەبێتەوە، دەستی بەر قوڕ دەکەوێت، دواتر بە قاچی مرۆڤێك. دەســـتی لێ دەدات، هێشـــتا گەرمی تیاماوە و هەناسە دەدات. ئەمیش چاوی دەبەســـتێت و گوریســـەکەی تێ دەبەســـتێ و ڕای دەکێشـــێ و زۆر بەزەحمـــەت و نارەحەتی لەناو کارێزەکـــە دەری دێنێ. بە هۆی گوریســـەکەوە سەری لێ تێك ناچێ و دەزانێ بە کوێدا هاتوە. بەهەر حاڵێك بێ دەی گەیەنێتە دەمی چاڵەکە. خورما و ئاوی دەداتێ و دەی دات بە کۆڵیدا و دەی هێنێتەوە بۆ ماڵی خۆی. جارێکی تر ژیان سەری دەکێشێتەوە بۆ جەستەی هاوڕێکەی. لەگەڵ ئەوەدا هێشتا مناڵەکانی کابرا بەمە نازانن. ئێنجا دراوســـێکەی لێی دەپرسێ: توخوا پێم بڵێ چـــۆن توانیت مـــاوەی هەفتەیەك لەژێر ئەو زەویـــەدا، بەو تاریکیە بژیت؟! پیاوە بەخشـــندەکەش دەڵێ: شـــتێکی زۆر سەیرم بینی، بۆت

دەگێڕمەوە. کاتێ ڕۆیشـــتمە ناو دحولەکـــەوە (کارێزەکەوە) لە ناوەوە پەلوپـــۆی زۆری لێ ببـــۆوە و ڕێ و تولەڕێی زۆری لێ کەوتەوە. ڕێم دەرنەکرد و ســـەرم لێشێوا.. گوتم: شەو لە ناو ئەو ئاوەدا دەمێنمەوە و تێر ئاو دەخۆمەوە، بەڵام برســـیەتی زۆری بۆ هێنام، خۆت دەزانی برســـیەتیش ڕەحم ناکات و ئاویش بە تەنیا بەس نییە. برســـیەتی پاش سێ ڕۆژ تەواو یەکی خستم. کاتێ کە من لە سەرپشت کەوتبووم و توانـــای جمووجۆڵـــم نەمابوو. هـــەرکات چاوەڕوانی مردنم دەکرد، خۆم تەسلیم بە خوا کرد. بەرچاوم تاریك بوو. هیچم نەدەبینی، وام هەســـت دەکرد لەکاتی ژەمەکاندا کەســـێك کاسەیەك شیرم بۆدێنێ و دەی کات بە دەممەوە و تێری لێ دەخۆمەوە و دەڕوات. ڕۆژانە ســـێ جار ئەم هەســـتەم بۆ درووســـت دەبوو. بەڵام ئەوە دوو ڕۆژ بوو لێم بڕابـــوو. نەم دەزانی هۆی چی بـــووە!!! دەڵێ: منیش پێم گوت ئەگەر هۆی بڕان و نەمانەکەی بزانی، سەرت سوڕ دەمێنێ!، کوڕەکانت پێیان وابوو تۆ مردوویت، هاتن بۆ لام و ئەو وشـــترەیان لێ سەندمەوە کە خوا شیرەکەی بۆ تۆ دەنارد!!!

بەڵێ ئیمانداران: موســـڵمان لە ســـایەی خێر و صەدەقەکەیدایە و خـــوا بە هۆی خێرەکەیەوە لە مردنـــی خراپ دەی پارێزێ. هەروەکو لـــە فەرموودەی (صحیح)دا هاتوە کە خۆشەویســـتمان، نوری چاومان -محمـــد المصطفـــی- (ﷺ) فەرموویەتی: خێـــر و صەدەقەی نهێنی غەزەبی خوا خامۆش دەکات و سەردانی کەسوکار تەمەن زیاد دەکات و کردەوەی چاکەش خاوەنەکەی لە مردنی خراپ دەپارێزێ).

بەڵێ، کابرای خاوەن ماڵ و سـامانی تەبیعەت سـەخی کە ئەمەی بیسـت، ڕۆیشـتەوە بۆ ماڵی خۆی و کوڕەکانی کۆکردەوە و پێی وتن: واتـان زانی من مـردووم و لە جیاتی خەملێخـواردن و دۆزینەوەی تەرمەکەم، ماڵەکەمتان دابەش کرد بە سەر خۆتاندا؟! بڕۆن هەمووی بێننەوە جێگای خۆی، هەمووی پێ هێنانەوە و ماڵەکەی کرد بە دوو بەشـی ڕێکەوە، نیوەی بۆ خۆی و نیوەی بۆ دراوسێ بە وەفاکەی. کە لـە مردن ڕزگاری کرد.. بەڵێ ئەمە بەرهەمی بەخشـینە کە ئاوا لە دونیـا و قیامەتدا دێتەوە ڕێگامان. دەی بـا ئەو ماڵەی هی خۆمانە خۆشـترمان بوێ لە وەی کە بۆ میراتگرەکانمانی بە جێ دێڵین. با پێش خۆمان بی نێرین و قەبرەکەمانی پێ ڕۆشن بکەینەوە. با پێش خۆمـان بی نێرین و تـەرازووی چاکەمانی پێ قورس بکەین. ئەمڕۆ دونیا و فرسـەتە و وا لەبەر دەسـتدایە، شـەوی تاریکت لە پێشـە، ڕێگەت ئیحتیاجی چرایە.

دەبـا ئیماندارانی بەڕێـز: ئێمەش ئەم مانگـی ڕەمەزانە بکەینە وێسـتگەیەك بـۆ بالآبوونـی ڕوح و گەیاندنـی پەیامی هـاوکاری و یارمەتیدان و برایەتی و بەهێزکردنی خۆشەویستی و پەیوەندیەکانمان. با لەم مانگەدا سەردانی نەخۆش و دەردەدارەکان بکەین و دڵنەواییان بکەین و یارمەتیان بدەین. با لەم مانگەدا سەردانی هەژاران بکەین و دڵخۆشـیان بکەین، با لەم مانگەدا منداڵانی بێباوکمان بیر نەچێت و نازیان هەڵگرین. با لەم مانگەدا خزم و کەسوکارمان بەسەر بکەینەوە -بە تایبەتی هەژارەکانیان- هەواڵیان بپرسین و یارمەتیان پێشکەش

بکەین. با بەربانگ بۆ خێزانە دەستکورتەکان ئامادە بکەین، بۆ ئەوەی ئێـــواران چێژ لە خۆشـــی بەربانگ وەربگرین و لە ڕۆژی دواییشـــدا بەدیـــداری ئەو خودایە دڵخۆش بین کە لە پێناویدا بەخشـــیومانە و بە ڕۆژوو بووین.

## سەرچاوەکان:


١. سلسة الهداية - الإنفاق فی سبيل الله. الاستاذ: عمرو خالد.

٢. گۆڤاری بڕیار. ژ: ١٥، ل١٤، ل٤٢.

٣. ڕۆژنامەی یەکگرتوو. ژ: ٨٧٢، ل١٠ (دەرووی دوای تەنگانە، لە نووســینی: م.حسن پێنجوێنی).

**وتاری چوارەم بۆمانگی ڕەمەزان**

# ليلة القدر

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلامُ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانداران بەڕێز: لە کۆتا هەینی مانگی پڕ بەرەکەتی ڕەمەزانداین. شادمانین و شوکری خوا دەکەین کە تا ئێستا توانیمان بە جوانی لە خزمەت ئەو مانگەدا بین و داواکارین و ئومێدەوارین بە ڕەحمی خوا کە لەم کۆتاییەشدا، بتوانین (وَخِتامُهُ مِسْكٌ) بە جوانترین شێوە عیبادەت و بەندایەتی خوای خۆمانی تێدا بکەین. کە خوای گەورە بەرەکەتی تایبەتی لە ناو مانگە پڕ بەرەکەتەکەتدا خستۆتە بەشی کۆتایی ڕەمەزانەوە. کە بە ڕاستی زیاتر شادمان و دڵخۆشمان دەکات. ئەویش هەدیە و دیاری شەوی قەدرە (لَيْلَةُ القَدْر). کە ئەو شەوە هێندە گەورەیە، یەك سوڕەتی تایبەتی قورئان، ناوی سوڕەتی: ( القَدْر)ەو لەو سوڕەتەدا، باسی هیچ شتێکی تر ناکات جگە لە باسی گەورەیی ئەو شەوە. جا بابچینە خزمەت سوڕەتی ( القَدْر) : بِسْمِ اللهِ الرَّحْمنِ الرَّحيم. إِنّا أَنْزَلْناهُ في لَيْلَةِ القَدْرِ، وَما أَدْراكَ مالَيْلَةُ القَدْرِ، لَيْلَةُ القَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَهْرٍ، تَنَزَّلُ المَلائكَةُ وَالرُّوحُ فيها بإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ، سَلامٌ هِيَ حَتّى مَطْلَعِ الفَجْرِ)..**

بەڕێزان: با بە وردی لە گەورەیی ئەم شەوە بگەین، نەك وا بزانین تەنها نەخەوتنی شــەوێك یان چەند شــەوێکە. بەڵکو شــەوی قەدر، زۆر گەورەترە لە وەی کە تا ئێســتا بیرمان لێ کردۆتەوە، ئەو شەوە تەنها خوای گەورە دەزانێ چەند گەورەیە، چونکە گەورەترین و کۆتا پەیامی خوا کە قورئانە، لەو شــەوەدا هاتۆتە خوارەوە، با لە چەند خاڵێکدا لەو شەوە پیرۆزە بدوێین..

١. ئــەم شــەوە بۆیە خــاوەن ڕێزە و خوای گــەورە خۆی ڕێزداری کردوە. چونکە قورئانی تێدا هاتوە.

٢. باشــە بۆچی (فـي لَيْلَةٍ) بۆچی لەو شــەوەدا بوو؟! ئەی بۆچی لە ڕۆژدا نەبوو؟! ئەمە ئەو وانە گەورەیەمان فێردەکات کە ئیســلام شەوەکەشــی وەکو ڕۆژەکەی ڕووناکە: (تركتُكُمْ عَلى المَحجَّةِ البَيضاءِ، لَيْلُها كَنَهارِها، لايَزيغُ عَنها إلا هالِكٌ).. بەڵێ ئەمە فەرموودەی خۆشەویستمانە (ﷺ) کــە فەرمووی: لە دوای خۆم کە لە ناوتان دەرچووم بە لاشــە، لەســەر ڕێبازێکی ســپی و صــاف و بێگەرد بە جێتــان دەهێڵم، کە شەوەکەشــی وەکو ڕۆژەکەی ڕووناکە. هیچ کەس لەو ڕێگایە لانادات، ئیلــلا بە هیــلاك دەچێت. بەڵێ ئەوە ئیســلامە تاریکیش دەکات بە ڕووناکی، ئیســلام هیــچ پێچ و پەنا و چاوبەســتی و فرت و فێڵ و چاوبەستی تێدا نییە. ئیسلام کە قورئان سەرچاوەیەتی لە شەودا هاتە خوارەوە، تا تێمان بگەیەنێ ئەم دینە، نەك هەر ڕۆژی پرشــنگدارە، بەڵکو شەویشــی پرشنگدارە. پاشان، شەو لە ئیسلامدا چۆن ئارامییە بۆ جەســتەی ماندوو، لە شــەودا چۆن هەموو باڵندە و زیندەوەران

ئارام دەگرن و دنیا بێدەنگ و ئارامە، بۆ موسـڵمانانیش، شـەو کاتی پشـووی ڕوحە و کاتی کار و کەسـابەتی قیامەتە. کاتێ ئیسـراحەت و حەسـانەوەی دڵ و دەروونـە، وەرە تاقی بکەوە، بە دڵ و بە گیان شـەوێك خواپەرسـتی بکە، بزانە، دڵت، ڕوحت چەند پشـووی داوە. نیوەشەوان کاتی گفتوگۆی نهێنی نێوان بەندە و پەروەردگاریەتی. کە هەموو شەوێ خوای گەورە دەفەرموێ: کێ پێویستی هەیە و داوام لێ دەکات تا پێی ببەخشم، کێ داوای لێخۆشبونم لێ دەکات تا لێی خۆش بم. جا ئەو کەسەی کە لەو کاتەدا بە ئاگایە خەڵکی خەوتوون. دەست بۆ لای خوا بەرز دەکاتەوە و دەڵێ: خوایە من. خوایە من..

بەڕێـزان: لەبەر گەورەیی شـەوەکە یەك سـوڕەتی قورئان ناوی سـوڕەتی (الَّيْلَ)، وە لە چەندین ئایەتدا خوای گەورە باسـی شـەوی کردوە. باسـی هەسـتان بۆ شەونوێژ و خواپەرسـتی شەوانی کردوە. ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلْمُزَّمِّلُ ۝١ قُمِ ٱلَّيْلَ إِلَّا قَلِيلًا﴾ المزمل: ١ - ٢

عاریفان و خواناسـان زۆر ئارەزووی موناجاتی شـەوانیان کردوە لەگەڵ پەروەردگاریاندا. هەزار ڕەحمەت لە شـاعیری خواناس (سەید ئەحمەدی نەقیب) کە لە مەدحی شەودا دەفەرموێ:

جێی نیاز و ناز و ڕازی حەزرەتی جانانە شەو
وەقتێ نازڵ بوونی فەیز و ڕەحمەتی سوبحانە شەو.
شەو ئەگەر نەبوایە ڕۆژ ئەم قیمەتەی کەی دەست دەکەوت.
دوو ڕوو مرواری لە دەریای ئەخزەرا تابانە شەو.
بۆ کەسێ قەدر ئاشنابێ (لَيْلَةُ القَدْر) ی بەسە.

قانیعی کردوە دەمێکە ڕۆژی بەو بورهانە شەو.
شەو کە میعراج و زهوری بەحری نوری تیابووە.
تاقیامەت ڕۆژ لەدوی گریانە، هەم شادانە شەو.
بۆ شەوی میعراج سەد لەك ڕۆژی قوربانی دەگا.
ئاسمان بەو گەورەیی خۆیە کەوا خەندانە شەو.
با لەشەودا دز دزی خۆشی بکا وەك گورگی هار
وەقتی زاری و تاعەت و پاڕانەوەی پاکانە شەو.
شەو ئەگەر نەبوایە، خەو بۆ ئێمە قەت مومکین نەبوو.
مەحزی لوتفی بێ کەرانی حەزرەتی ڕەحمانە شەو.
شەو ئەگەر نەبوایە کەی دەستی دەدا وەسڵی حەبیب
خێری تاعات و عیباداتیشی بە دوو چەندانە شەو.
بێ سەبەب نەبوە لە قورئانا کە شەو پێش ڕۆژ خرا
نور و زوڵمەت هەردوو زیدن، جامیعی ئەم دوانە شەو.
ئەحمەدی بێ چارە، گەرچی ساکین و ماتە بە ڕۆژ
بۆ لیقای جانانە شەیدا و شێت و سەرگەردانە شەو...

ئیمانــداران: کاتێ خوای گەورە دەفەرموێ: (إِنَّـا أَنْزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ). باســی شــەوی پڕ قــەدر و ڕێزمان بــۆ دەکات. ئەوەمان تــێ دەگەیەنێ کــە ئیســلامەتی و گەیاندنی ئــەم قورئانە هەوڵی شەویشــی دەوێ، لە پاڵ هەوڵ و تێکۆشــانی ڕۆژدا، دەبێ شــەو و ڕۆژ بخەیتە ســەر یەك بۆ خزمەتی ئەم دینە. ســەلەفی صاڵح لە شــەودا بەرهەمی بیرکردنەوەی ڕۆژیــان کۆکردۆتەوە لە بواری زانســتی شــەرعیدا. ئەوەتــا: جارێکیان

ئیمامی (ئەحمەد) و ئیمامی (شافیعی) و (یەحیای کوڕی مەعین) پێکەوە چوون بۆ مەککە، کاتێك گەیشـــتنە ئەوێ لە جێگایەکدا لایان دا. ئیمامی شافیعی و (یەحیا) ڕاکشان. بەڵام ئیمام ئەحمەد نوێژی ئەکرد. بۆ بەیانی کە هەســـتان ئیمامی (شــافیعی) فەرمووی: ئەمشـــەو دووسەد مەسەلەی شـــەرعیم بۆ موسڵمان ڕوون -حل- کردووە، (یەحیا) فەرمووی: ئەمشەو دووســـەد فەرموودە کە بە دەم پێغەمبەرەوە (ﷺ)، هەڵبەســـترا بوو، بە درۆم خستەوە. ئیمام (ئەحمەد) یش فەرمووی: چەند ڕکاتێك نوێژم کرد، زۆربەی قورئانم تێدا دەور کردەوە.. بەم شـــێوەیە زانایانی ئەم ئوممەتە شەو و ڕۆژیان خستبوە سەریەك تا ئاوا ئەم دینەیان بە ئێمە گەیاند..

بەڵێ خۆشەویســـتان: شـــەوی قـــەدر هێندە گەورەیـــە، کە خوای گەورە دەفەرمـــوێ: (وَما أَدْراكَ مالَيْلَةُ القَدْرِ). تۆ چووزانی ئەو شـــەوە پڕ قەدر و حورمەتە چ شـــەوێکی گەورەیە، واتە هەرچی بە بیرتدا بێ لە گەورەیی ئەو شـــەوەدا، هێشـــتا پەیت بە گەورەیی ئەو شـــەوە نەبردوە!! خوای گەورە لە وەصفی گەورەیی ئەو شـــەوەدا دەفەرموێ: (لَيْلَـــةُ القَدْرِ خَيْرٌ مِنْ أَلْفِ شَـــهْرٍ). شـــەوی قەدر چاکتـــرە و گەورەترە لە خواپەرســـتی هەزار مانـــگ، یەعنی ئەگەر کەســـێك هەزار مانگ خواپەرســـتی بکات، کە شەوی قەدری تێدا نەبێ، خواپەرستی شەوی قەدر، نەك بە ئەندازەی ئەو هەزار مانگەیە. بەڵکو (خیر) چاکتریشە لـــە خەیری ئەو هەزار مانگەدا!! ســـبحان الله لە ڕەحمی خوا لەگەڵ ئەم ئوممەتە، چۆن قەرەبووی تەمەنی کورتمانی بۆ کردووینەوە. کە ئێمەی ئوممەتی محمد (ﷺ) تەمەنمان لە چاو ئوممەتانی پێشـــوودا

زۆر کەمە، بەڵام خوای بە بەزەیی ئەو شەوەی بەم ئوممەتە خەڵات کردوە و فەرمبووی تەمەنی کەمی بۆ کردۆتەوە. (فەنایی) شـــاعیر لە وەصفی (شەوی قەدر)دا فەرموویەتی:

شەوی قەدرە، شەوی ئازارە ئەمشەو

شەوی دەرگی سەفای ئەنوارە ئەمشەو.

شەوێکە وەك هەزار و چاتریشە

بەڵێ جەژنی دڵی بێدارە ئەمشەو..

شەوی ڕاز و نیازی بادەنۆشان

خۆمار و مەستی بێ ئازارە ئەمشەو.

فەلەك سەرگەرمی نەشری فەیزە ئاری.

بەهار و گوڵشەنی ئەسرارە ئەمشەو.

مزوولی ڕەحمەت و فەزڵی خودایە.

دەسا خۆزگەم بەوەی هۆشیارە ئەمشەو.

ئەگەرچی من دەستەپاچە و ناتەوانم

خەڵاتی ئوممەتی سەردارە ئەمشەو.

منیش خۆهەر غولامی ئەو جەنابەم

ئەگەرچی بارەکەم نابارە ئەمشەو.

لە دەریای کەریمیت یا ئیلاهی

هەزاری وەك منی بێکارە ئەمشەو

(فەنایی) با خەتابار و نەزانە.

بەسەر سەوداگەری دڵدارە ئەمشەو...

بەڵێ لە گەورەیی ئەو شەوەیە کە خوای گەورە دەفەرموێ: (تَنَزَّلُ المَلائِكَةُ وَالرُّوحُ فيها بِإِذْنِ رَبِّهِمْ مِنْ كُلِّ أَمْرٍ). جا سەرنج بدەن:

تَنَزَّلُ المَلائِكَةُ: فریشــتەکان دێنە خوارەوە بۆ سەر زەوی. بە مانای ئەوەی کە تۆی موســڵمان هێندە نزیك دەبــی لە خوا، هێندە پاك و بەرێز دەبی، دەبی بە هاورێی فریشــتە. (والــروح)، جوبریلی ئەمین کە گەورەی هەموو فریشتەکانە. ئەویش دێتە سەر زەوی، (بِإِذْنِ رَبِّهِمْ) کە جوبریل و فریشــتە لە ئاسمانەوە، سەرزەوی دەبینن، کە ئەو نور و بەرەکەتەی خواپەرســتان بەرز دەبێتــەوە. داوا لە خوا دەکەن کە ئیزنیان بدات بەشــداری ئەو هەموو خێر و بەرەکەتە بکەن، (مِنْ كُلِّ أَمْرٍ) بە جۆرەها فەرمان و کار بە تایبەت بۆ ســەردانی خواپەرستان، بۆ سەردانی مزگەوتەکان، بۆ گوێگرتن لە قورئان، بۆ بینینی دیمەنی دوعای بەکوڵ و چاوی بەفرمێسکی تۆبەکاران. دەی وەرە لەو شەوەدا ماڵت، مزگەوتت برازێنەوە. چونکە جوبریل و فریشــتەکان میوانن.. بەڵێ شــەوی قەدر (بَلا تَشْــبيه) وەکو یــادی دامەزراندنی حیزب و رێکخراوەکانە کە ســاڵانە یادی دەکەنەوە. تۆی موســڵمان دەبێ یادی هاتنە خوارەوەی قورئانەکەت بکەیتەوە. شــانازی بە ئیسلامەکەتەوە بکــەی.. ئــای چ یادکردنەوەیەکــی گەورەیــە، هەرچــی ئیمانــداری سەرزەوییە لەو شەوەدا لەگەڵت بەشدارە، جوبریل و فریشتە لەگەڵت بەشدارن، ئای ئەوانیش چەند خۆشحاڵن. کاتێ ئەو هەموو ئیماندارە دەبینــن. کە لە ماڵەکاندا، لە مزگەوتەکاندا لەو شــەوە تاریکەدا، کە خەڵکی لە جێگای خەوتنیاندان. ئەمان بە ئاگان و یادی خوا دەکەن

و سوپاسی خوا دەکەن.. ئای جوبریل چەندە خۆشحاڵە کاتێ دەبینێ ئاینی ئیسـلام لە سەرتاسـەری دنیادا بلاوبۆتەوە و سەردانی - الله أکبـر - و - لاإلـه إلا الله وَمُحَمَّدٌ رَسُـولُ الله - بـەرز دەبێتەوە. بە ملیۆن خەڵك، لەیەك خولەكدا دەڵێ:

(أَشْهَدُ أن لاإله إلاّ الله، وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ)..

جوبریـل یـادی کاتی هاتنـی وەحی وإقْـرَأ. دەکاتـەوە. کە کاتێ خۆشەویسـتمان (ﷺ) گەڕایەوەماڵەوە. فەرمـووی: ئەی خەدیجەی خۆشەویسـتم، ئەی هاوسەری بە وەفام: زَمِّلُونِی، زَمِّلُونِي. دام پۆشن، دام پۆشـن. پاشان کە هێور بۆوە و هەسـتا و بەسەرهاتەکەی بۆ خاتوو خەدیجە گێڕایەوە. یەکسـەر موژدەی ئەوەی دایە، کە ئەوە نیشانەی خێـر و گەورەییـە و خوای گەورە هەرگیز تووشـی خراپەی ناکات. چونکە خاوەنی ڕەوشتە جوان و بەرز و باڵاکانە و دڵسۆزی هەژارانە و بەبەزەییە بەرامبەر لێقەوماو و کۆسـتکەوتوان.. پاشـان کە زانی پێغەمبـەری خوایـە و ئەوەی بینیویەتی وەحییە. یەکسـەر ئیمانی پێ هێنا و لە سەرتاسـەری ئەم گـۆی زەوییە. تەنها یەك ئیمانداری موسـڵمان هەبوو. لـە دوای پێغەمبەرەوە، ئەویـش خاتوو خەدیجە بوو.. پاشـان کە لە پەنای کەعبەدا خواپەرستیان دەکرد، پێغەمبەری خوا (ﷺ) خاتوو خەدیجە و عەلی تەمەن (١٠) ساڵ و زەیدی کۆیلەی لەگەڵ بوو. کابرایەکی بازرگانی غەریب کە خەڵکی مەککە نەبوو، بۆ کاری بازرگانی ڕێی کەوتبوە شـاری مەککە، پرسی: ئەوە ئەوانە کێن و ئـەم جۆرە نوێژ و عیبادەتە چییـە دەی کەن، کە جیاوازە لە هی

قورەیش و ئەم هەموو خەڵکە؟! وتیان: ئەوە کەسێکە بە ناوی محمد وا گومان دەبات کە خوا وەحی بۆ ناردوە و کردوویەتی بە پێغەمبەری هەمـــوو جیهان و دەڵێ دەبێ هەموو ســەرزەوی ئــەم ئاینەی پێ بگا و لە سەرتاســەری ســەرزەویدا هەریەك خوا بپەرســترێ و شەریکی نەبێ.. کابرای بازرگان وتی: جا کەس پشــتیوانی لێ دەکات و بڕوای پێ دەکات؟! وتیان: هەر ئەوەی دەیبینی، ئەوە خێزانەکەیەتی و ئەو منداڵــە و ئــەو کۆیلەیە بڕوایان پێ کردوە!. کابرای بازرگان وتی: ئەم محمدە یان کەسێکە شێت بوە و عەقڵی لە دەست داوە، یان کەسێکی زۆر بە غیرەتە و بە جەرگە کە دەوێرێ باســی شتی وا بکات!! چۆن دەتوانێ بڵێ دینێك، بەم لاوازی و بێکەسیە، ڕۆژێك دێ لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئــاوا دەگــرێ. بەڵێ ئــەم بازرگانە نەی دەزانــی، کە ئەم دینی ئیسلامە، دینی خوایە و چرایەك خوا ئومیدی بێ بۆ تا ئەبەدمانە.. بەڵێ جوبریلی هاوەڵی (٢٣) ساڵ پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) کە ئەم هەموو ئیماندارە دەبینێ، وا بە دڵ و بە کوڵ لە خوا دەپاڕێنەوە، لە خۆشەویســتی ئیســلام خەویان لە چاویان تۆراندووە. وا قورئانەکان بە دەستی ئەو هەموو کوڕە گەنج و کچە گەنجەوەیە، وا ئەم هەموو ســەرە لە ســوژدەدایە.. کاتــێ جوبریل بە هاوڕێیەتــی وەفدی باڵای ئاســمان، ئەم هەموو خۆشــییە دەبینێ، دڵنیا بن دەچێتەوە خزمەت پێغەمبەری خوا و سەلامی لێ دەکات و پێی دەفەرموێ: موژدەت لێ بێ ئەی پێغەمبەری خوا، ئاواتەکەت هاتەدی، وەرە ســەیرکە ئیسلام چۆن گەیشتە هەر شوێنێك کە تیشکی خۆری بگاتێ، لە هەموو کون و

قوژبنێکی ئەم سەرزەمینە بانگی -الله أکبر-ی لێیە... دەی ئیمانداری بەرێز: دوا نەکەوی و بەشدار بە لەم کەرنەڤالە بێوێنەیەدا. جلوبەرگی پاك و خاوێن و جوان لەبەر کە، خۆت بۆنخۆش کە، بە دەســتی بە دەستنوێژ، بە دڵی خاوێن، ڕوو لە ماڵی خوا بکە. ڕوو لەسەر بەرماڵ بکە، بەیعەت و پەیمان نوێ بکەوە، کە لە ســاڵیادی هاتنە خوارەوەی قورئاندا، کە مەنهەجی ژیانی تۆیە، کە ڕێگای ڕاســتی تۆیە و تەنها بە ڕۆیشــتن بەم ڕێگایەدا دەچیتە بەهەشــت، زیاتر پابەند بی بەم ڕێبازەوە.. بەڵێ شــەوی قەدر، شــەوی پەیمان نوێکردنەوەیە، (تَنَزَّلُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ) موژدەیە بۆ تۆی ئیماندار، کە تۆ بە هێزی. تۆ لەگەڵ فریشتە دای. دەوەرە پشتیوانی خۆت، پەیمانی خۆت بۆ پێغەمبەر و ڕێبازەکەی نوێ بکەوە. سەرنجی قورئان بدەن کە دەفەرموێ: (وَجِبرِيلُ وَصالِحُ الْمُؤمِنينَ وَالْمَلائِكَةُ بَعْدَ ذالِكَ ظَهِيرٌ) سەرنجی بدەن (صالِحُ الْمُؤمِنينَ) لە نێوان، جوبریل و فریشتەدا هاتوون. بە پشتیوانیکردنی ئەم دینە و بە خزمەتی ئەم ئیســلامە تۆی ئیماندار لە فریشتە گەورە تری!!، ســبحان الله ئەم ئیسلامە کۆن بوونی بۆ نییە. ئەوەتا هەموو کاتێك وەکو ســەردەمی صەحابە، دەتوانی لە بەرەکەتی ئیســلام سودمەند بی، هەروەکو چۆن فریشــتەکان بەسەرکردایەتی جوبریلی ئەمین. لە بــەدر و خەندەقدا هاوڕێیەتی صەحابەیان دەکرد و پشــتیوانیان لێ دەکردن. لە شــەوی قەدریشــدا دەبنە هاوەڵی تۆی ئیماندار!. کەواتە: یەکەم هەنگاوی شــەوی قەدر، نوێکردنەوەی پەیمانە لە سەر ڕێبازی ئیسلامەتی.

ئیمانداران: خاڵێکی تر له فەزڵ و گەورەیی ئەو شــەوە پڕ قەدرە بریتییە (سَــلامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الفَجْرِ).. مانای (سَلامٌ): أيْ تُسَلِّمُ فيها المَلائِكَةُ عَلى المُؤمِنينَ).

واته: لەو شــەوەدا مەلائیکەتەکان ســەلام لە ئیمانــداران دەکەن، دەچنــە ناو ماڵ و مزگەوتەکانیانەوە و ســەلامیان لــێ دەکەن. لەو شــەوەدا ئاسوودەیی و ئاشتی و هێمنی و ڕەحمەت و میهرەبانی خوا دادەبارێت بە سەر مرۆڤە چاکەکارەکانماندا.. (هِيَ) ئەم شەوە پیرۆزە (حَــتَّى مَطْلَعِ الفَجْرِ) ســەلام و ڕەحمەت بارینی خــوا تێیدا، ئەم یادە پڕشکۆیە. ئەم مەڕاســیمە بێوێنەیە، کاتەکەی بەردەوام دەبێت هەتا کاتی بەرەبەیان..

بەڕێزان: پرسیارێکی گرنگ دەکرێ، ئەویش ئەوەیە: ئایا بۆچی ئەم شــەوە ناوی (القدر) بەڕێزە؟! لە وەڵامدا دەڵێیــن: والله أعلم: چونکە قورئان لەو شــەوەدا هاتۆتە خوارەوە کــە قورئان خۆی بەڕێزە. دیارە شەوەکەش بەڕێزە، دەی هەرکەسێ ڕێز لەو بەڕێزە بگرێ کە قورئانە. کە شەوی قەدرە. إن شاء الله لە دونیا و قیامەتدا بەڕێز و خاوەن قەدر دەبێ. شــەوی ڕێزە: تۆی موســڵمانی بەڕێز ئەوەندەی تر تێیدا بەڕێز دەبی، بەڵێ هەرکەسێ لەسەر ڕێبازی ئیسلام بێ، بەڕێز دەبێ. لە ژیانی دنیادا: کەســێکی وەکو بیلالی حەبەشی، ســەلمانی فارسی، صوهەیبی ڕۆمی، ئیســلام بوو کردنیە ئەستێرەی پڕشــنگداری مێژوو. لە ژیانی خێزانیدا: ئەوەی لە سەر ئیسلام بژی دایك و باوك و ئەولادی خاوەن ڕێزن. کچەکەت، کوڕەکەت، بە ڕێزەوە دەچێتە خانەی هاوسەرییەوە.

لە ژیانی هاوسەریدا: ئەو کەسانەی بە بەرنامەی ئیسلام ژیانی هاوسەری بەسەر دەبەن ئەوپەڕی حورمەت و ڕێز لە نێوانیاندا هەیە. ئەوپەڕی (مَوَدَّةً وَرَحْمَةً) لە نێوانیاندا هەیە. لەخۆبوردن و قوربانیدان هەیە.. بەڵام لە ئەوروپا و ئەمریکا، کاتێ ژیانی هاوسەری لە نێوان ژن و پیاوێکدا پێك دێ، دەبێ ژنەکە قاپێك برنج بکڕێ و پیاوەکەش قاپێك شلە. ژنەکە کەوچکێك بکڕێ، پیاوەکە چەتاڵێك بکڕێ، ئەگەر مێردەکە پەتاتەیەکی کڕی. ژنەکەش دەبێ لەبەرامبەردا شتێکی تر بکڕێ. بەڵێ موسڵمان ڕێزدارە لەناو کۆمەڵدا، چونکە: حەرام ناخوات، غەش ناکات، تەزویر ناکات، بەرتیل ناخوات، چاوی پاکە، دڵی پاکە، دەستی پاکە. (الْمُسْلِمُ مَنْ سَلِمَ الْمُسْلِمُونَ مِنْ لِسَانِهِ وَيَدِهِ) ناسنامەیەتی.. مرۆڤی ئیماندار حکومەت لە دەستی سەلامەتە. چونکە تریاك و عەرەق و ماددەی هۆشبەر ناخوات و ژیانی خۆی و خەڵکی تێك نادات. ئاژاوە و شەڕ نانێتەوە، دار ناشکێنێ، ژینگە بە شوشە عەرەق پیس ناکات. بەڵێ، ئەو گەنجانە ئەم حەقیقەتە باش دەزانن کە ڕۆژگارێکی ژیانیان لە بێدینی و دوور لە مزگەوتیدا بە سەر بردوە. ئێستاکە خوا هیدایەتی داون بۆ ئەم ئیسلامە، دەزانن جاران چەند بێڕێز بوون. بێزیان لە ڕابردوویان دەبێتەوە!!.

بەڵێ (لَيْلَةُ الْقَدْرِ) تۆی موسڵمان لای خوا بەڕێز دەکات. ئای چەند کەس هەیە کە لە لای خەڵکی سەرزەوی نەناسراوە، گوم ناوە، بەڵام لەلای (رَبُّ الْعالَمِين) ناوی بەرزە و ناسراوە، لە فەرمودەیەکدا هاتوە کە: (دَخَلَ عَلى النَبِيِّ (ﷺ) رَجُلٌ، النَبِيُّ (ﷺ) هَشَّ لَهُ وَبَشَّ، وَقالَ: أَهْلاً بِمَنْ

أَخْبَــرَنِي جبريلُ بِقُدُومِهِ، قــالَ: أَوَمِثْلِي؟! مَنْ أَنا؟! قالَ: نَعَــمْ ياأَخي خامِلٌ في الأَرْضِ، عَلَمٌ في السَّماءِ).

**واتە: ڕۆژێکیان کەسێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ)، داوای هاتنــەژورەوەی کرد، پێغەمبەری خــوا (ﷺ) کەوتە خۆکۆکردنەوە و جلوبەرگ ڕێکخســتن و جێگای دانیشتن ئامادەکردن، زۆر بە گەرمی بەخێرهاتنــی ئــەو میوانــەی کرد و فەرمووی: ســڵاو لەو کەســە خۆشەویستە بێ، کە پێش ئەوەی بگاتە ئێرە جوبریل هەواڵی هاتنی پێ دام!! کابرا وتی: من، کەسێکی بێ ناونیشان و نەناسراو، گومناو؟! یانــی جوبریل نــاوی منی هێنا؟! پێغەمبەری خــوا (ﷺ) فەرمووی: بەڵــێ. ئــەی براکەم (الله أکبــر لەو پلە گەورەیــە، پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی بفەرموێ ئەی براکەم، خۆزگەمان بە خۆی). ئەی براکەم: زۆر کەس هەیە لەم ســەرزەویەدا ناوی نییە. خەڵکی نایناسێ. بەڵام خاوەنی ناوو و پێگە و مەشخەڵی تایبەتە لە ئاسماندا، لە لای خوای پەروەردگار. لە لای فریشتەکانی، لەوێ ناسراوە. تۆ یەکێ لە وانەی!!..**

**بەڵــێ خۆشەویســتان: بەم ئیســلامە، مرۆڤ وا بەڕێــز دەبێ، کە خوای گەورە بە جوبریلدا ســەلامی بۆ دەنێرێ و دەفەرموێ: ســەلام لــە خەدیجە بکە!! بەڵــێ خەدیجە بە خزمەتکردنی ئەم ئیســلامە گەیشــتە ئەو پلە و پایە.. مژدەتــان لێ بێ ئەی ئەو کچە گەنجانەی کە بە شــانازیەوە شــوێن پێی خاتوو خەدیجەی دایکتان هەڵگرتووە و پابەندی تەواوتان هەیە بە ئیســلامەوە و ڕەشەبای نەفامی لارتان ناکاتەوە و لاتان نادات لە ڕێگای ڕاستی ئیسلامەتی و بەرگی حورمەت**

و ڕێــزی بالاپۆشــیتان وەکو دیــن وەرگرتووە. ئێــوەش وەکو خاتوو خەدیجــە بەم ئیســلامە بەڕێز و خاوەن قەدر دەبن. دەی ســوووربن لەســەر ڕێبازەکەتان. تۆی موسڵمان لە ســەرەمەرگدا بەڕێزی، چونکە دەبی بە هاوڕێی فریشــتەکان، کە موژدەت پێ دەدەن و پێت دەڵێن: (أَلاّ تَخافُوا وَلا تَحْزَنُوا وَأَبْشِرُوا بالْجَنَّةِ الَّتي كُنْتُمْ تُوعَدُون، نَحْنُ أَوْلِياءُوكُمْ في الحَياةِ الدُّنيا وَفِي الآخِرَة).

تۆی ئیماندار لە بەهەشتدا بەڕێزی. (فـي جَـنّاتٍ مُكْـرَمُـونَ)..

دەی هەر کەسێ دەیەوێ بەڕێز بێ، با لە سەر ئیسلامەتی بژی و بمرێ. شەوی (لَيْلَةُ الـقَدْر) پێت دەڵێ: وەرە ڕێزدار بە لە دونیا و لە قیامەتدا.

بەڵــێ مرۆڤی موســڵمان بەڕێــزە و زۆری فەرقە لەگــەڵ کافر و بێباوەڕدا، (إِنَّ سَــعْيَكُمْ لَشَــتَّى) اللَّيْل: ٤. بە کردەوەی جوانی، بە دڵی گوشــادی. بە دەستی ســەخاوەتی، بە دڵپاکی و زمانپاکی، جیاوازە لە کەسی کافر و خوانەناس و بێبڕوا بە پاداشتی خوایی و بەهەشت.

لە (تەفسیری ئاســان، کە نوسراوی م. بورهان محمد أمین)، چاپی نۆزدەهــەم، لاپەڕە: ١١٩١)دا ئەم بەســەرهاتە هاتووە: (إِبْــنُ أَبـي حاتَم) و ئەوانــی دی لە (إِبْــنُ عَبّاس)ەوە دەگێڕنــەوە، دەفەرموێت: پیاوێك دارخورمایەکی هەبوو. لقی دارخورماکە چووبوە ماڵی پیاوێکی هەژاری خــاوەن مناڵی ورددا. پیاوەکــەش هەرجارێك بهاتایە دەچووە ماڵەکە و ئەوجــا بە دارخوماکەدا هــەڵ دەگەڕا، تا بەرووبوومی لێ بکاتەوە، جاری وا هەبوو، خورما دەکەوتە خوار، مناڵانی پیاوە هەژارەکە هەڵیان دەگرتەوە. پیاوەکەش خێرا لــە دارخورماکە دادەبەزی و خورماکەی

لە دەست دەسەندنەوە. خۆ ئەگەر خورمایەکی بە دەمی یەکێکیانەوە بدیایـــە ئەوا پەنجەی دەکرد بە دەمیدا و خورماکەی دەردەهێنایەوە. کابرای خاوەن منداڵیش ئەم شکاتەی بردە لای پێغەمبەر (ﷺ). ئەویش فەرمووی: تۆ بڕۆ، ئەوجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کابرای دارخورما گەیشت و پێی وت: ئەو دارخورمایەتم بدەرێ کە لقەکانی چۆتە سەر ماڵـــی فلان کەس، لە بەرامبەر ئەودا خورمایەکت لە بەهەشـــتدا پێ دەدرێت.. کابرا وتی: بە ڕاســـتی نرخت پێ دام، بەڵام دارخورمایەکی زۆرم هەیـــە، هیچ دارخورمایەکی وای تێدا نییە کە بەرووبوومەکەی ئەنـــدازەی ئەمە جوان بێت!! کابرا ڕۆیشـــت. ئەوجا پێغەمبەر (ﷺ) بە پیاوێکی تر گەیشت، کە گوێی لە قسەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگـــەڵ خاوەن خورماکە بوو. کابـــرای دووەم وتی: ئەی پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) ئـــەوەی دات بەو پیاوە، ئەوەش ئەدەی بە من. ئەگەر ئەو دارخورمایە لەو پیاوە بکڕم؟! فەرمووی: بەڵێ. پیاوەکە ڕۆیشت و بە کابرای خاوەن دارخورما گەیشـــت، خاوەن دارخورماکە پێی وت: ئایا هەستت بەوە کرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەو دارخورمایەی پەلەکەی چۆتە سەرماڵی فلان کەس دارخورمایەکی بەهەشتی پێ داوم؟! ئەویش وتی: بەڵێ. ئینجا وتی: بەڵام بەرووبوومی ئەو دارخورمایە سەرنجی ڕاکێشـــاوم، منیش وتم: دارخورمام هەیە، بەڵام هیچیان بە ئەندازەی بەرووبوومی ئەو دارخورمایە شـــیرین نییە لەبەر دڵما، پاشـــان پێی وت: ناتەوێت بی فرۆشـــیت؟! وتی: نەخێر، مەگەر ئەوەندەم بدەیتێ کـــە داوای دەکـــەم. وا پەی نابەم کەس ئەو نرخەم بداتێ. کابرا وتی:

چەندی لێ داوا دەکەی؟! وتی: چل دارخورما!! ئەویش وتی: زۆر داوا دەکەی، پاشـــان بێدەنگ بوون، ئەوجا وتی: چل دارخورمات دەدەمێ بە مەرجێ شـــاهیدم بۆ بهێنی لە ســـەر بەڵێن و قســـەکانت. ئینجا پیاوەکە خزمانی خۆی کۆکردەوە و شـــایەتییان دا، پاشـــان ئەو پیاوە ڕۆیشـــتەوە بـــۆ لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) و وتـــی: ئەی پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) دارخورماکـــە هی ئەوان بوو، ئێســـتا هی تۆیـــە و بۆ تۆ. پێغەمبەری خواش (ﷺ) چوو بۆ لای خاوەنماڵەکە و پێی وتن، ئەو دارخورمایە بۆ تۆ و منداڵەکانت، پاشـــان خوای گەورە ئایەتی: (وَاللَّيْلِ إِذا يَغْشى....) تا کۆتایی سورەتەکە ناردە خوارەوە..

ئیمانداران: ئایا شـــەوی قەدر کام شـــەوەی مانگـــی ڕەمەزانە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: پێغەمبەری خۆشەویســـتمان (ﷺ) فەرمویەتی: (تَحَرَّوا لَيْلَةَ القَدْرِ فِي العَشْرِ الأَواخِرِ مِنْ رَمَضانَ). رَواهُ البُخاري (٢٠١٧) وَمُسْلِم (١١٦٩)

هەروەها لە فەرموودەیەکی تری سەروەرماندا (ﷺ) کە لە صەحیحی بوخاری بە ژمارە (٢٠١٢) هاتووە. فەرموویەتی: (إِلْتَمِسُوها فِي العَشْرِ الأَواخِرِ مِنْ رَمَضانَ، لَيْلَةَ القَدْرِ فِي تاسِعَةٍ تَبْقَى، فِي سابِعَةٍ تَبْقَى، فِي خامِسَةٍ تَبْقَى).

کەواتـــە: لە دە شـــەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندایـــە و بە تایبەت شـــەوە تاکەکانی. هەروەکو إِبْنُ حَجَر لـــە (فَتْحُ الباری)دا فەرمویەتی: (أَرْجَحُ الأَقْوالِ أَنَّها في وتر مِن العَشْرِ الأَخيرِ وَأَنَّها تَنْتَقِلُ)..

وَقـــالَ العَلاّمَة (إِبْنُ عُثَيمين): (وَلا تَخْتَصُّ لَيْلَةُ القَدْرِ بِلَيْلَةٍ مُعَيَّنَةٍ في جَميعَ الأَعْوامِ بَلْ تَنْتَقِلُ فتكون في عام لَيْلَة سَبْعٍ وَعِشرينَ مَثَلاً. وَفي عامٍ آخَر لَيْلَةُ خَمْسٍ وَعَشْرينَ. تَبَعاً لِمَشيئَةِ اللهِ وَحِكْمَتِهِ)..

بەڵام ئەوەش کە لە زۆربەی جیهانی ئیسـلامی و وڵاتی کوردەواری خۆمانـدا زۆر تەئکیدی لە سـەر دەکرێ. شـەوی (بیسـت و حەوت) ی مانگـی ڕەمەزانە، کە لەم بارەیەشـەوە فەرمودەی صەحیح هەیە. هەروەکو لە: (صَحيحُ مُسْلِم: (٧٦٢) وأَحمد: (٥/١٣٢) وأَبُوداود: (١٣٨٦)دا هاتوە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (لَيْلَةُ القَدْرِ لَيْلَةُ سَبْعٍ وَعِشرينَ).

واتە: شەوی بیست و حەوتی ڕەمەزان، شەوی قەدرە.

بەڕێزان: ئەگەر بە وردی لە قورئان وردبینەوە، دەبینین، سورەتی -القـدر- لە جوزئـی (٣٠)دایە کە مانگ (٣٠) ڕۆژە لە جوزئی (٣٠)یش دایە، سـورەتی -القدر- ژمارە (٢٠)ی جوزئەکەیە!.. سورەتی -القدر- (٣٠) وشـەیە!!، کەواتە: ئەم قورئانە هەمـووی موعجیزەیە تەنانەت تەرتیب و ڕیزبەندی جوزئو ژمارەی سورەتەکانیشی، کە ئاوا دانراون، هەمـووی تایبەتمەندی خۆی هەیە.. هەر لە بارەی شـەوی (٢٧)ەوە. ئیبن عەبباس دەفەرموێ: شەوی قەدر، شەوی (٢٧)ی مانگی ڕەمەزانە. بە بەڵگەی ئەوەی کە: دەستەواژەی (لَيْـلَةُ الـقَدْر) (٩) پیتە. لە سورەتی -القـدر- یشـدا، (٣) جار (لَيْلَـةُ القَدْر) دووبارە بۆتـەوە. بەم جۆرە (٩*٣=٢٧).. هەروەها وشـەی: (القدر) (٣) جار لە سـورەتەکەدا هاتوە. زنجیرەی وشـەی -قدر-ی یەکەم =٥. واتە پێنجەم وشـەیە. قەدری دووەم (١٠)هەمین وشەیە، قەدری سێیەم (١٢)هەمین وشەیە.

سەرەنجام: ٥+١٠+١٢=٢٧.. کەواتە: شەوی قەدر شەوی (٢٧)ی مانگە..

ئیمانداران: ئایا چ دوعایەك. چ پاڕانەوەیەك لەم شەوەدا زۆر گەورە و پیرۆزە کە ئێمەی موسڵمان پی کەین؟! ئەم پرسیارەی ئێمە، دایکمان،

دایکی هەموو ئیمانداران، خاتوو عائیشـــە، لە پێغەمبەری خوای (ﷺ) پرســـی: خاتوو عائیشە دەفەرموێت: (قُلْتُ: يارَسُولَ الله: أَرَأَيْتَ إِنْ عَلِمَتُ أَي لَيْلَة لَيْلَةُ القَدْرِ، ماأَقُولُ؟! قالَ: قولي: اللّهُمَّ إِنَّكَ عَفُوٌّ تُحِبُّ العَفْوَ فَاعْفُ عَنّي) حَديْثٌ صَحيح: أَخرجه الترمذي (٣٧٦٠) وَصَحَّحَهُ الأَلْباني في صَحيح إِبْنُ ماجّه (٣٨٥٠)

واتە: خاتوو عائیشـــە دەفەرموێ: وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئایا ئەگەر زانیم کە کام شەوە شەوی قەدرە، چی بڵێم تێیدا، چ دوعا و پاڕانەوەیەك بڵێم؟! فەرمووی: بڵێ: پەروەردگارا، بە ڕاستی تۆ زۆر لێخۆشـــبووی، تۆ سڕەرەوەی گوناهی بەندەکانتی. گوناهەکانی منیش بسڕەوە و چاوپۆشیم لێ بکە و لێم خۆش بە..

بەڕێزان: لێرەدا پرســـیارێك دروست دەبێت. ئەویش ئەوەیە: ئایا بۆچی لەناو هەموو ناوە بەرز و پیرۆزەکانی خوای گەورەدا، کە مانای داوای لێخۆشـــبوونیان تێدایـــە. وەکو: (التَّواب. الغَفُـــور. الغَفّار) ناوی -العَفُـــو - دەڵێین؟! لە وەڵامدا دەڵێین: اللّه وَرَسُـــولُهُ أَعْلَم: چونکە بەندە ئەوەندەی گوناه کردووە و پەشیمان بۆتەوە و تەوبەی کردووە و دیسان چۆتەوە سەری، ئێستا شەرم دەکا بڵێ: خوایە هیچی تر لێم خۆش بە، بۆیە -العَفُوا- واتە: خوایە لاپەڕەیەکی سپیم لەم شەوەدا بۆ هەڵ دەوە، کە شـــوێنەواری گوناهەکانی ڕابردووم بســـڕێتەوە، کە تەنانـــەت فریشـــتەکانیش کـــە گوناهەکانیان تۆمار کـــردووم بیریان بچێتەوە و لاپەڕەیەکی ســـپی لە ژیانمدا هـــەڵ بدرێتەوە. هەر بۆیە پاداشـــتی خواپەرستی شەوی قەدر بریتییە لە ڕزگاربوون لە گوناهی ڕابردوو. هەڵدانەوەی لاپەڕەیەکی ســـپی ســـەرلەنوێ لە دایکبوونەوە.

هەروەکو پێغەمبەری خــوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ قَامَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ إِيمَانًا وَاحْتِسَابًا غُفِرَ لَهُ مَا تَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ). رَوَاهُ البُخاري (٢٠١٧) وَمُسْلِم (١١٦٩)

واتە: هەرکەس لە شەوی قەدردا، نەخەوت و خواپەرستی کرد. بە بــاوەڕەوە و لەبەر ڕەزامەندی خوا، وە چاوەڕوانی ئەو پاداشــتەی لە خوا کرد، خوای گەورە لە گوناهی لەوەو پێشی خۆش دەبێت. کەواتە: موژدەتان لێ بێ ئەی تۆبەکاران، لە گەنج و بە تەمەنەکان، لە کوڕان و لــە کچان، کە ئەم ڕەمەزانە بە دڵ ڕووتان کردە خوا، إنْشــاءَ اللّه خوا لێتان خۆش بووە. وە لە شــەوی قــەدردا داوا بکەن لە خوا، کە لاپەڕەی ســپیتان بۆ هەڵداتەوە، تەنانەت فریشتەکانی نوسەریش لە بیریان بچێتەوە کە ئێوە چ گوناهێکتان کردووە.

ئیماندارانی بەڕێز: چاك وایە لە بەشــێکی دانیشــتنەکانماندا بۆ قەدر، نوێژی تەســبیحات (صَلاةُ التَّســبيح) بکەین. کە مامۆستایانی پێشنوێژ و وتاربێژی مزگەوتەکان، خوا پاداشتیان بداتەوە (٣٠٠) جار زیکری: (سُــبْحانَ اللّهِ والحَمْدُ لِلّهِ وَلا إلهَ إلاّ اللّه وَاللّه أكبر) دەوترێ. باشــە بۆچی ئەم زیکــرە دەوترێ؟! موفەســیرینی قورئان زۆربەیان لــە تەفســیری ئایەتــی: ﴿ٱلْمَالُ وَٱلْبَنُونَ زِينَةُ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَٱلْبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا﴾ الكهف: ٤٦، لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا فەرمویانە: (الباقياتُ الصّالحات). بریتیە لە زیکری (سُــبْحانَ اللّه وَالحَمْــدُ لِلّه وَلا إلــهَ إلاّ اللّه وَاللّه أكبــر). چونکە: (إذا سَــبَّحْتَهُ وَحَمَّدْتَــهُ وَوَحَّدْتَهُ وَكَبَّرْتَهُ، فقَدْ عَرَّفْتَهُ، وَإذا عَرَّفْتَهُ -اللّه- عَرَفْتَ كُلَّ شَــيءٍ، وَسَــعَدْتَ بِهذِهِ المَعْرِفَةِ إلى الأبَدِ. وَهذهِ لايُدانيها مَتاعُ الدُّنيا

كُلَّــهُ وَلَوْ كَثُرَ).. واتە: ئەگەر خوای پــەروەردگارت بە پاك و بێگەرد ناسی، وە سوپاست كرد و هەرچی هەتە بە خەڵات و بەخششی ئەوت زانی، وە بە تاك و تەنها و بێشەریك ناسیت، وە یەقینت هەبوو كە لە هەموو گەورە و دەسەڵاتدارێك گەورەترە و هاوتای نییە، ئەوە ئەوكاتە مانای وایە، خوای خۆتت ناســی. كاتێ ناسیشت، هەموو شتێ دەناسی و دەزانی، بە نوری ئەو خواناســییە بەرچاوت رۆشــن دەبێ. وە بەم بیروباوەڕە پاكە و ئەم جوان ناسینی خوای پەروەردگارتە هەتا هەتا بەختەوەر دەبی و هیچ تەنگ و چەڵەمە و ناڕەحەتی و ئازارێكی ژیان ناتوانێ چۆكت پێ دابدات. ئەم بەختەوەری و ئاسودەیی و ئەڤینی دڵ و دەروونە. بەرامبەری پێ ناكرێ لەگەڵ هەموو خۆشی و خەڵاتەكانی دونیا. لە ماڵ و منداڵی چاك و پاك و خواناس. وە سەروەت و سامانی زۆر و حــەڵاڵ. وە خانــوو باڵەخانەی بەرز و باخی ڕازاوە و زەوی و زاری زۆر، هەرچەندە زۆریش بێ.. بەڵێ تۆی ئیماندار لە دانیشــتنی شــەوانی قەدردا، وەرە ماوەیەك دابنیشە و تەنها سەیری (٢٥) سم لە لاشــەی خۆت بكە، بە وردی سەرنجی سەر و دەم و چاوت بدە: ئاوی ناو دەم: ئەگەر تاڵ بێ، ژیانت لێ هەراسان دەبێ، ئەگەر وەكو شەكراو شــیرین بــێ. هەرچەندە ژیانت نابــێ و بەردەوام تینــووت دەبێ و مێرووله ناودەمت دەخوات. ناتوانی بە ئاسودەیی بخەویت!! سُبْحانَ اللّٰه ئەو لیكی ناودەمەت، بەم جۆرەی ئێســتا گەورەیی و عەزەمەتی خوای پەروەردگارت دەخاتە بەرچاو و سوپاسی خوای دەوێ.. پاشان: ئاوی لوتت، ئەگەر ســارد بێ، تووشی نەخۆشی دەبی، ئەگەر گەرمتر

بــێ بۆگــەن دەكات!! هەروەها: ئاوی گوێ تاڵە. ئەگەر شــیرین بوایە حەشەرات و زیندەوەران دەچوونە گوێتەوە و بە بچووکترین حەشەرە مێشــکت دەشڵەژا. خۆ ئەگەر ئەو مادەیەی کە گوێ دەری دەدات شل بوایە. بەردەوام ئاو بە گوێتا دەهاتە خوارەوە، ئەگەر لەوەی ئێستاش ڕەقتــر بوایە، ئەوا دەبوایە بــەردەوام خەریکی پاککردنەوەی گوێمان بووینایە.. بەڵام ئێســتا خوای گەورە گوێمانی وا دروســت کردوە، کە بۆ خۆی بە شێوەیەکی پێچاوپێچ بە هێمنی و بەپێی پێویست وردە، وردە دێتە دەرەوە و تەنانەت پزیشــکەکان دەڵێن: گوێ پاککردنەوەی زۆر و بــەردەوام نــەك باش نییە. بەڵکو زیانیــش دەگەینێ!! ئەمجا سەیرکە: ئاوی چاو سوێرە، چونکە چاو لە (بەز) دروست کراوە. ئەو ســوێریە نەبوایە ئەو بەزی چاوە دەتوایەوە. هەروەها ئەو ســوێریە وا دەکات کــە پارێــزگاری بکات لە چوونە نــاوەوەی زۆر ڤایرۆس و میکرۆب، کە ئەو سوێریە دەیانکوژێت!..

(سُبْحانَ اللّه وَالحَمْدُلِلّهِ وَلا إلهَ إلاّ اللّه وَاللّه أَكْبَر) ئەم ئاوانە وەکو کانیەکی بچکۆلە وان. بەڵام چۆن کانیەك؟! کانیەکی سەرســوڕهێنەر، نە وشــك دەکات، نــە لێی دەڕژێ!! بە ئەندازەی پێویســت لێی دێتە دەرەوە!!!

ســەرنج بدە: نینۆکی پەنجەی دەست ڕۆژانە (٠،٨٦) ملیمەتر زیاد دەکات، بەڵام نینۆکی پەنجەی قاچ ڕۆژانە (٠،٠٥) ملیمەتر زیاد دەکات!! خۆ ئەگەر وا نەبوایە و نینۆکی قاچ وەکو دەست درێژ ببوایە، ئەبوایە هەرخەریکی نینۆککردنی قاچمان بووینایە و ماوەیەك بۆمان نەکرایە

نینۆکـــی قاچمـــان بکەین. هەمـــووی لە ناو پێڵاودا دەشـــکا و توانای ڕۆیشـــتنمان نەدەما!!.. لە فرمێســـکی ئادەمیزاددا، جـــۆرە ماددەیەك هەیـــە کە دەتوانێت زیاتر لە (١٠٠) جۆر بەکتریا و ڤایرۆس بکوژێت، سەیر لە وەدایە. ئەگەر ئەو فرمێسکە (٦٠٠) جار ڕوون بکرێتەوە هەر هەمان توانا و کاریگەری خۆی دەمێنێت!!.

هەروەها سەرنجی لێدانی دڵت بدە: دڵ لە یەك دەقیقەدا (٧٢) جار لێ دەدات. ئەی لە ساڵێکدا چەند جار لێ دەدات؟! (٧٢*٦٠= ٤٣٢٠*٢٤= ١٠٣٦٨٠* ٣٥٦= ٣٧٨٤٣٢٠٠)

واتە: لە ساڵێکدا: سی و حەوت ملیۆن و هەشت سەد و چل و سێ هەزار و دووسەد جار لە ساڵێکدا لێ دەدات!.

هەروەهـــا (دڵ) لە هەر کاتژمێرێکـــدا: (٣٠٠) لیتر خوێن پاڵ پێوە دەنێت بۆ لەش و وەریشـــی دەگرێتەوە: واتـــە: (٣٠٠*٢٤= ٧٢٠*٣٦٥= ٢٦٢٨٠٠٠) (واتە: دوو ملیۆن و شـــەش ســـەد و بیست و هەشت هەزار لیتر لە ساڵێکدا)..

بەرێـــزان: مرۆڤ لە باری ئاســـاییدا. لە یـــەك خولەکدا: (١٥) جار هەناسە دەدات. واتە: (٦٠*١٥= ٩٦٠*٢٤= ٢٣٠٤٠*٣٦٥= ٧٥١١٠٤٠) حەوت ملیۆن و پێنج سەد و یانزە هەزار و چل جار هەناسە دەدات.

مرۆڤ لە (٢٤) کاتژمێردا: (١١٨٠) جار چاو دەتروکێنێ!، خۆ ئەگەر یـــەك جار لە جوڵە کەوت و چاوت نەتـــروکا، ژیانت لێ تاڵ دەبێ!!. ئایـــا لە ناخی دڵەوە ناڵێی: (سُـــبْحانَ اللهِ وَالحَمْدُلِلّهِ وَلا لإِلهَ إلاّ اللّه وَاللّه أَكْبَر)؟!!

ئەمجـا ئیمانداری بەڕێز: وەرە سـەیری بەرهەمـی ڕووەکی بکە، ئەو ڕووەکەی بەردەوام دەیخۆین: کاڵەك و شـووتی بەر بۆ بەر یەك بـە دوای یەکدا، چیـن، چین پێ دەگات، خۆ ئەگـەر گەنم و جۆش ئـاوا بوایە. بە کەڵك نەدەهات و دەبوایە ماوەیەکی یەکجار زۆر هەر خەریکـی دروێنە بووینایە بە شـێوەی گوڵەچن و ئـەوکات ژیانمان مسۆگەر نەدەبوو. بەڵام خوای گەورە دانەوێڵەی وا دروست کردوە کە بە یەك جار پێ دەگات و بە دەڕاسە دروێنە دەکرێ و نانمان مسۆگەر دەبـێ!. خۆ ئەگەر کاڵەك و شـووتی وەك گەنـم و جۆ بە یەك جار پێ بگەیشـتایە. دیسان لەویش سـودمەند نەدەبووین و تەنها چەند دانەیەکمان بۆ دەخورا و ئەوی تری دەڕزی و خەسار دەبوو، یان بازاڕ هەرچەند ڕۆژێکی کەم بەرهەمی کاڵەك و شـووتی تێدا دەبوو. ئیتر کۆتایـی دەهات و نیوەی خەڵکی فریای کڕینی نەدەکەوتن!!. کەواتە: (سُبْحانَ اللهِ وَالحَمْدُلِلّهِ وَلا إلهَ إلاّ اللّه وَاللّه أكْبَر).

ئەمجا: سوپاسـی خوا دەکەین لە سەر خەڵاتی قورئان. شاخەڵاتی ئاسمان بۆ سەر زەوی. پاشان الحَمْدُللّه، کە بەیانی لە خەو هەڵدەستین و لاشـەمان ساغە و بیروهۆشـمان تەواوە و ڕۆژێکی نوێ لە ژیانمان دەستی پێ کردوە، بۆیە دەڵێین: (الحَمْدُلِلّهِ الّذي أحْياني بَعْدَ ماأماتَني وَإلَيْهِ النُّشُور)..

الحَمْدُللّه لە سـەر هەموو قومە ئاو و پاروە نانێك، لە سـەر ئەو هەموو خۆراکە کە پێی بەخشـیوین. پاشان:لا إلهَ إلاّ اللّه. دواتر: اللّه أكبـر. مانـای (اللّه أكبر). واتە:أكبر مِمّا عَرَفْـتَ. چەند بە بیرتدا دێ

کــە خوا بە توانایە. خوا لــەوە بە تواناترە. بە ڕەحمە، بە ڕەحمترە لــە وەی کــە تۆ بە بیرتــدا دێ. تۆ دەزانی خوا ڕازیقــە. بەڵکو خوا -الرَّزاقَ-ە، زۆر لەوە زیاتر ڕۆزی دەرە کە تۆ بیرت لێ کردۆتەوە. تۆ ئەزانــی کە خوا -الهادی-یە و هیدایەتی بەندەکانی دەدا، بەڵام لەوە زیاتر هیدایەتدەرە کە ئێمە بیرمان لێ کردۆتەوە، هیدایەتی گومڕای وای داوە و گەڕاوەتەوە بۆ ســەر ڕێگای ڕاست کە کەس بیریشی لەوە نەکردۆتەوە کە ئەو کەســە خراپە ئاوا گۆڕانکاری بەســەردا بێت و ببێتە مرۆڤێکی ئاوا چاك و باش.

مانایەکــی تــری -اللّٰه أکبر- ئەوەیە: کــە هەرچەندە تۆ خەم و پەژارەکەت گەورە بێ، نەخۆشــیەکەت ســامناك بێ، ناحەزەکانت کە لەبەر ئەوەی موسڵمانی ڕقیان لێتە و دژایەتیت دەکەن، خوا لە وانە بە هێزترە، گەورەتــرە. بۆیە هەرگیز مەڵێ خوایە خەمێکی گەورەم هەیە. بەڵکو بڵێ: ئەی خەم خوایەکی زۆر گەورەم هەیە.. هەرچەندە دەستکورتی و هەژاری و قەرزاری زۆری بۆ هێناوی. دڵنیابە خەزێنەی خوا گەورەترە کە ئەو قەرز و دەســتکورتیە لەسەر تۆ لاببات.. ئیتر مادام تۆ بڕوات بە -اللّٰه أکبر- هەیە. ئیتر خەمبار و دڵتەنگ مەبە. هەر بۆیە موسڵمان بە بیستنی بانگ و صەدای -اللّٰه أکبر- دڵی ئارام دەبێت..

مانایەکی تری اللّٰه أکبر، کە ئێمەی موسڵمان لە نوێژی تەسبیحات (صَلاةُ التَّســبِيح)دا لە کاتی وتنی زیکری (سُــبْحانَ اللهِ وَالحَمْدُلِلّٰهِ وَلا إِلَهَ إلاّ وَاللّٰه أکبر)دا بیری لێ دەکاتەوە و ئاشــنای دەبێت ئەوەیە

کـــە: بـــازاڕ و کڕین و فرۆشـــتن و ناوماڵ و منـــاڵ و جێگای خەو و پشـــوو، خۆشە. بەڵام نوێژەکە گەورەترە، لەزەتی عیبادەتی دانیشتنی شـــەوانی قـــەدر گەورەترە لە خۆشـــی و لەزەتی خەوتـــن لە جێگای گەرم و تەنیشت هاوســـەری خۆشەویست. بە وتنی: (اللّٰه أکبر) ئەوە دەڵێین کە بۆ ئافرەتی ئیماندار. بۆ کچان و خوشـــکانی موســـڵمان و ئەهلی مزگەوت، حیجاب و تاجی ڕێزی سەرپۆش گەورەترە لە مۆدی ســـەردەم، گەورەترە لـــە لۆمەی خەڵکی. بە وتنـــی: (اللّٰه أکبر) ئەوە دەڵێین و دەســـەلمێنین کە: شـــەرعی خوا، لە قانون و یاسای مرۆڤ کرد، کە پێچەوانەی بنچینەکانی شـــەرعە گەورەترە و منی موسڵمان پەنـــا بۆ شـــەرع دەبەم بۆ داواکردنی مافەکانـــم. وە چیش بڕیار درا پێی ڕازی دەبم.

ئیمانداری بەڕێز: لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ، ئەویش ئەوەیە: ئایا بۆچی ئەم زیکرانە (سُبْحانَ اللّٰهِ وَالحَمْدُلِلّٰهِ وَلا إِلَهَ إِلاّ اللّٰه وَاللّٰه أكبر) یەك لە دوای یەك و بەتەرتیب دەڵێین و (لا إِلَهَ إِلاّ اللّٰه) پێش (سُـــبْحانَ اللّٰه) ناڵێین؟! لە وەڵامدا دەڵێین: چونکە: تا خوای گەورە بە پاك و بێگەرد و کاربەجێ نەناسی، ناتوانی بە دڵ سوپاسی بکەی. تاحەمـــد و پەنات بۆ خوا نەبێ. ناتوانی وەکو خۆی بیناســـی، تا (لا إِلَهَ إِلاّ اللّٰه) نەچەسپێ لە ناخ و مێشکتدا، ناتوانی مەعبودی تر ڕەفز بکەی. تا ئەمانەشت لا نەبن بە یەقین خوات پێ لە هەموو شتێ بە لاوە گەورەتـــر نابێ. جا هەرکەس بە یەقین و تێگەیشـــتنەوە، ئەمە بڵێ، ئەوە بە ڕاستی ئیمانی دادەمەزرێ. ئەی ئەگەر کەسێ نەك یەك

جـار بەڵکو بە یەقینەوە (٣٠٠) جـار ئەم زیکرە بڵێ؟ ئەی ئەگەر لە نوێژدا بیڵێ؟! ئەی ئەگەر چەندین جار لە سـوجدەدا کە نزیکترین کاتە کە بەندە لە خوای خۆی نزیکە بیڵێ؟! ئەی ئەگەر لە شـەوانی مانگـی ڕەمەزاندا بێ؟! ئەی ئەگەر لـە کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا بێ. لە دوای بە ڕۆژووبوونی چەندین ڕۆژ، دوای پاکبوونەوەی ڕوح و دڵ و دەروون؟! ئەی ئەگەر ئەو نوێژە هاوکاتی شـەوی قەدر بێ؟! ئەوە هەر لێی گەڕێ و دەستی لێ مەدە. چونکە نازانی پاداشتەکەی چەندە گەورەیـە. تەنها ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دڵمان ئارام دەکاتەوە لەبارەی گەورەیی (صَلاةُ التَّسـبیح)ەوە هاتوە و (عیکریمە) لـە ئیبنو عەبباسـەوە ڕیوایەتی کـردوە و دەفەرموێت: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) بـە (عَبّاس)ی کوڕی (عبدالمطلب) کـە مامی پێغەمبەرە فەرمووی: ئەی عەبباس، ئەی مامە. ئایا شتێکت نەدەمێ، ئایا شتێکت پێ نەبەخشم. ئایا تۆ تایبەت نەکەم بە شتێك، ئایا شتێکت فێرنەکەم (دە) جۆر گوناه بسڕێتەوە، وە ئەگەر ئەو شتەت کرد، خوا لە تاوانی ئەوەڵ و ئاخر و کۆن و نوێت و هەڵە و قەسـتیت و بچوك و گەورە و نهێنی و ئاشـکرات ئەبوڕێـت؟! (دە) خەصڵەتـە. ئەویش ئەوەیە: چـوار ڕکات نوێـژ بە سـەر یەکـەوە بکەیت لە هەمـوو ڕکاتەکاندا سوڕەتی فاتحە و سوڕەتێکی تری قورئان بخوێنیت، کاتێ لە خوێندن بوویتەوە، لە یەکەم ڕکاتدا هێشـتا بە پێوەی نەچوویتە ڕکوع، پانزە جار بڵێ: (سُـبْحانَ اللّهِ وَالحَمْدُلِلّهِ وَلا إلهَ إلاّ اللّه وَاللّه أكبر) پاشان ڕکوع ببە و لە کاتی ڕکوعەکەدا (دە) جار ئەوە بڵێوە. پاشـان سـەرت

بەرز بکەرەوە لە ڕکوع و (دە) جار لە ســوجدەکەتدا بیڵێرەوە. پاشان ســەر بەرز بکەوە لە ســجود (واتە: لە دانیشــتنی ئیســراحەت پێش ئەوەی هەســتی) دەجار بیڵێوە. ئەوە (٧٥) جار لە هەر ڕکاتێکدا، بەو شــێوەیە هەر چوار ڕکاتەکە تەواو ئەکەیت. جا ئەگەر توانیت ڕۆژی یەکجار ئەو نوێژە بکە. ئەگەر نەت کرد هەر جومعەی جارێ. ئەگەر نەت کرد ســاڵی جارێــك بیکە ئەگەر بۆت نەکرا لــە ژیانتا یەکجار بیکە... (ئەم فەرموودەیە: ئەبوداود و ئیبن ماجە و ئیبنو خوزەیمە، لە صەحیحەکەیدا گێڕاویانەتەوە. هەروەها (طەبەرانی)یش ڕیوایەتی کــردوە). حافظی مُنْــذري لە (الترغیــب ج١ ص٢٣٨)دا دەفەرموێت: ئەم حەدیســە لە زۆر ڕێگاوە ڕیوایەت کــراوە. هەروەها لە کۆمەڵێك صەحابــەوە، وە کۆمەڵێك لە زانایان بە (صەحیح)یان داناوە. لەوانە: حافظ ئەبوبەکری عاجوری، وە مامۆستامان (ئەبو محمد عبدالرحیم میصری) وە مامۆستامان (حافظ ئەبو حەسەنی مەقدیسی) ڕەحمەتی خوایان لێ بێت.

ئیبنو موبارەك دەفەرموێت: نوێژی تەســبیح ڕەغبەتی پێ دراوە، موســتەحەبە ئادەمیزاد هەموو کاتێك ڕابێت لەســەری و لێی بێئاگا نەبێت..

ئــەوەی ماوە بیڵێین ئەوەیە: بۆچی شــەوی قەدر (لَیْلَةُ القَدْر) لە کۆتایــی مانگــی ڕەمەزاندایە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: تاوەکو نیشــانەی بەردەوامی بێ بۆ دوای ڕەمەزان و نیشــانەی ئەوە بێ کە موســڵمان نەك لە عیبادەت ماندوو نابێ، بەڵکو زیاتر لێی گەرم دەبێ.

وه ئایا بۆچی ده‌بێ ته‌واوی شـــه‌وه‌که موســـڵمان به خه‌به‌ر بێ و نه‌خه‌وێـــت؟! ئه‌مه‌ش وه‌کو ڕه‌مزی ئه‌وه‌ی که بڵێی: منی موســـڵمانی ڕۆژووه‌وان نه‌ك هه‌ر وه‌ڕس نه‌بووم به‌ڵکو ئه‌گه‌ر جاران هه‌ر ته‌راویحم ده‌کرد. ئه‌وا ئێســـتا تا به‌یانی ناخه‌وم. که‌واته: ئه‌ی موســـڵمان دوای ڕه‌مه‌زانیـــش له خواپه‌رســـتی و مزگه‌وت و عیبادەت بـــه‌رده‌وام به. چونکه شیعاری موسڵمان (فَإِذا فَرَغْتَ فانْصَبْ. وَإلى رَبِّكَ فَارْغَبْ)..

خـــوای په‌روه‌ردگار به ڕه‌حمی خۆت له خێر و به‌ره‌که‌تی شـــه‌وی قه‌در بێبه‌شمان مه‌که. آمین.

## سه‌رچاوه‌کان:


١. ته‌فسیری ئاسان، بورهان محمد أمين. چاپی نۆزده‌هه‌م، ل١١٩١.

٢. گوڵبژێر، هه‌ڵبژارده‌ی شیعری شاعیرانی کورد، ل٢٩٩، ل١٤٠.

٣. الصَّحيح مِنَ الأَثَر في خُطَبِ المِنْبَر، ص١٧١. تَأليف: أَبي عبدالله. فَيْصَلُ بن عبده الحاشِريِّ.

٤. تابلۆ ناوازه‌کان، نوعمان مه‌لا مصطفى سه‌رگه‌تی، ل٢٠٨.

٥. مَوْســـوعَة أَسْماءَ الله الحُسْـــنَى، د.محمد راتب النابُلُسي، ج١ ص٥٨٩. ص٥٩٣.

٦. لاشه‌ی ئاده‌میزاد، جلال الدين نجم الدين، ل١٢، ل٨.

٧. جه‌سته‌ی مرۆڤ، جلال محمد سرۆچلی.

٨. فقه السـنة به کوردی، سه‌ید ســـابق، وه‌رگێڕانی: حه‌مه ئه‌مین ئه‌حمه‌د به‌رزنجی ب١، ل٣٤٩.

وتاری جەژنی ڕەمەزان

# الله اكبر نۆ جار دەوترێ

اللهُ أكبر كَبيراً، وَالحَمْدُلله كَثيراً، وَسُبْحانَ الله بُكْرَةً وأَصيلاً..

**الحَمْـدُلِلّهِ الَّذي سَـهَّلَ لِعِبادِهِ طَريقَ العِبادَةِ وَيَسَّـرَ. وَجَعَلَ لَهُمْ عَيداً يَعُودُ عَلَيْهِمْ بَعْدَ إكْمالِ صِيامِهِمْ وَيَتَكَرَّر. وَواصَلَ لَهُمْ مَواسِمَ الخَيْراتِ لِيُوَفيهِمْ أُجُورَهُمْ وَيَزيدَهُمْ مِنْ فَضْلِهِ الَّذي لايُحْصَرُ. أَحْمَدُهُ وَهُوَ أَحَقُّ أَنْ يُحْمَدَ وَيُشكَرَ. وَأَشْهَدُ أَن لا إله إلاّ اللّه وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ. شَهادَةً يَأْمَنُ مَنْ قالَها وَعَمِلَ بِمُقْتَضاها يَوْمَ الفَزَعِ الأكْبَر. وَأَشْهَدُ أَنَّ سَيِّدِنا مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. صاحِبُ المَقام المَحْمودِ وَالكَوْثَر. صَلَّى اللّه عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ وَسَلَّمَ تَسْليماً كَثيراً. إلى يَوْمِ البَعْثِ وَالمَحْشَر...**

**أُوصيكُمْ عِبادَ اللّه. وَنَفْسـي قَبْلَكُمْ بِتَقْوى اللّهِ الكَريم وَطاعَتِهِ وَلُزوم أَوامِرِهِ وَكَثْرَةِ مَخافَتِهِ. فَإِنَّ اللّه مَعَ الَّذينَ اتَّقوا وَالَّذينَ هُمْ مُحْسِنُونَ. وَاعْلَمُوا أَنَّ هذا اليَوْمِ. يَوْمُ عيدٍ يَفْرَحُ فيهِ المُؤمِنُونَ بِما مَنَّ اللّه بِهِ بالطّاعاتِ وَالقُرُباتِ. فَإنَ الفَرَحَ بِذالِكَ هُوَ الفَرَحُ المَشْرُوعُ.. (قُلْ بِفَضْلِ اللّهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذالِكَ فَلْيَفْرَحُوا هُوَ خَيْرٌ مِمّا يَجْمَعُونَ)..**

**ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز: جەژنی ڕەمەزانی ساڵی (....) کۆچیتان لێ پیرۆزبێت. جەژن لە ئیسلامدا، دوای سەرکەوتن دێت.**

دوای بە دەســـتهێنانی سەرکەوتنی گەورە و دەسکەوتی گەورە دەبێت بـــە جەژنـــی مرۆڤی موســـڵمان. جەژنی ڕەمەزان دوای دڵخۆشـــی بە عیبادەتی ڕەمەزان و تەراویح و مەوعیزەی عەسران و شەوان. جەژنی قوربانیـــش، دوای عیبادەتی حەج. کە حاجییـــەکان بە بەجێهێنانی فەرزی حەج و ئێمەش بە ســـەربڕینی حەیوانی قوربانی شادمانین و جەژن دەکەین.

بەڵێ، مانگی ڕەمەزان دەروازەیەك بوو. دوای سێ ڕۆژ بە ڕۆژووبوون و تەراویح و شەونوێژ. ئەو خولە گەورە بە جەژنی ڕەمەزان کۆتایی هات، ئەمڕۆ ڕۆژی وەرگرتنەوەی ئەنجامی خولەکەیە. ئەمڕۆ لای فریشتەکان ناسراوە بە (يَوْمُ الجائِزَة)، خەڵکانێکی زۆر لە ژن و پیاو و پیر و لاو -إنْ شـــاءَ اللّه ئێمەش لەوانە دەبین- کە لە نوێژی جەژن چوونە دەرەوە، فریشتە ئەنجامەکەی نیشان دەدات، کە ئەوەیە لێی نوسراوە:

(مَنْ صامَ رَمَضانَ إِيماناً وَإحْتِساباً، غُفِرَ لَهُ ماتَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ).

بەڵـــێ، هەرکەســـێ مانگی ڕەمەزان بـــە ڕۆژوو بووبـــێ. (إيماناً) بە بیروباوەڕێکی تەواو چەســـپاوە وە کە بەڕاســـتی بە ڕۆژووبوون -لەم وەرزە گەرمەدا- ئیمانی پتەوی دەویست کە مەردانە شان بدەیە بەر ڕۆژووگرتن و ئامادەبوونی تەراویحی شەوانە.

(وَاحْتِســـاباً) کـــە ڕۆژووەوان لە ڕۆژووگرتنەکەیـــدا دەڵێ: خوایە گیان تەنهـــا بـــە ئومێدی پاداشـــتی تۆ بـــە ڕۆژوو بووین.. کە برســـیەتی و تینویەتیمان واز لێ هێنا، زۆر کار و کەسابەتمان واز لێهێنا، یان کەممان کردەوە، کاتی نانخواردن و خەومان گۆڕی. غەیری بەجێهێنانی ئەمر و

فەرمانی تۆ. هیچ شتێ ئەمەی پێ نەکردین، ئەم جۆرە کەسانە لە لای شـوێنی نووسینی ئەنجامەکەوە نوسراوە: (غُفِرَ لَهُ ماتَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ). ئەوە ڕابـردووت پاك بـۆوە لە گوناه، بەڵام نەك هەر ئەوەندە، بەڵکو بانقی چاکە و حەسەناتت پڕبوە لە چاکە بۆ ڕۆژی قیامەت. ئەویش بە:

١. تەراویح و شەونوێژ.

٢. قورئانخوێندن و گوێگرتن لە قورئان، کە بە خوێندنی یەك پیتی ئەو قورئانە (١٠) چاکە بۆ ئەو کەسە دەنوسرێ کە خوێندوویەتی..

٣. دانیشـتنی شەوانی قەدر. کە پاداشتی خواپەرستی (١٠٠٠) مانگ زیاتری بۆ موسـڵمانان مسۆگەر کردوە. بۆ ئەو کەسانەی لەو شەوەدا بە ئاگابوون.

٤. ئـەو سـەرفیترە و زەکاتەی کە بەخشـیتان، ئـەو صەدەقە و خێراتـەی کە کردتـان، هەرچەند کـەم بێ. ئەگـەر دوور لە ڕیا و منەتکردن بەخشرابێ، بە هەر دینار و دۆلارێ کە بەخشیتان پاداشتی یەك بە حەفتاویەك بە حەوت سـەدو یەك بە حەوت هەزارتان وە: (وَاللهُ يُضاعِفُ لِمَنْ يَشـاءُ) هەندێ کەس زۆر لەوەشی زیاتر بۆ نوسراوە بە ویسـتی خوا بە ڕاستی ئەمە دڵخۆشـی دەربڕین و جەژن گرتنی دەوێ، ئـەی ئەو کەسـەی کە زۆرت بەخشـی و فرمێسـکت کرد بە پێکەنیـن. چۆن دڵـی خەڵکیت خۆش کرد، إنْشـاءَ اللّٰه ئاوا خواش دڵـی تۆ خـۆش دەکات، چونکـە (رَسُـولُ اللّٰه) (ﷺ) بەڵێنی داوە و فەرموویەتی: (مَنْ فَرَّجَ عَنْ مُسْـلِمٍ كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ الدُّنيا، فَرَّجَ اللهُ عَنْهُ بِها كُرْبَةً مِنْ كُرَبِ يَوْمِ القِيامَةِ). مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

ئــەی ئەو کەســەی کە خەڵکت لە قــەرزاری ڕزگار کرد. ئەو پارە گرانەت لەســەر شــان لابرد، کەوای لــێ هاتبوو لەبەر قــەرزاری لە ژیــان بێزار ببوو، دنیای ڕووناکی لا تاریك ببوو، کە تۆی دەوڵەمەند و هەبــوو قەرزەکەت لەســەر لابرد و لە موحتاجی دەســتی خەڵکی ڕزگارت کرد. وات کرد شــەوان بە ئاسودەیی سەر بکاتە سەر سەرین. (إِنْ شــاءَ اللّه) ئــاوا خوای گــەورە تۆش لە موحتاجــی دەپارێزێ و هەرگیز موحتاجی دەستی هیچ کەس نابی و دەست ناکەی بە باخەڵ و قاسە و کاسەی خاڵیدا.

ئەی ئەوکەســەی کە بە پارەی تۆ، بە ویســتی خوا نەخۆشێك لە ئــازار و مەینەتی ڕزگاری بوو، چارەســەری نەخۆشــیەکەی بوو. (إِنْ شــاءَ اللّه) ئاوا خوا شیفای نەخۆشــی لاشەی تۆش دەدات و خۆت و خانەوادەت لە نەخۆشی دەپارێزێ. ئەی ئەو کەسەی کە لەو پارەیەی کــە خۆت زۆرت خۆش دەویســت و بەرەنــج و ماندووبوونی زۆر بە دەستت هێنابوو، بەڵام لەبەر خوا وازت لێ هێنا و دات بە هەژارێك، لــە دەمی خۆتــت گرتەوە بۆ موحتاجێك. لە منالی خۆتت گرتەوە و کردتــە بەرگی منالی خەڵکی هەژار. تەنها و تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوا. (إِنْ شــاءَ اللّه) بەهەشــتت بۆ خۆت مسۆگەر کرد. با سەرێك لە ماڵی پێغەمبەری خوا بدەین. (ﷺ)، بزانین دایە عائیشــە چیمان بۆ دەگێڕێتەوە. (عَن عائِشَــةَ: جاءَتْني مِسْكينَةٌ تَحْمِلُ إبْنَتَيْنِ لَها، فَأَطْعَمْتُها ثَلاثَ تَمَراتٍ، فَأَعْطَتْ كُلَّ واحِدَةٍ مِنْهُما تَمْرَةً وَرَفَعَتْ إلى فيها تَمْرَةً لِتَأْكُلَها، فَاسْــتَطْعَمَتْها إبْنَتاها، فَشَقَّتِ التَّمْرَةَ الَّتي كانَتْ تُريدُ أَنْ تَأْكُلَها بَيْنَهُما، فَأَعْجَبَني شَأْنُها، فَذَكَرْتُ

الَّذي صَنَعَتْ لِرَسُولِ الله (ﷺ) فَقالَ: إِنَّ اللهَ قَدْ أَوْجَبَ لَها بِها الجَنَّةَ أَوْ أَعْتَقَها بِها مِنَ النّارِ) رَواهُ مُسْلم

**هەر لە ڕیزی ئەم دەرچوانەن بە پلەی ئیمتیاز و زۆرباش ئەو پیر و بە ســالآچوانەی، ئەو نەخۆشانەی شەرع ڕێگای بە ڕۆژوونەبوونی پێ دان، ئەو ئافرەتە حامیلە و شــیردەرانەی شــەرع ڕێگای پێ داون، بە ڕۆژوو نەبن.. ئەو کاسبکارانەی، ناچاری وای لێ کردوون بە ڕۆژوو نەبن، بەلآم کەس بە ئاشــکرا نەیبینین قومە ئاوێك بخۆنەوە. دڵیان غەمبار و مەحزوون دەبوو کە ڕۆژوەکەیان دەشــکاند، ئەوە (إِنْ شاءَ اللّه) بــە قەزاکردنەوەی ڕۆژوەکانتان و ئەو فیدیەی بەخشــیتان، لە ئەجر و پاداشــتی ڕۆژوەوانانتــان و ئەو فیدیەیەی بەخشــیتان، لە ئەجرو پاداشــتی ڕۆژوەوانانتان کەم نابێتەوە. ئەو جۆرە کەســانەش لەسەر کارتەکەیان نوسراوە:** (غُفِرَلَهُ ماتَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ).

**کەواتە: بە ڕاستی جێگای خۆیەتی دڵمان خۆش بێ و جەژن بۆ ئەم جۆرە کەسانەیە. کە ئاوا لە خولی مانگی ڕەمەزاندا سەرکەوتوو بوون.**

**بەڕێــزان: ئەم جێژنە، ئەوە فەرەحی و جەژنی یەکەممانە کە لە دنیــادا ئەنجامــی دەدەین و پێی دڵخۆش دەبیــن. جەژنی دووەممان ئــەو کاتەیە: کە بە خزمەتی خوای پەروەردگارمان دەگەین و ئەجر و پاداشــتی ڕۆژوەکەمان وەردەگرینەوە. کە تــا ئەو کاتە هیچ کەس نازانێ پاداشتی ڕۆژووی ڕەمەزان چەند گەورەیە. هەتا ئەو کاتە، ئەو کارتەت پێچراوەیەوە و تەنانەت فریشتەکانیش نەیان زانیوە پاداشتی ئــەو ڕۆژوەت چەندە. چونکە خوا خۆی فەرموویەتی لە فەرموودەی**

قودسى دا: (الصَّوْمُ لِي وَأَنا أَجْزِي بِهِ) لەبەر ئەوەی کە یاسایەکی چەسپاوە کە: (الجَزاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَل)، تۆی ئیمانداری بە ڕۆژوو کە لە دنیادا تەنهــا خــوا ئاگای لێ بوە کە بە واقیعی بـــە ڕۆژووی یان نا، چونکە دەتتوانـــی لـــە بەرچاوی هەمـــوو خەڵکی خۆت بە بە ڕۆژوو نیشـــان بدەی، بەڵام بە پەنهانیش بخۆی و بخۆیتەوە. کەچی ئیمانبوونت بە چاودێری خوا وای لێ کردووی کە بە ڕۆژوو بی و خۆت بپارێزی لە هەموو شتێك کە ڕۆژوو بەتاڵ دەکاتەوە. جا پاداشتی ئەم خواناسییە، تەنهــا خوا خــۆی دەیزانێ، لەو ڕۆژەدا ئەو هەموو خێر و پاداشـــتە چــاوەڕوان نەکراوە دەبینی، لـــەو ڕۆژەدا کە هەموو کەس موحتاج و ئاتاجە بۆ یەك چاکە. جا چۆن کەســـێك کە لە ئەوپەڕی تەنگانەدا، کـــە موحتاجە بـــە دینارێك، بیری دەکەویتەوە کە لە فلان شـــوێندا پارەیەکی دانراوی هەیە. کە دەچێ سەیری دەکات، چەندین ملیۆنە، لە کاتێکدا ئەم چاوەڕێی چەند هەزارێکی دەکرد و وا ئێستا بە یەکجاری لە موحتاجی ڕزگاری بوو، بی هێنە بەرچاوت ئەو کەســـە لەو کاتەدا چەند خۆشـــحاڵە. بڕوا بکەن و یەقینتان هەبێ، موسڵمانی ڕۆژووەوان لـــە ڕۆژی قیامەتـــدا ئاوا خۆشـــحاڵ دەبێ، بگـــرە زۆر زیاتر. چونکە ئەوەی لە دنیادا لە موحتاجی ڕزگاری بوو، هێشتا لە ناخیدا ترسێکی هەیـــە بۆ داهاتوو، کە نەکا ڕۆژێ موحتاجی ڕووی تێ بکاتەوە. بەڵام ئەو کەســـەی کە لە قیامەتا بە هۆی قورسی تەرازووی چاکەکانیەوە ڕزگاری بوو، ئیتر هەرگیز خەم و خەفەت بە خەیاڵیشیدا نایەتەوە، ئەمـــەش وەعـــد و بەڵێنی خوایە: (فَأَمَّا مَنْ ثَقُلَتْ مَوازِينُهُ فَهُوَ فِي عِشَـــةٍ

راضِيَة).. بە ڕاستی ئەوکاتە جەژنی ڕاستەقینەی موسڵمان دەست پێ دەکات. ئــەوە مانای فەرموودەکەی ســەرومرمان -محمدە- (ﷺ) کە فەرمووی: (لِلْصّائِم فَرْحَتانِ يَفْرَحُهُما: إذا أَفْطَرَ فرِحَ، وَإذا لقِيَ رَبَّهُ فَرِحَ بِصَوْمِه) رَواهُ البُخاري (١٩٠٤) وَمُسْلِم (١١٥١)

بەڵــێ ئیمانداران، جەژنی موســڵمانی ڕۆژووەوان لە کاتێکدایە، کە قورئان وەصفی دەکات کە چەند سامناك و چارەنوسسازە و هەر کەس لــە خەمی خۆیایەتی، کە خوا دەفەرمــوێ: (يَوْمَ يَفِرُّ المَرْءُ مِنْ أَخيهِ وأُمّهِ وَأَبيهِ وَصاحِبَتِهِ وَبَنيهِ، لِكُلِّ امرئٍ مِنْهُمْ يَوْمَئِذٍ شَأْنٌ يُغْنيهِ)..

بەڕێــزان: ڕۆژووی قبووڵکراو لای خوا، ســەرەنجام و بەرهەمەکەی لە جەژنــدا دیارە. کە خواپەرســتی و دینداریت لەلا شــیرینە و کۆتایی پێ نایەت. چونکە هەدەف لە ڕۆژوو گەیشتنە بە پلەی تەقوا (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ). تەقواش یانی: ﴿ وَمَن يُعَظِّمْ شَعَٰٓئِرَ ٱللَّهِ فَإِنَّهَا مِن تَقْوَى ٱلْقُلُوبِ ﴾ الحج: ٣٢

بەڵێ تەقوا وا لە دڵدایە و بەرهەمەکەی لە کردارەکانتدا دەردەکەوێ: ئایا لە هەڵسوکەوتت لە ژیانتدا خوات لە بیرە؟! ئایا لەبەرخوا چاکە دەکــەی و لەبەر فرمانی خوا واز لەخراپــە دێنی؟! ئەگەر ئاوا بووی ئەوە تۆ موتەقی و ڕۆژوو کاریگەری خۆی هەبووە لە سەرت. جا تەقوا وا لە ناو دڵدایە. نەك لە جلوبەرگ و بە ڕواڵەت خۆ بەچاك نیشاندان. پێغەمبــەری خوا (ﷺ) ئاماژەی بۆ ســەر ســنگی کــرد و فەرمووی: (التَّقْــوى هاهُنا، وَأَشــارَ إلى صَدْرِهِ ثَلاثَ مَــرّاتٍ) وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامــۆژگاری یەکەبەیەکەمان دەکات و دەفەرمــوێ: (إتَّقِ اللهَ حَيْثُما كُنْتَ) لە هەرجێگایەکی تەقوای خوا بکە و چاودێری خوا بە ســەر خۆتەوە

ببینــە. ئایا وەکو لە مزگەوتدا خــوات لە بیرە، لە بازاڕیش، لە کاتی کڕین و فرۆشتنیشــدا، کە دینار و دۆلار لە دەســتا دێ و دەچێ، هەر ئاوا خوات لە بیرە و یادی دەکەی و بەقسەی دەکەی؟! ئایا وەکو لە ناو خەڵکا خێر دەکەی و خۆت لە خراپە دەپارێزی، ئایا ئەگەر کەســیش چــاوی لێــت نەبوو، هــەر وای؟! کە هەدەفــی ڕۆژووش هەر ئەوەیە: کــە ئەگەر دوور بووی لە چــاوی خەڵکیش، لەبەر خوا ســنورەکانی نەشــکێنی. سُبْحانَ اللّه، ڕۆژوو هەرچی ڕیا بێ تێیدا ناکرێ. چونکە تەنها خوا ئاگای لێیە کە بەو تینویەتیە کە هەموو لاشــەت بۆ قومێ ئاوی ســارد هاوار دەکات، دەســتی لێ دەدەی، کەچی دەمی بۆ نابەی. کــە غەیری خواش کەس چاوی لێــت نییە.. جا ئەگەر ئەم چاودێری خوایە، لە دوای ڕەمەزانیشەوە هەر بە جێگیری مایەوە لە ناو ناخ و دڵ و دەروونتدا، وە جێگیر بوو. ئەوە نیشانەی قبوڵبوونی ڕۆژووەکەتە و (غُفِرَ لَهُ ماتَقَدَّمَ مِنْ ذَنْبِهِ) دەتگرێتەوە و لاپەڕەکانت سپی بوونەوە.

بــەڵام: ئەگەر خوانەخواســتە، ڕۆژووی ڕەمــەزان تەنها هەر ئەوە بــوو کە نانخــواردن و ئاوخواردنەوەی لێ قەدەغــە کردبووی، وە لە جەژندا چوویتەوە ســەر ڕەفتارەکانی پێش ڕەمەزانت، ئەوە پەنا بە خوا نیشــانەی دەرنەچوونە لە خولی ڕەمەزان. ئەو کەسانەی لەسەر کارتەکەیان نوســراوە: (مَنْ لَمْ يَدَعْ قَوْلَ الزُّورَ وَالعَمَلَ بِهِ، فَلَيْسَ لِلّهِ حاجَةٌ أَنْ يَدَعَ طَعامَهُ وَشَرابَهُ). رَواهُ البُخاري (٦٠٥٧)

ئیماندارانی بەڕێز: لە ئادابەکانی جەژن ئەمانەن:

١. لــە جەژندا دڵــت پاك بکــەوە، هەروەکو عادەتــەن ماڵت پاك

دەکەیتەوە و خاوێن دەکەیتەوە. چونکە لەفەرمودەی خۆشەویستماندا (ﷺ) هاتوە، کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی ئەوەی کە ئایا کێ باشترین کەسە؟! فەرمووی: (مَخْمُومُ القَلْبِ، صَدُوقُ اللِّسانِ)

مرۆڤی موسڵمانی دڵپاکی زمان ڕاستگۆ.. هەر کەس دەیەوێ بزانێ کەسێکی چاکە یان نا، با سەیرێکی خۆی بکات و بە خۆداچوونەوەیەك بـــۆ خۆی بکات، کە ئایا ئەم دوو ڕەوشـــتەی تێدایـــە؟! یەکەم: دڵ و دەروونـــی پاك، کـــە حەســـودی و بەخیلی و ڕق و قینـــی بەرامبەر کەســـی تێدا کۆنەبۆتەوە. دووەم: ڕاســـتگۆیی. کە زمانی پارێزراوە لە درۆ و ئەوەی دەیڵێ ڕاســـتە.. دەی با هەروەکو لە جەژندا ماڵەکانمان خاوێـــن دەکەینەوە، گەســـکێکیش بە دڵماندا بێنیـــن و لە پوخڵەوات پاکی بکەینەوە. ئەینا ماڵی ڕازاوە و چوکلێت و شیرینی، بەڵام ناخی بۆگەن، جەژن پیرۆز ناکەن..

٢. پێویستە لە جەژندا، ئادابی سەردان و هاتووچۆ ڕەچاو بکەین. بەیانیان زۆر زوو مەچن بۆ ســـەردانی ماڵان. با بە ئیســـراحەت نانی جەژن بخۆن و خۆیان بگۆڕن و ئامادەی پێشـــوازی میوان بن، ئەمجا ســـەردان بکەن. لە کاتی نزیك نیوەڕوانیشدا سەردانەکان کۆتایی پێ بهێنن هەتا نزیکی عەســـر و ڕەچاوی نانخواردنی نیوەڕۆ و پشـــووی نیوەڕوان بکەن و با ســـەردان و دانیشـــتنی ماڵەکان و جەژنە پیرۆزە زۆر درێژە نەکێشێ و لە چەند خولەکێ تێپەڕ نەکات..

٣. ئاگاتان لە منداڵ بێ، پارەیەکی زۆری وایان مەخەنە بەردەســـت، کـــە بـــی دەن بە تەقەمەنـــی و یاری ئاگری و میزڵـــدان و هەڵمات و

جگــەرە. کــە زەرەر بەخۆیان و بە خەڵکیــش بگەیەنن و جەژن لە خۆیــان و لە بنەماڵە و خەڵکیش تاڵ بکەن.. ئامۆژگاری منداڵەکانتان بکــەن، کــە ئاگاداری خۆیان بن و لەهاوڕێــی خراپ بەدوور بن و بە ئــەدەب و هێمنییەوە ســەردانی ماڵان بکەن و زمانیــان بپارێزن لە هاتووهاوار و جوێن و قســەی ناشــیرین.. تکایە منداڵەکانتان بەڕەڵای کــۆڵان مەکەن و نەزانن ڕوویــان لە کوێ کردوە، هیچ مەعقول نییە منداڵ تا نیوەی شــەوان لە کۆڵان بێ و بە دەمانچەی ترەقە بە شوێن یەکتردا ڕابکەن و دایك و باوکیش بە دیار تەلەفیزیۆنەوە دانیشتبێ، یان خەریکی قســەکردن بێ لەگەڵ میوان!! چونکە لە دەســتچوونی منداڵ ئاسانە. بەڵام دەسکەوتنەوەی گەلێ گرانە.. دەبا ئاگادار بین.

٤. تــکام وایە لە دوکاندارە بەڕێزەکان. کــە ئێوە خەڵکانی خاوەن ڕێز و حورمەتن و دەستی خێرن لە ناو کۆمەڵگادا و پێداویستیەکانی خەڵکــی دابیــن دەکەن. بە ویســتی خــوا. لەوە گەورەتــر بن کە بۆ قازانجــی کەم، لە چەند ڕۆژێکدا، ئەو شــتانە بهێننــە دوکانەکانتان و بــە منداڵانی بفرۆشــن کــە زەرەریان لێ دەدات. وەکــو: تەقەمەنی و یــاری ئاگــری و دەمانچە و میزڵدان و هەڵمات و ئەم جۆرە شــتە زیانبەخشــانە. لە جیاتی ئەوە ئەو یاری و شــتانەیان بۆ بێنن کە لە ڕووی جەســتەیی و تەندروســتی و دەروونییەوە شادمانیان دەکات و سودیان پێ دەگەیەنێ.

٥. داواکارم لــە هەمــوو خوشــك و برایەکی موســڵمان کە خۆتان بپارێــزن لە تەوقەی حەرام. جگە لــە خێزانی خۆت. دایکی خۆت و

خوشــك و پووری خۆت. یان کچ و کچــەزا و کوڕەزای خۆت، هەموو کەســێك حەرامە تەوقەی لەگەڵ بکەی، با ئەو کەســە ئامۆژن، یان خاڵــۆژن یــان براژن، یان ژن خوشــکت بێ، جا ئــاگاداری خۆتان بن تووشــی ئەو حەرامە نەبن. پێغەمبەری خــوا (ﷺ) دەفەرموێ: (لَأَنْ يُطْعَــنَ فِي رَأْسِ أَحَدِكُــمْ بِمِخْيَطٍ مِنْ حَدِيدٍ – خَيْرٌ لَهُ مِنْ أَنْ يَمَسَّ اِمْرَأَةً لاتَحِلُّ لَهُ) حَدِيْثٌ صَحِيح، صَحَحَّهُ الأَلْبَانِي فِي صَحِيح الجامِع: بِرَقَم (٥٠٤٥)

واتە: ئەگەر بێت و بە ئاسن بکێشرێ بە سەری یەکێك لە ئێوەدا، هێشــتا ئەوەی بۆ چاکترە لەوەی کە دەســت بــدات لە ئافرەتێك کە حەڵاڵی نییە!!.

جائەگــەر (أَنْ يَمَــسَّ) هــەر بەریەککەوتنێکی بچــووك ئەمەی بۆ درووســت بکات، واللّٰه وَرَسُولُهُ أَعْلَم: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە باسی ســەر و دەســت لێدان و بەریەککەوتنی ژن و پیاو، یان کوڕ و کچی نامەحرەمــی بە یەکــەوە کرد. چونکە لە ڕووی زانســتییەوە کاتێك مرۆڤ تەوقە لەگــەڵ بەرامبەرەکەیدا دەکات، بە تایبەت ئەگەر ئەو بەرامبەرە لە ڕەگەزی بەرامبەر بێ. ئەوە ناولەپی دەست بەهێزترین خانەی گەیەنەری تێدایە و یەکســەر خانەکانی هەست لەناو مێشکدا ئــەم بەریەککەوتنــە دەگوازنــەوە و پەیامێك ئاڕاســتە دەکەنەوە و خرۆشان و جووڵانێك دروست دەبێت.. شەریعەتی ئیسلامیش دڵپیسی بڵاوناکاتــەوە. وە نافەرموێ: هەرچی تەوقەی لەگەڵ نامەحرەم کرد، خراپەکار و نیازخراپە. بەڵکو ئەمە دەچەسپێنێ لە پێناو ڕێگری لە کەســانی گورگ ئاســا، کە بە دڵنیاییەوە هەبوە و هەشە. کە تەماحی

له ژن خوشکی خۆی کردوه و خیانەتی لەگەڵ کردوه. جا بۆ ڕێگرتن له ئەو کەســـه دەروون نەخۆشــانه، ڕێگا له هەموو کەس دەگیرێ کە بیەوێ تەوقە بکات لەگەڵ نامەحرەم. یا لەڕووی خزمایەتیشەوە زۆر لێی نزیك بێ، یان بە چاوی خوشك و برایەتی تەماشای بکات.

٦. چــاك وایە لەکاتــی جەژنە پیــرۆزەدا بڵێی: (تَقَبَّــلَ اللهُ مِنّا وَمِنْكُــمْ) کە ئەمە لە (الحاوي للســيوطي ج١ ص٨٢ وە: الفتاوى لأبن تيمِيَّة (٤٢/ ٢٥٣)دا هاتوە.

کەواتە: جەژنە پیرۆزەی موســڵمان، دوعا و پاڕانەوەیە بۆ خۆی و بۆ ئیمانداران، کە خوای گەورە طاعەت و عیبادەتی مانگی ڕەمەزانیان لێ قبوڵ بفەرموێ.

دووبارە داواکارم لە خوای گەورە کە جەژنی ڕەمەزان لە هەموو لایەك پیرۆز بکات و عیبادەت و خواپەرستی مانگی ڕەمەزانمان لێ قبوڵ بکات و لەو کەسانە بین کە لەم ڕۆژە موبارەکەدا مەدالیای لێخۆشبوونیان بە گەردندا دەکرێ. خوای گەورە عاقیبەتی هەموو لایەکمان بەخێر بگێڕێ و لە هەموو ناخۆشــی و نەخۆشــییەك و دوور لە دینیەك بمانپارێزێ. (أَقُولُ قَوْلي هذا وَأَسْــتَغْفِرُاللهُ العَظيمَ لي وَلَكُمْ وَلِســائِرِ المُسْلِمينَ مِنْ كُلِّ ذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرُوهُ إِنَّهُ هُوَ الغَفُورُ الرَّحيم)..

(رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ)

اللّهُمَّ آمين.

وتاری یەکەم بۆ مانگی شەوال

# بەردەوام بوون لەسەر خواپەرستی لەدوای مانگی ڕەمەزان

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**هەزاران سوپاس بۆ تۆ ئەی خوای پەروەردگارمان. خوای تاك و تەنها و بێشەریك، کە یارمەتیت داین و هیدایەتت داین بۆ بە ڕۆژووبوونی مانگی پڕ ڕەحمەت و بەرەکەتی ڕەمەزان و خوایە هەروەکو هیدایەتت داین و یارمەتیت داین. لێشمان قبوڵ بکەی. آمین.**

**هەزاران سـەلات و سەلامی خوا، لە سەر ڕوحی هەمیشە زیندووی سـەردار و سـەروەرمان پێغەمبەری ئاخر زەمان، خاتەمی ئەنبیا و مورسـەلین. محمدی ئەمین.. ڕەحمەت و میهرەبانی خوا لە سەر یار و یاوەرانی و هەموو ئیمانداران هەتا ڕۆژی دوایی.**

**بەڕێـزان: ئێمەی موسـڵمان هەروەکو لە ڕەمەزانـدا بەردەوام لە هاتووچـۆی مزگەوتـدا بوویـن و خەریکی یادی خـوا و فێربوونی شـەریعەتی ئیسـلام و خواناسی و خواپەرسـتی بووین. پێویستە لە سـەرمان لە دوای ڕەمەزانیشـەوە هەر بەردەوام بین و (ڕەببانی بین نەك ڕەمەزانی). چونکە ئەو خوایەی کە لە ڕەمەزاندا دەمانپەرسـت، ئـەو خوایە هەر باقییە و ئێمەش هـەر بەندەی ئەوین. ئایا ئێمەی موسـڵمان تام و چێژمان لە مانگی ڕەمەزان کـردوە؟! ئایا ئەنجامی**

ڕۆژووگرتنمـــان تێدا هاتۆتـــە دی؟! کە هەدەفـــی ڕۆژوو بریتی بوو: (لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ).. تەقواش کە گەلێك پێناسەی بۆ کراوە و لە یەکێکیاندا هاتوە: کە کاتێ کەسێك لە هاوەڵی بەڕێز (ئەبوهورەیرەی پرسی) ئایا تەقوا چییە؟! ئەویش لە وەڵامدا فەرمووی: هەروەکو چۆن بە ڕێگای دڕکاویدا ڕۆیشـــتووی و بەوریایی و خۆپارێزییەوە هەنگاوت ناوە و بە بەرچاوڕوونییەوە ڕۆیشـــتووی. ئـــاواش لە ژیانتدا هەنگاو هەڵبگرە و بەرچاوڕوون بە. بۆ ئەوەی تووشـــی داوی حەرام و قەدەغەکراوەکان نەبی و سنوور نەشکێنی.

بەڵـــێ، تەقوا ئەوەیە: چۆن لـــە ڕەمەزاندا، کاتێ هیچ کەس چاوی لێت نەبوو. ئاوی ســـارد لە بەردەستت بوو، تینویەتیش چاوی تاریك کردبـــووی، کەچی یەقینت هەبوو خوا چـــاوی لێتە. لەبەر ئەوە ئەو ئاوە ساردەت نەدەخواردەوە. دەی دەبێ تەواوی مانگەکانی دوای مانگی ڕەمەزانیـــش هەر بە هەمان یەقینەوە بژی. کە دڵنیا بی لە وەی کە بەردەوام خوا چاوی لێتە. (إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعاً بَصِيراً)..

بەڵـــێ ئیماندارانـــی بەڕێز: ئـــەم جیهانە کە ئێمە تێیـــدا دەژین، وەکـــو کۆگایەکی گەورە وایە، یـــان وەکو فەرمانگەیەکی زۆر گەورە و قەرەباڵغ وایە. تۆ تێیدا دێ و دەڕۆی، جا هەرچەندە تۆ هیچ نابینی، بـــەڵام کامێـــرای نهێنی وا بە ســـەرتەوەیە و هەمـــوو جوڵەیەکت لە ژێـــر چاودێری وردایـــە و دەنگ و ڕەنگت هەمووی تۆمارکراوە. (وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الأَعْلَى) تەشـــبیە نەبێ، خـــوای گەورەش ئاوا لەم کۆگای ژیانەدا چاودێرە بە ســـەرمانەوە و هەم دەمان بینێ، هەم دەنگمان دەبیستێ.

جا ئێمەی موسڵمان ئەگەر بمانەوێ پەروەردگارمان بناسین، پێویستە لە قورئانەوە بیناســین کە خوای گەورە لە ڕێی کەلامی خۆیەوە کە قورئانــە، خۆی بە ئێمە ناســاندوە: (وَعِنْدَهُ مَفاتِحُ الغَيْـبِ لايَعْلَمُها إلاّ هُـوَ).. بەڵــێ کلیلی غەیب هیــچ کەس نایزانێ تەنهــا -الله- نەبێ.

(پێنج) شت هەن کە غەیبن و تەنها (الله) دەیانزانێ و کەسی تری لێ ئاگادار نەکردوون. کە ئەمەنانەن:

١. (إِنَّ اللهَ عِنْدَهُ عِلْمُ السّاعَةِ): بە ڕاستی نەزانینی کاتی هاتنی قیامەت تێکچوونی ئــەم دنیایە و پێچەوانەی ئــەم گەردوونە و بەرپابوونی جیهان پاداشت و سزا تەنها -اللە- سُبْحانَهُ وَتَعالى - دەی زانێت. بۆیە کاتێ کە کەسێك پرسیاری لە پێغەمبەری خواکرد (ﷺ) (کە جوبریل بوو)، لەســەر شێوەی مرۆڤێك پرســیاری کرد، کەی قیامەت دێت؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: پرسیار لێکراو -کە بە حیساب شارەزایە- لەم مەســەلەیەدا هەروەکو پرسیارکار وایە کە بۆیە دەپرسێ چونکە نازانێ.. یان کاتێ کە کەســێکی تر پرسیاری لێ کرد: (مَتَّـى السّـاعَةُ؟) کەی قیامەت هەڵدەستێ و دونیا کۆتایی دێت؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەوەڵامیدا فەرمووی: (ما أَعْدَدْتَ لَها؟!) چیت بۆ ئامادەکردوە، چونکە ئەوە هیچ گومان لە هاتنیدا نییە و کەسیش غەیری خوا نازانێ کەی دەبــێ، بەڵام ئەوەی بۆ تۆ گرنگــە ئەوەیە: چیت بۆ ئامادە کردوە؟!. لەبەر ئەوەی ســاڵانە خەڵکی پێوە مەشــغوڵ دەکرێ، کە گوایە ساڵی ئەوەنــدە. بــۆ نموونە وتیان: (٢٠١٢) دنیــا کۆتایی پێ دێت. هەمووی خەڵەتاندن و چاوبەستەکییە و دوورە لە ڕاستییەوە.

٢. (وَيُنَزِّلُ الغَيْثَ). بارانیش هەر ئەو دەی بارێنێت (بە پێی کەشناسی بوایــە و بە پێـی بواری جوگرافی بێ، ئەوروپا گەرمترە لە ڕوســیا. کەچــی ئەوروپــا زۆربەی وڵاتەکانــی وا لافاو بردی و بــە هەزاران خەڵك لەناو چوون. ڕوســیاش وڵاتێکی ساردە، کەچی ڕوسیا زۆربەی دارستانەکانی ئاگری گرتوە و ناکوژێتەوە..

٣. وَيَعْلَمُ مافي الأَرْحام: هەر خوا خۆی دەزانێت چی لە سکی دایکاندا هەیــە.. بــەو مانایەی کە لــە کاتی جووتبوونــی ژن و مێرددا و بە یەکگەیشــتنی تۆوی پیــاو و هێلکۆکەی ئافرەت، تەنهــا پەروەردگار دەزانێ کە ئەو منداڵەی لەو نوطفەیە دروســت دەبێ، نێرە یان مێیە. ئەوەی ئێستا (سۆنەر) دەری دەخات کە منداڵەکە کوڕە یان کچە، ئەوە کاتێکە کە منداڵەکە تەواو پێگەیشــتوە و کامڵ بوە و هەموو ئەندامی جەستەی درووست بوە. بەڵام ئەو کاتەی کە نوطفەیە یان خوێنپارە و و گۆشــتپارەیە. هیچ کەس نازانێ ئەو منداڵە کوڕە یان کچە!! تەنها -الله- کە خالیق و دروستکەرە دەزانێ. لەبەر ئەوە ئەو کەسانەی کە بە بوونی کچ دڵتەنگ دەبن، یان حەزیان لە کچە و ڕقیان لە بوونی کوڕە. ئەوانە لەم قورئانەوە خوای خۆیان نەناسیوە. ئەینا چۆن دەبێ پیاوێك لە ژنەکەی توورە بێ، یان خۆی لە ماڵ و منداڵی توورە بکات، ئەمە چییە کچیان بوە و کوڕیان نەبوە؟!! مانگی ڕەمەزانی ساڵی (١٤٣١) ی کۆچی بوو. کاتی پارشــێو گوێم لە ڕادیۆ گرتبوو. وتارێکی (حاجی کاروان) بوو لە ڕادیۆی یەکگرتووی ســلێمانی. لە بەرنامەی (ئیمان و ژیان)دا. مامۆســتا حاجی کاروان وتــی: کابرایەك چوار کچی هەبوو.

بــە ژنەکەی وت: ئەگــەر ئەمجارە حامیلە بووی و ســکی پێنجەمت کچ بێت، شــەرت بێ قۆڵێکت ببڕم!!! ئەم پیاوە کەســێکی زۆر دڵڕەق بوو. ژنەکەشــی ئافرەتێکی بەسەزمانی موسڵمانی ڕەوشت بەرز، هیچ دەســەڵاتی نەبوو بەرامبەر ئەم پیاوە دڵڕەقە. تازە دوای چوار منداڵ چــی بــکات. خۆی بە تەڵاقدان بدات.. بچێتــەوە لای برا و براژن بۆ خزمەتکاری هەر نابێ، ئەی چوار کچەکەی بچنە ژێر دەستی زڕدایك خراپتــر، لەبەر ئەوە هیــچ چاری نەبوو. تەنها بە پەنهانی لە خوای خۆی پاڕایەوە و وتی: یا ڕەبی خوایە من کەســم نییە تۆ نەبێ ئەی کەســی بێکەســان، لای من منداڵ کوڕ بێ یان کچ هیچ جیاوازی نییە و هــەر هەدیە و خەڵاتی تۆیە و لەســەر چاوانمە، بەڵام ئەم مێردە دڵڕەقــە کەللە شــەقەم لە دەســتی دێ، ئەگەر ئەمجــارە کچم ببێ، مەرجەکەی بێنێتە دی و قۆڵێکم ببڕێ و هەتکم بکات، خوایە گیان، خۆت بە هانامەوە بێیت!! بەڵێ ژنە حامیلە بوو بە منداڵی پێنجەم. لە ترسان کە نەوەکو کچ بێ و مێردەکەی منداڵەکەی ناو سکیشی بکوژێ، نەی وێرا ســۆنەریش بکات. بۆیە ئارامی گرت و مێردیش چاوەڕێیە و بە چاوسورکردنەوە و سمێڵبادانەوە هەر هەڕەشە دەکات کە ئەگەر کچی ببێ، دەســتێکی لە قۆڵیەوە دەبڕێ!!.. بەڵێ ســەرەنجام کاتی لە دایکبوونــی منداڵەکــە هات، کە لەدایك بوو، کوڕ بوو. بەڵام سُــبْحانَ اللّه، دەستێکی لە ئانیشکەوە نەبوو!!!

بەڵێ بڕیاردان لەســەر بوونی منداڵی ناو ســکی دایك کچ یان کوڕ تەنها بە -الله- دەکرێ. پاشان هی وا هەیە، لەژێر چاودێری دکتۆرەی

تایبەتی بواری ژنان و منداڵبووندایە بۆ ئەوەی منداڵەکەی بە سەلامەتی لــە دایك ببێ، کەچــی منداڵەکەی بۆ ناژی و دەمرێ. هەیشــە بە بێ سەردانی دکتۆر چەند منداڵی بەیەك سك دەبێ و هەمووشیان زیندوو دەبــن. هــەر وەکو ئەو ئافرەتە (ئیطالی)یەی کــە پێش ئەوەی بگاتە تەمەنی (٤٠) ســاڵی بە (١٤) سکی دوانی و سیانی و چواری (٥٤) منداڵی هەبوو. هەمووشیان لە ژیاندان و باری تەندروستیشیان زۆر جێگیرە و لەش ساغن!!

یاخود ئەو ژنەی کە لە ڕوســیا لە سەرەتای ساڵی (٢٠١٢)دا، بەیەك سك (١١) منداڵی بوو. هەمووشیان ژیان و باری تەندروستیشیان جێگیر بوو.سُــبْحانَ الله، هــەر (١١) منداڵەکەش کوڕ بــوون!! ئەمە هەمووی بــە دەســەڵات و حیکمەتی خوای پــەروەردگارە و دەســەڵات توانای کەســی تری تێدا نییە. ئەم ڕێــژەی نێر و مێیە لە جیهاندا هەر بە خــوا ڕادەگیــرێ، ئەوەتا ئامارەکان دەڵێن: لــە دوای جەنگی جیهانی دووەمــەوە. بــە هۆی کوژرانی ئەو هەموو پیــاوە لە جەنگدا، ڕێژەی ژنان زۆر زیادی کرد و لە بەرامبەر هەر پیاوێکدا، چوار ژن هەبوو!، ئەمە تەنها چەند ساڵێکی کەمی خایاند کە ئەو ڕێژەی خوای گەورە دیــاری کردوە هاتەوە جێگای خۆی (١٠٥٪) نێــر و (٩٥٪) مێ. زانایان دەڵێن: ئەم ڕێژەیە جێگیرە لە هەموو وڵات و شار و کیشوەرەکاندا. وە لە هەموو زەمان و زەمینێکدا ئاوایە. ئەوەی جێگای سەرنجە ئەوەیە کــە هەرچەنــدە، هەریەك لە ژن و مێرد ژمارەیەك منداڵیان هەیە لە کوڕ و کچ. بۆ نموونە: ئەو ماڵە هەشت کچیان هەیە. ماڵێکی تر چوار

کچیان هەیە، لەگەڵ چوار کوڕ. ئەوماڵە، ئەو ژن و پیاوەی تر، هیچ منداڵیان نییە. ئەم ڕێژەیە جیاوازە لە هەر شار و شارۆچکەیەکدا. وە لە هەر سەردەمێکدا، سەرەنجام ئەو ڕێژەی نێر و مێیە لە جیهاندا لە ئاستی دیاریکراودا دەوەستێ. کە زانایانی جوگرافیای مرۆیی، (الجُغْرافِيَّة البَشَرِيَّة) دیاری دەکات و بەم شێوەیە لە وەزارەتی دارایی و ئابووری ئەو وڵاتەدا ناوی کەسەکان بە پێی ڕێژەی نێر و مێ دیاری دەکرێت. ئەم ماڵی فلان کەسە، ئەم دایك و باوکە، ئەوەندە کوڕە و ئەوەندە کچەیان هەیە. ئەویان ئەوەندە کوڕی هەیە. ئەو ژن و مێردە هیچ منداڵیان نییە. ئەمە لە لای یاسای سەرزەوی. لە لای خوای پەروەردگاریش تۆمارێکی زۆر چەسپاو هەیە. کە ئەو ڕێژەی نێر و مێیە دیاری دەکات. بە ڕاستی ئەم باسە جێگای تێ ڕامانە، لە کاتێکدا کە ڕێژەی نێرینە بۆ (٢٥٪) کەم ببۆوە وە ڕێژەی مێینە بۆ (٧٥٪) دوای بەرز ببۆوە لە دوای جەنگی جیهانی دووەمەوە، کەچی دوای چەند ساڵێك ئامارەکان ئەوەیان خستەڕوو کە زۆربەی هەرە زۆری ئافرەتانی دووگیان کوڕیان دەبووا!، هەتا ئەو کاتەی ڕێژەکە وەکو خۆی چاك بۆوە و ڕێژەی نێر و مێ هاتەوە ئاستی خۆی. ئیتر دوای ئەوە وەکو جارانی پێشوو منداڵی کوڕ و کچ لە دایك دەبوو.. ئایا ئەمە هەمووی دەستی قودرەتی -القادر-ی لە پشتەوە نییە؟! بەڵێ: (وَيَعْلَمُ مافي الأَرْحام).

یان لەئایەتێکی تردا دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تَحۡمِلُ كُلُّ أُنثَىٰ وَمَا تَغِيضُ ٱلۡأَرۡحَامُ وَمَا تَزۡدَادُۖ وَكُلُّ شَيۡءٍ عِندَهُۥ بِمِقۡدَارٍ ﴾ الرعد: ٨

واتە: خوا چاك دەزانێت بە وەی هەموو مێینەیەك چی لە سكیدا هەڵگرتــووە (نێرە یان مێ، تــەواوە یان ناتەواو، ڕەنگی ڕوخســاری، قەبارەی...هتــد). هەروەهــا دەزانێت بە وەش كە دەپوكێتەوە و لەبار دەچێت و بە وەش كە زیاد دەكات و گەورە دەبێت. هەموو شتێك لای ئەو زاتە بە ئەندازە و پێوانەیە...

٤. وَما تَدْري نَفْسٌ ماذا تَكْســبُ غَداً: هیچ كەس نازانێت ســبەی چی بەسەر دێت و چی دەست دەكەوێت. (لە بەرهەمی مادی دنیایی یان لە زەخیرە و توێشووی قیامەت).. كەواتە: ئەمڕۆی ژیانت بە فرسەت بزانە و ئــەو چاكەی ئەمڕۆ پێت دەكرێ مەیخەرە بەیانی. چونكە هەر خوا دەزانێ چیت لە ڕێگادایە، تووشــی چی دەبی، دەی ئەمڕۆ بە هەلێكی زێڕیــن بزانە بۆ ئەوەی چاكەی تێدا تۆمار بكەی. كەواتە: هەموو ئەو كەســانەی كە بانگەشــەی ئەوە دەكەن كە دەزانن چی ڕوودەدات بەسەر فلان كەســدا و بەختی چۆن دەبێ و چی لێ دێ و چۆن شــوو دەكا و ژن دێنێ و باری ئابووری باش دەبێ و...هتد. لە فاڵچی و فاوەگرەوە و بورجەكان. هەمووی ناڕاستن و سەد لەسەد بێبنەمان و غەیری -الله- هیچ كەس نازانێ مرۆڤ چی لێ بە سەر دێ.

٥. وَما تَدْري نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوت: هیچ كەســیش نازانێت لەسەر چ زەویــەك دەمرێت و كۆتایی بە ژیانی دێــت (هەروەها كاتی مردن و چۆنیەتیەكەشــی شاراوەیە).. ئاگات لە خۆت بێ و هەموو كات ئامادە بــە بۆ مردن، كە بە شــێوەیەكی جوان بمری. مــردن لە ناو جێگای نەخۆشــی و لە ناو شــایی و ســەیراندا وەكو یەك تەماشات دەكات.

چەنــد کەس هەبوە ساغ و سەلامەت چوە بۆ پرسەی خزمێکی، دۆست و ناسیاوێکی، کەچی لە ناو مەجلیسی پرسەکەدا بە لادا هاتوە و مردوە، چەند جار بوە کەسێك لەگەڵ جەنازەیەکدا چوە بۆ گۆڕستان و هەرچی نەخۆشی و ئازار بووبێ نەی بوە، کەچی لەسەر گۆڕستانەکە بە لادا هاتوە و مردوە و یەك قسەشی لێ نەبیستراوە!!

ئیمانداران: با بە یەکەوە سەرنجی ئەم بەسەرهاتە ڕاستەقینە بدەین کە لە زمانی (مامۆستا مەلا حەمە یوسف)ەوە لە مەریوانی کوردستانی ڕۆژهەلات گێڕدراوەتەوە: پیاوێك دوو گەلابەی هەبوو، ڕۆژێك بۆ ئیشکردن لە ناو شاردا گەڕابوو. بە گەلابەکەوە خۆی دابوو بە ماڵێکدا و لایەکی ڕووخاندبوو. کە دابەزی بوو بە هەڵەداوان ڕادەکات بزانێ کێی کوشتوە، خەڵکی گەڕەك بەرەو پیری ڕادەکەن و پێی دەڵێن: خەمت نەبێت، بە خوا بەختت هەبوو، کەسیان لەماڵ نەبوو. چوون بۆ گەڕان و سەردان بۆ شارێکی دیکە. کابرا زۆر دڵخۆش دەبێت و ناونیشان و ژمارەی تەلەفۆن و تەسکەرەی دادەنێت و دەڵێ: من کارم هەیە پێیان بڵێ چەندی تێ چوو چاکی بکەنەوە لەسەر من و خۆم لە ئەستۆی دەگرم. بەڵێ گەلابەکەی دەباتە لای وەستا و دەڕواتەوە ماڵەوە، بۆ ڕۆژی دوایی کابرا سواری گەلابەکەی تری دەبێت و بەرەو شارێکی دیکەی ئێران بەڕێ دەکەوێت، لە ڕێگەدا قەمەرەیەك خۆی دەکات بەژێر گەلابەیەکدا و پان دەبێتەوە و کەسیان دەرناچن و هەموو دەمرن. کابرای شۆفێری گەلابەکە دەگیرێت و تەرمەکان دەهێننەوە سەرەنجام دەردەکەوێت کە خێزانێکی تەواو بوون. بە باوك و دایك و

منداڵەکانیانەوە!! ئەوەی مایەی سەرسوڕمان و هەڵوەستەلەسەرکردنە لەم بەسەرهاتەدا ئەوەیە، لە کاتی لێکۆڵینەوەدا دەرکەوت کە ئەو خێزانەی کەوتوونەتە ژێر گەلابەکەوە و هەموویان مردوون. خاوەنی ئەو خانوە بوون کە ڕۆژی پێشتر، کابرا بە گەلابەکەی تری لە خانوەکەی دابوو، کەسی تیا نەبوو بوو!! سەرەنجام هەر بە دەستی ئەو و گەلابەی ئەو تیاچوون!!!.. بەڵێ وەعدی خوایە: (وَما تَدْري نَفْسٌ بِأَيِّ أَرْضٍ تَمُوت)..

لەکۆتایی دا، خوای گەورە دەفەرموێ: (إنَّ اللهَ عَلِيْمٌ خَبيِر) لقمان: ٣٤

واتە: بە ڕاستی خوا بە هەموو شتێك زانایە و ئاگادارە..

بەڵێ ئیمانداران، ئەمە ئەو پێنج شتە نهێنی و غەیب و پەنهانە بوون، کە تەنها خوای پەروەردگار دەیانزانێ و غەیری خوا کەس پێیان ئاگادار نییە..

ئێستا دەچینەوە خزمەت ئایەتەکە. کە فەرمووی: (وَعِنْدَهُ مَفاتِحُ الغَيْبِ لايَعْلَمُها إلاّ هُوَ) ئەمجا دەفەرموێ: (وَيَعْلَمُ مافي البَرّ) هەر خوایە کە زانستی هەیە و ئاگادارە بە هەموو ئەوەی کە لە وشکانیدایە..

زاناکانی زەویناسی دەڵێن: لە یەك دۆنم زەویدا (٥٠٠,٠٠٠) پێنج سەد هەزار کرمی زەوی هەیە. کە لە کوردەواریدا پێی دەڵێن (گڵخۆرکە) و لە کاتی جووتکردن و کێلانی زەویدا دەبینرێن. ئەم کرمانە لە یەك دۆنمدا لە ماوەی (یەك ساڵ) دا، (١٠) تەن گڵ دەخۆن!! لە ئامێری هەرسی ئەم کرمانەدا، ماددەیەکی کلسی دانراوە کە کالسیۆم دەرژێنێتە سەر ئەو خواردنەی دەی خوات کە گڵەکەیە. زاناکان

دەڵێن: ئەم ماددەی کلســە تەنها لەم کرمانەدا هەیە کە دەبێتە هۆی بە پیتکردنی زەوی..

زانایــان دەفەرموون: تا ئێســتا نزیکەی (٣) هــەزار جۆر مێروولە دۆزراوەتــەوە لەســەر زەویدا؛ ئەمــە هەمووی خوای پــەروەردگاری جیهانیان پێی ئاگادارە..

ئەمجـا کە دەفەرموێ: (وَيَعْلَمُ مافي الْبَرِّ) لە زمانی عەرەبیدا، (فـي) بۆ (ظَرْفِيَّة) بەکار دێ.

واتــە: ئەوەی لە ناو تاریکی و وشکانیشــدایە، خــوای گەورە پێی ئــاگادارە، خوای گەورە ئاگاداری ناو گۆڕە تاریکەکانیشــە، ســەرنجی ئەم ڕووداوە سەرنجڕاکێشــە بدەن: (منداڵێکی تەمەن هەشــت مانگ و کچێکــی تەمەن پێنج ســاڵ لە دوای ئەوەی باوکیــان دەمرێ و دوای ماوەیەکی زۆر کەم دایکیشــیان دەمرێ. مامیان دەیان باتە لای خۆی بۆ بەخێوکردن و سەرپەرشتی و پێگەیاندنیان. چونکە کەسی تریان نەبــوو. بــەڵام دوای ماوەیەك خێزانەکەی بە هــەر هۆیەك بێ نەی توانی بەرگەی ئەم ئەرکە قورســە بگرێــت و بەخێویان بکات، داوای لە هاوســەرەکەی کرد یــان تەڵاقی بدات، یان ئــەم دوو منداڵە دوور بخاتــەوە و لــە بەرچــاوی ئەو لایان بــات. (پیاوی کــەم غیرەت بە هــاوکاری نەفــس و شــەیطان) پیلانێکی گڵاوی دانا و لە شــەوێکی تاریکدا هەســتا لە لای گۆڕی برا و براژنەکەیەوە قەبرێکی هەڵکەند، لــە دڵی خۆیدا وەڵامی ئەوەشــی ئامادە کردبوو کە ئەگەر کەســێك پێــی زانی و لێی پرســی ئەم قەبرە هی کێیە؟! لــە وەڵامدا بڵێ بۆ

خۆمی ئامادە دەکەم و ئەم جێگایە دەگرم. بۆ ئەوەی ئەگەر مردم لە تەنیشــت برا جوانەمەرگەکەمەوە بم، قەبرەکەی تەواو کرد و شەوی دوایی هەردوو منالەکەی برد بۆ لای قەبرەکە و خستنیە قەبرەکەوە و هەردووکیانی بە زیندویەتی لە گۆڕنا و بەجێی هێشتن. بەم جۆرە مانــەوە تاوەکو چــوار ڕۆژ. بە بێ ئەوەی کــەس بزانێ!! دوای ئەو چوار ڕۆژە کەســێك لەو شــارە مرد و کە بردیان ناشتیان، خەڵکەکە گوێیان لە قسە و یاری منالان بوو!! زۆر ئەملا و لایان کرد و بە دوای منالەکاندا گەڕان، هیچ منال دیار نەبوو، سەرەنجام لە گۆڕەکە نزیك بوونەوە، بیســتیان ئەم دەنگە لەوێ دێتــە دەرەوە، خێرا گۆڕەکەیان هەڵدایەوە، چی ببینن؟! دوو منالی بێ تاوان، بە پەلە دەریان هێنان و بردیانن بۆ شــوێنی سەرپەرشتیکردن و بەخێوکردنیان. لە دواییدا مامە تاوانبارەکەیان دەستگیر کرا لەسەر تاوانەکەی. کە بۆ چی وەکو بــۆ خۆی نەی توانیوە بەخێویان بکات، نەشــی بردوون بۆ پەناگەی منالانی بێکەس. لە بەردەم دادوەردا هیچ وەلامی بۆ نەدرایەوە. دوای ئەوەی کە لە کچە پێنج ســالانەکەیان پرســی، چۆن ئەم چوار ڕۆژە بــە بێ خــواردن و خواردنەوە ژیاون و چیتــان دەکرد؟! لە وەلامدا، ئەو کچە بچکۆلە پێنج ســالانە وەلامێکی زۆر سەیری وت کە هەموو ئەفسەر و دادوەرەکانی لێکۆلینەوەی تاساند. وتی: گۆڕەکەمان بۆ بوو بە خانوویەکی گەورە (پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: بۆ مرۆڤی ئیمانــدار گۆڕ گەورە دەبێ بە ئەندازەی ئەوەی چاو بڕ بکات). وە لە نــاو ژووری گەورەکەدا درەختێکی لێ بــوو، هەموو جۆرە میوەیەکی

پێوە بوو. هەر کات برســیم ئەبوو لێم ئەکردەوە و ئەم خوارد. زۆر بە تام و خۆش بوو!! بەڵام کاتێ براکەم برســی ئەبوو ئەگریا. خێرا پیاوێکی ســەر و ڕیش سپی لە باوەشــی ئەکرد و ئەیگوت: ئەی بەم بــۆ لای دایکت. تا تێر شــیر بخــوات و بخەوێت. ئیتــر براکەم تێر ئەخەوت!! ئەوەیە دەسەڵات و گەورەیی خوای تاك و تەنها. (حەزرەتی ئیبراهیم و ســارا خاتوونی خێزانی سەرپەرشتی ئەو منالانە ئەکەن، کە بە منالی دەمرن، هەتا لە بەهەشــتدا تەســلیمی دایك و باوکیان دەکەنــەوە، ئــەم دوو منالەش هەر لەو بابەتە بــوون). کەواتە: ئەی دایــك و باوکی کۆرپە مردوو، خەمبار مەبە. ڕۆڵەکەت لای حەزرەتی إبراهیم و سارا خاتوونە. الله أکبر. خوای گەورە بە ڕەحمی خۆی ئەو دوو منالەی ڕزگار کرد، کە بێتاوان بوون و پەپوولە ئاســا دەژیان و نەیان دەزانی چاکە و خراپە چییە..

بەڵێ، ئەمجــا پەروەردگار دەفەرموێ: خوا ئاگادارە بە وەی کە لە ناو بەحر و زەریا و دەریاکانیشدا هەیە، (وَيَعْلَمُ مافي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ). کە جیهانی دەریا زۆر فراوان و سەرسوڕهێنەرە. لە دەریای هیندی، جۆرە ماسییەك هەیە (١٤) ساڵ دەتوانێ بە بێ خواردن بژی!!. نەهەنــگ (کە بێچوو هەڵدێنێ و شــیر دەدات بە بەچکەکــەی). نەهەنگی وا هەیە، کێشەکەی (٢٢٠) تەنە، تەنها کێشی زمانی (٢) تەنە!!.

ڕۆژنامەی (الأخبار الجديـدة) لە ژمارەی (٣٩٦)ی بەرواری ١٩٥٣/٩/٢٧ دا، نووســیویەتی: لە پاریس حوتی (ئونا) هەبوو. کە کێشــەکەی (٨٠) تەن بوو!! کارەبایان لە ناو دەمیدا دانابوو (گلۆپیان تێدا هەڵکردبوو،

جــاری (١٠) نەفەر دەچوونە نــاو دەمییەوە. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەم حوتە، هێشتا تەمەنی هەر (١٨) مانگ بوو. بە ئوتومبێلێکی بارهەڵگر هەڵیان گرت، کە درێژاییەکەی (٣٠) مەتر بوو...

بەڵێ، نەهەنگی وا هەیە، لە یەك ژەمدا، خواردنی (١٠٠) هەزار مرۆڤ دەخوات!! قەتیش لە برسان نامرێ، تا وەختی مردنی دیاریکراوی خۆی دێ. ئەمە هەمووی خوای پەروەردگار پێی ئاگادارە. (يَعْلَمُ فِي البَرِّ وَالبَحْرِ)..

ئەمجــا خوای گەورە دەفەرموێ: (وَما تَسْــقُطُ مِنْ وَرَقَــةٍ إلاّ يَعْلَمُها). هــەر گەڵایەك لــە درەختێك لە گوڵێــك دەكەوێتە خــوارەوە. ئیللا خوای گەورە ئــاگادارە پێی!. (وَلا حَبَّةٍ فِي ظُلُماتِ الأَرْضِ) خوای گەورە ئاگادارە بە هەر دەنكە تۆوێك لە ناو تاریكایی ناو زەویدا، زۆربەمان جوتیاریمان كردوە و دەزانین كە كاتێ تۆو دەچێنی، بۆ ڕوانی دەنكە گەنمێــك، جۆیــەك، پێویســتە، لای ڕەگەكەی بۆخــوارەوە بێ و لای چەكەرەكەشــی بۆ ســەرەوە بێ. چونكە ئەگەر پێچەوانە بێ، ناڕوێ. بەڵام ئایا كە كاتێ جوتیار تۆوەكە بە زەویدا دەچێنێ پشــت بەخوا، ئایــا ئەم جوتیارە دەزانێ كام دەنكە گەنم چۆن كەوتوە و ڕاســتە و قابیلی ڕوانە یان ســەراوبنە، یان لەســەر لایە، تــۆ بڵێ: ئەرێ كەس هەیــە بزانێ دەنكە گەنــم، یان جۆ كامە لای چەكــەرە و كامە لای ڕەگەكانیەتــی؟!! بێگومان نەخێر. ئایا جوتیــار دەنك بە دەنك ئەم گەنمــە دەچێنــێ؟! نەخێر. بەڵكو بە مشــت بە زەویــەوە دەكات و هەریەكەی بە شــێوەیەك دەكەوێتە ناو زەوییە كێڵدراوەكەوە. یەكێ ڕێك، یەكێ لەســەر تەنیشــت، یەكێ ســەراوبن.. جا ئەوەی سەراوبن

کەوتوە و لای ڕەگەکەی بۆ سەرەوەیە. ئەگەر ئاوا بمێنێتەوە دەفەوتێ و دەرزێ و نــاڕوێ. بۆیــە خوای گەورە فەرمان دەکات کە ئەی دەنکە گەنــم بە (١٨٠) پلە هەڵســوڕێ، تاوەکو ڕەگەکانــت بچنە خوارەوە و ئامادەی ڕوان بی، خۆ ئەگەر دەنکە تۆوەکە لەسەر تەنیشت کەوتبوو. خوای گەورە فەرمان دەکات ئەی دەنکە تۆو (٩٠) پلە هەڵسوڕێ، تاوەکو ڕاســت دەبیتەوە و ڕەگەکانت بۆ خوارەوە دەبــن، جا ئایا پارووی‌ەك نان، ئەگەر بە وشکی بی خۆی و هیچ پێخۆریشت دەست نەکەوێ پێی بخۆی هەر (الحَمْدُلِلّهِ) ناوێ؟!

ئەمجا پەروەردگار دەفەرموێ: (وَلارَطْبٍ وَلايابِسٍ إلاّ في كِتابٍ مُبين).. هەموو تەڕ و وشــکێك لە نووسراوی ئاشکرادا لای خوا تۆمارکراوە و خوا بە هەمووی ئاگادارە جا ئایا ئەم پەروەردگارە، هەر لە ڕەمەزاندا دەبێ ئیطاعەی بکەین؟! نەخێر، بەڵکو نیشــانەی قبوڵبوونی ڕۆژوو ئەوەیــە: کە لە دوای مانگی ڕەمەزانــەوە بەو هێزە ئیمانیەی کە لە ڕەمەزاندا پەیدات کردوە، بەردەوام بی لەســەر خواپەرســتی و پێی بگەیتەوە ڕەمەزانی داهاتوو، وە لە عیبادەت ســارد نەبیتەوە. چونکە یەکێ لە صیفاتی (عِبادُ الرَّحْمن) کە خوا لە قورئاندا باســی کردوون، ئەوەیە کە بەردەوامن لە سەر کاری جوان و طاعەت و عیبادەتی خوا.

هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ ٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَاتِهِمْ دَآئِمُونَ ﴾ المعارج: ٢٣

یان دەفەرموێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ هُمْ عَلَىٰ صَلَوَٰتِهِمْ يُحَافِظُونَ ﴾ المؤمنون: ٩

دەی تــو خــوا گەنجی تۆبەکار لەســەر تەوبەکەت بــەردەوام بە. ئەی ئەو کەســەی دەســتت کردوە بە نوێژکردن، لە نوێژکردنەکەت

بەردەوامبە.. توخوا ئەی ئەو خوشکەی کە لە مانگی ڕەمەزاندا جلی شەرعیت پۆشی و تاجی زێڕین کە سەرپۆشە خستە سەرت دای مەنێ و لە دوای ڕەمەزانیش لە پۆشینی حیجابەکەت بەردەوام بە.

بەڵێ، بەردەوامبوون لە سەر خواپەرستی زۆر گرنگە. باسمان کرد کە (لَیْلَةُ القَدْر) لە کۆتایی ڕەمەزاندایە، کە هێمایە بۆ ساردنەبوونەوە. لە دوای ڕەمەزان بۆ ڕۆژووی شەشەڵان هەیە. کە ئاماژەیە بۆ بەردەوامبوون. هەندێ لە پیاوچاکانی سەلەفی صالح، کاتێ هەستانایە بۆ شەونوێژ. بۆ بەیانیەکەی بە ڕۆژوو دەبوون، بۆ سوپاسکردنی خوای گەورە لە سەر ئەو خەڵاتەی کە ئەو پێی بەخشیوە!! جا با ئاگامان لە ڕۆژووی شەشەڵان بێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (مَنْ صامَ رَمَضانَ، ثُمَّ أَتْبَعَهُ سِتًّا مِنْ شَوَّالٍ كانَ كَصِيامِ الدَّهْرِ) صَحْيح مُسْلِم (١١٦٤)

واتە: هەر کەسێ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان بگرێ و پاشان شەش ڕۆژی شەشەڵانیشی بە شوێندا بگرێ، ئەوە وەکو ئەوە وایە کە تەواوی ساڵەکە بە ڕۆژوو بێ.

ئیمامی نەوەوی دەفەرموێ: بۆیە وەکو ڕۆژووی ساڵێك وایە، چونکە پاداشتی چاکەیەك بە دەیە. مانگی ڕەمەزان بەرامبەر بە (دە) مانگە. شەش ڕۆژەکەی شەوالیش بەرامبەر دوو مانگی ساڵەکەیە. کە دەکاتە (٣٦٠) ڕۆژ. پێنج ڕۆژەکەی تریش ئەوە حەرامە تیایاندا بە ڕۆژوو بی چونکە یەکیان هی جەژنی ڕەمەزانە. چواریشیان هی جەژنی قوربانە!! ئەمە تەواوی ساڵەکە کە دەکاتە (٣٦٥) ڕۆژ.

ئیمانـــداران: ئەگەر کەســێك قەرزاری ڕەمەزان بــوو -بە تایبەت ئافرەتــان کە لەو مانگەدا تووشـــی حاڵەتی بێنوێــژی دەبن و قەزای ڕۆژوویان لەســەرە- ئەم کەســە وا چاکە قەزای ڕۆژوە فەوتاوەکانی بکاتەوە. چونکە ئەو کاتە (مَنْ صامَ رَمَضانَ) دێتە جێ، پاشان ڕۆژووی شەشەڵانەکەش بگرێ. بە پێچەوانەشەوە درووستە. واتە: یەکەم جار شــەش ڕۆژی شەشــەڵانەکە بگرێ. ئەمجا قەزای ڕۆژوەکان بکاتەوە.. خاتوو عائیشە دەفەرموێ: ئێمە کە قەرزاری ڕەمەزان دەبووین، نەمان دەگرتەوە تا مانگی شەعبانی داهاتوو دەهات. ئەوکات دەستمان دەکرت بــە گرتنەوەی قەرزی ڕەمەزان. واتە: لە مانگی شەشــەڵاندا ڕۆژووی شەشەڵانیان گرتووە، هەرچەندە قەرزی ڕەمەزانیشیان لەسەر بووە.

ئەمجا بە نیسبەت چۆنیەتی بە ڕۆژووبوونەکەوە:

شــافیعیەکان و حەنبەلیەکان، پێیان وایە بەسەر یەکەوە بگیرێن باشترە..

لای حەنەفیــەکان: نێوان تێخســتنی ئەو شــەش ڕۆژە باشــترە و موستەحەبە، بۆ نموونە، هەر هەفتەی دوو ڕۆژی تێدا بگری. دەتوانی دووشەممە و پێنج شەممە بە ڕۆژوو بی.

لای مالیکیەکان: مەکروهە و ناپەسەندە یەکسەر بە دوای ڕەمەزاندا ڕۆژووی شەشەڵان بگیرێ، بەڵکو چاك وایە مرۆڤ وزەیەکی تێ بێتەوە. ئەمجا دەست بکات بە ڕۆژووی شەشڵانەکە. بە تایبەتی لەو کاتانەی کــە مانگی ڕەمەزان دەکەوێتە کاتــی گەرماوە و مرۆڤ هیلاك دەبێ. ئەو لەو کاتەدا ئەگەر دوای مانگی ڕەمەزان پشوویەك بدات و گوڕ و

تینێك پەیدا بكاتەوە و ئەمجا ڕۆژووی شەشەڵانەكە بگرێ باشترە..

ئیمانداری بەڕێز: ئەوەی وات لێ دەكات لە سەر خواپەرستی و دینداری بەردەوام بێ ئەوەیە: واز لە هاتووچۆی مزگەوت مەهێنە. نوێژەكانت بە جەماعەت بكە. نوێژی بەیانیان مەفەوتێنە.. ئەوەی وات لێدەكات لە سەر خواپەرستی بەردەوام بی ئەوەیە: ئیسلامەتی وەكو بەرنامەی ژیان وەربگری، ئیسلامەتیەكەتت لە هەموو شتێ زیاتر لەلا بەنرخ و بەها بێ. بۆیە حەز بكەی كچ و كوڕت هەبێ. بۆ ئەوەی لە خزمەتی ئیسلامدا بن و بانگخوازی ئیسلام بن، بۆیە حەزت لە خانووبەرەی باش بێ كە عیبادەتی خوای تێدا بكەی... دڵخۆشیش بن بە وەی كە ئیسلام ڕۆژ بە ڕۆژ لە فراوانبووندایە، لە گەشەكردندایە. هەزاران هەزار سوپاس بۆ خوا لە سەر ئاستی هەرێمی كوردستان، هەندێ لە خەڵكی وایان گومان دەبرد كە چونكە گەرمایە، خەڵكی كەم بە ڕۆژوو دەبێ. كەچی بە پێچەوانەوە لە هەموو ساڵانی پێشوو زیاتر خەڵكی بە گەرم و گوڕیەوە پێشوازی مانگی ڕەمەزان كرا و بە گوڕ و تینەوە خەڵكی بە ڕۆژوو بوون و هاتووچۆی مزگەوتیان كرد، لە ڕۆژنامەكانی ناوخۆی هەرێمی كوردستاندا. بە تایبەت ئەوانەی كە لە پارێزگای سلێمانی دەردەچن، نوسرابوو: سێ ساڵە سلێمانی ڕەمەزانی وا گەرم و گوڕ و مزگەوتی ئاوەدان بە تەراویح و نوێژی جەماعەتی بە خۆیەوە نەبینیوە. ساڵانی پێشوو هیچ كات (لَيْلَةُ القَدْرِ)ی ئاوا قەرەباڵغ نەبووە.

لە ئاستی ئەم شارۆچكەی خۆشماندا، سوپاس بۆ خوا هەرگیز ئاوا

ڕەمەزانی ئاوەدان و مزگەوتی گەرم و گوڕ نەبینراوە!.. لە سەر ئاستی جیهانیشدا، لە وڵاتێکی وەکو (تورکیا) دا، کە ئەو هەموو بێشەرعیەی لێ دەکرێ. کەچی لە شارێکی وەکو (ئەستەمبوڵ)دا، لە یەك بەربانگدا (٧٠) هەزار کەس بەشداری کردوە!..

لــە ئەوروپــا و ئەمریــکادا بینیمــان کــە مزگەوتــەکان جێگای نوێژخوێنانــی تێدا نەدەبۆوە و لە ســەر جادەکان نوێــژ دەکرا.. لە مانگــی ڕەمەزانی ڕابردووشــدا ئەوە ســەلما کە: هەر ئیســلامە دڵی خەڵکــی خــۆش دەکات. لە مانگــی ڕەمەزان، خەڵکــی دوور لە دین، دوور لــە نوێــژ و ڕۆژوو، دوور لــە مزگەوت، کە پــارەی خەڵکی بە نــاڕەوا لووش دەدا، چەند باندی دزیکردن گیران!! چەندین کەس کە بــەو ڕەمەزانە دوکانی خواردەمەنیان کردبــۆوە و حورمەتی خۆیان نەدەگرت و خواردنیان دەفرۆشــت. بە دەیان کەســی لێ گیرا کە بە تەن گۆشــتی کۆنیان، بەسەرچوو بۆگەنیان بە خەڵکی فرۆشتبوو لە ڕێگەی گەص و خۆراکی ترەوە..

لــە بەرامبەردا، ئەهلــی ڕۆژوو، مزگەوت، جومعــە و جەماعەت، پارەی گیرفانی خۆیان بە خۆشحاڵیەوە دەدا بە هەژاران و هاوبەشیان دەکردن لە بەربانگی خۆیان و ژیانی خۆیاندا..

کەواتە: ئیسلام تاکە چارەسەری گرفتەکان دەکات.

بەڕێزان: ئەگەر کەســێك وتی: بەیانی بــە ڕۆژوو دەبم لە مانگی شەشەڵان، لە جیاتی قەرزی ڕەمەزان، ئەمە درووست نییە. (لأَنَّ صَوْمَ القَضاءِ عِبادَةٌ مُسْــتَقِلَّةٌ. وَصِيامُ السِّنَةِ مِنْ شَوال عِبادَةٌ مُسْتَقِلَّةٌ. فَلا

یَصِحُ التَّداخُــلُ بَیْنَهُما) چونکە ڕۆژووی قەزای ڕەمەزان عیبادەتێکی سەربەخۆیە و ڕۆژووی شەشەڵانیش عیبادەتێکی سەربەخۆیە. قەزای ڕۆژوو فەرزە و ڕۆژووی شەشەڵان سوننەتە و دروست نیە تێکهەڵکێش بکرێن..

خــوای پەروەردگار بە ڕەحــم و میهرەبانی خۆی دامەزراویمان لە سەر دینداری و خواناسی پێ ببەخشێ و عاقیبەتی هەموو لایەکمان خێر بکات.

(ربَّنا آتِنا مِنْ لَدُنْكَ رَحْمَةً وَهيِّءْ لَنا مِنْ أَمرِنا رَشَداً)

اللّهُمَّ آمين

سەرچاوەکان:

١. مَوْسُوعَة الإعْجاز العِلْمي، آياتُ الله في الإِنْسان، د.محمد راتب النابُلْسي، ص٥١.

٢. ڕۆژنامەی یەکگرتوو، ژ: ٤٥٩، ژمارە: ٤٥٦.

٣. بارین. عادل شاسواری، ل٣٧٢.

٤. خەمبار مەبە. د.عائض القرني، وەرگێڕانی: عبدالله وەرتێ، ل٤٧٧.

٥. نامیلکەی (شەشەڵان)، م.عەففان شێخ صدیق سەرگەتی.

٦.یَسْأَلُونَكَ. د.حسام الدِّين عَفّانَة. ج٢ ص٣٢٥.

٧. پایزە برا، مەلا ئەحمەدی شەریعە. ل٨.

وتاری دووەم بۆ مانگی شەوال

# دوژمنایەتی کافران بۆ قورئانی پیرۆز

الحَمْدُلله رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانـــی بەڕێـــز: گەورەیـــی ئـــەم ئوممەتی ئیســلامە، کەدوا ئوممەتــە و (خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلْنّاسَ).. لە هەموو ئوممەتان زۆرترە لـــە قیامەتدا، بـــەڵام لە دنیادا ئیماندارانی ئوممەتی ئیســلام کەمن، هەروەکو هەموو شـــتە بەنرخ و گرانبەهاکان کەمن، وەکو ئاڵتوون لە چاو تەنەکەدا. جـــا گەورەیی ئەم ئوممەتە بە قورئانەکەوەیەتی، کە کەلامی خوایە. بە پێغەمبەرە دڵســۆزەکەیەوەیەتی کە ڕوونکەرەوەی قورئانەکەیە بە ژیان و هەڵسوکەوتە پیرۆزەکانی، پڕ بەرەکەتەکانی. (إِنَّ هذا القُرْآنَ يَهْدي لِلَّتي هِيَ أَقْوَمُ)..**

**بەڵێ، شـــیفای نەخۆشی و ناخۆشـــی و نەزانیمان لە قورئاندایە.. کـــێ شـــیفای دەوێ، کێ ڕەحمەتی دەوێ. با بـــێ لە خزمەت قورئاندا بێ، (وَنُنَزِّلُ مِنَ القُرْآنِ ماهُوَ شِـــفاءٌ وَرَحْمَةٌ لِلْمُؤمِنينَ) بەڵام قورئان شیفا و ڕەحمەتە، بەڵام بۆ کێ؟! (لِلْمُؤمِنينَ). بۆ ئیمانداری ڕاســـتەقینە، نەك ئیمانداری بە قسە، بەڵام بێ کردەوە. چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) قورئـــان تێیدا ببوە کردار، هەروەکو خاتوو عائیشـــەی دایکمان دەفەرموێ لە بارەی هەڵسوکەوت و ڕەوشتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) (كانَ**

خُلُقُهُ القُرْآن).. دەبا ئێمەی ئوممەتی ئەو سـەردارەش، رەفتارەکانمان، گوفتارەکانمان، هەڵوێستەکانمان، هەنگاوەکانمان قورئانی بن، با حەقی ئەم قورئانە بدەین کە سەرچاوەی هەموو زانستێکە، ئاشکرایە قەدر و رێز و گەورەیی هەر ئوممەت و گەل و نەتەوەیەکیش زانستە. کەواتە: ئەگـەر لە خزمەت قورئاندا بین زاناتریـن کەس و گەل و ئوممەت دەبین. جا نەك هەر زانسـتی شـەرعی و فیقهی کە باسی دەستنوێژ و خۆشـتن و نیکاح و طەلاق و میرات و معامەلە، بکات. کە ئەمانە جوانترین و بە بەهاترین زانستن. چونکە ئەوپەڕی جەهلە، کەسێك بڕوانامەی باڵای هەبێ. کەچی نەزانێ خۆپاککردنەوە چییە. نەزانێ خۆشـتنی واجب چییە. نیکاح و طەلاق و مافی نێوان دوو هاوسـەر چییە. حەلاڵ و حەرام چییە. بەڵام قورئان هەروەکو ئەم زانستەمان بـۆ بـاس دەکات. کە بنچینـەی ژیانی مرۆڤن، بەڵکو باسـی هەموو زانسـتە دنیاییەکانیش دەکات، کە لـە خزمەت مرۆڤدان.. بۆ نمونە: زانسـتی کیمیا: خوای گەورە لە قورئانـدا دەفەرموێ: (وَأَنْزَلْنا الحَديدَ) الحَديد: ٢٥ لە ناو هەموو ماددە کیمیاییەکاندا، یەك سـورەت بە ناوی سورەتی ئاسن -الحديد- ەوە هاتووە. باشە بۆچی؟! ئەی باشە بۆچی سورەتێك لە قورئاندا بەناوی سـورەتی: (الذَّهَب. الفِضَّة. النُّحاس) نیـە؟! هەرچەنـدە بە ناو هەمـوو ئەمانەش لە قورئانـدا هاتوون.. چونکـە: ئاسـن تاکە ماددەیە کە لە سـەر زەویدا درووسـت نەبوە، بۆیـە دەفەرمـوێ: (وَأَنْزَلْنا الحَديد).. زانای بەناوبانگ (أَسـتروخ) کە ناودارترین زانای وەکالەتی (ناسـا) ئەمریکییە، بۆ کۆنگرەی ئیعجازی

زانســتی قورئان، قســەی کرد و وتی: (تاکە مەعدەنێك -کانزایەك- کە بۆتە جێگای سەرســوڕمانی زانایان، ئاســنە. پێکهاتەکانی ئاســن، پێکهاتەیەکی تایبەتمەندن. چونکە ئەلکترۆنات و نیوترۆناتی توخمی ئاسن. بۆ ئەوەی دروست ببێ، پێویستی بە گوڕ و هێزێکی زۆر توند هەیە. کە دەخەملێنرێ بە چوار هێندەی ئەو پلە گەرمیەی کە ئەمرۆ لە کۆمەڵگەی خۆردا هەیە. هەر لەبەر ئەمەشــە کە ناگونجێ ئاســن لە ســەر زەویدا هەبووبێ لە بنەڕەتــدا، بەڵکو توخمێکی تایبەتە لە سەر زەویدا. کە بۆی هاتوە و لە ئەصڵدا لە ناویدا نەبووە. قورئانیش دەفەرموێ: (وَأَنْزَلْنا الحَديد). ناردمانە خوارەوە ئاسن!!.

پاشان تەماشای پێرستی زنجیرەی ناوی سوڕەتەکانی قورئان بکەن. دەبینین ســوڕەتی -الحديد- لە قورئاندا بریتییە لە ژمارە (٥٧). جا یەکێ لەو شتانەی کە ناسراوە لە زانستی کیمیادا، ئەوەیە کە: گەردیلە ژمــارە بریتییــە لە ژمارەی پرۆتۆنەکانی گەردیلە و بارســتە ژمارە، پەیوەنــدی بە ژمــارەی (پرۆتۆنەکان + نیۆترۆنــەکان)ی گەردیلەوە هەیە. هەندێ کەس دەڵێن: بارســتە ژمارەی ئاسن (٥٥ و ٥٩)یە. بەڵام دواتر سەلما کە نەخێر، ڕاستییەکەی ئەوەیە: کە ئاسن پێنج بارستە ژمارەی هەیە. بە پێی جۆری ئاســنەکە، بارســتە ژمارەکانی بریتین لــە: (٥٥، ٥٦، ٥٧، ٥٨، ٥٩). ئەوەی ســەرنجمان ڕادەکێشــێ ئەوەیە: کە ژمارەی (٥٧) لە ناوەڕاستیاندا هاتووە!!! ئایا ئەمە ئەوپەڕی وردەکاری نییە لە زانســتی کیمیادا؟! وە تەنانەت ئەو ئایەتەی کە لە ســوڕەتی -الحديد-دا باســی ئاسن دەکات لە ژمارە ئایەتی (٢٥)دایە. دەی ئەگەر

(بِسْــمِ اللهِ)شــى لەگەڵ بە ئايەت حيســاب بكەين. دەكاتــە: (٣٦) دەى گەرديلە ژمارەى ئاسن = (٢٦). ئايە ئەگەر كەلامى خوا نەبێ لە تواناى مرۆڤدايە بابەتێكى زانســتى كيميا كە دواى هەزار و ئەوەندە ســەد ساڵە لە دواى هاتنە خوارەوەى قورئاندا دۆزراوەتەوە، ئاوا بەدەقيقى باس بكات؟! بێگومان، نەخێر..

پاشــان بــا بچينــە ســەر بابەتــى: قورئــان و زيندەوەرزانى، با نموونەيەك وەربگرين، ســورەتێكى قورئان ناوى سورەتى -النحل-ە، (هەنگ) لێرەدا پرسيارێك دروست دەبێ؟ ئەى باشە بۆچى سورەتێك بەناوى (مێشوولە – بعوضة) يان (مێش - ذباب) نيە؟! خۆ ئەمانەش لە قورئاندا ناويان هاتوە. ئەى بۆچى سورەتيان بە ناوەوە نييە؟! لە وەڵامدا دەڵێين: الله أعلم، حيكمەتێكى گەورە لە (هەنگ)دا هەيە. بۆ نموونە: ژمارەى سورەتى -النحل- لە زنجيرەى سورەتەكانى قورئاندا، (١٦)يە. واتە: سورەتى -النحل- شانزەهەمين سورەتى قورئانە. دەى لە زانستى زيندەوەرزانيدا دەڵێ: هەنگ (١٦) جووت كرۆمۆسۆمى هەيە!! نێرەكانيشى (١٦) تاكيان هەيە!!..

پاشان سەرنج بدەن، لە ئايەتى (٦٩)ى سورەتى -النحل-دا دەفەرموێ: (وَأَوْحَى رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الجِبالِ بُيُوتاً، وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمّا يَعرِشونَ .... هەتــا كۆتايى ئايەتەكان). تەماشــاكەن، هەمــوو جارێك قورئان بــە (صيغەى مؤنَّــث) ناوى هەنگ دەبات. وەكــو (اتَّخِذي.... كُلي.... فَاسْلُكي.... بُطونِها..) كەچى باسى هەنگى رەگەز نێر ناكات.. بۆچى؟! لێكۆڵەرەوان دەڵێن:

١. ئەو هەنگەی کە شـــانەکان دروست دەکات و سەرپەرشتی هەنگەکان دەکات، مێیەکانن. دەوری نێرەکان تەنها هێنانی هەلاڵە و وردە ئیشی ترە.

٢. ســـبحان الله، نێرەکان بە بێ پیتاندن تەنها لە مێیەوە دروست دەبن، کە ئەم مەســـەلەیەش موعجیزەیەکی گەورەیە، کە خوا لە ناو گیاندارانیشـــدا قودرەت و توانای بێ ســـنوری خۆی نیشان داوین کە دەتوانێ تەنها لە مێینە بەچکە دروست بکات بە بێ باوك!

کەواتە: کە قورئان شـــایەتی بۆ پاکیەتی مەریەمە دەدات. کە بەبێ بوونی مێرد -عیســـا-ی بوە. لە ســـورەتی -النحل-یشدا ئەوەی ئاماژە پێ کردوە کە هەتا قیامەت لە هەموو کات و شـــوێنێکدا هەموو کەس دەتوانێ بی بینێ.. لێرەدا دەڵێم: دەبوایە مەسیحیەکان هەر مەمنوونی قورئان بوونایە کە عیســا پێغەمبـــەر و مەریەمەی پاك داوێن، تەنها لە قورئاندا وەکو خۆیان ناسراون، لە قورئاندا (٢٥) جار ناوی (عیسی) و (مســـیح) هاتوە. کەچی تەنها (٥) جار ناوی (محمد) هاتووە!، ئای چ بێوەفایی و سپڵەییەکە، کە قەشەیەك بێت قورئان بسوتێنێ!!!

بەڕێزان: یەکێکی تر لە بواری زانســـتەکانی قورئان، زانستی هێڵی پانی و درێژی زەوییە لە سەر نەخشە، لە زانستی جوگرافیادا.. خوای گەورە باســـی شاخی جودی دەکات کە کەشتیەکەی (نوح) پێغەمبەری لە ســـەر نیشتەوە. (وَاسْـــتَوَتْ عَلى الجُودِيِّ) ئەم ئایەتە، ئایەتی ژمارە (٤٤)ی سورەتی (هودە.. سبحان الله، وەرە لە سەر نەخشە تەماشا بکە. شـــوێنی شـــاخی جودی لە سەر هێڵی درێژی زەوی (٤٤)ە!!. ئایا ئەگەر ئەمە کەلامی خالیقی ئەرز و ئاسمان نەبێ، کێ ئەمە دەزانێ؟!

هــەر لە بابەتی قورئان و زانســتی جوگرافیــادا، ئەوە هاتوە کە: زەوی خڕە، بەڵام خڕی هێلکەیی. هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ وَٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ ذَٰلِكَ دَحَىٰهَآ ٣٠ ﴾ النازعات: ٣٠

لــە فەرهەنگەکاندا هاتوەکە: (الدَّحِيَّة): هِــيَ بَيْضَةُ النِعام. واتە: دەحیــە بــە هێلکــەی نەعامە دەوتــرێ. کەواتە: قورئــان نەك هەر ســەلماندی زەوی خڕە، بەڵکــو جۆری خڕیەتیەکەیشــی دیاری کرد کە هێلکەییە.. ئەمەش لە ڕێگەی مانگە دەســتکردەکانەوە سەلما کە وێنەی زەوی دەگرن لە دووری هەزاران کیلۆمەترەوە..

یاخــود خوای گــەورە دەفەرمــوێ: ﴿ وَأَذِّن فِي ٱلنَّاسِ بِٱلۡحَجِّ يَأۡتُوكَ رِجَالٗا وَعَلَىٰ كُلِّ ضَامِرٖ يَأۡتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٖ ﴾ الحج: ٢٧

بەرێــزان: ئەم قورئانە هەموو وشــەیەکی موعجیزەیەکی تایبەت و ئیعجازێکی زانســتییە. بــۆ نموونە: لەو ئایەتەدا، وشــەی (عمیق) بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشــکرایە لەســەر عەزەمەتــی قورئان، چونکە ئەگــەر زەوی ڕێك و تەخــت بوایە، قورئان دەیفەرمــوو: (يَأْتينَ مِنْ كُلِّ فَجٍ بَعيد). چونکە وشــەی (بعید) مانای دووریەکە لە نێوان دوو مســتەوای دیاریکراودا، کە تەخت بن. بەڵام وەکو وتمان لە قورئاندا چەســپاوە کە زەوی خڕە. جا ئەو کەســانەی کە دێن بەرەو مەککەی موکەڕەمە، لە جێگایانێکی قووڵەوە دێن بە نیسبەت شاری مەککەوە، چونکە زەوی خڕە. هەر بۆیە ئایەتەکە وشــەی (عمیق)ی بەکارهینا، نەك (بعید).. دەی ئەگەر ئەم قورئانە کەلامی خوا نەبوایە و قســەی مرۆڤــی تێکەڵ بوایە، دەبوایە وشــەی (بعید)ی بەکار بهێنایە چونکە

بە ڕووکەش خەڵکی لە شوێنی دوورەوە دێن بەرەو مەککە و ئەوکاتە قورئــان لــە ناو خۆیدا دژایەتی تێدا درووســت دەبــوو. کە ئەمەش دوورە لە قورئانەوە، چونکە هەر ئەو خوایە ناردوویەتی کە زەویشی بەخڕی هێلکەیی دروست کردوە!.

پاشان قورئان باسی سوڕانەوەی زەوی دەکات و دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلْجِبَالَ تَحْسَبُهَا جَامِدَةً وَهِىَ تَمُرُّ مَرَّ ٱلسَّحَابِ ۚ صُنْعَ ٱللَّهِ ٱلَّذِىٓ أَتْقَنَ كُلَّ شَىْءٍ ۚ إِنَّهُۥ خَبِيرٌۢ بِمَا تَفْعَلُونَ ﴾ النمل: ٨٨

واتــە: تــۆ کێــوەکان دەبینیــت وا دەزانیــت کە وەســتاون و بێ جوڵــەن، لە کاتێکدا کە ئەوانیــش وەکو هەور لە جووڵەدان. (چونکە زەوی بــە خێرایی هەزار کیلۆمەتر لە ســەعاتێکدا بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە، هەروەها لە ســەرەتای بەرپابوونی قیامەتدا، کێوەکان وەکو خوری شــیکراوە دەبرێن بە ئاســماندا و چاڵ و چۆڵی زەویان پێ پڕدەکرێتەوە) ئەمەیە دەستکردی ئەو خوایەی کە هەموو شتێکی بەوپەڕی ڕێکوپێکی دروســت کردوە، بە ڕاســتی ئەو زاتە زۆر ئاگایە بەو کار و کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن..

ســبحان الله لە وردی دەربڕینی قورئان، کە چۆن شــێوەی جوڵەی شاخەکان دەشوبهێنێ بە جوڵەی هەورەکان.. ئەی بۆچی ئێمە هەست بەو جوڵەیە ناکەین؟! خۆ دەبوو خانوەکان بڕوخانایە؟! بە هۆی ئەو هێزە کێشــندەی زەوییەوە ئێمە هەســت بەو جوڵەی زەوییە ناکەین کــە ئەمەش یەکێکە لــە ڕەحمەتەکانی خوا بەرامبەر بە بەندەکانی. خۆ ئەگەر ئەم هێزی کێشــکردنە نەبوایە ئەوا مرۆڤ لە سەر زەویدا

دەفرێ و بەرز دەبۆوە بەرەو ئاســمان. هەروەکو لە سەر هەسارەکانی تــر دەبینــرێ، کە چۆن مرۆڤ بەرەو ئاســمان هەڵدەکێشــێ و بەرز دەبێتەوە. چونکە لە ســەر هەســارەکانی غەیــری زەوی ئەو هێزی کێشندەیە، یان نیە، یان زۆر کەمترە لە وەی کە لە سەر زەوی هەیە. هەر بۆیە خوای گەورە پێمان دەفەرموێ: ﴿ أَمَّن جَعَلَ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا ﴾ النمل: ٦١ ، یــان دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ قَرَارًا وَٱلسَّمَآءَ ﴾ غافر: ٦٤

واتە: خوا ئەو زاتەیە کە زەوی بۆ کردوون بە شــوێنی سرەوتن و ژیان و حەوانەوە، ئاسمانیشــی بە سەرتانەوە ڕاگرتووە... ئەمەش بە هۆی بەرگە هەوای دەوری زەوی، کە ئەم بەرگە هەوایە (٣٠٠) ئەوەندە کیلۆمەترە دەوری زەوی گرتووە..

زانســتی زیندەوەرزانــی -الاحیــاء- و قورئــان: بناغەی زانســتی زیندەوەرزانی لەســەر خانە -الخلیة- دامەزراوە. کە خانە پێکهاتەی بنچینەیی زیندەوەرانە. قورئانیش دەفەرموێ: ﴿ وَجَعَلْنَا مِنَ ٱلْمَآءِ كُلَّ شَىْءٍ حَىٍّ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴾ الانبیاء: ٣٠

واتــە: لە ئاو هەموو شــتێکی زیندوومان فەراهــەم هێناوە.. ئەمڕۆ زانســت دەڵــێ: هەموو زیندەوەرێــك لە خانە پێك هاتــوە و خانەش -سایتۆپلازمی- تێدایە. کەلە (٧٠٪ - ٨٠٪)ی پێکهاتەی سایتۆپلازم ئاوە.

لە تەفســیری کوردی، مەلای گــەورەی کۆیەدا ب١٠، ل٤٦٩ دا هاتوە کە: مەنی پیاو کە منالی لێ دروست دەبێ، (٨٢٪)ی ئاوە.!

لێرەدا پرســیارێکی زانستی دروســت دەبێت، ئەویش ئەوەیە: ئایا

بۆچـــی ئاو بناغەی ژیانە؟! لە وەڵامدا دەڵێین: لە ڕووی فیزیاییەوە، هەموو شــلەیەك كاتێ لە حاڵەتی شــلیەوە دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی ڕەقی - چــڕی زیاد دەكات و قــورس دەبێ. بەڵام ئاو بەپێچەوانەی هەموو ماددەیەكی شــلەوە، كاتێ كە دەگاتە (چوار) پلەی ســەدی، قەبارەكەی گــەورە دەبێ و چڕیەكەی كەم دەبێتەوە و كێشــەكەی ســوك دەبێ، بۆیە كاتێ ئاو بەســتی. ئاوە بەستوەكە (سەهۆڵەكە) سەرئاو دەكەوێ و ژێرەوەی هەر شــلە بۆ ئەوەی گیاندارانـــی ناو ئاوەكە، كە هەزاران زیندەوەرن، بە زیندوویەتی بمێننەوە.

لێــرەدا ئاماژە دەكەین بــۆ تایبەتمەندیەكی تری ئاو، كە ئەویش: تایبەتمەندی موینی فیزیایە بۆ ئاو، بەم تایبەتمەندییە، ئاو لە ڕەگی درەختەكانەوە بەرەو ســەرەوە هەڵدەكشــێ و دەگاتە گەڵاكان. بە بێ هیـــچ جۆرە ترومپایەك!! ئەم تایبەتمەندیەش تەنها خوای گەورە لە ئاودا دروســتی كردوە، لە ناو هەموو مادده شلەكاندا. بۆ گەشەكردنی گژوگیا و ڕووك و درەختەكان..

ئیماندارانـــی بەڕێز: لێرەدا شــتێكی گرنگی تر هەیە كە شــایەنی ئاماژەپێكردنــە، ئەویش ئەوەیە: جۆرێك لە بەكتریا هەیە لە هەوادا دەمرێ!! خۆ ئاشكرایە كە هەوا چەندە بنچینەیە بە نیسبەت ئێمە و هەموو زیندەوەرانەوە. كە ناتوانین هەرگیز لەچەند خولەكێكی كەم زیاتــر بــە بێ هەوا بژین. بەڵام: جۆرێك لــە بەكتریا هەیە كە پێی دەوترێ: (البَكْتريا اللاهَوائِيَّــة) (Un atropic pacateria) هەر كاتێ ئەم بەكتریایە هەوای بەركەوت دەمرێ!! دەی خوای پەروەردگار نەی

فەرموو: (وَجَعَلْنا مِنَ الهَواءِ كُلَّ شَيءٍ حَيٍّ) خۆ ئەگەر وای بفەرمواية، ئەوا ئەمڕۆ بەم دۆزینەوەیە دەوترا، ئەوەتا هەر هەموو شتێ بنچینەی ژیانی هەوا نییە. قسە و فەرموودەی ئەو خالیقەیە، کە ئەو جۆرە بەکتریایەشی دروست کردوە و ئاگادارە بە وەی کە بە هەوا نەك ناژی، بەڵکو پێی دەمرێ، ئایا تەنها ئەمە بەس نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ ئیمان بە خوا و بە کەلامەکەی و بە پێغەمبەرەکەی بێنێ؟! بەڵێ بۆ کەسی زانا بەسە و بۆ کەسی نەزان و نەفامیش نەخێر.

لایەنێکی تر: قورئان و زانستی کشتوکاڵ: ئەمڕۆ لە زانکۆکاندا لەبەشی: (عِلْمُ الهَنْدَسَةَ الزراعِيَّة)دا دەڵێن: پێش بڕیاردان لە هەر پرۆژەیەکی کشتوکاڵی پێویستە بە وردی لێکۆڵینەوە و دیراسەی ئەم شتانە بکرێ:

١. کارتێکەرەکانی ئاو و هەوا، ئاو و هەوا لەو ناوچەیەدا کە کشتوکاڵەکەی لێ دەکرێ. وە دیاریکردنی سەرچاوەکانی ئاو بۆ ئەو کشتوکاڵە کە پشت بە چ ئاوێك دەبەستێ. وە شیکردنەوەی جۆری ئاوەکە و ڕێژەی خوێ تێیدا. ئایا ئاوێکی سوێرە یان ئاوێکی گونجاوە بۆ کشتوکاڵەکە..

٢. شیکردنەوەی گڵەکە و زانینی ماددەی ئەندامی و کانزایی تێیدا. وە هەروەها دیاریکردنی جۆری گڵەکە و ڕمڵ و لمی وردەی ناو خاکەکە. کە ڕێژەکەی چەندە لەو گڵەدا..

٣. جا لە سەر ڕۆشنایی ئەو زانیاریانە، هەڵدەستین بە هەڵبژاردنی (ڕوەکی گونجاو، وە دەوری کشتوکاڵی گونجاو، کە ساڵی چەند جار

دەتوانرێ ئەو کشـــتوکاڵە بکرێتـــەوە. وە هەروەها دیاریکردنی جۆری تۆوەکە.. جا ئەم بنەما گشتیانەی زانستی ئەندازیاری کشتوکاڵی. خوای گـــەورە لە (ســـێ) ئایەتدا هەمووی باس کردوە. لـــە کاتێکا بە ماوەی چەند ســـاڵ لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی زانســـتی لە لایەن پســـپۆڕانی کشتوکاڵیەوە و نوســـینەوەی و تاقیکردنەوەی، ئەمجا بۆتە بابەتێکی زانستی کشـــتوکاڵ، بەڵام قورئان تەنها بە (سێ) ئایەت هەمووی باس کـــردووە، کە دەفەرموێ: ﴿ أَنَّا صَبَبْنَا ٱلْمَآءَ صَبًّا ﴿٢٥﴾ ثُمَّ شَقَقْنَا ٱلْأَرْضَ شَقًّا ﴿٢٦﴾ فَأَنۢبَتْنَا فِيهَا حَبًّا ﴿٢٧﴾ ﴾ عبس: ٢٥ - ٢٧

واتە: بێگومان ئێمە ئاومان بۆ داباراندۆتە خوارەوە، چۆن داباریـنێك، لـــەوەو دوا زەویمـــان بۆ لەتلەت بە چەکەرەی ناســـکی ڕووەك. ئینجا دانەوێڵەمان تێدا ڕواند..

ئەوەتا لە ئایەتی یەکەمدا، باسی ئاوو هەوا و جۆری ئاوەکە دەکات کە پشت بە ئاوی باران دەبەستێ. ئایەتی دووەم: باسی جۆری خاکەکە دەکات کە گونجاوە بۆ کشـــتوکاڵ و دانەوێڵە دەتوانێ چەکەرەی تێدا بکات. لە ئایەتی ســـێیەمدا باســـی جۆری دانەوێڵە و پاشـــان جۆری ڕووەکـــەکان دەکات کـــە گونجاون بۆ چاندن لەو خاکـــەدا.. بەڵێ، هەر کەســـێ لە خزمەتی قورئاندا بێ، زانـــا دەبێ ئەگەرچی خوێندەواری زۆریشی نەبێ، چونکە سەرچاوەی هەموو زانستەکانی خوێندۆتەوە..

پاشان: قورئان و زانستی دەریا و زەریاکان (عِلْم البِحار): قورئان کە لە بیابانی وشـــکی حیجاز هاتۆتە خوارەوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هەموو ژیانیدا سواری کەشتی نەبوە و نەچۆتە ناو دەریا. کەچی قورئان

گەورەتریــن بابەتی زانســتی لە بواری دەریــا و زەریاکاندا باس دەکات و دەفەرمــوێ: ﴿ مَرَجَ ٱلْبَحْرَيْنِ يَلْتَقِيَانِ ﴿١٩﴾ بَيْنَهُمَا بَرْزَخٌ لَّا يَبْغِيَانِ ﴿٢٠﴾ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ ﴿٢١﴾ يَخْرُجُ مِنْهُمَا ٱللُّؤْلُؤُ وَٱلْمَرْجَانُ ﴿٢٢﴾ ﴾ الرحمن: ١٩-٢٢

واتــە: ئــاوی دوو دەریای بەڕەڵڵا کــردوە و بەیــەك گەیاندوە و تێکەڵیش نابن.. لەو دوو جۆر دەریایە مرواری و مەرجان دەردەچن. (کە دوو جۆر گەوهەری بە نرخن).

بەڕێزان: دوای زیاتر لە (١٣٠٠) ساڵ زیاتر لە هاتنە خوارەوەی ئەم قورئانە و ئەم ئایەتانە. ئەمجا دەریاوانەکانی شــارەزای زانستی دەریا و ئاو، ئەم ڕاســتییەی قورئانیان لە نێوان دەریای ســپی ناوەڕاست و زەریای ئەتڵەســیدا و دەریای ســور و دەریای عەرەبدا بۆ دەرکەوت و بینی!!. بەڵێ قورئان ئاماژە بەوە دەکات کە هەردوو ئاوەکە ســوێرن، چونکە باســی ئەوە دەکات مرواری و مەرجانیان تێدایە و ئاشــکرایە کە مرواری و مەرجانیش تەنها لەئاوی سوێردا هەن!..

بەڵێ لە نێوان ئەم دوو ئاوە ســوێرەدا، لە شــێوەی سێگۆشەیەکدا لە نێوان دەریای ناوەڕاســت و زەریای ئەتڵەســی دا، کە پێی دەوترێ: (جبل طارق). ئەم ئاوە جیاوازە هەیە. کە ئاوەکەی لە هیچیان ناچێ لە: پلــەی گەرمی، خوێ، توانەوەی ئۆکســجین، چــڕی ئاوەکە، (ئەم ئــاوەی لەم نێوانەدایە -برزخ- لە ئــاوی هیچیان ناچێ، نە لە ئاوی دەریای ناوەڕاســت، نە لە ئاوی زەریای ئەتڵەســی). بەڵام: ماســی و گیانداری ئەملاولا (ئەتڵەســی و ناوەڕاســت) دەچنە ئــەم ناوەندەوە و تێیــدا دەژین. بۆیــە لێرەدا نافەرمــوێ: ﴿ وَحِجْرًا مَّحْجُورًا ﴾. بەڵام

بـۆ ئـەو دوو ئاوەی کە یەکیان شـیرینە و بۆ خواردنەوە شـیاوە و یەکیشیان سوێرە و تاڵە. کاتێ ئەم دوو ئاوە بە یەك دەگەن. بۆ ئەمان دەفەرمـوێ: ﴿وَحِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾. هەروەکو لەم ئایەتـەدا دەفەرموێ: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِي مَرَجَ ٱلۡبَحۡرَيۡنِ هَٰذَا عَذۡبٞ فُرَاتٞ وَهَٰذَا مِلۡحٌ أُجَاجٞ وَجَعَلَ بَيۡنَهُمَا بَرۡزَخٗا وَحِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾ الفرقـان: ٥٣، لێرەدا بـەو نێوەندەی کە لە نێوان ئـەو دوو ئاوەدا هەیـە دەفەرمـوێ: ﴿بَرۡزَخٗا وَحِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾. چونکە لەگـەڵ ئەوەدا کە ئەو ئاوەی لـەو ناوەندەدا هەیە لە ئاوی هیچ کام لا ناچـێ. لەگەڵ ئەوەشـدا ئەو ماسـی و گیانـدار و ڕووەکانەی لەو ناوەندەدان، ناتوانن بچنە هیچ کام لە ئاوە شیرین و سوێرەکەوە، وە هـی ئەوانیش ناتوانن بێنە ناویەوە. بۆ نموونە: دوو ڕووبار هەن کە لە (تشاتغام)ی پاکستانەوە تێ دەپەڕن. بەرەو ڕۆژهەڵات بۆ لای شاری (ئـەرکان) لـە (بۆرما). زۆر بە جوانی دەبینـرێ کە ئەو دوو ڕووبارە هەر یەکەیان سـەربەخۆیە لەوی تریان و هەرچەندە هەریەك ئاوە، بەڵام بە ئاشـکرا هێڵێکی جیاکەرەوە -کە ئاوەکەی لە هیچیان ناچێ، لە نا وەڕاسـتدا بە نێوانی ئەملا و ئەولادا دەڕوات و بە تەواوەتی لە یەکتری جیاکردونەتەوە. ئاوی لایەکیان شـیرین و خۆشـە. ئاوەکەی لایەکەی تر سـوێرە و ناخورێتەوە و بەیەکـەوە دەڕۆن و ئەو هێڵی ناوەندە لە نێوانیاندایە ﴿بَرۡزَخٗا وَحِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾. ئاوی ئەم ناوەندەش نە لە هی ئاوە شیرینەکە دەچێ، نە لە ئاوە سوێرەکە، بەڵکو ئاوێکی سەربەخۆیە و هیچ ماسی و زیندەوەرێکی ئەملا ناچێ بۆ ئەولا و بە پێچەوانەشەوە. بۆیە قورئان ﴿وَحِجۡرٗا مَّحۡجُورٗا﴾ی بەکارهێنا.. جا ئایە

تەنها ئا ئەمە بەس نییە لەسەر موعجیزەی ئەم قورئانە و بەڵگەی ئەوەی کە قورئان تەنها کەلامی خوایە و دوورە لە وشەی هیچ مرۆڤێك. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) هەرگیز نەچۆتە دەریاوە و ئەم حاڵەتانە ببینێ، تەنانەت ئەوانەشی لەو سەردەمەدا ژیاون و ئەهلی ناو ئاو و دەریا بوون، باسیان لە شتێکی ئاوا نەکردوە. بەڵکو نزیکەی (١٠٠) ساڵێکە ئەم باسە زانستییە لە لایەن پسپۆڕانی دەریاییەوە باس کراو بلاوکرایەوە.. بەلام قورئان ئەوەندە بە وردی باسی کرد و جیاوازی خستە نێوان بە یەکگەیشتنی دوو ئاوی سوێر، لەگەڵ بە یەکگەیشتنی دوو ئاو کە یەکیان شیرین و ئەوی تریان سوێر بێ، بۆ یەکەم جار تەنها فەرمووی: ﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا﴾، بەلام بۆ دووەمیان فەرمووی: ﴿بَيْنَهُمَا بَرْزَخًا وَحِجْرًا مَّحْجُورًا﴾. چونکە هی ئەمەی دوەمیان ماسی و زیندەوەرانی ئەملا ناچن بۆ ئاوی ئەولا و بە پێچەوانەشەوە. ئایا ئەگەر ئەمە کەلامی دروستکەری ئاوی سوێر و شیرین نەبێ، ئەبێ چی بێ؟!

ئیمانداران بەڕێز: ئەگەر سەیری بواری زانستی قانون و یاسا بکەین، دەبینین لە یاسای ئەمریکیدا: (٨) موجەڵەد کتێب لە سەر میرات نوسراوە. بەلام لە قورئاندا ئەم هەموو باسە گرنگە بە یەك ئایەتی قورئان باسی هەموو یاسا بنچینەییەکانی میرات دەکات و بەشەکان بە ڕوون و ئاشکرایی باس دەکات. جا ئەگەر ئەمە کەلامی خوا نەبێت چۆن ئاوا بە وردی لە یەك ئایەتدا ئاوا باسی میرات شی دەکاتەوە.

جـا لێرەوەیە: کە دوژمنانی ئیسـلام دەزانن کـە هێز و گەورەیی موسڵمانان لە قورئانەوەیە. هەروەکو قورئان خۆی ئاماژەی پێ دەکات و دەفەرمـوێ: ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَا تَسۡمَعُواْ لِهَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانِ وَٱلۡغَوۡاْ فِيهِ لَعَلَّكُمۡ تَغۡلِبُونَ ﴾ فصلت: ٢٦

واتـە: بێباوەڕان دەیانوت: گوێ مەگـرن بۆ ئەم قورئانە و بیکەن بـە گاڵە و هەرا و هوریا، بۆ ئەوەی ئێوە زاڵ ببن و بیبەنەوە. بەڵام پیلانـی ژەهـراوی کافران دژی قورئان بە دوو شـتە: یەکەم: خەڵك گوێی لێ نەگرێ. دووەم: نەك هەر گوێی لێ نەگرێ و بڵێ من حەقم چییـە. بەڵكـو دەبـێ کار و جموجۆڵ و چالاکی هەبـێ بۆ دژایەتی قورئـان و هەموو هەوڵێکی ڕاگەیانـدن و بڵاوکردنەوەی بۆ بخرێتە گـەڕ. بەڵێ قوڕەیشـیە موشـریکەکان گۆرانی و ڕەقصیـان دەکرد و شـانامەیان دەخوێندەوە، لەو کاتانەی کە لە ناو کەعبەدا موسڵمانان قورئانیان دەخوێند. وە ئەم دژایەتیە بۆ قورئان هەتا ڕۆژی قیامەت هـەر بەردەوامە. بەڵام: دژایەتی قورئان، دژایەتی زانسـتی ئەوەڵ و ئاخیرە. هەر کەسێ دەیەوێت کتێبێك بخوێنێتەوە، کە هەرچی زانستە تێیدا بێ. کە چەند نمونەیەکمان لێ باس کرد لە زۆربەی زانستەکان شـتێکمان بە نمونە وەرگرت، با بێ دیراسە و لێکۆڵینەوە لە قورئان بکات. بەڵێ، هەر کەسێ دەیەوێت کتێبێك لە ماڵ و کتێبخانەیدا بێ، کە هەرچی باسـی کاتی مردن و دوای مردن و قیامەتە تێیدا بێ، با لەخزمـەت قورئاندا بێ و قورئان لـە ماڵ و مەکتەبیدا بێ. کەواتە: هەر کەسـێ دژایەتی قورئان بکات و بی دڕێنێ و بی سـوتێنێ، ئەوە

بێجگــە لــە دوژمنایەتی خــوا و کەلامی خــوا، دوژمنایەتی هەرچی عیلم و زانیاری هەبوە و هەیە و دەبێ کردوە.. ئەگەر کەسێك بچێ زانکۆیەك بە هەموو کۆلێج و کتێب و دەستنووســیەوە بســووتێنێ، هێشــتا بە جوزئێکی ئەوە نابێ کە دێڕێکی قورئان بسووتێنێ. ئەمە هەروەکــو بواری عیلم و زانیاری. ئیتر ئــەوەی کە کەلامی خوایە و دواخەڵات و دیاری و ڕێنمایی ئاسمانە بۆ مرۆڤایەتی بە گشتی، ئەوە گەورەترین جەریمەیە..

لــە ١١ ســێبتمبەری (٢٠١٠) دا، دوای ٩ ســاڵ بەســەر ڕوداوی (١١ی ســێبتەمبەر)دا. قەشــە (جۆنز) بڕیاری دا (٢٠٠) قورئان بســووتێنێ. هەرچەندە لە ژێر فشاری ناوخۆی ئەمریکا و جیهاندا پەشیمان بۆوە، بەڵام دواتر قەشەیەکی بەدبەخت لە بەردەم کۆشکی سپی قورئانێکی دڕاند، لێرەدا دەبێ سەرنج بدەین:

١. دەپرسین باشە ڕووداوی (١١ی سێبتەمبەر) سیاسییە یان ئاینی؟! خــۆ (ئۆباما) خــۆی دەڵێ: ئەمە بابەتێکی سیاســییە نەك جەنگێکی ئاینی. باشــە بۆچی لە جیاتــی حکومەتی ئەمریکی لــە یادی (١١)ی ســێبتەمبەردا، ئەم بڕیارە بدات کە ئیشــی ئەوە. بۆ (قەشــە) دەبێ ئــەم بڕیارە بدات!!. ئەی مەگەر ناڵێن: لە دەوڵەتی دیموکراتیدا دین جیایە لە دەوڵەت!!. ئەی کەوایە قەشــە بۆچی لە کڵێسادا قورئانەکە نادڕێنێ. بۆ دەبێ بگاتە بەردەم کۆشــکی ســپی ئەمریــکا؟! کەواتە: ئەصــڵ و ئەساســی نییــە کە دین جیایــە لە دەوڵــەت، بەڵکو ئەوە قەشەیە و هێندە دەسەڵاتدارە حوکم بە سەر دەوڵەتدا دەکات!!...

٢. یان قەشە (جۆنز) وەکو بە سەرهاتی کابرای لێ قەوماوە، کە لە دیوەخاندا باسی هەموو کەس دەکرا، ئەو نەبێ، کەس نەی دەناسی، بۆیە چوو پیسایی کردە سەرچاوەی ئاوی دێیەکەیانەوە، کە کانیەکی پاك و جوان و سازگار بوو!! پاشان هەر خۆشی بلاوی کردەوە کە ئەو بوە ئەو کارە قێزەونەی کردوە!، کە لێیان پرسی: باشە بۆچی وات کردوە؟! وتی: بەڵکو باس بکرێم. ئەگەر بۆ چاکەش باس نەکرێم، با بۆ خراپە ناوم بێ!!!

٣. (قەشە جۆنز) خۆی بە دەمی خۆی وتی: کە هیچ لە بارەی قورئانەوە نازانم و هیچم لێ نەخوێندۆتەوە. لە بەر ئەوە ئەمە نیشانەی نەفامی و گێلی و نەزانی ئەو کەسە دەردەخات کە شتێکی نەخوێندبێتەوە و نەزانێ باسی چی دەکات و هەرلە خۆیەوە دژایەتی بکات. لە کۆنیشەوە وتراوە: (الإِنْسان عَدُوّا لِما يَجْهَلُهُ)..

بەڵێ، (قەشە جۆنز) ناوی چوە ناو ناوانەوە، بەلام چ ناو و ناوبانگێك؟! لە پێش هەموو کەسەوە کچەکەی خۆی لە کەناڵی (الجزيرة) وتی: باوکم خەڵەفاوە و شێتە..

وە پێش موسڵمانان بە دەیان قەشەی مەسیحی نەفرەتیان لێ کرد..

کەواتە: دژایەتی قورئان، هەر شەڕی نێوان کوفر و ئیسلام نییە. بەڵکو شەڕی نێوان عیلم و جەهلە.. بەڵێ سوکایەتی بە قورئان هەڕەشەیە بۆ سەر ئاشتی جیهان، چونکە تەنها و تەنها ئەم قورئانە کە پەیامی ئاشتی پێیە بە ویژدانەوە لە هەموو گاور و جولەکە دەپرسین، لە مولحید و بێبڕوا دەپرسین: لە قورئاندا، چۆن ئیمان

بە (محمد) (ﷺ) واجبە، ئاوا ئیمان بە عیسـای ڕوح الله واجبە. وە ئیمان بە موسای کلیم الله واجبە. هەر کەسێ عیسی، یان موسی یان هـەرکام لە پێغەمبەران بە پێغەمبەری حەق نەناسـێ، کافر دەبێ!!
نـاوی پێغەمبـەری ئاخر زەمان -محمد المصطفـی- (ﷺ)، بە ناوی (محمـد و ئەحمـەد) تەنها (٥) جار لە قورئانـدا هاتووە. بەڵام ناوی: موسـی (١٣٦) جار هاتوە، (توخوا هەموو جولەکەی جیهان، بە ساڵێك، بە قەدەر یەك سـەعاتی موسـڵمانان ناوی (موسـی) دێنن؟! نەخێر. چونکە موسڵمان بە بەردەوامی قورئان دەخوێنێتەوە و بە بەردەوامی لە هەر خەتمێکی قورئاندا (١٣٦) جار ناوی (موسی) دەهێنێ!..

ئەمجا ناوی (عیسی) (٢٥) جار لە قورئاندا هاتوە.

نـاوی (إبراهیم) (٦٩) جار هاتوە، ناوی (داود) (١٦) جار هاتوە، ناوی (یوسف) (٢٧) جار هاتوە. ناوی (یعقوب) (١٦) جار لە قورئاندا هاتووە.

بە گشـتی ناوی هەموو پێغەمبەران تێکـڕا (٥١٣) جار لە قورئاندا هاتوە، جگە لە ناوی پێغەمبەری ئاخرزەمان، حەزرەتی محمد (ﷺ)..

لێرەدا دەپرسـین: ئایا غەیری قورئان و ئیسلام، دەتوانێ ئاوا ڕێز لەو خـاوەن ڕێزانە بگرێ؟! هەرگیزاو هەرگیز. پاشـان ئەگەر یەکێ بپرسـێ: باشـە بۆچی ناوی (مولحید) تان باس کرد، خۆ ئەو باوەڕی بـە هیچ ئایـن و بیروباوەڕێکـی ئاینی نییە؟! لە وەڵامـدا دەڵێین: قورئان ئاشتی و ئارامی و سەلامەتی بۆ مولحید و بێباوەڕانیش پێیە لـەم ژیانی دنیایەدا، چونکە بە زۆر ئاینی بە سـەردا فەرز ناکات و تەواوی ئازادی لە هەڵبژاردنی بیروباوەڕدا پێ دەبەخشـێ. هەروەکو

دەفەرموێ: (وَلا تَسُــبُّوا الَّذيــنَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ فَيَسُــبُّوا اللهَ بِغَيْرِ عِلْمٍ) بەڵێ بۆ موســڵمان نییە جوێن بدات بە بتپەرســتێکی بوذی یابانی، یان هەر بتپەرســتێکی تر. بۆ ئەوەی شــەڕە جوێن دروســت نەبێ و ئەو بتپەرستەش لەو کاتەدا بێئەدەبی بەرامبەر (رَبُّ العالَمين) لە دەم دەرنەچێ.

پاشــان: هەر قورئانە کە ئەمڕۆ لە تەواوی ســەرزەویدا، شــایانی ئــەوە بێ کــە پێی بوترێ کەلامــی خوا. چونکە کەلامــی خوا نابێ قســەی بەشەری تێدابێ.. چونکە لە سەر زەویدا، تەوراتێك نییە. کە ئەو تەوراتە ڕاســتەقینە بێ کە بۆ حەزرەتی موسا هاتوە. ئەمڕۆ بە دەیــان جۆر تەورات هەیە و هەریەکەی بە جۆرێك نوســراوەتەوە و هەر نوســەرەی بە ئارەزووی خۆی لێی زیاد و کەم کردوە. هەروەها (ئینجیــل) بــە دەیان جــۆری هەیە. هەر چاپەی کۆمەڵێك شــتی لە چاپەکــەی تــر جیاوازە، بڕوا بکەن قەشــەی ئێــرە بچێتە ئەمریکا، لــە ئینجیلی ئەوێ تێ ناگات. چونکە لە وێــش بە ئارەزووی خۆیان دەســتکاری دەکەن!.. بەڵام وەرە سەرنجی قورئان بدەن. ئەم قورئانە لە تەواوی ســەرزەویدا هەریــەك قورئانە و دەڵێی ئێســتا لە دەمی پیرۆزی پێغەمبەری خواوە (ﷺ) بیستراوە..

دەگێڕنــەوە: پیاوێکــی خوێنــدەوار و خەتخــۆش و زانا هاتە لای خەلیفە (مَأمُون)، ئەویش پێی وت موسڵمان بە. چونکە ئەو کابرایە مەسیحی بوو. بەڵام کابرا موسڵمان نەبوو. پاش چەند ساڵێك هاتەوە بەڵام ئەمجارە بە موســڵمانی هاتەوە، خەلیفە لێی پرسی: چۆن بوو

موسـڵمان بـووی؟! کابرا وتی: گـەڕام بزانم کام دینـه حەقە. هاتم ئینجیلم بە خەتی جوان نوسییەوە. دابەشم کرد لە بەردەم کەنیسەدا، هەموو زۆر دڵخۆش بوون و زۆر مەمنوون بوون. لە کاتێکدا چەندین شوێنم بە ئارەزووی خۆم بۆ زیاد و کەم کردبوو. کەچی کەس هەستی پێ نەکرد. تەوراتیشم بە هەمان شێوە لێ کرد و بەسەر جولەکەکاندا دابەشـم کرد و زۆر سوپاسـیان کـردم و خوێندیانەوە و هەسـتیان بـە هیچ کەموکوڕی نەکرد. لە کاتێکدا لە زۆر شـوێندا دەسـتکاریم کردبـوو! بەڵام کە قورئانم نوسـییەوەو هەندێ وشـەم لێ لابرد و هەندێکم بۆ زیاد کرد. پاشان کە لە بەردەم مزگەوتێکدا دابەشم کرد. هەر ئەوەندەم زانی پاش کەمێك لە هەموو لایەکەوە گەمارۆ دراوم و بۆم هاتن و قورئانەکەیان سوتاند و وتیان: جارێکی تر شتی وا بکەی دەت دەیـن بـە دادگا، منیش بۆم دەرکەوت تەنها هەر ئەمە حەقە و کەلامـی خوایـە و خوای گەورە خۆی پارێـزگاری لێ دەکات و کەس نییە بتوانێ وشـەیەك، پیتێك بەڵکو فەتحە و زەمەیەکی لێ زیاد و کەم بکات. ئیتر زۆر بە خۆشحاڵیەوە موسڵمان بووم!..

ئیمانداراني بەڕێز: دڵسۆزانی قورئان: ئایا ئێمە کاردانەوەمان چی بێ بەرامبەر بە هەر سـووکایەتی و بێڕێزی نواندنێك کە بەرامبەر بـە قورئان دەکرێت، لە لایەن کەسـانی بێ ڕێـزەوە، ئایا ڕێپێوان و خۆپیشـاندانی سـەرجادە و شـەقامەکان بکەین و درووشم بدەین و لافیتە بەرز بکەینەوە؟! نەخێر. مەرج نییە موسڵمان لاسایی خەڵکی تـر بکاتەوە. با لە جیاتی برژێینە سـەر شـەقامەکان و هاتووهاوار

بکەین، یا بە بێدەنگی و بە خشوعەوە ڕوو بکەینە مزگەوتەکان. کێ بەدڵ دژی ئەم فەشــە و هەر فەشــە سفەتێکە لە هەرجێگایەکی ئەم سەرزەوی و هەرزەمان و زەمینێکدا هەیە، بە خشوعەوە ڕوو بکەینە مزگەوتەکانی ماڵی خوا. کێ بە دڵ دیفاع لە قورئان دەکات با بڕیار بدات کە نەهێڵێ نوێژی عیشــا و بەیانی بە جەماعەت لە مزگەوتدا بفەوتێ. چونکە خۆپیشــاندان و هوتافکێشانی سەرشەقام. (عاطیفە و سۆز جووڵانی سەعاتێکە). بەڵام گرنگ ئەوەیە کە مزگەوتەکانمان تا (قِیام السّـاعَة) قەرەباڵغ و گەرموگوڕ بن وەکو ڕەمەزان.

با بڕیار بدەین لە دوای مانگی ڕەمەزانەوە. (إسْــتِیقامە)مان هەبێ، نەك (إسْتِقالە). لە خواناسی و هاتووچۆی مزگەوت و مەجلیسی خێر..

زۆربەمــان بیســتمان کــە گەنجێکی تــازە پێگەیشــتوو لە قەزای چەمچەماڵ لەم حەفتەیەدا بە ناوی (جیهاد محمد) لە ناو مزگەوتدا، لــە کاتی دەســتنوێژگرتن بۆ نوێــژی بەیانی بەلادا دێــت و ڕوحی پاکــی دەردەچێــت!! الله أکبر لەو بەختەوەرییــە، ڕۆژی قیامەت کە زیندوو دەبێتەوە ئاوی دەســتنوێژەکە بە ڕوخساریەوەیەتی، ئەمەش فەرموودەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە فەرمووی: (یُبْعَثُ کُلُّ عَبْدٍ عَلى ماماتَ عَلَیْهِ) رَواهُ مُسْلِمُ

واتە: هەموو بەندەیەك لە ســەر ئــەوە زیندوو دەکرێتەوە کە لە سەری مردووە..

ئەمجا لە ڕۆژی قیامەتدا لەو ڕۆژەدا کە هیچ ســایە و ســێبەر و پەناگایــەك نییە. جگە لە ســێبەری عەرشــی خوا. خــوای گەورە و

میهرەبان دەفەرموێ: ئەی بەندەکەم وەرە بۆ ژێر سـێبەری عەرشی من. (وَشـابٌّ نَشَـأَ فـي عِبـادَةِ اللّٰه)..

جـا هـەر گەنجێ دەیـەوێ بەشـداری بکات لـە دڵسـۆزی نواندن بەرامبـەر بە قورئان و بەرپەرچدانـەوەی ئەو بێرێزانەی کە بێرێزی بەرامبەر بە قورئان دەکەن، با بێت رەوشتی بکات بە قورئانی، چونکە پێغەمبەری پێشـەوامان وا بوە. (كانَ خُلُقُهُ القُرْآن). با هەر یەکەمان بە خۆداچوونەوەیەك بکات بۆ کردەوەکانی رابردووی و بە تەرازووی قورئان و سـوننەت هەڵیان سـەنگێنێ و هەر کەموکورتیەك هەبێ چارەسەری بکات. هەروەها هەر خوشکێك دەیەوێت بەشدار بێ لە دیفاع و بەرگری لە قورئان، بابێت سـورەتی -نور- بکاتە نوری باڵای و حیجاب بپۆشێ. بـا ژیانـی کچیەتی. شـووکردن و هاوسـەرگیری و دایکیایەتی و منداڵ پەروەردەکردنی بەو شێوەیە بێ کە قورئان فەرمانی پێ کردوە.. تاوەکو لە قیامەتدا قورئان شەفاعەتی بۆ بکات..

چ مامۆسـتا و خوێندکارێك دەیەوێت پشـتیوانی خـۆی بۆ قورئان دەرببـڕێ بـا بێت وانـەکان رازاوە بـکات بە ئایەتەکانـی قورئان، کە پەیوەندیان بەو وانە و باسەوە هەیە. با هەموو لایەکیشمان ئاگاداربین کـە بەبێ ئاگایی پیلانی کافران و خوانەناسـان لـە گاور و جولەکە و مولحیـدەکان نەهێنینە دی. (گلادسـتۆن) کاتی خـۆی وتی: قورئان لە ژیانی موسـڵمانانـدا بدرێنن، وایان لێ بکەن کە کار بە قورئان نەکەن، ئافرەتەکانیان وا لێ بکەن کە جلوبەرگێك لەبەر بکەن کە قورئان نەهی لێ کردوە!! بە داخەوە ئەمڕۆ ئەو هەموو ئافرەتە موسڵمانە نەخشە و

ئاواتی ئەو دژ بە قورئانە جێبەجێ دەكات. یان ئەو هەموو پیاوەی كە ڕێزی خێزانی، ڕێزی كچی ناگرێ و ئەهلی مزگەوتیشە، بەڵام بێئاگایە لە وەی كە دژی ئایەتی: (وَعاشِرُوهُنَّ بالْمَعرُوف) كاری كردوە!!

دەبا دەســـت بە قورئانەوە بگرین. چونكە هــەر بەو بەختەوەری دونیا و قیامەت دەبین و دڵنیاشین و هیچ گومانیشمان نییە لە وەی كە قورئان بە پیلان و فووی دەمی بۆگەنی ئەوان ناكوژێتەوە و لەناو ناچێ، چونكە وەعدی خوایە: (يُرِيدُونَ لِيُطْفِئُوا نُورَ اللَّهِ بِأَفْوَاهِهِمْ وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ...)

## سەرچاوەكان:


١. تەفسیری ئاسان. م.بورهان محمد أمین.

٢. المَوْسُـــوعَة الذَّهَبِيَّـــة في إعْجاز القُرْآن الكَـــريم.. د.أَحمد مطفى متولي ص٢٦٠ ص٨٥٧.

٣. تابلۆ ناوازەكان، نوعمان مەلا مصطفی سەرگەتی، ل١٠٥.

٤. حَقائِقُ عِلْمِ الحَديْث. عبدالرَّحْمن العَصّافي. ج٢ ص٣٢١.

٥.الإعْجاز العِلْمي في القُرْآنِ وَالسُّنَة. م.نايف مُنير فارس ص٣٦. ص٥٠٨. ص٩٨.

٦. كۆباسەكانی میحراب. شەماڵ موفتی، ئامادەكردنی: عادل شاسواری ب٢، ل٢٨.

٧. تەفسیری كوردی. مەلای گەورەی كۆیە، ب١٠، ل٤٦٩.

٨. كۆباسەكانی میحراب، شەماڵ موفتی، ب٥، ل٥٨.

وتاری سێیەم بۆ مانگی شەوال

# پاراستنی ژینگە
## بەشی یەکەم

الحَمْدُلله رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِه أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: یەکێك لەو بابەتە هەستیار و زۆر گرنگانەی کە پێویستە ئێمەی موسڵمان لێی بە ئاگا بین. بریتییە لە بابەتی ژینگە و پاراستنی ئەم ژینگەیەی کە بە تایبەت خوای گەورە لەم کوردستانە پاك و جوانەدا بە ئێمەی میللەتی کوردی بەخشیوە. سەرەتا با بزانین ژینگە یانی چی؟! ژینگە واتە: شوێنی ژیان، ئەو شوێنەی مرۆڤ لێی دەژی، کە ئەو سەرزەویەیە لە سەری دێی و دەچی و کشتوکاڵ دەکەی و بازرگانی دەکەی و ئاو و نانی لێ وەردەگری و خانوو ماڵی لە سەر دەکەی و ئوتومبێلی لەسەر لێ دەخوڕی، لەگەڵ ئەو ئاسمانەی کە بە سەرتەوەیە و هەوا و باران و بەفر و تەرزەت لە وێوە بۆ دێتە سەر زەوی و بەرگێکە و دەوری زەوی داوە... ژینگە لە دوو برگە پێك هاتوە: ژین + گە هەروەکو دەوترێ: خوێندنگە، کۆمەڵگە، خولگە، فێرگە. کە بە مانای شوێنی ئەو کارانە دێت.. بەڵێ، ئەو ئادەمیزادەی کە بە چاکترین شێوە بەدی هێنراوە، شوێنێکی لە باریشی بۆ ژیانی هەڵبژێردراوە تا بتوانێ دەوری خۆی تێدا ببینێت.. لێکۆڵینەوەکان چەندین خاڵی گرنگیان لەم ڕووەوە بە دیار خستوە،**

بــۆ نموونە: مرۆڤ ناتوانێ لــە زەویەکدا بژی کە پڕبێت لە کەند و کۆســپ و شــکانەوە و کونی زەبەلاح و بــەرد و دۆڵی کاکی بە کاکی وەك ئەوەی لە هەســارەکانی تردا هەیە، یان زۆر نەرم بێت و مرۆڤ لە ناویا نقوم بێت. بەڵکو پێویستی بە زەویەکی ڕاخراوە کە ڕووکاری ســەرەوەی پێکهاتەیەکی توندوتۆڵ بێت بۆ ئەوەی مرۆڤ بە باشی و بێ گرفت لە سەری جێگیر بێت.

ناشــبێت بەردین بێت تا بە کەڵکی کشتوکاڵ بێت. ئەمەش هاتۆتە دی لــە پێکهاتنی زەوی کە چینێکــی تەنك (چەند مەترێك) خۆڵ بە ســەر چینێکی بەردینەوەیە. ئەم چینە بەردینــە زۆر گرنگە تاوەکو چینــە خۆڵەکە فشــەڵ نەبێت و مرۆڤ لە ناویــا ڕۆ نەچێ و بتوانێ بینای لە ســەر دابمەزرێنێ.. ئەگەری هەمان فشەڵبوون لە ئارادا بوو ئەگــەر چینە خۆڵەکە زۆر قوڵ بوایە. بۆیە ســەیر دەکەین چینێکی تەنکــە و لە ژێریا چینێکی بەردینی قــوڵ هەیە کە تا زیاتر لە (٤٠) کلم قوڵ بۆتەوە تاوەکو چینە خۆڵیەکە توندوتۆڵ بێت لە لایەك و لە لایەکی تریشەوە هۆکارێکی بەربەست و جیاکەرەوەی ڕووی زەوی بێت لــە قوڵاییە گەرم و کوڵیوەکەی.. هۆکارێکــی تری گرنگ بۆ گونجانی زەوی بــۆ ژیان پێکهاتنی چینەکانی ناوەوەیەتی، چەقی زەوی لە دوو بەش پێك دێت.. بەشی دەرەوەی شلە و بەشی ناوەوەی ڕەقە، ئەم دوو بەشــە بە شوێن یەکتردا دەسووڕێنەوە، ئەم سوڕانەوەیە دەبێتە هۆی جۆرێك لە هاندانی موگناتیســی بۆ کانزا قورســەکان، وەك: ئاســن و مەگنیسیۆم کە لە چەقی زەویدان و بە هۆیانەوە بوارێکی موگناتیسی

پێك دێت. بە چەشنی پشتێنەیەکی قەڵغان بۆ زەوی کە دەیەها هەزار کیلۆمەتـــر درێژ دەبێتەوە. تا دەگاتە دەرەوەی بەرگی هەوا. ئەم بوارە دەبێتە بەربەســت لە ڕێگای گەیشــتنی بای خۆری (کە بریتییە لەو بایەی کە لە ڕۆژەوە دێت و پێك هاتوە لە نیۆترۆنات و ئەلیکترۆنات بـــە خێراییەکی زۆرەوە کـــە خەمڵێنراوە بە ملیارێك و نیو کیلۆمەتر لە ســـەعاتێکدا. هەروەها ئەم بوارە ڕێگا لە بەردەم هەوری پلازمی و تیشـــکە گەردوونیەکان دەگرێت کە بگەنە سەر زەوی تەنها بە بڕێکی زۆر کەم نەبێت، کە خەمڵێنراوە بە یەك بۆ هەزار، ئەمیش لە ڕێگای بەرگـــی هەواوە دەمژرێ. جا ئەگەر بزانی تەنها وزەی هەوری پلازمی خەمڵێنراوە بە ســـەد ملیاری وزەی ئەو بۆمبە ئەتۆمیەی کە بە سەر (هێرۆشـــیما)دا درا. ئەوســـا دەزانی کە بواری موگناتیسی زەوی چەند ئەرکێکـــی گرنگ جێبەجـــێ دەکات. لەم بارەوە هـــەردوو لێکۆڵەرەوە (فرانك بریس و ڕیموند سیڤر) ئاماژەیان بەوە کردوە کە: نرخی بواری موگناتیسی زۆر بە ئەندازەیە و بە هۆیەوە بواری هیچ ڕوداوێکی لەم جۆرە نەدراوە. بەڵێ خوای گەورە لە قورئاندا سەرنجمان ڕادەکێشێ بۆ گەورەیی و گرنگی و گونجاوی زەوی کە خوای گەورە چۆن فەراهەمی هێنـــاوە بۆ ژیانی مرۆڤ وەکو دەفەرمـــوێ: (وَفِي الأَرْضِ آياتٌ لِلْمُوقِنِينَ) بە ڕاســـتی لە زەوی و ناو زەویدا چەندەها بەڵگە و نیشانەی زانستی سەرنجڕاکێش هەن بۆ کەسانێك کە ورد ببنەوە و لێکۆڵینەوە بکەن.

بەڵـــێ ئیمانداران: ئەم زەوییە کە ژینگـــەی هەموو مرۆڤایەتییە سەرجەم بە بێ جیاوازی خوای گەورە بە پوختترین شێوە درووستی

کردوە و لەم ســەرزەویەدا هەرچــی زەرەر لە مرۆڤ بدات -بەمانای زەرەرێك کە هیچ قازانج و بەرژەوەندیەکی لە پشتەوە نەبێت- لەم ســەرزەویە بوونی نییە. وە هەر شــتێك لە خزمەت و بەرژەوەندی مرۆڤدا بێ لەم سەرزەوی و ناخی زەویەدا خوای گەورە بۆ بەندەکانی دروستی کردوە..

چونکە هەرچی لەم سەرزەویە هەیە، بە ئەندازەگیری و ڕێژەیەکی دیاریکراوی بێ زیــاد و کەم هەیە. خوای گەورە فەرموویەتی:(إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ).

بەڵێ جاران دەیانگوت ژینگە لە سێ بەش پێك هاتوە: (هەوا، خاك، ئاو..)

جا بۆ نمونە با سەیری هەوا بکەین؛ مرۆڤ لەم زەمینەدا لە ژێر ئەســتووریيەکی زۆری هەوادایە کە بە (بەرگە هەوا) ناسراوە. ڕێژەی پێکهێنەرەکانی هەوا تا بەرزایی نزیك (٧٠)کلم. بەم شێوەیە قەبڵێنراوە: نزیکەی (٧٨٪) گازی نایترۆجین، (٢١٪) گازی ئۆکســجین، (١٪) کۆمەڵێ گازی وەك گازە بە دەگمەنەکان و دووەم ئۆکسیدی کاربۆن و ئۆزۆن و هەڵمی ئاو.. جا بە ڕاستی ئەم ڕێژەی هەوایە زۆر بە وردی و دەقیقی ڕێژەکــەی دیاری کراوە، هەر زیــاد و کەمێك دەبێتە هۆی تێکچوونی ژیــان. بۆ نموونە: لێکۆڵەرەوەی بــواری کیمیایی زیندەگی بەریطانی (جیمس لافلوك) ئاماژەی بەوە کردوە کە ئەگەر ڕێژەی ئۆکســجین لە جیاتی (٢١٪)ی ئێستای (٢٥٪) زیاتر بوایە ئەوا جەنگڵستانەکانی هێڵی یەکسانی و گشــت ئەو ڕووەکانەی خۆراکی سەرەکی مرۆڤ پێك دێنن گڕیان دەگرت!.

پاشـــان وەرە ســـەیری (خاك) بكە، بزانە خوای گـــەورە چەندە بە ئەندازەگیـــری دروســـتی كردوە. بەرزی و نزمی ســـەر زەوی، چونكە ئەگەر هەمووی تەخت بوایە ڕەشـــەبای توند لە ناوی دەبرد.. پاشان شێوەی هێلكەیی زەوی كە بە شێوەیەكە دەڵێی ڕاخراوە و لە هەموو لایەكەوە هەســـت بە ئارامی دەكەی. ئەمجا بوونی شـــاخەكان، بوونی بیابـــان، تەنانـــەت لەنێو ئـــەم زەویـــەدا جۆرەها كـــرم و بەكتریا و جانەوەری جیاجیا دەژین كە وەك كارگەیەكی شاراوە و پەنهان وان، كە هەندێ گرنگیان بە دیار كەوتوە، بەڵام بە تەواوەتی كارەكانیان ڕوون نەبۆتەوە. بۆ نموونە: كرمەكان هۆكارێكی گرنگن بۆ درووســـتكردنی پەین، هەروەها ئەو كون و كەلەبەرانەی بە هۆی كرم و مشك و مار و زیندەوەرانـــی ترەوە لـــە زەوی دەكرێت زۆر گرنگن بۆ گەیشـــتنی هەوا بۆ ناوەوەی زەوی كە جۆرەها بوونەوەری تیا دەژی و گشتی لە خزمەتی مرۆڤ و بەرهەمهێنانی جۆرەها میوە و بەرهەمی كشتوكاڵی گرنگن بۆی.

ئیماندارانی بەڕێز: یەكێك لەو شتانەی كە هەمووومان دەیناسین و بینیومانە لە زەویدا، پێی دەڵێن: (گڵخۆركە): زاناكان دەڵێن: لە یەك دۆنـــم زەویدا، (٥٠٠,٠٠٠) هەزار كرمی زەوی هەیە، ئەم گڵخۆركانە لە كاتـــی جووتكردن و كێڵانـــی زەویدا دەردەكەون. ئەم كرمانە لە یەك دۆنمدا لە ماوەی یەك ساڵدا (١٠) طەن گڵ دەخۆن. لە ئامێری هەرسی ئەم كرمانەدا، ماددەیەكی كلسی دانراوە كە كالیسیۆم دەرژێنێتە سەر ئـــەو خواردنەی دەی خوات، كە گڵەكەیە. زاناكان دەڵێن: ئەم ماددەی

کلسە، تەنها لەم کرمانەدا هەیە کە دەبێتە هۆی بە پیتکردنی زەوی!.

پاشان یەکێکی تر لە پێکهێنەرەکانی ژینگە ئاوە. دەبینی ئەو ئاوە ¾ ی ســەرزەوی داپۆشــیوە، کە ئەگەر بە پێچەوانەوە بوایە و وشکانی بــەو ئەندازە بوایە، ئــەوا ژیان تێك دەچوو. چونکــە ئەو بایەخەی کە دەریا و زەریاکان هەیانە بۆ ســەر زەوی، هەر خوای گەورە خۆی دەیزانێ و پاشان ئەو کەسانەی کە پسپۆڕن لەو بوارەدا.

بەڵێ ئەم ژینگە پاکوخاوێنە کاتێ دەستی مرۆڤی تێ کەوت تێکی دا. قورئــان دەفەرموێ: ﴿ ظَهَرَ ٱلْفَسَادُ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي ٱلنَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ ٱلَّذِي عَمِلُواْ لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ ﴾ الروم: ٤١

واتە: تاوان و خراپە دەرکەوتوە و هەموو سەر زەوی و دەریاکانیشی گرتۆتــەوە، بــە هۆی ئەو تــاوان و گوناهانەوە کە خەڵکی دەســتیان داوەتێ، سەرەنجام دەبێت تاڵاوی هەندێك لە کردەوەکانیان بچێژن (کە بەرپابوونی جەنگ و کارەساتە سروشتییەکانە) بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ ڕێبازی پاکی و خواناسی..

بەڵێ بەڕێزان: کاتێ کە بواری پیشەســازی پێشــکەوت، مرۆڤ لە بواری گوزەران و کارئاسانی ژیانەوە پێشکەوتنی بەرچاوی بە خۆیەوە بینی. بەڵام وەختێ بە خۆی زانی ئەو ژینگە پاکەی لە دەست دا. هەر بۆیە بڕیاریان دا کە نابێ پێشــکەوتنی تەکنەلۆجیا و پیشەســازی لە سەر حیسابی ژینگە بێ، هەروەکو سەرۆك وەزیرانی یابان وتی: وڵاتی یابان پێنج ســاڵ دوای جەنگی جیهانی دووەم، واتە: لەساڵی (١٩٥٠)دا، دەســتی کرد بە بواری پیشەســازی، توانیمان بەرهەمی جوان و باش

بە دەســـت بێنن و خەڵکی ســـوودی لێ وەربگرن. بەڵام یەکەم گورزی کوشندەمان لە خۆمان دا، ئەویش بە وەی کە ژینگەکەمان پیس بوو. کاتێ کە ئەو جیوەیەی وەکو پاشماوەی کارگەکان دەمایەوە بە نەزانی فڕێمان دایە دەریاوە، ماسییەکانیش خواردبوویان. پاشان هاووڵاتیانیش ئەو ماســـیانەیان خواردبوو، ئەوە بوو پێی تووشی نەخۆشی سامناك بوون و هەندێکیان گیانیان لە دەست دا و ئەوە بوو حکومەتی یابانی بڕیـــاری دا کە قەرەبووی ئەو کەســـانە بکاتەوە، یان هی نەوەکانیان. وە ئـــەم قەرەبـــوە بەردەوام دەبێ هەتا نەوەی نەوەشـــیان. بۆ ئەوەی جارێکی تر پێشکەوتنەکانیان لە سەر بواری پیسکردنی ژینگە نەبێ. هەر بۆیە ئێســـتا جۆرێك ئوتومبێل لە یابان دروست دەکرێ کە پێی دەوتـــرێ ئوتومبێلی ســـەوز، بەو مانایە نا کە ڕەنگی ســـەوزە. بەڵکو بەو مانایەی کە دۆستی ژینگەیە و کەمترین سوتەمەنی بەکار دێنێ و کەمترین زیان بە ژینگـــە دەگەیەنێ، یاخود جۆرە کۆمپیوتەرێکی لاپتۆپی درووســـت کردوە، کە پێی دەوترێ لاپتۆپی ســـەوز، بە مانای ئەوەی کە دۆســـتی ژینگەیە و بەماوەیەکی کەم برێکی زۆر شـــەحن وەردەگرێ و هەتا کارەباش کەمتر خەرج بێ، بێگومان ســـووتەمەنی کەمتر دەسوتێ و سەرەنجام کەمتر زیان لە ژینگە دەکەوێ.

ئیمانداران: یەکێ لە پێکهێنەرە بنچینەییەکانی ژینگە بریتییە لە (ئاو) کە ســـەرچاوەکەی ئاوی بارانە. ئەو ئاوی بارانە بە پاکوخاوێنی لە ئاســـمانەوە دێتە خـــوارەوە، خوای گەورە دەفەرمـــوێ: (وَأَنْزَلْنا مِنَ السَّماءِ ماءً طَهُوراً). واتە: ئێمە لە ئاسمانەوە دامان باراندۆتە خوارەوە

ئاوێکــی پــاك و پاککەرەوە. کە هەم خۆی پاکە، هەم پاککەرەوەشــە. بەڵام ئەم بارانە پاکوخاوێنە کە سەرچاوەی چارەسەری زۆر نەخۆشی بــوو. ئەویش دەســتی مرۆڤ پیســی کــرد. لە ڕێگەی ئــەو هەموو دووکەڵی ئوتومبێل و کارگە و هەناســەی مــرۆڤ و گیانلەبەرانەوە، هەیە. کە سەرەنجام (گۆگرد و هایدرۆجین) یەك دەگرن و ترشەڵۆکە باران درووســت دەبێ، زۆربەمان لە بیرمانە کاتێ بەعسییەکان بیرە نەوتەکانی کوەیتیان تەقاندەوە، کە زیاتر بوون لە (٧٠٠) بیرە نەوت. ئــەوە بــوو بینیمان کە ئەو هەموو دووکەڵە بەو ڕەشــیە ئاســمانی ناوچەکەی ڕەش کرد و خەڵکی هەموو تووشــی تەنگەنەفەسی ببون. ئەوە بوو کاتێ باران باری هەر لە هیندستانەوە تا کوردستانی خۆمان بارانی ڕەش دەباری. کە ئەم ئاوە بارانە ڕەشە بە سەر زەویدا دەڕوات و زەوی دەیمــژێ و دەبێتــە ئاوی ژێرزەوی. پاشــان کارێز و کانیاوی پــێ زیاد دەبێ و ئەویش هەر ترشــەڵۆکە بارانە، وە هەندێکی وەکو لافاو دەچێتە دەریاکانەوە و ســەرەنجام دەبێتە هۆکاری پیســبوونی ئاوی دەریا و ڕووبارەکان، ئەوکاتەش کە ئاوی ژێرزەوی پیس بوو. بە کەڵکی خواردنەوە و مەڕ و ماڵات نایەت و دەبێ وازی لێ بینێ، خوای گەورە کە لە قورئاندا باســی ئەو گەل و نەتەوانە دەکات. کە خوای گەورە غەزەبی لێ گرتوون و لەناوی بردوون. لە گەورەترین سزاکان بریتییە لە وشــکبوونی ئاوی ژێرزەوی و نەمانی بیر و ســەرچاوەی پاکــی. هەروەك دەفەرموێ: (وَبِئْرٍ مُعَطَّلَةٍ وَقَصْرٍ مَشــِيدٍ) بەڵێ قەصر و کۆشــك و ڤێلاکانیان ســەریان چووبووە ئاسمان و پێشبڕکێیان لەگەڵ

بەرزی هەورەکان دەکرد. کۆشــك و باڵەخانەکانیان هێندە بەرز بوون کە جێگای سەرســوڕمان بوون. کەچی خوای گەورە بوومەلەرزەی بۆ نەناردن خانوەکانیان بە ســەردا بڕوخێنێ، بەڵکو ســزاکەیان بریتی بوو لە وەی کە کانیەکانیان وشــك بوون.. جا بێگومان دەکرێ مرۆڤ نەوتــی نەبێ و بژی. بەڵام هەرگیز ناتوانێ بەبێ ئاو بژی کۆشــکی بێ ئاو نرخی چیە؟!!

پاشان ئەگەر بێینە سەر باسی گرنگی هەوای پاك، ئەوا بە دڵنیاییەوە دەڵێین کە: هەوای پاك ســەرچاوەی خۆشــی ژیانە. دەتوانێ ئەم ئاوە نەخۆیتــەوە. چونکە باش نیــە بۆ خواردنەوە، کلســی هەیە. بڕۆی ئاوێکی پاك بە دەست بێنی. جیهازێك دابنێی کە ئاوەکە پاڵافتە بکات و ئاوێکی خاوێنت دەســتکەوێ، یان دەتوانی ئــەو خواردنە نەخۆی. چونکە وا گومان دەکەی کە پاك نەبێ، یان بەروارەکەی بە سەرچوو بــێ، خۆت ڕاگری تا دەگەیتە خۆراکی پــاك. تەنانەت مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە خۆڕاگر بێت بەرامبەر بە وەی کە ماوەیەکی زۆر خواردن و خواردنەوە نەخوات. لە وڵاتی (چین) کاتێ بومەلەرزەیەك ڕووی دا، هەندێــك کەس کەوتنە ژێر دار و پــەردووی خانوە ڕووخاوەکانەوە. دوای (هەشــت) ڕۆژ توانیان ڕزگاریان بکەن و (ســبحان الله) هێشــتا زینــدوو بوون دوای ئەوەی کە ماوەی هەشــت ڕۆژ بوو نان و ئاویان نەخواردبــوو!! بەڵام: هیچ کەس نییە بڵێ دەتوانم ئەم هەوا پیســە نامژم و دەم و لوتم دەگرم. لەبەر ئەوە ســوێند بە خوای گەورە ئەو کەســەی کە دەچێت ژەهر دەکاتە تانکی ئاوی خواردنەوەی گەڕەکێك

یان شارێکەوە، چەندە تاوانەکەی گەورەیە و هەرچی دەزگای میدیایی و ڕاگەیاندنە باســـی دەکات و دەبێتە سەردێڕ و سەرباس و مانشێتی هەموو ڕاگەیاندنەکان بە بینراو و بیســـتراو و خوێندراوەوە، وە ئەو کەســـەی ئەو کارە قێزەونە بکات توندترین ســـزای یاسایی دەدرێت..
یان ئەو کەســـەی کە خواردنی بە ســـەرچوو بە خەڵکی دەفرۆشێ و سەرەڕای خواردنی پارەکەیان بە ناحەق، دەشیان کوژێ لە ڕێگەی ئەو خواردنە بە سەرچووەوە کە یەك پارچە ژەهرە، ئەم بێویژدانە چەندە کارەکەی ناموسڵمانانە و نامرۆڤانەیە و شایستەی سزای توندە. دڵنیا بن تاوانی ئەو کەســـەی کە هەوا پیس دەکات بە ســـوتاندنی تایە و بڵاوکردنەوەی ئەو دووکەڵە ڕەشـــە کوشندە، کە ماددەی شێرپەنجەی خوێنی تێدایە، یان نایلۆن و عەلاگە دەسوتێنێ و ئەو دووکەڵە پیسە ژەهراویە، دەکاتە ئەو ژینگە هەواییە پاکەوە، تاوانی ئەم کەســـە لەو کەسە زیاترە کە ئاوەکەی ژەهراوی کرد یان خواردنە بەسەرچووەکەی فرۆشـــت!!! بۆچی؟! چونکە ئیحتیمالـــی هەیە کە ئەو ئاوە ژەهراویە پێـــی بزانـــدرێ و خەڵکی لێ ئـــاگادار بکرێ و کـــەس نەیخواتەوە و حەوزەکە بەتاڵ بکرێ و پاك بکرێتەوە و هیچ کەس تووشـــی زەرەر نەبێ. وە تاوانبارەکەش دەستگیر بکرێ. یان خواردنەوە بەسەرچووەکە دەســـتی بەسەردا بگیرێ، یان کەسەکە لەماڵەوە هەستی پێ بکات و نەی خوات. بەڵام بە هیچ شـــێوەیەك هەوای پیســـبوو، خۆپارێزی لێ ناکـــرێ و کـــەس نییە بتوانێ ئەو دوکەڵە نەچـــێ بە لووت و قوڕگ و ســـینە و ســـییەکانیدا. لە مناڵێکی سەربێشـــکەوە تا کەســـێکی بە

ســالاچوو. لە کەســێکی ساغەوە، تا ئەو نەخۆشەی ڕەبۆی هەیە و بە بۆنی ئەو دووکەڵە ژەهراویە ئارامی لێ هەڵدەگیرێ و نازانێ بۆ کوێ بڕوات!!! وە ئەو کەســەش کە ئەو تاوانەی بەرامبەر ئەو ژینگە پاکە ئەنجام داوە، لە لایەن یاساوە ناگیرێ و سزا نادرێ تا هەندێ لە کۆڵی گوناهە گەورەکەی لە سەر سووك ببێ.. لەبەر ئەوە با لەخوا بترسین، بەزەییمــان بــە خۆمان و هاووڵاتی و هاونیشــتمانیانماندا بێتەوە با بەزەییمــان بەو گژوگیا و دار و درەختەدا بێتەوە کە ئەوانیش وەکو مرۆڤ بە دووکەڵی نایلۆن و تایە قەڵســن، با بەزەییمان بە ئاژەڵ و باڵندە و زیندەوەرە بچوکەکانیشدا بێتەوە کە ئەوانیش هەناسە دەدەن و بەو دووکەڵە ژەهراویە کوشندە ئازار دەچێژن و لەناو دەچن!...

بەڵێ ئیماندارانی بەڕێز: ئەم ســەردەمە، سەردەمی (قەتیسبوونی گەرمایە) کە بە مانای ئەوە دێ، گازی دوانە ئۆکسیدی کاربۆن ($CO_2$) لە ژینگەدا بلاوبۆتەوە و لەو ڕێژەیە دەرچوە کە پێویستە لە ژینگەدا هەبــێ.. بۆ بەرچاوڕوونی بەڕێزتان و تێگەیشــتن لە قەتیســبوونی گەرما لە سەر گۆی زەوی، نموونەیەکی بەرچاو دێنینەوە: هەمووومان دەزانین کە لەم ســەردەمەدا شتێك نییە بە ناوی هاوین و زستانەوە بــۆ بوونــی بەرووبوومی ڕوەکی. تەماتە و خەیــار و...هتد. وەکو لە هاویندا هەیە. لە چلەی زستانیشــدا هەیە.. ئەویش بە هۆی خانووی نایلۆنــەوە. کە لە ئەنجامــی ئەوەدا ئەو میوەیە، ئەو ســەوزەیە پێ دەگات کە ئەو نایلۆنە ڕوونە ڕێگە دەدات بە تیشــکی خۆر و گەرمی کە بێتە ناوەوە بۆ ناو خانوە نایلۆنەکە. بەڵام ناهێڵێ ئەو گەرمییەی

کــە لە ژوورەوە کۆبۆتەوە بچێتە دەرەوە، هەر بۆیە لە ئەنجامی ئەو گەرمییەدا ئەو بەرهەمە پێ دەگات. جا چونکە گەرمییەکە سروشتی نییە و دەســتکردە، تەماشــا دەکەی هیچ کام لەو بەرهەمانە کە بە ڕەنــگ و دیمەن چەند جوان و ســەرنج ڕاکێشــن. کەچــی لە تام و بۆنــدا وا نین و بێ تامن. جا ئەمڕۆ گۆی زەوی وەکو ناو ئەو خانوە نایلۆنەی لێ هاتوە، لە ئەنجامی کەڵەکەبوونی ئەو هەموو گازی دوانە ئۆکســیدی کاربۆنەدا (CO2) کە بەری ئاســمانی گرتــوە ناهێڵێ ئەو گەرمییــە لە زەوی بچێتە دەرەوە و گەرماکە قەتیس بوە. هەر بۆیە ژینگە پیس بووە، وە ڕۆژ بە ڕۆژ ئەم گازی دوەم ئۆکســیدی کاربۆنە ڕوو لــە زیادبوونــە. ئەویش بە هۆی ئەو هەمــوو کارگە زۆرەوە کە هەیە. بە هۆی ئەو هەموو ئوتومبێلەوە، کە هەمووشی دەگەڕێتەوە بۆ زیادبوونی مرۆڤ بە ڕێژەیەکی یەکجار زۆر لە سەر زەویدا، لە ساڵی (١٨٠٠)ی زاینیــدا، یەك ملیار کەس لە ســەر زەوی هەبوە. لە کۆتایی ســاڵی (٢٠١١)دا بوو بە (٧) حەوت ملیار مرۆڤ!! وا پێشــبینی دەکرێ کە ســاڵی (٢٠٥٠)ی زاینی، ژمارەی مرۆڤ لەسەر گۆی زەوی بگاتە (نۆ ملیــار و دووســەد ملیۆن) کەس. جا ئەم زۆربوونی دانیشــتوانە ئەم جــۆرە کاریگەری بەهێزی هەیە لە ســەر پیســبوونی ژینگە. چونکە ئــەم هەموو مرۆڤــە، هەمووی خواردنــی دەوێ. ئاژەڵی زۆری دەوێ. هەمــووی هەناســە دەدات و دوانە ئۆکســیدی کاربۆن فــڕێ دەداتە هەواوە. ئەم هەموو مرۆڤە پێویســتی بــە کەلوپەلی ناو ماڵە کە لە تەختە دروست دەکرێ، کاغەزی زۆری دەوێ ئیتر ناچار دەبێ دارێکی

یەکجـار زۆر ببرێتەوە. ئەم مرۆڤە هەتا زۆرتر بێ، کارگەی زۆرتری دەوێ، ئوتومبێلـی زۆرتری دەوێ، سـووتەمەنی زۆرتر بەکار دەبرێ. کـە ئەمانەش هەر هەمووی گازی دوانە ئۆکسـیدی کاربۆن دەخەنە هـەواوە.. هەر بۆیە بـواری ژینگە زۆر گرنگە، ئەوەتا لە سیاسـەتدا هەموو کەس حەز دەکات دوژمنەکەی لاواز بێ. بێبەرهەم بێ، هەژار بێ، نەخوێندەوار بێ، چاولەدەست بێ. بەڵام: لە بواری ژینگەدا دەبێ کەسـی تێگەیشتوو پێی خۆش بێ، دوژمنەکەشی ژینگەکەی پاك بێ. چونکە ژینگەی دوژمنەکەشـت کاریگەری بە سـەر تـۆوە هەیە. لە ئیسـرائیل هەوا پیس بێ و ژینگە بۆگەن بێ، کاریگەریە خراپەکانی لـە مەککـەی موکەڕەمە و مەدینەی مونەوەرە هەسـت پێ دەکرێ، لـە بەغدا گەردەلوول بێ، لە کوردسـتاندا پێـی ناڕەحەت دەبین. لە ئەمریکا کارگەی زۆر هەیە و کاریگەری بۆ سەر چینی ئۆزۆن هەیە. کـە ئۆزۆن کون بوو نەك هەر ئەمریـکا زەرەر دەکات. بەڵکو هەموو جیهان بە گشـتی لێـی زەرەرمەند دەبێ. لەبەر ئـەوە بواری ژینگە سـنوری جوگرافی ناناسێ و دەبێ هەموو دەوڵەتان ئەگەرچی ناکۆك و ناحـەزی یەکتری بن لە بواری سیاسـەتدا. بەڵام دەبێ دۆسـت و هـاوکاری یەکتـر بن لە بواری ژینگەدا، چونکـە ژینگەی هەر وڵاتێ پیس بێ کاریگەری بۆ سـەر وڵاتان بە گشتی و وڵاتانی دەوروبەری بە تایبەت هەیە.

ئیماندارانـی بەرێـز: یەکێـك لـەو شـتانەی کە لـەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆمانـدا، زۆرترین کاریگەری هەیە لەسـەر پیسـبوونی ژینگە.

بریتییــە لە (نایلۆن). نایلۆن و پلاســتیك چونكە خودی خۆی وەكو ماددەیەك لە ناو زەویدا نیە، لە ئەنجامی چەندین كارلێكی كیمیایی دروســت دەبێ و بە زەوی نامۆیە. جا ئەمڕۆ لاستیك بەشێكی زۆری پێكهێنەرەكانی ژیانی مرۆڤ دابین دەكات، هەر لە نەعل و پێڵاوەوە، تا دەگاتە عەلاگە و دەبەی ئاو و دەبەی شیر و بتڵی ساردی و ماست و زۆربەی پێداویستیەكانی ژیان هەر لە نایلۆن و پلاستیك سودمەندە لێــی، بەڵام ئەم هەموو بەكارهێنانــە دوو زەرەری زۆر گەورەمان لێ دەدات. یەكــەم: لە بواری ژینگەدا: كە لە بواری ژینگەییەوە نایلۆن و پلاستیك لەم ڕوانەوە زەرەر و زیانی گەورەمان لێ دەدات:

١. كشــتوكاڵ: چونكە ئەو نایلۆن و لاســتیكانەی كە دەكەونە ژێر زەویەوە، شــی نابنەوە وەكــو خۆیان دەمێننەوە، هەندێ ســەرچاوە دەڵێن: بۆی هەیە ماددەیەكی لاستیكی، نایلۆن ماوەی (٣٠٠) ساڵ وەكو خــۆی بمێنێتەوە. جا لــەو كاتەدا ئەو گژوگیایەی یان ئەو درەختەی كــە ڕەگەكەی بەر ئەو نایلۆنە كەوت وشــك دەبــێ. یان لانی كەم لە گەشەكردن دەوەستێ، بەمەش ژینگە بێبەش بوو لە سەوزاییەك..

٢. لــە بواری بیناســازیدا: ئەو خۆڵ و خاشــاكەی كە فڕێ دەدرێ و بەشــێكی زۆری نایلۆن و لاســتیكە. چونكە لە ژێر زەویشــدا شــی نابێتەوە. ئەو زەوییە بە فشــەڵی دەمێنێتەوە، جازۆرجار كاتی هێزی خۆڕاگری ئەو زەویە بۆ بیناسازی وەردەگیرێ. چونكە ئەو نایلۆنە لە قولاییەكی زۆردایە، هەستی پێ ناكرێ و پاشان كە خانوەكەی لەسەر كرا تووشی داچوون دەبێ و دەتەقێ!

٣. لەبـــواری ســـامانی ئاژەڵیدا: ئەم نایلۆنە کاتـــێ فڕێ دەدرێ، ئاژەڵ دەی خوات و پاشـــان لە گەدە و ڕیخۆڵەکانیدا هەرس نابێ و بە تۆپەڵی دەمێنێتـــەوە و ســـەرەنجام دوای ماوەیەك دەی کوژێـــت.. چەندین جار بینیومانە کە مانگا و مەڕ و بزن، نایلۆن و عەلاگە لە ســـکیا بوە، کە دوای سەربڕین دەرکەوتوە یەك تۆپەڵ نایلۆن لە سکیایەتی و بۆتە هۆی لاوازکـــردن و مردنـــی ئەو ئاژەڵە. هەروەها لە بـــواری ژینگەدا نایلۆن و لاســـتیك لە سەر ڕووی وشـــکانی زەویدا زیانی زۆر دەدات: لە هاویناندا دەبینین کاتێ ڕەشـــەبا هەڵدەکات ئەو هەموو عەلاگە ڕەشـــە دەچێ بە ئاســـماندا و چەند دیمەنێکی ناشـــیرین دەخولقێنێ و دوایی هەریەکەی دەکەوێتە شـــوێنێك و پارك و باخچە و ناوماڵ و ناو کشتوکاڵ ناشیرین دەکات.. لـــە زستانیشـــدا: لە کاتـــی بارانبارین و لافاودا ئـــەو عەلاگە و دەبە نایلۆنانە دەچنە ســـەر کونی مەنهۆڵەکان و سەرەنجام ئەو کونانە دەگرن و ئاوی بارانەکە ناچێتە مەنهۆڵی ئاوەڕۆکەوە و لافاو دروســـت دەبێ و خەڵکێکی زۆر زیانمەند دەبن. وە زۆرجار ئەم بابەتە ژینگەییە سەردەکێشـــێ بۆ بابەتی سیاســـی و کە لافاو هەڵســـا و خەڵکی زیانیان پێگەیشـــت، خەڵکی نارەزایی دەردەبڕن و خۆپیشـــاندان دژی حکومەت دەکەن و زۆرجار بە یەکدادان لە نێوان هاووڵاتیان و پۆلیسدا ڕوودەدات و دەبێتە بابەتێکی سیاسی، کە ئەمەش هەمووی لە ئەنجامی ئەو هەموو عەلاگـــە و نایلۆنە فڕێدراوانەوە درووســـت دەبێ، ئەمجا لە ناو دەریادا: ســـاڵی (یەك ملیۆن) زیندەوەری ئـــاوی لە ناو دەریادا دەخنکێن بە هۆی خواردنی نایلۆن و عەلاگەوە!! ئەمە زیانی نایلۆن لە ڕووی ژینگەوە.

دووەم: لەبواری تەندروستییەوە: لە وڵاتی ئێمە دەبەی ئاو، ئاوی تێ دەکرێتەوە و جارێکی تر بەکار دەهێنرێتەوە. بە تایبەت ئاوی تێ دەکەن بۆ منالان. کە هی وا هەیە هەموو ڕۆژێ هەر ئەو دەبەیە دەبات بۆ مەکتەب. کە بۆ تەنها یەك جار درووست کراوە. بەلام ئەم منالە دەیان جار بە کاری دەهێنێتەوە.. یان دەبەی ساردی، لە زۆر مالدا ئاوی تێ دەکرێ و دەخرێتە سەلاجەوە و بۆ ئاوی سارد بەکار دەهێنرێ. یان سەتلی ماستی ئێرانی و تورکی لە فرێزەری سەلاجەدا دەئەنرێ بۆ سەهۆل، گوایە باشتر دەیبەستێ لە ستیل و فافۆن. یاخود کە منال ددانی دەردێ، لاستیکی طوبی بۆ دەکرن بۆ خوراندنی پووکەکانی.. بەلام دەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە ئەم شتانە تەنها بۆ یەکجار بەکار دێن و تەواو چونکە ئەو ڕووپۆشەی بە ناوەوەیەتی لەگەل هەلپچرینی ئەو دەبە ئاوە، یان ساردیە، یان ماستەدا، دەورەکەی تەواو دەبێ و ئیتر بە کەلکی ئەوە نایەت جارێکی تر شتی تێ بکرێتەوە، کە بە داخەوە هەیە بە دەبەی ئاو چای گەرم دەخواتەوە! کە ئەمە کاریگەرییە سلبیەکانی چەند قات دەبێ!..

ئیماندارانی بەرێز: هەرکات ئەو دەبە لاستیکانەت کڕی تەماشایەکی ژێرەوەی بکە. دەبینی هێمای سێگۆشەیەکی لەسەرە کە بە چەند سەهمێك بەدوای یەکدا هاتون، بەم شێوەیە: (△)، کە لە ناو سێگۆشەکەدا ژمارەیەك نوسراوە، کە ئەو ژمارەیە ئاماژە بەوە دەکات کە جۆری ئەو لاستیك و نایلۆنەی کە ئەو دەبەی لێ دروست کراوە بۆ چ شتێك دەست دەدات، جا ئەگەر لە ناو سێگۆشەکەدا ژمارە (1)

نوســرابوو. ئەوە مانای ئەوەیە ئەم دەبەیە دەست ئەدا بۆ ئەوەی کە خواردنەوەی تێ بکرێ، وەکو: ئاو، ســاردی، ماستاو، دۆ، ئەگەر ژمارە (2)ی لێ نوسرابوو. واتە: ئەم جۆرە نایلۆنە بۆ ئەوە دروستکراوە کە ماددە پاکژکەرەوەکانی تێ بکرێ، وەکو: فاس و شــامپۆ و موعجیزەی کاشی خاوێنکردنەوەدا، ئەگەر ژمارە (3)ی لەسەر بوو واتە: ئەم جۆرە لاســتیکە بۆ بۆری ئاوەرۆ و زێراب بــەکاردێ، ئەگەر ژمارە (4)ی لێ نوســرابوو، ئەوە بۆ ئەوە دروســت کراوە کــە (CD) تێدا هەڵبگیرێ. ئــەو پلاســتیکەی کە وەکو پلاســکۆ، بۆ قاپ و قاچاغــی نانخواردن بەکار دێ، ئەگەر ژمارە (5)ی لەســەر بێ، ئەوە مانای ئەوەیە کە زۆر گونجاو و باشە بۆ ئەوەی خواردنی تێدا بخورێ، جۆری تری نایلۆن و پلاستیك کە ژمارە (6)ی لێ نوسراوە، یانی زۆر خراپە و لە ئەمریکا لە ســاڵی (١٩٨٠)ەوە قەدەغە کراوە کە بۆ خواردن و خواردنەوە بەکار بهێنــرێ. ئەگەر ژمارە: (7)ی لەســەر بوو، ئــەوە مانای ئەوەیە هەر زۆر خراپە و نەگونجاوە بۆ بەکارهێنان و بۆ کار و ئیشــی تر بەکار دەهێنرێ.. ئەمجا ئەگەر یەکێ بڵێ: ئەی باشە ئەگەر ترسی ئەوەمان هەبوو کە کەســێك کارگەیەك درووســت بکات و ژمارە: (1) لە ژێری دەبەکە بدا و ئاوی تێدا بفرۆشێ و لە ڕاستیدا وا نەبێ و ماددەیەکی لاســتیکی خراپ بێ، چی بکەین؟! لە وەڵامدا دەڵێین: ئەو کاتە ڕۆڵی خوێندکارانی بەشــی کیمیا لە کۆلێجی زانســتەکان دەست پێ دەکات، کــە ناوە ناوە ئەو دەبانە کۆبکەنەوە و لە تاقیگەدا شــیکاریان بکەن و جۆری ماددەکە دیاری بکەن کە گونجاوە یان نا، بەم شــێوەیە هەم

خوێندکارەکە خەریکی بابەتێکی زانستی دەبێ، هەم کۆمەڵگاکەشمان لە مەترسی تەزویرکردن دەپارێزێ..

بەڕێزان: بە ڕاستی بەکارهێنانی لاستیك مەترسی گەورەی هەیە بۆ سەر تەندروستی مرۆڤ، بە ڕادەیەك جار هەیە دەگاتە مردن. هەروەکو لە نەخۆشخانەی (هۆپکینس) لە ئەمریکا یەکێ لە هۆکاری مردنی چەند نەخۆشییەك بەوە دیاری کرا، کە ئەو دەبە ئاو و پێویستیانەی تر کە دەبێ تەنها یەك جار بەکار بهێندرێن، لە جارێك زیاتر بەکار هێنراون و بوونە هۆی مردنی ئەو کەسانە.. تەنانەت لە وڵاتی بەرازیل و نەخۆشخانەکانی (دوبەی)یش هەمان شت تۆمارکراوە.. لای خۆشمان سەیر ئەکەین منالێك کتوپڕ سکی دێشێ و تووشی ئازارێکی زۆر دەبێت. دەبینی هۆکاری سەرەکی بریتییە لە وەی کە ئەو دەبە ئاوەی بەکاری دێنێ زیاتر لە جارێك بەکاری هێناوە و ئاوی تێ کردۆتەوە، یاخود بەرواری بەکارهێنانەکەی بەسەرچوە و (Exp) بوە. یان تازەیە بەڵام لەبەر تیشکی خۆر دانراوە و ئەو ماددە حافیزەی کە ناهێڵێ ئەو ئاوە یان ئەو ساردیە، ئەو دۆیە، تێك بچێ، بە لێدانی ڕاستەوخۆی ئەو تیشکی خۆرە دەبێتە ماددەیەکی ژەهراوی و کاریگەری خراپ لەسەر تەندروستی بەکاربەر دروست دەکات. بەڵێ، ئێستا هەموو دەوڵەتان دەزانن کە بەکارهێنانی لاستیك و نایلۆن چەندە زیان بە ژینگە و بە تەندروستی مرۆڤ دەگەیەنێ. هەر بۆیە بۆ ڕێگرتن لە بەکارهێنانی حکومەتێکی وەکو (فەڕەنسا) باجێکی زۆر دەخاتە سەر ئەو کارگانەی کە نایلۆن و کەرەستەی پلاستیك دروست

دەکـــەن، بۆ ئەوەی ئەویش کەلوپەلەکانی لەســـەر گران بوەســـتێ و سەرەنجام هاووڵاتی ئەگەر بیەوێ شتێکی لە نایلۆن دروستکراو بەکار بێنێ، دەبێ بە نرخێکی گران بی کڕێ. لەبەر ئەوە بەکارهێنانی کەم دەبێتەوە. جا بۆ خۆپاراســـتن لە زەرەر و زیانی نایلۆن و کەرەســـتە لاستیکەکان پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەین و ئەم ڕێ و شوێنانە بگرینە بەر:

یەکەم: دروســـتکردنی کارگەی (ڕیســـایکلین) کـــە جارێکی تر ئەو نایلۆنانە بەکار دەهێنێتەوە و لە شێوەیەکی نوێدا دroوستی دەکاتەوە. هەروەکو چۆن ئەلەمنیـــۆم و کاغەز جارێکی تر بەکار دەهێنرێتەوە و لە کارگەدا درووســـت دەکرێتەوە. بەڵام دەبـــێ ئاگاداری ئەوە بین، نەعل و پاتە کۆن نەکرێ بە دەبەی ئاوخواردنەوە!!. لە وڵاتێکی وەکو (یابان) ئەم دەبە ئاوانەی کە لای خۆشـــمان هەیە، سەرەکەی لادەبەن و دەبـــە ڕوونەکە لە کارگـــەدا، دوای چەنـــد گۆڕانکاریەکی کیمیایی دەکرێت بە قوماش و کیسەی قوماش!! کە بەڕاستی ئەمە جۆرێکە لە ڕێگریە باشەکانی مەترسی نایلۆن.

دووەم: گەڕانەوە بۆ عەقڵی ڕابردوو، کە بە ڕاستی پێشینانمان زۆر عاقڵمەند بوون. ئەگەرچی نەخوێنـــدەوار بوون، بەڵام بە بەرەکەتی ئیمانـــە بە هێزەکەیـــان، دڵیان ڕونـــاك بووە و هەرچـــی کردوویانە هەمووی زانستی بوە. بۆ نمونە: دۆ لە مەشکەدا، پەنیر لە پێستەدا، ماســـت لە کیتەڵـــەدا، ئاو لە گۆزەدا هەڵگیـــراوە! بە کەوچك و قاپی دارین، یان لە قوڕ دروســـتکراو چێشـــتیان خواردوە.. یان کاتێ منداڵ

وەختی داندەرهاتنی دەهات. لە جیاتی لاستیکی طوبی - کە ئەگەر ئەو لاستیکە گونجاو نەبێ لەگەڵ تەمەنی منداڵەکە، کاریگەری خراپی دەبێ لە سەر زاکیرە و زیرەکی ئەو منداڵە لە دوارۆژدا، پێشینانمان دەهاتن پارچەیەك گۆشتی برژاویان دەدایە دەستی کە پوکەکانیشی پێ دەخوراند و تامێکی گۆشتەکەشی دەکرد و هیچ زەرەر و زیانێکیشی بە منداڵەکە نەدەگەیاند!..

سێیەم: گەڕانەوە بۆ کیسەی کاغەز و قوماش، کە لە سەردەمی پاشایەتی و بەشێکی زۆری کۆماریش. تەنانەت تا کۆتایی ساڵانی حەفتاکان لە عێراقدا، کیسەی کاغەز بەکار دەهات. خەڵکی میوەیان دەکڕی، گۆشتیان دەکڕی، سەوزەیان دەکڕی، چەرەساتیان دەکڕی، هەمووی دەخرایە کیسی کاغەزەوە. کە بە ڕاستی هەرچەندە دواتر فڕێش بدرایە هیچ کاریگەریەکی خراپی لە سەر ژینگە درووست نەدەکرد. چونکە یەکسەر شی دەبۆوە لەگەڵ خاکدا تێکەڵ دەبوو. بۆ ئەم سەردەمەش پێویستە (مارکێتە گەورەکان) کە سەرچاوەن بۆ مارکێتەکانی شار و شارۆچکەکان، زەرفی کاغەز دروست بکەن. وە کیسەی قوماش دروست بکەن و لۆگۆی خۆیانی لە سەر دابنێن، هەم دەبێتە پروپاگەندە (ڕیکلام) بۆ خۆیان و خەڵکی بە بەرهەمەکانیان ئاشنا دەبێ. هەم ژینگەش دەپارێزێ لەو هەموو نایلۆنەی ڕۆژانە فڕێ دەدرێتە ئەم ژینگەیەوە، وە گەڕانەوە بۆ بتڵی شووشە چۆن جاران ساردی لە شووشەدا دەفرۆشرا. چونکە شووشە زیانی نییە بۆ ژینگە.

چوارەم: هاندانی خەڵك بۆ کۆکردنەوەی هەموو ماددەیەکی نایلۆن

و پلاستیکی، بۆ ئەوەی کارگەکان لێیان بکرنەوە. خۆ ئەگەر بوتڵێ دەبەیەکی ئاو بە (٥٠) دیناری چاپی نوێ دەکردرێتەوە، دەبینی هەر منداڵ دەبەی بەتاڵ و فرێ دراو لە کۆڵان و سەیرانگاکان ناهێڵێ و کۆی دەکاتەوە و دەیفرۆشێ. کە ئەمەش رێگاچارەیەکی باشە بۆ بەرەو رووبونەوەی پیسبوونی ژینگە بە هۆی نایلۆن و لاستیکەوە. بە پشتیوانی خوای گەورە ئەم باسە لە وتاری داهاتوودا درێژە پێ دەدەین.

(رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّار) اللّهُمَّ آمين.

### سەرچاوەکان:


١. تەفسیری ئاسان. م.بورهان محمد أمین.

٢. لەروناکیەکانی باوەر و تاریکیەکانی بێباوەری، بەندەی پەرستکار، ل٧٦.

٣. رۆژنامەی یەکگرتوو. ژمارە: ٤٥٦.

٤. وتارەکانی ئەندازیار عبدالرحمن صدیق، لە بەرنامەی (پرد)دا، باسی ژینگە.

وتاری چوارەم بۆ مانگی شەوال

# پاراستنی ژینگە
## بەشی دووەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: لە وتارێکی ڕابردوودا باسی ژینگەمان کرد، بە پشـــتیوانی خوای گەورە لەم وتارەشـــدا هەندێکی تر لە باسی گرنگی (ژینگــە) دەدوێیـــن، لە وتاری ڕابـــردودا وتمان لە کۆنـــدا دەیانگوت: پێکهێنەرەکانـــی ژینگە ســـیانن: ئاو، هەوا، خاك. ئەم ســـیانە خوای گەورە زۆر بە ئەندازەگیرییەکی ورد دای ناون. کە ئەگەر هەر زیاد و کەمێکی تێدا بکرێ، زەوی ئەم ئارامییەی ئێستای نامێنێ، بۆ نمونە:**

**هـــەوا: ڕێژەی پێکهێنەرەکانی هەوا، تا بەرزایی نزیك (٧٠)کم، بەم شـــێوەیە قەبڵێنراوە: نزیکـــەی (٧٨٪) گازی نایترۆجیـــن، (٢١٪) گازی ئۆکســـجین، (١٪) کۆمەڵێ گازی وەك بە دەگمەنەکان و دووەم ئۆکسیدی کاربـــۆن و ئـــۆزۆن و هەڵمی ئاو. ڕێژەی بوونی ئۆکســـجین لە هەوادا ڕێژەیەکـــی نموونەییـــە بۆ ژیان، بە ڕادەیەك ئەگـــەر بە ڕێژەی (١٪) لـــە وەی دانـــراوە زیاتر بوایـــە، ئەوا گریمانـــی -إحتمالی- گڕگرتنی جەنگڵســـتانەکان نزیکەی (٧٠٪) زیادی دەکرد. چونکە ئۆکسجین ($O_2$) یارمەتی سوتان دەدات، لێکۆڵەرەوەی بواری کیمیایی زیندەگی بەریتانی (جیمـــس لافلـــوك) ئاماژەی بەوە کردوە کە ئەگەر ڕێژەی ئۆکســـجین**

(O2) (٢٥٪) زیاتر بوایە. ئەوا گشت جەنگڵستانەکانی هێڵی یەکسانی و دەشتەکانی پۆلی و گشت ئەو ڕووەکانەی خۆراکی سەرەکی مرۆڤ پێك دێنــن گڕیان دەگرت!! ئەو کاتە ژینگەی ســەر زەوی بە کەڵکی ژیان نەدەما، ئایا غەیری خالیق کە (الله)یە، کێ ئۆکسجینی بەڕێژەی (٢١٪) لە هــەوادا جێگیرکردوە؟! (لا إِلَهَ إِلاّ اللّه). سُــبْحانَ اللّهِ العَظيم... ســەرنجێکی تر: ئەو نرخە نمونەییەی کە بۆ توانای توانەوەی گازی ئۆکســجین دانراوە، ئەگەر کەمتر بوایە، ئەوا ئۆکسجینی پێویست لە ناو خوێندا نەدەتوایەوە، خۆ ئەگەر زیاتر بوایە، ئەوا ڕێژەی ئۆکسجین لە خوێندا زۆر دەبوو، وە دەبوە هۆی ژەهراویبوونی ئۆکســیدی.. بەم شــێوەیە هەموو گازەکانی نــاو هەوا بە ڕێژەیەك دانــراون، کە ئەم ژینگەی سەر زەویە گونجاوترین ژینگە بێ بۆ مرۆڤ. پاشان با بێینە ســەر پێکهێنەری دووەمی ژینگە کە بریتییــە لە (خاك): هەموومان دەزانیــن کە خاك بۆ ئــەوەی کە بەردەوام چــالاك و گونجاو بێ بۆ کشتوکاڵ و ڕوانی گژووگیا، پێویستی بە ماددەی بەهێزکەر هەیە، کە وەکو کیمیایی کە جوتیار بە زەویەکەیەوە دەکات تا بەهێز ببێ، بەڵام ئەی ئەو جێگایانەی کە جوتیار دەســتی نایگاتێ یان چونکە بەکاری ناهێنێ و لەوەڕگایە، پەینی کیمیایی پێوە ناکات، ئەی ئەم زەویە بە چی بە هێز دەبێت؟! خوای گەورە لە ڕێگەی هەورە تریشقەوە -هەورە بروســکە- ئەو بە پیتییە بە زەوی دەبەخشــێ بەم شێوەیە: یەکێك لــە گازەکانی ناو هەوا پێی دەوتــرێ (نایترۆجین)، ئەم نایترۆجینە گازێکی زۆر ناچالاکە و ئەرکی کەمکردنەوەی تینی چالاکی ئۆکسجینی

پێ سپێردراوە بۆ پێویستی زیندەوەران لە هەناسەدان و سووتان. ئەم گازە ناچالاکە بە هۆی هەورەتریشقەوە لەگەڵ گازی ئۆکسجین یەك دەگرێ و گازی یەکەم ئۆکسیدی نایترۆجین پێك دێنێت، کە ئەمەشیان لە ناو هەوادا دەگۆڕێت بۆ دوەم ئۆکسیدی نایترۆجین و لە ناو ئاوی باراندا دەتوێتەوە و بەشێوەی پریشکە ترشی نایتریکی ڕوون دادەبەزێتە سەر زەوی و لەگەڵ هێندێ ماددەی نێو زەوی دەگۆڕێت بۆ (نیتراتی کالسیۆم) کە لە چاکترین خۆراکەکانی ڕووەکە. بڕی ئەو نایترۆجینەی ساڵانە بەم هۆیەوە بە زەوی دەگات مەزەندە کراوە بە (٧٧٠) تەن، جێگای سەرنجیشە کە هەورەتریشقە لە جەنگڵستانەکان و باخ و بێستانەکان و لەوەڕگاکان زۆرتر ڕودەدات وەك لە بیابانەکان، تەنانەت لە کوردەواریدا دەوترێ، هەورەبروسکە لە مەڕی سپی دەدات و هەندێ جار شوانەکە و هەندێ مەڕ دەکوژێ، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوە هی مەڕەکە نییە، بەڵکو ئەو جێگایە لەوەڕگای چاکە و پێویستی بەپیتبوون هەیە، بۆیە هەورە تریشقەکە لەوێ دەدات!!..

واتە نایترۆجین بە بڕی جیاجیا بە سەر شوێنە جوگرافیە جیاوازەکاندا دابەش دەبێت و بە گوێرەی پێویستی ئەو شوێنانە بۆی.. جا بەڕێزان: ئایا گونجاوە هەورەتریشقە هەر لەخۆیەوە ئەمە بزانێت؟! نەخێر، هەرگیز. بەڵکو ئەمە هەمووی بە فەرمانی خودای کاربەجێیە، سُبْحانَ اللّٰه. سُبْحانَ الخالِق. پاشان هەر لە خاکدا: شێوەی ڕووی زەوی و ئەو بەرزی و نزمیانەی کە تیایەتی، هۆکارێکی گرنگی ترن، بۆ ڕێکخستنی جیاوازی پلەی گەرمی لە نێوان هێڵی

یەکسانی و جەمسەرەکان کە دەگاتە نزیکەی (١٠٠) پلەی سەدی. جا ئەگەر ڕووی زەوی سەرتاسەری تەخت بوایە، ئەم جیاوازی گەرمییە دەبوە هۆی هەڵکردنی ڕەشەبای توند کە خێرایی دەگەیشتە نزیکەی هەزار کم لە سەعاتێکدا، بەڵام لەم بارەی ئێستای ڕەشەباکان سنوردار دەکرێن بە هۆی زنجیرە چیاکانەوە کە لە وشکانی بەردەوام دەبن تا ئەگەن بە ئۆقیانوسی ئەتڵەسی لە ڕۆژئاوا و ئۆقیانوسی هادی لە ڕۆژهەڵات.. پاشان یەکێکی تر لە پێکهێنەرە بنچینەییەکانی ژینگە بریتییە لە (ئاو)، ئاشکرایە کە ¾ ی سەر ڕووی زەوی ئاو دای پۆشیوە. ئەم ئاوە زۆرە بەشی هەرەزۆری سوێرە و کەمێکی شیرینە و بە کەڵکی خواردنەوە دێت!، ڕەنگە یەکێ بپرسێ: باشە بۆچی ئەو هەموو ئاوی دەریا و زەریایانە سوێرە و ئەی ئەگەر شیرین بوایە باشتر نەبووو؟! لە وەڵامدا دەڵێین: خوای گەورە کە ئەم زەویەی کردۆتە باشترین ژینگە بۆ مرۆڤ، هەموو کارەکانی پڕ حیکمەتە و لە جێگای خۆیدایە. هەر بۆیە ئەو سوێری ئاوی دەریا و زەریایانە چەندەها سوودی گەورەی بۆ مرۆڤ و ژینگەکەی تێدایە. وەکو:

١. ئەگەر ئەو هەموو ئاوی دەریا و زەریایانە شیرین بوایە و ئاوا سوێر نەبوایە، ئەوا بە ڕاستی بۆگەنی دەکرد و ئەو کات ژیان لە سەر زەوی ناڕەحەت دەبوو.

٢. ئەگەر ئەو ئاوانە سوێر نەبوونایە، (مرواری و مەرجان)ی تێدا درووست نەدەبوو!! چونکە ئەو دوو ماددە گرانبەهایە لە ئاوی شیریندا دروست نابێ!

٣. ئۆقیانوسـەکانیش دەورێکی گرنگیان پێ سـپێردراوە لە ڕێگای مژینی گەرمی زیاد لە ناوچەی یەکسـانی و هاوسـەنگکردنی بەهۆی گواستنەوەی بۆ باکور و باشور..

ئیماندارانــی بەڕێز: جاران هەر (هـەوا و ئاو و خاك) ژینگە بوو، بەڵام ئێسـتا دوو پێکهێنەری تری گرنگی تـری بواری ژینگە زیادی کـرد کە ئەوانیش (ڕووەك و گیانەوەر)ن.. کە پێی دەوترێ: زیندەگی جۆری، ناوە زانستیەکەی (بایۆ دایڤێرستی).

بەڵێ لە ئیسلامیشـدا، ڕووەك زۆر گرنگە، ڕواندنی نەمامێك وەکو نوێـژ و ڕۆژو و صەدەقـە و خێرکـردن حیسـاب کـراوە. لە خێری نەبڕاوە دانراوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرمویەتی: (مامِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْساً أَوْ يَزْرَعُ زَرْعاً، فَيَأْكُلُ مِنْهُ إِنْسانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ إلاّ كانَ لَهُ بِهِ صَدَقَةٌ) رَواهُ البُخاري في الأَدَب (٢٠١٢) وَمُسْلِم (١٥٥٢)

واتە: هەر موسـڵمانێك نەمامێك بنێژێ، یان کشـتوکاڵێك بکات و زەویەك دابچێنێ، ئەوا هەرچی لەو سەوزایی و کشتوکاڵ و بەرهەمی نەمامە دەخوات، لە مرۆڤ یان ئاژەڵ و باڵندە و زیندەوەران، هەمووی بۆی بە چاکە دەنوسرێ و دەچێتە تای تەرازووی چاکەیەوە.

بەڕێـزان: بـە وردی سـەرنجی فەرموودەکە بـدەن: دەفەرموێ: (إِنْسـانٌ). هەر مرۆڤێـك لێی بخـوات، نافەرموێ: (إِنْسـانٌ مُؤمِنٌ). مرۆڤێکـی بـاوەڕدار لێی بخـوات. نەخێر، ئەو مرۆڤـە ئەگەر گاور بـێ، جولەکە بێ، بێباوەڕێکی مولحیـد بێ، لەو زەرعات و بەرهەمی نەمام و کشتوکاڵەی تۆی ئیماندار بخوات هەر بە چاکە و حەسەنات

بۆت دەنوســرێ. وەنافەرموێ: (إِنْسانٌ صالِحٌ) مرۆڤێکی چاك و پاك. نەخێر ئەگەر مرۆڤێکی دز و خراپەکاریش هات لێی دزی و خواردی، تۆی ئیماندار هەر چاکەت بۆ دەنووســرێ!! هەر بۆیە لە ئیســلامدا هیچ کات بە درەنگ دانانرێ بۆ ناشــتنی نەمامێك، با ئەو کەســە بە تەمەنیــش بــێ و هەتا ئەو نەمامە بەر دەگــرێ، ئەم بمرێ، نەخێر بــا هەر بیچێنــێ. بابۆی ببێ بە (صەدەقەی جــاری) خێری نەبڕاوە و لە دوای مردنیشــی هەتا لێی بخورێ، هەر چاکەی بۆ دێ. ســبحان اللــە، ئەو گەنــم و دەغڵ و دانەی کە فەلاحێك دەیکات. دوای ئەوەی بەرهەمەکــەی لــێ هەڵدەگرێ و قەســەڵ و کای تێدا بەجێ دەمێنێ و ئاژەڵێــك (مــەڕ و بزن و مانگایەك) لێی دەلــەوەڕێ و دەی خوات، مێروولەیەك دەنکە گەنمێکی کەوتوو بەجێماو هەڵدەگرێتەوە و دەی خوات. چۆلەکەیەك لە ترێی باخەکە بۆڵێ ترێ دەخوات، ژەنگەسورە و زەردەواڵەیەکی زیانبەخش بۆڵەترێیەك. لەتە قەیسییەك دەخوات، ئەمانە هەر هەمووی لە تای تەرازووی خێری ئەو کەســەدا دادەنرێ، بۆیە لە ڕۆژی قیامەتدا کەسی وا هەیە کە دەبینێ بە ئەندازەی ئەو شــاخە گەورانە خێر و چاکەی هەیە. بە سەرسوڕمانەوە دەپرسێ: یا ئیلاهــی ئەو هەموو چاکەیە هــی چیمە، خۆ من لە ژیانی دونیامدا، هەر خەریکی کشتوکاڵ و فەلاحەت و نەمامناشتن بووم. بە چی ئەو هەمــوو چاکەیەم دەســت کەوتوە، پێی دەوترێ، بەو هەموو شــتەی کــە لە فەلاحەت و شــینایی و باخەکەت خــوراوە لە لایەن مرۆڤ و گیانلەبەران و باڵندە و کرم و زیندەوەرەکانەوە. ئەوە هەمووی لەسەر

تــەرازووی خێرتە!! ئــا لەبەر ئەمەیە پێغەمبەری دڵســۆزمان (ﷺ) فەرمووی: (إنْ قامَتِ السّاعَةُ وَفي يَدِ أَحَدِكُمْ فَسيلَةٌ، فَإنِ اسْتَطاعَ أَنْ لاتَقُومَ حَتّى يَغْرِسْها فَلْيَغْرِسْها) رَواهُ مُسْلِم، ذَكَرَهُ الأَلْباني في صَحيح الجامع (١٤٢٤)

واتــە: ئەگەر قیامەت هەســتا و خەریك بوو ئــەم دونیایە تێك دەچــوو. بــۆ دواجار لاپەڕەی ژیــان و ژینگە دەپێچرایــەوە، ئا لەو کاتــەدا نەمامێك (نەمامێکی خورما کە دوای چەندین ســاڵ ئەمجا دێتــە بەرهەم) بە دەســتیەوە بوو. خەریکی ناشــتنی بــوو. ئەگەر دەیتوانی ئەو نەمامە بنێژێ و فریای دەکەوت کە گڵەکەی بە سەردا بکاتــەوەو بی نێژێ، با نەمامەکە بنێــژێ و کاری خۆی بکا و نەڵێ جا تازە خۆ وا دونیا کۆتایی هات، ئیتر بۆچی بی نێژم، چ ســوودی هەیــە؟! نەخێر، هــەر بی نێژێ، چونکە تا یەك هەناســە مابێ کە لەم سەرزەوییە بدرێ، ئەم ژینگەیە پێویستی بەو ڕووەکە هەیە و لە ناشتنی سوودمەند دەبی..

بەڕێزان: لە ئیســلامدا پێویســتە گۆڕستانی موســڵمانانیش پڕبێ لە ســەوزایی و وەکــو پارك و باخچەی ڕازاوە وابێ. بەڵێ گۆڕســتان کە جێگەی غەریبی و حوزنە. بەڵام لەئیســلامدا ئەو گۆڕســتانەش پێویســتە کە درەختی زۆری لە ســەر بێ و بە ســەوزایی ڕازاوە بێ!. پێغەمبەری ســەروەرمان (ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا بە لای گۆڕستانێکدا تــێ پــەڕی، دوو گۆڕی تازەی بینی، ئاماژەی بــۆ دوو گۆڕەکە کرد و فەرمــووی: (إنَّهُما لَيُعَذّبانِ وَمايُعَذّبانِ في كَبير، أَمّا أَحَدُهُما فَكانَ لايَسْــتَتِرُ مِنْ بَوْلِه، وَأَما الآخَرُ فَكانَ يَمْشي بَيْنَ النّاسِ بالنَّميمَةِ).

واتە: بە ڕاستی ئەم دوو گۆڕە سزا دەدرێن بە سزای ناوگۆڕ. سزاش نادرێـــن لەســـەر ئەو گوناهانـــەی کە لای خەڵکی بـــە گوناهی گەورە (کەبیرە) ناســـراون. وەکو کوشـــتنی ناحەق و زینا و بوختان و...هتد. یەکێك لەو دوانە (نەیفەرموو کامیان، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەردەوام خۆی دەپاراســـت لەوەی کە ڕاستەوخۆ ئاماژە بە هیچ کەس بـــکات!). خۆی لەپاش میز پاك نەدەکردەوە، گوێی بە خۆپاککردنەوە نەدەدا. جا ئەو کەســـەی کە خۆی لە پاش میز پاك نەکاتەوە، ســـتەم لە خۆی و لاشـــەی خۆی دەکات کە ئەو میزە بەر لاشـــەی دەکەوێ و تووشـــی چەندەها جۆر ڤایرۆس و میکرۆبی دەکات و ناوچەی نێوان هەردوو ڕانیش زۆر ئامادەیە بۆ دروســـت بونـــی بەکتریا و کەڕووی پێســـت و ئەو کەسە ســـتەمی لە خۆی کردوە. پاشان ئەو کەسەی کە خـــۆی لە پاش میز پاك نەکاتەوە ســـتەمی لـــە خەڵکی دەورووبەر و نزیکـــی کـــردوە بە وەی کە بۆن میز و پیســـی لـــێ دێ و خەڵکی بە بۆنی ناخۆشـــی ئازار دەچژن.. ئەمەش ســـتەمە لە ژینگەی بۆنکردن کە مافێکی گشتییە و کەس نابێ بۆنی ناخۆش بە لوتی کەسدا بکات! جا لە ســـەر ئەم پێشـــێلکردنی مافی خۆ و خەڵکییە، ئەم کەســـە لە گۆڕەکەیدا ســـزا دەدرێت. فەرمووی: ئەوی تریشیان دووزمانی دەکرد لە نێوان خەڵکیدا و قسەی دێنا و دەبرد، ئای چەند ژن و مێرد، دایك و بـــاوك و ئـــەولاد، برادەر و هاوڕێ، بە هۆی کەســـی دووزمانەوە لە یەك ترازان جا ئەو کەســـەی کە دووزمانی بکات دەبێ لە گۆڕەکەیدا سزا بدرێت.. پاشان پێغەمبەری بەبەزەیی و دڵسۆز (ﷺ)، کە (بالْمُؤمِنِينَ

رَءُوفٌ رَحِيــم). بینی دارێك. نەمامێكی ســەوز لە وێیە. هێنای كردی بــە دوو لەتەوە. (دارەكــە دوو پەلی هەبوە). هەریەكەیانی لە ســەر گۆڕێكیان ناشت. صەحابەكان فەرموویان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆچــی ئەم كارەت كرد؟! فەرمووی: (لَعَلَّهُ أَنْ يُخَفِّفَ عَنْهُما ما لَمْ يَيْبسـا). تكام وایە خوای گەورە ســزایان لە ســەر سووك بكات، هەتا ئەم دوو نەمامە بە تەڕی و ســەوزی دەمێننەوە و وشــك نابــن.. كەواتە كێ دڵســۆزی مردووەكەیەتــی با بێ نەمامێكی لە ســەر بنێژێ، گوڵی بە دەوردا بــكات نــەك بێ چیمەنتــۆی بكات و بە كاشــی مەڕمەڕ دای پۆشــێ و چەتر و خانووی بە سەرەوە بكات. كە ئەو دارە هەم سوود بــە مردووەكــە دەگەیەنێ، هەم ســودی بۆ زیندوان هەیــە لە ڕووی ئەوەوە كە مرۆڤ لە كاتی چوونە ســەرقەبران و ناشــتنی ئازیزان و خۆشەویســتانیدا بە بینینی ئەو دیمەنە جوانەی سەوزایی و نەمامە سەوزانە، ئارامی و فەرەحیەك بە دەروونی گرگرتوویدا دێ. هەروەكو وتــراوە: (ثَلاثَةٌ يُذْهِبْنَ مِنْ قَلْبٍ حَزَن، الماءُ والخَضْراءُ وَالوَجْهُ الحَسَــن) ســێ شــت هەن غەم و پەژارە لە دڵ دەردەكەن. ئاو و تافگەی جوان، سەوزایی و دار و درەخت و گوڵ و گوڵزار، دەم و چاوی گەشی نورینی خواناســان و دڵپاكان.. وە هەروەها ئەو نەمام ناشــتنە دەبێتە هۆی پاكڕاگرتنی ژینگە، چونكە لە زانســتدا دەڵێ: هەر درەختێك بەشــی ســێ كەس ئۆكســجین دەداتەوە. بەڵام ئەمە لــە زەمەنێكدا كە ئەم هەموو كارگە و ئوتومبێلە نەبوو. ئێســتا پێویســتە هەر كەسێك سێ نەمام بنێژێ بۆ ئەوەی ژینگە بە پاكی بمێنێتەوە. هەر بۆیە ئێســتا

له وڵاتانی پێشکەوتوودا که زۆر گرنگی به بواری ژینگه دەدەن. کاتێ ڕێگایەکـی ڤیرتاو دروسـت دەکەن، پێش ئـەوەی جادەکه ڤیر بکەن لـه ناوەند و ئەملاولای شـەقامەکەدا نەمام دەنێژن، کاتێ نەمامەکه ڕواو گـەڵای کرد ئەمجـا جادەکه ڤیر دەکرێ و ڕێـگا به ئوتومبێل دەدرێ کـه هاتووچۆی تێـدا بکات، ئەمه بۆچی؟! بۆ ئەوەی که کاتێ ئۆتۆمبێلەکـه بەو شـوێنەدا دەڕوات و دووکەڵەکـەی که گازی دوانه ئۆکسـیدی کاربۆنی تێدایه دێته دەرەوە. ئەو ڕوەکه بی مژێ و گازی ئۆکسجین (O2) بداتەوە و بەم شێوەیه ژینگەکه سەلامەت و درووست دەمێنێتەوە.

بەڵێ له لای ئێمەی موسڵمان هەرچڵه گیایەك، هەر دار و درەختێك به بێ هۆ و پێویسـتی بشـکێنرێ و هەڵ بکەندرێ و بپچڕوکێندرێ، به گوناه له سەر ئەو کەسەی ئەو کارەی کردوە دەنوسرێ. ئەوەتا له حەرەمی مەککەدا، له کاتی حەجدا، هەر کەسێ دارێك بشکێنێ، چڵه گیایـەك هەڵکەنێ، ئەبێ خۆی خـۆی غەرامه بکات!! نەك حکومەت غەرامەی بکات، غەرامەکەشـی ئەوەیه که دەبێ حەیوانێك سەرببڕێ و بیـدات بـه فەقیر و هـەژاران، ئەینا حەجەکەی قبـووڵ نابێت!! سبحان الله ئەو حەجه که ڕوکنی ئیسلامه، که ئەو هەموو نارەحەتی و ئازارەی له پێناودا چێشـتراوە. ئەو هەموو پارەی بۆ خەرج کراوە، ماڵ و مناڵ و دۆسـتان و زێدی له دایکبوون و نیشـتمانی بۆ بەجێ هێشـتراوە، پەیوەسـت کراوە (به پاراسـتنی ژینگەوە) که دەبێ ئەو کەسـه ئـاگاداری خۆی بێ، چڵه گیایەك هـەڵ نەکەنێ، دارێك نەش

کێنیٚ، گەلایەك هەڵ نەوەرێنیٚ، هەروەها نابیٚ باڵندەیەك.. ئاژەڵێك.. ڕاو بکات و بی کوژیٚ، ئەگەر نەزانانە کردی دەبیٚ خۆی غەرامە بکات، بیٚ ئەوەی حکومەت چاودێر بیٚ بە سەریەوە و غەرامەی بکات دەبیٚ خۆی خۆی غەرامە بکات. ئەینا حەجەکەی قبووڵ نابیٚ! ئایا ئەم یاسا جوانە لە هەموو جیهاندا هەیە؟! ئەمە بۆچی وایە؟! بۆ ئەوەی مرۆڤی ئیماندار لە کاتی حەجکردنەکەیدا، لە خولێکی بە کردەوەی ژینگەپارێزیدا بژی و کە لە حەجیش هاتەوە هەر ژینگەپارێز بیٚ و دار و درەخت نەبڕیٚ و ئاژەڵ و باڵندەی کێوی ڕاو نەکات، کەواتە: ئێمەی موسڵمان حەجەکەشمان بواری زانستییە و حاجیمان ژینگەپارێزە. ئەمە دەربارەی پاراستنی دار و درەخت و سەوزایی، کە چۆن بە زۆری بی چێنین وە ئەوەی چێندراوەو پێگەیشتوە، پارێزگاری لیٚ بکەین!..

ئەمجا دێینە سەر باسی باڵندە و ئاژەڵ و پاراستنیان لە فەوتان، چونکە پاراستنی ئەم ژینگەیەمان پەیوەستە بە بوون و پاراستنی باڵندە و ئاژەڵە کێویەکانەوە، پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویەتی: هەر کەسیٚ بە بیٚ ئەوەی برسیەتی و ئاتاجی گۆشت پاڵی پێوە نابیٚ کە چۆلەکەیەك بکوژیٚ، هەر بۆ خۆشی و کەیفی دڵی خۆی چۆلەکەیەك بکوژیٚ و فڕێی بدات. ئەوا ئەو چۆلەکەیە لە ڕۆژی قیامەتدا لە حزوری پەروەردگاردا، شکات لەو کەسە دەکات. کە بۆچی بە خۆڕایی ژیانی ئەم چۆلەکە بە خزمەتەی لەناو برد و کوشتی!!.. چونکە بە دڵنیاییەوە هیچ زیندەوەرێك، باڵندەیەك،

خشۆکێك، کرمێك لەم سەرزەوییە زیاد و بێ جێگا نییە. هەر کامیان لەنــاو چــوو، یان جۆرەکەی کەم بوو، ئەوی تــر زیاد دەکا و ژیان و ژینگە تێك دەچێ.

بــۆ نموونە: لە وڵاتی (چین) بە ســەرکردەی چینی (ماوتســی تونگ) وترا: چۆلەکەکان دەنکە گەنمەکان دەخۆن و ئەگەر وا بڕوات دەبێ دەغڵ و دانمان بەڕەڵا بکەین. ئەویش فەرمانی دا بە چینیەکان کە دەست بکەن بە چۆلەکە کوشــتن و هەرکەس چەندە چۆلەکەی زیاتر بکوژێ ئەوەندە زیاتر پاداشت وەردەگرێ، چینیەکانیش گەورە و بچوك دەستیان کرد بە چۆلەکە کوشتن و سەرەنجام چۆلەکە لە گوند و شارەکانی چیندا نەما. لە ساڵی داهاتوودا، ئافرەتێك، بەڵایەك لە گەنم و دانەوێڵەکەیان دەرکەوت، ئەویش بەڵای جاڵجاڵۆکەی سوور بوو!! ڕاستیەکەشی ئەوەیە کە جاڵجاڵۆکە سوورەکان هێرش دەبەنە سەر گوڵە گەنمەکان و چۆلەکەکانیش دەیانخۆن و پەرێزەکــە لــە زیانی ئەوان دەپارێــزن. بەڵام ئــەم چۆلەکانە لەگەڵ خواردنــی جاڵجاڵۆکەکاندا چەند دەنکە گەنمێکیش دەخۆن، لە ئەنجامدا چینیــەکان ناچار بوون بە گەڕانەوەی ئەو تەوازونەی کە تێکیان دابوو. ئەویش بــە هاوردەکردنی چۆلەکە لە (هۆنگ کۆنــك) وە پارەیەکی زۆر بــۆ بەرگریکردن لە بڵاوبوونەوەی ئەو بەڵای جاڵجاڵۆکەی ســووردا. وە توندترین سزاشــیان دانا بۆ ئەو کەســەی کە ئازاری چۆلەکەیەك بدات نەك بی کوژێ، ئەمجا نرخی چۆلەکەیان زانی.

نموونەیەکی تر: بەهۆی ژمارەی زۆری ماری ژەهراوی لە دوورگەی (جامایکا) خەڵکەکەی جۆرە باڵندەیەکیان هێنا بۆ ئەم شــوێنە کە بە

(ســکرتیر) ناوبراوە. ئەم باڵندەیە مار دەکوژێت و بە زۆربوونی ئەم باڵندەیـــە ژمارەی مارەکان کەمی کرد. بەڵام ئەم کەمبوونە بوە هۆی زۆربوونـــی جرجی کێڵگەکان، کە ئەم مارانـــە زۆریان لێ دەخواردن. بۆیە میری ئاژەڵی (مانجوستی هیندی) بۆ ئەم شوێنە هێنا کە لەسەر ئـــەم جرجانـــە دەژیا، بـــەڵام دواتر ئەم ئاژەڵەش لە ســـنووری خۆی زیاتری کرد و کاردانەوەیەکی نالەباری بوو.!

نموونەیەکی تر: لە ساڵی (١٩٨٥)ی زاینیدا، وڵاتی بەنگلادیش (٥٠٠) تەن گۆشـــتی بۆقی هەنـــاردەی ئەڵمانیا کرد بۆ بەکارهێنانی لەلایەن مرۆڤەوە، بۆ خواردن!! ئەم (٥٠٠) تەن بۆقە بە ئەنجامی کۆکردنەوەی گۆشـــتی نزیکەی (١٢) ملیۆن بۆق بـــوو.. هەمان دەوڵەت (بەنگلادیش) (٢٥٠) تەن بۆقی تری ناردە سویسرا و فەڕەنسا. لە هەمانساڵدا کۆی ئەو بۆقانە کە لە وڵاتی بەنگلادیش کۆکرایەوە و هەناردەی ئەورووپا و ئوســـتوراڵیا و ئەمریکا کرا گەیشتە نزیکەی (٢٠٠) ملیۆن بۆق!! بە گوێرەی لێکدانەوەی زانـــاکان ئەو بۆقانەی کە دەگیرێن و دەکوژرێن و هەنـــاردەی دەرەوە دەکرێـــن لە بەنگلادیش کـــە گریمان (إحتمال) دەکرێت. ڕۆژانە ئەو مێش و مێشوولانەی کە قووتیان دەدات یەکسانە بەتێکڕای (١٠٠) طەن!! کە ئەمەش گرفتێکی تەندروســـتی زۆر پەیدا دەکات بە هۆی ئەو مێشـــوولە زۆرانە کە نەخۆشـــی بڵاو دەکەنەوە. ئەگەر دەسەڵاتداری تەندروستی هەستا بە لەناوبردنی ئەم مێشولانە بەهـــۆی ژەهری کیمیایی، ئەمـــەش گیروگرفتەکە زیاتر ئاڵۆز دەکات بە هۆی ژەهراویبوونی ژینگـــە. لە ئەنجامی تاقیکردنەوەیەك کە لە

بەنگلادیـــش ئەنجام درا بینرا نێوان (٣١) جۆر ئەم مێشـــولانە کە لە ســـکی بۆق دەرهێنرا لە توخمی (Rana) لەمانە (٧) جۆر زیانبەخش بـــوون بۆ گیای سروشـــتی (٤) جۆری زیانبەخش بـــوو بۆ دارەکان. ئا لێرەدا گەورەیی فەرموودەکـــەی پێغەمبەرمان (ﷺ) بۆ دەردەکەوێت کـــە صەحابەکان دەفەرمـــوون: پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) نەهی کردوە لەکوشـــتنی بۆق (الحَدِيْث أَخْرَجَهُ أَحمـــد، وَصَحَّحَهُ الحاكم).. بەڵێ پێغەمبەری دڵســـۆزمان (ﷺ)، ئـــا ئەو کاتـــە فەرموویەتی ئـــەی ئومەتەکەم بۆق مەکوژن.. چونکە ئەوە ژینگە پارێزە.. کە ئەمڕۆ زانستی نوێ سەلماندی کە بەڵێ بۆق ڕۆڵێکی گەورەی هەیە لە پاراستنی هاوسەنگی ژینگە..

نموونەیەکـــی زۆر بەرچـــاوی خۆمان: لای هەموومان ئاشـــکرایە، کە ڕژێمـــی لەناوچـــووی بەعـــس لـــە ١٩٨٨/٣/١٦دا کیمیابارانـــی هەڵەبجەی شـــەهیدی کرد. ئەو کاتە بۆ ئەو ناوچە کوێستانیە هێشتا هەر ساردە و مارەکان سڕبوون و لە ژێر خاکدا بوون و کیمیابارانەکە کاریگەری لەسەر درووســـت نەکردبوون. بەڵام لەقلەق و ئەو باڵندانەی کە مار و بەچکە مـــارەکان دەخۆن، ئـــەوان بەرکەوتن و لەناوچوون. جا لە دوای ئەوە کە مارەکان بووژانەوە و بەچکەیان کرد و هاتنە دەرەوە. ئەوەی بەرامبەریان نەمابوو. بۆیە لە ئاســـتی خۆیان زیاتر بوون و ئاماری مارپێوەدانی دوو ســـاڵی دوای کیمیابارانی هەڵەبجە لەو ســـنوورەدا حەشـــری کردوە، بە هۆی زۆری ئەو هەموو مارەوە. ئا لێرەوە دەوترێ، کە کیمیاباران کردن هەروەکو تاوانێکی دژ بە مرۆڤایەتیە. تاوانێکی گەورەی دژ بە ژینگەشە و ژینگە تێك دەدات و هاوسەنگیەکەی لە ناو دەبات!

ئیماندارانی بەڕێز: قورئانی پڕ بەخشش کە سەرچاوەی هەموو زانستەکانە بە جوانی و بە ڕوون و ئاشکرایی باسی پاراستنی هاوسەنگی ژینگەیی دەکات، ئەویش لە باسی (تۆفان)ەکەی سەردەمی (نوح) پێغەمبەردا، سەلامی خوای لێ بێ، ئەوە بوو کاتێ کە دوای (نۆسەد و پەنجا) ساڵی ڕەبەق بانگەوازی شەو و ڕۆژ، بێ ماندووبوون لە لایەن حەزرەتی نوحەوە بۆ گەلەکەی، بەڵام ئەوان گوێی خۆیان دەئاخنی و پەنجەیان دەخستە کونە گوێیانەوە بۆ ئەوەی گوێیان لە قسە و ڕێنماییەکانی نوح پێغەمبەر نەبێ. ئەوە بوو حەزرەتی نوح دوعای لە قەومە ملهوڕە سەرسەختەکەی کرد و داوای لە خوا کرد کە ئیتر لە ناویان ببات و ئەوانە هیدایەت وەرناگرن. خوای گەورە فەرمانی پێ کرد کە کەشتیەك دروست بکات، کەشتییەکی زۆر سەرسوڕهێنەر کە تا ئێستاش زانایان سەرسوڕمانی خۆیان دەردەبڕن لەو هەموو ڕێکوپێکی و نەخشەسازیە بێوێنەیەی کە لە کەشتی نوحدا هەبووە. بەڵێ حەزرەتی نوح بە فەرمانی خوا بە ڕێنمایی جوبریلی ئەمین، لەو وشکانیە. لەو ناوچەیە کە هیچ دەریا و ڕوبارێکی لێ نییە، دەستی کرد بە کەشتی درووستکردن، ئیتر بێبڕوایان بەردەوام گاڵتەیان پێ دەکرد و دەیانگوت: نوح شێت بوە و عەقڵی لە دەست داوە، ئەینا کێ بیستوویەتی و بینیویەتی کە کەشتی لە بەیاردا، لە وشکانیدا، بەبێ بوونی دەریا و ڕوبار درووست بکرێ، ئەویش کەشتیەکی ئاوا گەورە و بێوێنە!! حەزرەتی نوح وەڵامی نەدەدانەوە و خەریکی کاری خۆی بوو. جا خوای گەورە نیشانەیەکی بە حەزرەتی

نــوح گوتبوو. کــە ئەگەر هــەر کات تەنووری نانەوای شــارەکە، کە خەڵکــی نانی گەرمی لێ وەردەگرن، لە کاتێــکا لە گڕی ئاگردایە پڕ بــوو لە ئاو و ژێــرەوەی قوڵپی ئاوی دا، ئەوە نیشــانەی هەســتانی تۆفانە و خێرا بڕۆنە کەشــتیەکەوە. بەڵــێ ڕۆژێکیان کتوپڕ بوو بە هەرا و دەنگەدەنگ و وتیان: زۆر ســەیرە. تەنووری شــارەکەمان لەو کاتەدا کە بڵێسەی ئاگری دەدا، پڕ بوو لە ئاو و ئاوەکەی بوو بەکانی و تەقــی!.. حەزرەتی نــوح بە ئیماندارانی فەرموو: خێرا بڕۆنە ناو کەشتییەکەوە. قورئان دەفەرموێ: ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمۡرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ وَأَهۡلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيۡهِ ٱلۡقَوۡلُ وَمَنۡ ءَامَنَۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٞ ﴾ هود: ٤٠

واتــە: هەتا ئــەو کاتەی بڕیارمان هات و فەرمــان دەرچوو بە لە ناوبردنی بێباوەڕەکان و لە تەنورە پڕ لە ئاگرەکەوە ئاو فوارەی کرد. کە ئەوە نیشــانەی دەستپێکردنی تۆڵە خواییەکە بوو. ئەوسا وتمان: ئەی نوح لە هەموو نێر و مێیەك دووان هەڵبگرە لە کەشــتیەکەدا و ماڵ و خێزانت، جگە لە وانەی کە بڕیاریان لە سەر دراوە تووشی تۆڵە ببــن بە هۆی بێباوەڕیانەوە ئەوانەش هەڵگــرە کە باوەڕیان هێناوە. بەڵام شــایانی باســە کە کەســیش بڕوای بە نوح نەکرد و لەگەڵیدا نەبوو، جگە لە کەسانێکی کەم نەبێت!.

ئیماندارانی بەڕێز: بابەتی ئێمە لێرەدا ﴿ قُلۡنَا ٱحۡمِلۡ فِيهَا مِن كُلّٖ زَوۡجَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِ ﴾. لــە هەموو نێر و مێیــەك دوان هەڵگرە. (لە هەموو نێر و مێیەك!!) ئەگەر ئێمە بووینایە دەمانگوت: وا ڕزگارمان بوو لە

گورگ و چەقەڵ و ڕێوی و پڵنگ و بەراز و مشــك و ئەم جۆرە شــتە زیانبەخشــانە بۆ مرۆڤ و هەرچی سوودبەخش نەبێ لەگەڵ خۆمان نای بەین. بەڵام خالیق و دروســتکەری مرۆڤ و هەموو زیندەوەران بە حەکیمی و کاربەجێیی خۆی دەزانێ چی بۆ ژیانی ئەم بەشــەرە لەم ســەرزەویە پێویســتە، چــۆن هەنگ دەبێ هەبێ، دەبێ مێشــکە ڕەشــکەش هەبێ، چۆن مەڕ هەیە دەبــێ گورگیش هەبێ! چونکە وا نەبــێ تەوازونــی ژینگە تێــك دەچێ و ئەو کاتە مــرۆڤ ژیانی لەم سەرزەویە لێ تاڵ دەبێ هەر بۆیە قورئان بە وردی ئامازەکانی باسی (لــە هەموو نێــر و مێیــەك دوان هەڵگرە، لەگەڵ مــاڵ و خێزان و ئیمانداراندا).. هەردووکیانی بە یەکەوە باس کردوە، واتە: ئەگەر ئەو زیندەوەرانە  لە ژینگەدا نەمێنن، ئێوەی مرۆڤی ئیمانداریش ژیانتان نامێنێ!!

بەڕێــزان: دەچینە خزمەت ئایەتێکی قورئان کە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَأَيَٰتٍ لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٣﴾ وَفِي خَلْقِكُمْ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ءَايَٰتٌ لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ الجاثیە: ٣ - ٤

مانــای ئایەتــەکان بە کوردی و بە کورتی ئەمەیە: بە ڕاســتی لە ئاســمانەکان و زەویدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەن دەربارەی گەورەیی و دەســەڵاتی پــەروەردگار بۆ کەســانێك کە بــڕوادارن. هەروەها لە دروســتکردنی ئێــوەدا، لە ئەندامەکانی لەشــتاندا. لــە قۆناغەکانی گەورەبوونتانــدا. لە جیــاوازی نێر و مێتاندا... هتــد، هەروەها لەو هەموو زیندەوەرە جۆراوجۆرانەی کە لە سەر زەوی و لەژێر زەوی و

ناو ئاودا هەن و بڵاویان دەکاتەوە. لە چوارپێ و باڵندەکان. لە خشۆك و شەشپێکان، لە گیاندارانی هەمەجۆر لە قەبارە و ڕەنگ و شێوازدا. لە دەور و ڕۆڵیان لە خزمەتکردنی ئادەمیزاددا، هەموو ئەوانە بەڵگە و نیشـانەن لە سەر دەسەڵاتی خوا بۆ کەسانێك کە دڵنیان و باوەڕی دامەزراویان هەیە...

ئێسـتاش با لەسـەر چەند بڕگەیەکی ئایەتەکان بوەستین: خوای گـەورە فەرمـوی: ﴿ وَفِي خَلْقِكُمْ ﴾. لە درووسـتکردنی ئێوەی مرۆڤدا چەندەها نیشـانە و بەڵگە لە سەر عەزەمەت و دەسەڵاتی خوا هەیە، نافەرمـوێ: (آيَـةٌ) بەڵکو: (آياتٌ) چەندین بەڵگە و نیشـانە هەیە. بۆ نموونـە: خڕۆکەی سـووری خوێـن (١٢٠) ڕۆژ دەژیـن و دوای ئەوە دەمـرن و لە ڕێـی سـپڵەوە دەردەکرێنە دەرەوە و خانـەی نوێ لە جێیان دروسـت دەکرێنەوە. لە بار و زرووفی ئاسـاییدا (دوو ملیۆن و نیو) خڕۆکەی سـوور لە چرکەیەکدا بەرهەم دەهێنرێت. لە لەشدا و ئـەم ژمارەیەش زیاتر دەبێت ئەگەر پێویسـت بـکات. ڕێژەی ئەم بەرهەمهێنانەش هۆرمۆنێك ڕێکی دەخات کە ناوی (ئیریسرۆپۆیتین) ە. کاتێك لە ڕووداو و کارەسـاتێکدا مرۆڤ تووشی خوێنلەبەرڕۆیشتن دەبێـت بەرهەمهێنـان زیاد دەکات، هەروەها کاتێك مرۆڤ بە سـەر شوێنێکی بەرزدا سـەرکەوێت و ئۆکسجین کەم بکات خڕۆکەی سوور زیاتر بەرهەم دەهێنرێت تا زۆرترین ئۆکسـجین وەربگرێت!! سبحان اللـە، بە بێ ئەوەی هەسـت بـە هیچ بکەی، پارە بـدەی. بچیە لای دکتـۆر، زانـا بی یان نـەزان، خواناس بی یان بێدیـن، ئەم کارگەیە

بەم سیستەمە ئۆتۆماتیکیە بێوێنەیە کە هەرگیز هەڵەیەك ناکات، کار دەکات و ژیانی تۆ لە مەترسی دەپارێزێ.. ئایا ئەمە بەڵگە و نیشانەی بەهێز نییە لە سەر دەسەڵات و گەورەیی خوا؟! لا إِلَهَ إِلاّ اللّه. پاشان دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَبُثُّ مِن دَآبَّةٍ ﴾ بەڵێ وردبوونەوە لە هەڵسووکەوتی گیانلەبەران و ڕێکوپێکی ژیانیان ئەو ڕاستییەمان بۆ دەردەخات. کە خوای گەورە بەرنامەی بۆ هەموان داناوە و هەموان بە نەخشە و پلانێکی تایبەت دەژین تا بەرگری بکەن لە تیاچوون و هەوڵ بدەن بۆ مانەوە و بەردەوامبوون.. ئەوەتا لەبارەی هاوکاری لە نێوان گیانلەبەراندا سەرنج بدەن: گیانلەبەران زۆریان بە یەکەوە دەژین و هاوکاری یەکتر دەکەن و یەکتری ئاگادار دەکەنەوە لە هەر مەترسییەك کە ڕوویان تێ بکات. بۆ نموونە: کاتێك (دۆلفینێك) لە سەر ئەوەیە بێچوی ببێت. دۆلفینێکی مێیەی تر لەگەڵیا هاوکارێتی و چاودێری دەکات و پاشان بە هەموویان خزمەت و چاودێری دۆلفینە بچوکەکان دەکەن و بە کۆمەڵ بە یەکەوە دەژین!!

زانایەکی بەناوبانگ بەناوی (کینیث وکر) گەشتێکی کرد بە ئەفریقیادا و کەوتە تۆمارکردنی ئەوەی کە دەیبینی، ئەم زانا بەناوبانگە دەڵێ: پێش چەند ساڵێك لە ڕۆژهەڵاتی ئەفریقیا بە چاوی خۆم بینیم کە کۆمەڵێك ئاسك و کەری وەحشی بە یەکەوە بوون و هاوکاری یەکتریان دەکرد لە دەشتی (هایتی)دا، بە جۆرێك کە یەکێکیان لە خۆیان دادەنا بۆ چاودێریکردنی ناوچەکە و هەر ئەوەندە هەستی بە شتێك بکردایە هەموانی ئاگادار دەکردەوە!!..

هەروەها: فیل و زەڕافەشم بینی کە هاوکاری یەکتریان دەکرد. چونکە فیل بە هۆی گوێیەکانییەوە زیاتر هەســـت بە نزیکبوونەوەی دوژمن دەکات و لـــە هەمـــان کاتدا چاوی کزە، بـــەڵام زەڕافە بە ملی بەرز و چـــاوی تیژی باشـــتر دوژمن دەبینێ. بۆیە زەڕافەکان هەر شـــتێکیان ببینیایە لە دوورەوە فیلەکانیان ئاگادار دەکردەوە!!

(وحید القرن)یش باڵندەیەك لە ســـەر پشـــتی دەنیشێتەوە و هەر مشـــەخۆرێك لە ســـەر پشـــتی بێت دەی خوات و بەمـــەش هاوکاری یەکتـــری دەکـــەن و هـــەرکات باڵندەکەش هەســـت بـــە دوژمن بکات دەنگێکی لێـــوە دێت و (وحید القرن)ەکە ئاگادار دەکاتەوە تا ڕا بکات و دوور بکەوێتەوە!!.. ئەمە لەســـەر وشـــکانیدا. ئەمجا با سەیری ناو دەریا بکەین: جۆرە ماســـییەك هەیە زۆر بچووکە، هەر بە ئەندازەی پەنجـــە گـــەورەی مرۆڤ دەبێت و لەوە گەورەتر نابێت، پێشـــتر زۆر کەس دەیگوت: باشـــە ئەم ماسییە قەزەمە سودی چییە؟! خۆ گۆشتی ناخـــورێ، جوانییەکـــی ئەوتۆشـــی نییـــە، ئەی بۆچی باشـــە؟! بەڵام دواتر زاناکان ڕوونیان کردەوە کە بە ڕاســـتی ئەم ماســـییە بچکۆلەیە ژینگەپارێزێکی زۆر گرنگە و لەناو دەریاکاندا دەگەڕێ و لە بنی دەریا و ڕووبارەکانـــدا بەرد و تاوێرە بەردی زۆر گەورە هەیە. کە چەندین کونی تێدایە. لەناو ئەم کونانەدا، حەشـــەرات دروست دەبێ و دەبێتە هۆی زیانگەیاندن و بڵاوکردنەوەی نەخۆشی لە ناو گیانەوەرەکانی ناو دەریا و ڕووبارەکەدا، بەڵام ســـەرنجیان دا ئەم ماسییە زۆر بچکۆلەیە بەهۆی بچووکی لاشەیەوە دەتوانێ بچێتە ناو ئەو کونانەوە و هەرچی

میکرۆب و حەشــەراتە پاکی بکاتەوە و خۆراکی خۆی لێ دابین بکات و ئــەو مەترســییەش لەســەر زیندەوەرەکانی تــر دووربخاتەوە، کە غەیری ئەو ماسییە بچکۆلە هیچ زیندەوەرێکی تر توانای چوونە ناو ئــەو کونە بچکۆلانەی نییە و ناتوانــێ پاکیان بکاتەوە. ئەمجا بۆیان دەرکەوت کە ئەم ماسییە بچکۆلە نەك دەور و ڕۆڵی هیچ لەو ماسییە گەورانە کەمتر نییە کە مرۆڤ دەیان خوات و سودمەند دەبێ لێیان بەڵکو بوون و مانەوەی ئەو ماســییە گەورانە پەیوەستە بەو ماسییە بچکۆلەوە و خوای گەورە بە بێ حیکمەت درووستی نەکردوە!..

لەبەر ئەوە ئیماندارانی بەڕێز: با ئاگامان لە پاراستنی ژینگەکەمان بێ، با هیچ زیندەوەرێك بە خۆڕایی لە ناو نەبەین. چونکە هەمووی کاری تایبەتی خۆی هەیە. وە هەندێ جار خوای گەورە هەندێ شــت نیشــانی بەندەکانی دەدات بۆ ئەوەی بە ئاگایان بێنێتەوە کە ئەوەی تۆ زۆر حیســابی بۆ ناکەی، لای خوا بە نرخە و ئەویش بۆ خزمەت بە ژیان و ژینگەی تۆ درووســت کراوە، ســەرنجی ئەم ڕووداوە بدەن. کە لە کوردستانی خۆماندا، لە سنوری پارێزگای سلێمانی ڕووی داوە و ئەو کەســەی کە ڕووداوەکەی لێ ڕوداوە، خۆی بۆمان باس دەکات و دەڵێ: ساڵێکیان پەڵەیەك بێستانی کاڵەکم کردبوو، ڕۆژانە سەردانم دەکرد، بێســتانەکەم هاتە ئەوەی بەری گرت. کاڵەکی شیرین و جوان زۆر دڵخۆشیان کردم. بەڵام شتێ نیگەرانی دەکردم، ئەویش ئەوە بوو کە ڕۆژانە کاتێ بەیانیان دەچوومە ناو بێســتانەکەم و سەیرم دەکرد زرکە کاڵەکەکان کە خەریکی پێگەیشتن بوون، زۆریان لایەکیان خوراوە

و خــراپ کراوە. بڕگەیەك نەبــوو، دوان نەبوو، زۆربەی هەرە زۆری وەهایان لێ کرابوو. ئەوەی ڕاســتی بێ زۆر بێتاقەت بووم. لەوسەری بێســتانەکەوە ویستم بچمە دەرەوە و ســەرێکی دراوسێ بێستانەکەم بدەم، ســەیری بەرپێی خۆمم کرد، کیسەڵێکی گەورە بە خاوەخاو و خشپەخشــپ خەریکە دەچێتە دەرەوە لە بێستانەکەم، لە دڵی خۆمدا وتــم: ئەمە تۆی ئەم زەرەرەم لێ دەدەی، ئێســتا بە قوربانت دەبم!. دەســتبەجێ گرتم و خســتمە سەرپشــت و بەردێکی گەورەم خستە سەرســکی و ڕوە و ئاســمان بەجێم هێشــت، بە هۆی ســەرقاڵیمەوە ئــەم کارەم بیرچۆوە. کە بە هیوا بــووم بۆ ڕۆژی دوای ئەوە دووری بخەمەوە، ڕۆژانە هەســتم بە ماندووبوونی زۆر دەکرد و دوای ســێ چــوار ڕۆژ ئازارێکــی زۆر ناڕەحەتــی کردم و لە تاو ئازاری پشــتم هەناســەم بە ئاستەم بۆ دەدرا. چوومە لای جەڕاحی شارەزا و شێلان و ڕاســت و چەپــی بۆ کردم!! بەڵام هیچ ســودێکم لــێ نەبینی. بەم ئــازارەوە دەتلامەوە، کارەکانی ڕۆژانــەم زۆر بە ناڕەحەت بۆ ئەنجام دەدرا. تا ســەرەنجام ڕۆژێکیــان بە بێتاقەتی بە ناو بێســتانەکەمدا دەگەڕام، بە بینینی دیمەنێك ئەبڵەق بووم. خوایە چی دەبینم، ئەوە کیسەڵەکەیە و بەردە گەورەکەی هەر لەسەر سکە!! خوایە گیان تۆبە بێ، ئەوە من چیم کردوە، کیسەڵی داماو بەحاڵ گیانی لەبەردا مابوو. بە هێواشــی هەناســەی دەدا. بەردەکەم لەســەر لابرد و زۆر بەنەرم و نیانی هەڵم گرت و خســتمە ســەر زەوی، ئای کیســەڵی بەسەزمان ئەمە تۆی کە ماوەی (٢٥) شەوە لەم سوری هەتاوە و لەم ناڕەحەتەدا

سـەنگەوبەرد دانراوی، خۆ من هەر لە یادم نەمابووی. ئەم کیسـەڵە بەسـەزمانە لەسـەر گازی پشـت ئەوەندە ملی درێژ کردبوو، هەموو گڵی دەوری خۆی کە ملی گەیشـتبوویە لە برسانا خواردبووی. گەرما و درێژی ڕۆژگار برسـتی لێ بڕی بوو. تۆزێ سـەیرم کرد و ئەویش بـە زەلیلـی و داماوی و کزۆڵیەکەوە سـەیری کردم. لـە ناخەوە بە خۆمـم وت: خودایە ئـەم گوناهە چی بوو کردم؟! زۆر پەشـیمانیم دەربـڕی. وردەوردە ڕێگەم بۆ خۆش کرد بەرەو جۆگەلە ئاوی قەراغ بێستانەکەم یارمەتیم دا و بە چاوی بەزەییەوە سەرنجم دەدا!، وەك زمانزان ئاوڕێکی لێ دامەوە و پاش سەرنجێ بەخاوەخاوو خشپەخشپ کەوتەوە ڕۆیشـتن بەرەو جۆگەلە ئاوەکە، هێندەی چارەکە سـەعاتێ دەمی لەو ئاوە بەرنەدا، بێپسـانەوە ئاوی خواردەوە. ئاوی خواردەوە، بێتاقـەت بووم لە تەماشـاکردنی، پاش کەمێ هۆشـێکی هاتەوە بەر خـۆی و سـەیرێکی تری کردم، بە هێواشـی و بـەلارەلار بەرەو ناو گژوگیـا و پنگەڵانـی لێـواری جۆگەلەکە خزی و لە چـاو ون بوو.. بەڵێ بەڕێزان، بەو دیمەنە زۆر بێتاقەت بووم کە من چی ستەمێکی گەورەم لەو بەسـەزمانە کردوە، بەڵام سـبحان اللـە هەر لەو کاتەدا هەسـتم بەوە کرد کە ئازاری پشـتم کەمی کرد. متمانەتان هەبێ، تا ئێوارە ئازارم نەما و گەڕامەوە سـەر چوسـت و چالاکی جارانم. ئەو ڕزگاری بـوو، منیش ڕزگارم بوو. بە ئومێدی ئەوەی کە ژینگەکەمان بپارێزین و دین و ژینمان سـەلامەت بێ. (رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنيا حَسَـنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ) اللّهُمَّ آمين

## سەرچاوەکان:

١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.

٢. لە ڕووناکیەکانی باوەڕ و تاریکیەکانی بێباوەڕی، بەندەی پەرستکار، ل٧٨، ل٨٠، ل١٠٣.

٣. مِنْهاجُ الصّالِحِين في الآداب الإِسْلامِيَّة. محمد عبدالعاطي بحيرى. ص٥٢٠.

٤. ئایندەی هەسارەکەمان، شەماڵ موفتی، ل٥٥.

٥. حَقائِق عِلْمُ الحديث. عبدالرحُمن العَصّافي. ج١ ص٦٤.

٦.قصص الأَنبياء. محمد متولى الشَّعراوى. ص٤٥.

٧. ژیانەوە. ئەندازیار عثمان، ل١٠٨، ل٩٩.

٨. ئەسرینەکانی سەدەی بیستەم، ب٤، ل٧٤.

٩. بەرنامەی پرد، مامۆستا عبدالرحمن صديق، بە (D.V.D).

وتاری پێنجەم بۆ مانگی شەوال

# ماف و ئەرکی بە ساڵاچووان
## بەشی یەکەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمِين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ:

**ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز: ڕۆژی ١/١٠ی هەموو ساڵێك كراوەتە ڕۆژی بە ساڵاچووانی جیهان. ئێمەی موسڵمانیش كە ئیسلامەكەمان هەموو شتێكی بۆ باس كردووین و هیچ كەس و چین و توێژێك نییە لە كۆمەڵگەی مرۆڤایەتیدا، باسی نەكرابێ و ئەرك و مافی بۆ دیاری نەكرابێ، بۆیە بە پێویستمان زانی كە ئێمەش لە بارەی ئەو چین و توێژە گەورە و گرنگەی كۆمەڵگاوە قسەی خۆمان هەبێ و چەند وتارێكی -بە پشتیوانی و ویستی خوای پەروەردگار بۆ تەرخان بكەین- لەبەر ئەوەی چینی بە ساڵاچووانی ئەمرۆ گەنجانی دوێنێ بوون. وە مامۆستا و ڕێنیشاندەری گەنجانی ئەمرۆن!**

**هەر بۆیە ڕێز و حورمەت لە خەبات و ماندووبوون و تێكۆشانی دوێنێیان دەگرین و لەو هەموو تەجرەبە و حیكمەتەی كە لە قوتابخانە و زانكۆی ژیانی چەند ساڵەیاندا خوێندوویانە سوودمەند و بەهرەمەند دەبین، إنشاء اللە. وە دوعای خێریان بۆ دەكەین و داوای دوعای خێریان لێ دەكەین. یارمەتیان دەدەین و داوای یارمەتیان لێ دەكەین.**

بەڕێــزان: ژیانی مــرۆڤ وەکو چڵە گیایەك وایە کە ســەوز دەبێ و گەورە دەبێ و پاشان کامڵ دەبێ و زەرد دەبێ و وشك دەبێ و دەوەرێتە سەر زەوی و تێکەڵ بە خاك دەبێتەوە. خوای پەروەردگارمان دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ ضَعۡفٖ قُوَّةٗ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفٗا وَشَيۡبَةٗۚ يَخۡلُقُ مَا يَشَآءُۚ وَهُوَ ٱلۡعَلِيمُ ٱلۡقَدِيرُ ﴾ (الروم: ٥٤)

واتــە: خــوا ئەو زاتەیە ئێوەی بە لاوازی درووســت کردوە (ســەرەتا نوتفەیەکــی لاواز، دوایی وەك دیل لە ســکی دایکدا، پاشــان هەر منالّی لاوازیت تا دەگەیتە تەمەنی لاوی) ئەوســا خوا هێز و دەســەڵاتێکت پێ دەبەخشــێت، دوای هێز و توانایی دووبارە نۆرەی لاوازی و پیری دێت، بێگومان ئەو خوایە هەرچی بوێت درووستی دەکات، (ئەم هێز و بێهێزیە بەشێکە لە ویستی ئەو زاتە). ئەو پەروەردگارە زانا و بە توانایە..

ئیمانداران‌ــی بەڕێــز: بە ڕاســتی کاتێ مرۆڤی موســڵمان دەچێتە خزمەتــی قورئان، دەبینێ هەر وشــەیەکی مانایەکــی تایبەتی گەلێ گــەورە و گرانــی هەیە. کــە قورئان جیا دەکاتەوە لــە هەر کتێب و نووسینێك کە دەســتی مرۆڤی تێدابێ، چونکە ئەوەی کە قورئان بە تەنها یەك وشــە باســی دەکات. نووســەرانی هەرە بە توانا بە چەند لاپەڕە ناتوانن بۆچوونی خۆیانی لە سەر دەرببڕن، ئەوەتا لەو ئایەتەی ســورەتی -الروم-دا. کە ئایەتی ژمارە (٤٠)، دەفەرموێ: ﴿ خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ ﴾ نافەرمــوێ: (خَلَقَكُمْ ضِعافاً). یــان نافەرموێ: (خَلَقَكُمْ في حالَــةِ ضَعْفٍ). بەڵکو دەفەرمــوێ: ﴿ خَلَقَكُم مِّن ضَعۡفٖ ﴾. وەکو ئــەوەی پێمــان بڵێ بوونتان لە کۆمەڵێ بێهێــزی و لاوازییەوە پەیدا

بووە. تەماشای خۆت بکە ئەی مرۆڤ. سەرەتای بوونت لە تاکە یەك خانەوە دەســت پێ دەکات. خۆ خانەش ئەوەندە بچووك و لاوازە، کە ئەگــەر خوای خالیــق پارێزگاری لێ نەکات هەر زۆر بە ئاســانی لە ناو دەچێ و بەرگەی هیچ فشــار و هێزێك ناگرێ. ئەگەر دەتەوێ لە بچوکــی و لاوازی خانە تێ بگەی، ئــەوا بزانە: ژمارەی ئەو خانانەی کە لەشــی مرۆڤێکیان لێ پێك هاتووە. نزیکەی، (ســەد هەزار هەزار ملیۆن) خانەیە!. واتە: (سەد هەزار بلیۆن) خانە، یاخود (سەد تریلۆن) خانەیــە!!! خانە ئەوەندە بچووکە بە چاو نابینرێ، مەگەر (١٤٠) جار گەورەی بکەی بە وردبینی بەهێز، کێشی ئەم خانەیە (قورسییەکەی) یەکســانە بە یەك لە سەر هەزار ملیۆنی غرامێك!!. بە مانای ئەگەر (هــەزار ملیۆن خانە) بە تەرازوویەکی تایبەت بکێشــرێ. ئەو هەزار ملیــۆن خانەیە بە هەر هەمووی دەکاتە تەنها (یەك غرام)!! ســبحان الله. ئەی مرۆڤ تۆ ســەرەتاکەت یەك دانە خانەی ئاوا بێهێز و لاواز و بێ وەزن بووە! پاشــان ســەرنج بدە: ئەو ماددەیەی کە مرۆڤی لێ دروســت بووە، لەناو هەموو ماددەکاندا. بریتییە لە گڵ (خاك). دەی ئــەم گڵە ئەگەر بەو (نَفَخْتُ فِيهِ مِــنْ روحی) خوای پەروەردگار نەبێ، بزانــە چ مادەیەکی لاواز و بێهێزە. ســەیرکە مردوو، ئەو گەنجە بە هێــزە، هەر کە ڕووحەکەی لێ هاتە دەرەوە، وەکو گڵەکەی یەکەمجار بێدەســەڵات و بێتوانا دەبێ و بە ئارەزووی خۆیان لە شــتن و کفن و دفنا ئەمدیواو دیــوی پێ دەکەن، گەورەترین پاڵەوانی جیهان کە بە چەندیــن کەس نەگیرێ. کە ڕووحەکەی دەرچوو. بە کەســێکی لاواز

و بێهێز ئەمدیواو دیو دەکرێ. دەی مرۆڤ تۆ ئەو جەستە بێهێزەی. ئەصڵــی بوونەکــەت ماددەیەکــی بێهێــزە! ﴿ خَلَقَكُم مِّن ضَعْفٍ ﴾.. هەروەها مرۆڤ لە ناو سکی دایکیــدا، بوونەوەرێکی لاواز و بێهێزە، پاشان دوای لە دایکبوونی، سەرنج بدەن: مرۆڤ بێهێزترین بەچکەیە کە لە دایك دەبێ. بەچکەی هەر زیندەوەرێك کە لە دایك دەبێ، خۆی توانای جووڵە و هەوڵ و تێکۆشــانێکی هەیە. بەڵام بەچکەی مرۆڤ، هیــچ توانایەکی نییە و بێدەســەڵاتترین بەچکەیە. مامۆســتا هەژار موکریانی، لە وەرگێڕانی شعرێکی (د. عەلی شەریعەتی)دا دەڵێ:

تۆ لە جوچك بێهێزتر بووی ..... بێدەرەتان و پێزتر بووی.

ئــەو دێتــە دەر بــە جووکە جــووك ..... بــۆ دان ئەکوتێ پەل و دەنووك.

بەڵام تۆ پارچە گۆشتێ شل ..... نە پەل، نە مل، نە گوڕ، نە تل.

بەڵێ بەرێــزان: مرۆڤ لە بەردەم کۆمەڵــێ بێهێزی و لاوازیدایە. ئەوەتــا کاتێــك گەنــج و لاوێکی پێگەیشــتوە و بە هێــزە لە ڕووی بازوەوە. کەچی ئەگەر پابەندبوون بە ڕێنماییەکانی شــەرعەوە نەبێ و ئیمانێکی تۆکمە و دامەزراوی نەبێ، ئەو مرۆڤە زۆر لاوازە بەرامبەر داواکارییەکانی جنس و ئارەزوو ورگ و داوێنی. چەند مرۆڤی جەستە بــە هێز تووشــی لادان و خراپەکاری بــوە و زۆر لاواز بوە بەرامبەر ئارەزووە نەفسیەکانی، یان تموحە ماددیەکانی.

﴿ ثُمَّ جَعَلَ مِنۢ بَعۡدِ قُوَّةٖ ضَعۡفًا ﴾ ئەمجــا دوای ئــەو قۆناغــی لاوازییە، قۆناغێکی بە هێز بە ســەر مرۆڤدا دێ، کە ئەویش قۆناغی

گەنجییەتیـــە. تەماشـــاکە هێزی بازووی مرۆڤ شـــاخ دەکۆڵێ. هێزی عەقڵی ئەو هەمـــوو بەرهەمی تەکنەلۆجیایە درووســـت دەکات. ئەو کۆمپیوتەر و ئەنتەرنێتە بەرهەمی عەقڵی مرۆڤە.

﴿ ثُمَّ جَعَلَ مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ ضَعْفًا وَشَيْبَةً ﴾. ئێمە لەم باســەدا باســی ئەم قۆناغەی ژیان دەکەین. کە پێســـت چرچ دەبێ، موو ســـپی دەبێ، چاویلکە دەچێتە چاو، گوێ گران دەبێ، پشت دەچەمێتەوە، قاچ گوڕ و هێزی نامێنێ. دەبێتە مامە و خاڵە و باپیرە، لە دائیرە و فەرمانگە خانەنشـــین دەکرێ. دەســـت دەبـــەی بۆ پاروویەکی چـــەور و خۆش، هـــاوارت لێ دەکەن، باوەگەورە، نەکەی، نەی خۆی، ســـوێرە، چەورە. (بەڵێ)کانـــت دەبن بە (ئێی). هەموو قســـە دەکەن تۆ دەحەپەســـێی، دەڵێی قســـە نازانی، تا لە نەخۆشییەك ڕزگارت دەبێ، نەخۆشییەکی تر میوانتە. وەکو سەهۆڵ دڵۆپ دڵۆپ دەتوێیتەوە. قەڵەو بوونیشت بۆ خۆی جۆرە نەخۆشییەکە، زۆرجار ڕابردووی ژیانت دێتەوە بەرچاو، بـــە خۆت دەڵێـــی: هەرچەند ژیان حەقیقەت بـــوو، بەڵام بە خوا لە خەو دەچوو!!...

ئیمانداران: جاری وا هەیە ئەم پیریە دەبێتە (أَرْذَل العُمُر). کە لە ســـەروو قۆناغی پیربوونی ئاساییەوەیە.. هەروەکو زانایان وتوویانە: مرۆڤ بـــەم قۆناغانەدا دەڕوات. کۆرپە (لـــە دایکبوونەوە تا تەمەنی یەك ســـاڵی). مناڵ (لە شەش ســـاڵی تا (١٢) ساڵی. مێردمناڵ لە (١٢ — ١٨) ســـاڵی. گەنج لە (١٨ — ٤٠) ســـاڵی. پێگەیشتوو لە (٤٠ — ٥٠) ساڵی. تێگەیشـــتوو لە (٥٠ — ٦٠) ساڵی. پیر لە (٦٠ — ٩٠) ساڵی. أَرْذَل العُمُر

(٩٠ — ١٠٠) ســاڵ و زیاتر هەرچەندە جارووبارەش کەســانێك هەن و دەیان بینین کە تەمەنیان لە ٩٠ ساڵ بەرەو ژوورە کەچی زۆر چالاك و بە گوڕ و تینن. بەڵام ئەمانە زۆر کــەم و دەگمەنن و یــاســاش بە ڕیزپەڕ (شاذ) هەڵ ناوەشێتەوە.. خوای گەورە لە قورئاندا دەفەرموێ:

﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَىْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴾ النحل: ٧٠

واتە: بە ڕاستی هەر خودا درووستی کردوون و پاشان هەر ئەویش دەتانمرێنێت، هەتانە تەمەنی درێژ دەبێت و دەبرێتەوە بۆ لاوازترین تەمــەن، (کەنەفتی و کەفتەکاری). تاوەکــو دەگاتە ڕادەیەك کە دوای ئەو هەموو زانســتی و زانیاری و تێگەیشــتنەی کە هەی بوو، هەموو شتێکی لە بیر دەچێتەوە و هیچ نازانێت. بە ڕاستی هەر خوا زانا و بە دەسەڵاتە..

بەڕێزان: سەرنجی ئایەتەکە بدەن، لە کۆتاییدا دوو صیفەتی خوای گــەورەی باس کردوە کە ئەوانیش: (علیــمٌ) (قَدیرٌ). کە پێمان دەڵێ: ئــەی ئادەمیزاد بزانــە و یەقینت ببێ کە تەنهــا عیلمی خوا بەقای هەیە. کام کەس زۆر زانایە و عیلمی پێیە کە گەیشتە قۆناغی (أَرْذَل العُمُر) هیچی بیر نامێنێ و توانای دەرس و دەور و نووسینی نامێنێ، هەروەهــا خــوای گەورە (قَدیــرٌ) کە پێمان دەڵێ، هــەر تەنها خوا بۆ خــۆی توانا و هێزی باقی دەمێنێتەوە. کام کەســی زۆر پاڵەوانە، کە گەیشــتە (أَرْذَل العُمُر)، وەکو لاوازترین و بێهێزترین مرۆڤی لێ دێ، هەمووومان بینیمان کە چۆن (محمد علی کلای) ئەســتێرە و پاڵەوانی

بۆکسـێن کاتێ کە لە پیری و پەککەوتەییدا. خەڵاتی ڕێزلێنانیان پێ بەخشـی، چۆن دەسـتی دەلەرزی و سـەری دەلەرزی و قاچەکانی لە سـەر زەوی ڕاگیر نەدەبوون!! ئەو پاڵەوانـەی کە چەندین پاڵەوانی لـە مەیدانا بە چۆکدا هێناوە. کەواتە: ئەی مرۆڤ هەرگیز بە عیلم و زانیارییەکەتدا وە بەهێز و بازووی پتەو و پاڵەوانانەتەوە، مەنازە و بـە ئەمانەتـی خوایان بزانە و لە خزمەتـی دین و ژینی خۆت و خەڵکیدا بە کاری بهێنە.

لـە صەحیحی بوخاریدا، بە ژمارە فەرمـوودەی (٢٨٢٢) هاتوە کە: (كَانَ رَسُـولُ اللهِ (ﷺ) تَعَوَّذَ مِنْ أَنْ يُـرَدَّ إِلى أَرْذَلِ العُمُرِ). واتە: پێغەمبەری خـوا (ﷺ) پەنای دەگرت بە خـوای گەورە کە بی گەیەنێتە قۆناغی کەنەفتی و پەککەوتەیی. بەڵێ، (أَرْذَل العُمُر) مامۆستا هەژاری شاعیر، ئاوا وەصفی دەکات کە دەفەرموێ:

- ئێستا چی لە پاش سەد ساڵی، چوویتەوە دەقی مناڵی.

چاو نابینێ، گوێ ناژنەوێ ..... دانت نەما، شیرت دەوێ.

یەخسیری لەناو جێگادا، مۆرەغەت زەوی بەرنادا.

لەوەرزیان ئاغڵەب خەوتووی ..... بێهێز و پێز لە کار کەوتووی.

هەر سێ کارت ماوە لە ژیان .. خواردن و ڕینەوە و گریان!!...

بەڵێ (أَرْذَل العُمُر) یانی پەککەوتەیی و کەنەفتی و زەلیلی سەرجێگا. هـەر بۆیە پێغەمبەری خۆشەویسـتمان (ﷺ) داوای لە خوای گەورە کردوە کە (أَرْذَل العُمُر) بی پارێزێ و وای لێ نەکات کە لە بەر زۆری تەمەن بیر و هۆش لە دەسـت بـدا و پاکوخاوێنی خۆی پێ نەکرێ.

هەروەکو لە (صەحیحی بوخاری)دا هاتوە بە ژمارە فەرموودەی: (٢٨٢٢) کە: (كَانَ رَسُولُ اللهِ ﷺ تَعَوَّذَ مِنْ أَنْ يُرَدَّ إِلَى أَرْذَلِ العُمُرِ).

بەڵێ، هی وا هەیە تەمەنی زۆر درێژ دەبێ و دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی پیر و کەنەفتەیی، وای لێ دێتەوە بێهێز و لاواز و زەبوون، هەستەکانی وەکو پێویست کار ناکەن. توانای عەقڵی و جەستەیی نامێنێ. لەرزۆك و لاوازو و پەککەوتە و کەنەفت دەبێ، بە ڕاستی بە سەربردنی ژیان لەو جۆرە تەمەنەدا گەلێ سەخت و دژوارە. بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) زۆرجار لە دوعا و پاڕانەوەیدا، لە خوا دەپاڕایەوە: کە تەمەنی ئەوەندە درێژ نەبێ بگاتە تەمەنی زەلیلی و کەنەفتەیی، دەیفەرموو: (أَعُوذُبِكَ مِنَ البُخْلِ وَالكَسَلِ وَأَرْذَلِ العُمُرِ، وَعَذابِ القَبْرِ وَفِتْنَةِ الدَّجالِ، وَفِتْنَةِ المَحْيا وَالمَماتِ)..

ئەم فەرمودەیە: ئیمامی بوخاری و ئیبن و مەردەوەیهی لە ئەنەسەوە ڕیوایەتیان کردوە..

بەڵام بەڕێزان: شایانی باسە کە هی وا هەیە، زۆر پیر دەبێ و هێشتا عەقڵ و هۆشی لە سەر خۆیە. بە تایبەتی کەسێك موسڵمان بێ و دڵی بە ئیمان ئاوەدان بێ، بتوانێ ئەرکەکانی سەرشانی ئەنجام بدا. ئەم جۆرە کەسانە با لە ڕووی تێپەڕبوونی ساڵەوە، زۆریش بە تەمەن بن، لە تەمەنی عادەتی ئەولا بکەون. ئەوانە بە تەمەنەکەیان ناوترێ (أَرْذَلِ العُمُرِ). بەڵکو ئەو تەمەنی پیرۆزە، تەمەنی خێر و بەرەکەتە. چونکە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (خَيْرُكُمْ مِنْ طالَ عُمُرُهُ وَحَسُنَ عَمَلُهُ). واتە: باشترینی ئێوە کەسێکە تەمەنی درێژ بێ و کرداری جوان بێ، بە گوێرەی شەریعەت هەڵسوکەوت بکات..

بەڵێ ئیمانداران: پیری ئەو دەردەیە کە دەرمانی نییە. خوای گەورە هەر شکســت و نەخۆشــییەکی دانابێ، دەرمانێکیشی بۆ کردوە بە شیفا، تەنها یەك شت دەرمانی نییە. (إلاّ داءً واحيداً). لە پێغەمبەری خوایان پرســی. ئــەوە چییە کە دەرمانی نییە. فەرمووی: (الهَرَمُ) فەرمــووی: ئەوە دەردی پیریە کە دەرمانی نییــە و هەرگیــز مرۆڤ جارێکــی تر ناگەڕێتــەوە بۆ گەنجی و جوانــی و هێــز و گوڕ و تاقــەت و تواناکــەی جارانی. (ئەم **فەرمودەیە:** حديث صحيح، رواه، أبوداود: (٣٨٥٥) والترمذي: (٢٠٣٨) و صححه الالباني)

ئیماندارانی بەڕێز: هۆکارەکانی پیربوون زۆرن وەکو:

١. بە سەربردنی تەمەنێکی زۆر و چوونە ناو ساڵەوە.

٢. نەخۆشــی کوشــندەی بە ئازار، کە بە ڕاستی هەندێ نەخۆشی -خوا بمانپارێزێ- هەر بە گەنجی مرۆڤ پیر و کەنەفت دەکات.

٣. خەم و خەفەت و مەراق و خەمۆکی و دڵتەنگی، زوو پیری لە سەر مرۆڤ دەردەخەن.

٤. هەژاری و موحتاجی دەســتی ئەم و ئەو، کە بە ڕاستی هەژاری پڕووکێنەر مرۆڤ پیر دەکات.

٥. مــاڵ و مناڵی خراپ. ئەولادی لاســار، ژنی خراپ و دەمەوەر و بێڕێــز، بۆ ژنیش پیــاوی خراپ و دەم پیس و دڵپیس و دڵکوێر. کە ژیانــی لــێ دەکات بە ژان هەر بە گەنجی دەی کات بە پیر و چرچ و لۆچ لە نێوچەوان و دەموچاویا دەردەکەوێ..

٦. خەمـــی دین و ئیســـلامەتی و ترســـی قەبر و قیامـــەت. کە بە ڕاستی ئەم ترسە بوو پێغەمبەری خوای پیر کرد (ﷺ) (عَنْ إبْنِ عَبّاس، قالَ أَبوبكر: يارَسُـــولَ الله قَدْ شِـــبْتَ، قالَ: شَيَّبَتْني هُود، وَالواقِعَة وَالمُرْسَلات، وَعَمَّ يَتَساءَلُونَ، وَإِذا الشَّمْسُ كُوِّرَت). رَواهُ الترمذي (٣٢٩٧) وَالطَّبَراني في الكبير (٧٩٠)

واتە: ئیمامی ئەبوبەکر ڕۆژێکیان لە پێغەمبەری خوای پرسی: بە قوربانـــت بم ئەی پێغەمبەری خوا ئەوە بۆ وا پیریت لێ دەرکەوت و مووی سپی کەو تەسەر و ڕیشی موبارەکتەوە، توخوا چی وا پیری کردی؟! فەرمووی: (بە خوا ســـورەتی هود و واقیعە و مورســـەلات و تەکویـــر پیریان کـــردم). کە ئەو ســـورەتانەم دەخوێندەوە کە باس لـــە هاتنی قیامـــەت و تێکچوونی ئەم دنیایە و وەســـتانی مەیدانی مەحشـــەر و ئەو هەموو هەڵوێستە ســـامناکانەم دەخوێندەوە باسی ئەو ترس و هەڵەعەی کە منالّی تازە لە دایکبوو، لە عەیبە تاوەکو پیـــری لێ دێ، تا ئەو دیمەنە ســـامناکانەی قیامەت ئەی ئەبوبەکر پیریان کردم!..

ئیماندارانی بەڕێز: خوای گەورە ڕێزی لە کەسی پیر و بە تەمەن گرتـــوە، دە تۆی ئیمانداریـــش ڕێزی بگرە: بـــە جێبەجێکردنی ئەم چەنـــد خاڵە با حەقـــی پیر و بە تەمەنەکان بدەین، ســـەرنج بدەن خـــوای گـــەورە بە عەزەمـــەت و گەورەیی خۆی چۆن کارئاســـانی بۆ کەسانی بە تەمەن کردووە:

١. خوای گەورە ڕۆژی ڕەمەزانی لەســـەر پیر و کەفتەکار لابردوە. ﴿ وَعَلَى ٱلَّذِينَ يُطِيقُونَهُۥ فِدْيَةٌ طَعَامُ مِسْكِينٍ ﴾ البقرە: ١٨٤

لە تەفسـیری إبن کثیردا، لە تە فسـیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: (إبْـنُ عَبّاس فەرموویەتی: نزلت هذهِ الآيَة في الشَّـيْخ الكَبير الَّذي لايُطيـقُ الصَّـوْمَ، ثُمَّ ضَعُفَ، فَرَخَّـصَ لَهُ أَنْ يطعم مَـكانَ كُلَّ يَوْم مِسْـكيناً). بەڵـێ ئەو کەسـانەی بە هۆی تەمـەن و پیری زۆرەوە توانـای ڕۆژووگرتنیان نەما، خوای گـەورە ڕێگای داون کە بە ڕۆژوو نەبن و لە جێگای هەر ڕۆژوویەك خۆراکی هەژارێك دەدات. ئەمەش لوتفی خوای گەورەیە لەگەڵ پیر و پەككەوتەكان.

٢. مرۆڤی بە تەمەن، کە توانای ئەوەی نەمابوو بچێتە حەج و لەوێ بـۆ خۆی بە جوانی واجبەکانی حەج جێبەجێ بکات. بەڵکو دەیزانی دەبێتە بارگرانی لە سـەر کەسـانی تر و توانا و بیروهۆشـی ئەوەی نەمـاوە کـە بچێ بۆ حەج. ئەمە ئەم پیر و بەسـاڵاچووە هەرچەندە خۆشی لە ژیاندایە. بەڵام دروستە کەسێك کە پێشتر بۆ خۆی حەجی کـردووە، لە جیاتی ئەم بچێ بۆ حەج. بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە: (لـە حەجی ماڵ ئاواییدا، ئافرەتێك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا و وتـی، ئەی پێغەمبەری خـوا: (إنَّ فَرِيضَةَ اللهِ عَلى عِبادِه فِي الحَجِّ أَدْرَكَتْ أَبِي شَـيْخاً كَبيراً، لايَسْتَطيعُ أَنْ يستوى الرَّاحِلَة، فَهَلْ يقضي عَنْهُ أَنْ أَحجَّ عَنْهُ؟! قالَ: نَعَمْ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ بخاري (١٨٥٤) وَمُسْلِمْ (١٣٣٤)

واتە: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو فەرزەی کە خوای گەورە لە سـەر بەندەکانی خۆی واجبی کردووە کـە بەجێی بێنن کە حەجی ماڵەکەیەتـی. باوکم ئەو مەرجانەی حەجکردنی تێدا هاتبوونە جێ. بـەڵام بە هۆی پیری و بە سـاڵاچوییەوە توانـای نەبوو حەجەکەی

بكات. چونكە لە سەر پشتی ولآخ خۆی نەدەگرت، تابێ بۆ حەج. ئایا من كە بۆ خۆم پێشتر حەجم كردووە، بۆم هەیە حەجی بۆ بكەم؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بەڵێ درووستە تۆ لە جیاتی باوكت حەج بكەی هەرچەندە هێشـتا خۆشـی لە ژیاندایە. لەبەر ئەوەی كە پیر بووە و بێتوانا بووە خوای گەورە ئەوەی پێ بەخشیوە.

٣. لەبـەر خاتـری كەسـانی پیـر و بەسـاڵآچوو كە دێنـە نوێژی جەماعەتەوە، دەبێ ئیمام نوێژی جەماعەتەكەی زۆر درێژ نەكاتەوە، كە بگاتە رادەیەك ئەوان بێتاقەت ببن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (إذا صَلَّـى أَحَدُكُمْ للنّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإنَّ مِنْهُمُ الضَّعيفُ، وَالسَّـقيمُ، وَالكَبيرُ، وَإذا صَلَّى أَحَدُكُمْ لِنَفسِـهِ فَلْيُطَوِّلْ ماشـاءَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، بُخاري(٧٠١) وَمُسْـلِم(٤٦٧)

واتە: ئەگەر یەكێ لە ئێوە پێشـنوێژی بۆ خەڵكی كرد و بوو بـە ئیمامی نوێژەكەیان، با نوێژەكەی كورت و پوخت بێ و زۆر درێژی نەكاتەوە. چونكە بە راسـتی لـە ناو ئەو نوێژخوێنانەی كە لە ریزی نوێژە جەماعەتەكەدان. كەسانێكی تێدان كە لاواز و بێتوانان. یان نەخۆش و لەش بە ئازارن. یان پیر و بە ساڵآچون، لەبـەر خاتری ئەوانە بـا ئەو ئیمامە نوێژەكەی درێژە پێ نەدا، بـە رادەیەك كە ببێتە هۆی ئازارخواردنی ئەو چین و توێژانەی كە لە كۆمەڵگەدا هەن و بێتوانا بوون و خۆ راناگرن بۆ دانیشتنی زۆر. یان بە پێوە وەسـتانی زۆر. بەڵام ئەگەر كەسـێك بۆ خۆی بـە تەنها نوێژی دەكرد، ئەوە چەندی پێ خۆشـە با نوێژەكەی درێژ بكاتەوە..

٤. هــەر لەبەر حورمەتی گەورەیی و پیر و بە تەمەنە، کە ئەگەر دوو کــەس وەکــو یەك قورئانیــان دەزانی و شــەرعزان بوون، با بە تەمەنەکــە ئیمامەت بکات بۆ هاوەڵەکەی. هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: ئەگەر وەختی نوێژی جەماعەت هاتوو، دوو کەس بە یەکەوە بوون. ئەوا با نوێژەکەیان بە جەماعەت بکەن و (وَلْيؤمَّكما أَكْبَرُكُما) رَواهُ البُخاري (٦٣٠)

واتە: با لەو دوو کەســە، یان کۆمەڵە کەسە کامیان بە تەمەنترە با ئەوەیان ئیمامەتەکە بکات.

٥. کەسی پیر و بە تەمەن، وەکو ڕێزێك بۆ تەمەنی زۆر و بێهێزی و لاوازبوونــی، ڕێگــەی پێ دراوە کە ئەگــەر نەیتوانی بە پێوە نوێژ بکات، با بە دانیشــتنانەوە بی کات. ئەگەر نەیتوانی با لە ســەر لای ڕاســت ڕاکشــێ و نوێژەکەی بکات. ئەگەر نەیتوانی با بە ڕاکشــانەوە نوێژەکەی بکات.

٦. لەبــەر حورمەتی کەســی بــە تەمەن و ڕیشســپی، نابێ ئەگەر گەنجێك لەگەڵ بە تەمەنەکەدا دەڕۆیشــت لە ڕێگادا پێشی بکەوێت.. پیاوچاکان و خواناسانی پێشین زۆر گرنگیان بەم بابەتە داوە. یەکێ لــەو گەورە زانایانە (لیــث)ە. ئەم زاتە دەفەرمــوێ: لەگەڵ (تەلحەی کــوڕی مصرف)دا بە ڕێگادا دەڕۆیشــتین، لیث بــە تەلحەی گوت: بە خــوا ئەگەر بم زانیایە بە یەك شــەو لە مــن گەورەتری بە تەمەن. ئەوا هەرگیز لە ڕۆشــتندا پێشــت نەدەکەوتــم. هەروەها دەگێڕنەوە کە (ئیبراهیمی کوڕی ســەعد) کــە پیاوچاك و زانایەکی گەورە بووە.

ڕۆژێکیـــان چـــاوی لێ بـــوو وا کۆمەڵە گەنجێکن و لـــە ڕێگەدا پێش کەســـانی بە تەمەن دەکەون و هیچ ڕێز و حورمەتێکی تێدا نامێنێ. لەبـــەر ئەوە ئەم زانایە ئەم هەڵوێســـتەی ئـــەو گەنجانەی بینی، بۆ تەمێکردنیـــان بڕیاری دا، ماوەی یەك ســـاڵ لەگەڵ ئـــەو گەنجانەدا وەکـــو جاران قســـە و باس نـــەکا و دەرس و وانەیان پـــێ نەڵێتەوە. زانای گەورە (إبْنُ عَقیل) دەفەرموێ: ئەگەر کەســـێك لەگەڵ کەسێکی لە خۆی گەورەتر لە تەمەندا قســـەی دەکـــرد، یان لەگەڵی بە ڕێگادا دەڕۆیشـــت. ئەوا با بچێتە لای ڕاســـتی کەسە بە تەمەنەکە و کەمێك لە دوایەوە بڕوات، با وا دابنێ  کە ئەم کەسە بە تەمەنە وەکو ئیمام بۆ ئەم دوانە وایە. خۆ ئەگەر کەسانێك. کۆمەڵە کەسانێك. لە سەفەر و گەشت و گوزارێکدا بوون، ئەوا لە کاتی بە ڕێگا ڕۆیشتندا با کەسە بە تەمەنەکە بخەنە پێشەوەی خۆیان و بۆ خۆیان لە دوایەوە بڕۆن.

کەواتە: بۆ موسڵمان هەموو جێگایەك وەکو مزگەوت وایە و دەبێ حورمەتی هەموو کەســـێك دابنرێ. کەس بە چاوی ســـووك ســـەیری کەس نەکات. (كونُوا عِبادَ اللهِ إخْواناً).

٧. لەئیســـلامدا ئەوەندە ڕێزی پیر و بە ســـاڵاچوو هەیە. تەنانەت لە نووســـینەوەی فەرموودەدا و (ترتیب المســـانید)دا بە پێویســـتیان زانیوە، ئەوەی بە تەمەنە لە پێشـــەوە ناوی بنووســـرێ.. بەڵێ دەبێ لە نووسینیشـــدا گەورە و بە تەمەن پێش گەنج و تازە پێگەیشـــتوو بنووسرێ. ئەوەتا (بقی ی کوڕی موخەلەد) کە لە ساڵی (٢٧٦)ی کۆچیدا مردووە. دەفەرموێ: کاتێ موسنەدەکەم لە زانستی فەرموودەدا نووسی

عوبەیدوڵـــڵای کوڕی یەحیا و براکەی کە ئیســحاق بوو دەهاتنە لام و ئامۆژگاریان دەکردم و دەیان فەرموو: بیســتومانە کە موســنەدت نووســیوە و نــاوی (أبو مصعــب الزهری و یەحیای کــوڕی بەکیر)ت پێش خستوە و لەپێش ناوی باوکمانەوە ناوی ئەوت نووسیوە.. ئەمە هۆکارەکەی ئەوەیە کە کاتێ (أبا موصعەب)م پێش خستوە، ئەوە هەر لەبەر خاتری فەرموودەکـەی پێغەمبەرە (ﷺ). کە فەرمووی: (قَدِّمُوا قُرَيْشَــاً وَلاتُقَدِّمُوها). هەروەها بۆ وەڵامی ئەو ڕەخنەیەشــت کە دەڵێی (إبن بکیر) پێش دەخەن، ئەوەشمان هەر لەبەر فەرمودەی پێغەمبەرە (ﷺ) کــە فەرمووی: (كَــبِّرْ، كَبِّرْ). هەروەها لەبــەر ئەوەش کە (ئیبن بەکیــر) گوێی لە (المُوَطَّأ)ی ئیمامــی مالیك وەرگرتوە، بە ماوەی (١٧) جــار، بەڵام باوکی ئێوە تەنها یەك جار کتێبی (المُوَطَّأ)ی لە خزمەت مامۆستا مالیکدا گوێ لێ بووە.

کەواتە: ڕێز و پێشخستن لەبەر دوو شت جوان و سوننەتە:

١. تەمەن و بە ساڵاچوویی.

٢. عیلــم و زانیــاری. کێ کەمتر شــارەزا دەبێ لەبەر ئەو کەســە هەستێ کە لە خۆی زاناترە و شتێك زیاتر دەزانێ.

٨. لەبەر ڕێزی کەسی بە تەمەن و پیرە کە دەبێ لە کاتی بە یەکگەیشتندا. گەنج سەلام لە پیر و بە ساڵاچوو بکات. هەروەکو لە فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتوە کە: (يُسَلِّمُ الصَغيرُ عَلى الكَبير) رَواهُ البُخاري (٦٢٣١)

٩. لە قســەکردندا دەبێ پیر و بە ســاڵاچوو مەجــال و دەرفەتی قســەکردنی پــێ بــدرێ و گەنــج و لاو گــوێ بگرێ. ســەرنجی ئەم

**فەرموودەیە بەدەن:** (جاءَ رَجُلانِ إِلى النَبيَّ (ﷺ)، شَيْخٌ وَشابٌ، فَتَكَلَّمَ الشّابُ قَبْلَ أَنْ يَتَكَلَّمَ الشَّيْخُ، فَقالَ (ﷺ) كَبِّرْ، كَبِّرْ).

**واتە: جارێکیان دوو کـەس هاتنە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) پیر و بە ساڵاچوویەك لەگەڵ گەنجێك. گەنجەکە یەکسەر دەستی بە قسەکردن کرد و مەجالی بە تەمەنەکەی نەدا هیچ بڵێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: با لە خۆت گەورەتر قسەبکا. گەورە و گچکەیی بزانە، گەورە و بچووکی بزانە.**

**بەڵێ ئیمانداران: پێغەمبەری خوا (ﷺ) کەسی تەریق نەکردۆتەوە، بـەڵام لێـرەدا دەبێ ئەو گەنـج و لاوە فێری ئـەدەب بکرێ. چونکە هـەرکات وای لـێ هات ڕێزی ڕیشسـپی نەما ئـەو کۆمەڵگایە بەرەو هەڵوەشان دەچێت..**

**١٠. لەمە جلیس و کۆڕ و کۆبوونەوەدا، با پیر و بە سـاڵاچوان لە لای سەرەوەی مەجلیس یان لە ڕیزی پێشەوەی کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا دابنیشن و حورمەت و ڕێزیان دیار بێ.**

**١١. لە کاتی سەرەگرتندا، با گەنجان پیر و بە تەمەنەکان ڕانەگرن بیان خەنە پێشەوە.**

**١٢. لە کاتی سـواربوونی پاصدا. ئەگەر بە تەمەنێك سـەرکەوت و جێگای نەمابوو، ناچار بوو بە پێوە بوەستێ، زۆر جێگای خۆیەتی کە گەنجێك هەڵسێ و بە پێوە بوەستێ و جێگاکەی خۆی بدات بە کەسە بە تەمەنەکە، جا ئەو بەساڵاچوە ژن بێ یان پیاو جیاوازی نییە.**

**١٣. هەرکاتێ گەنج و لاوێك ویسـتی هەڵەی بە ساڵاچوویەك ڕاست**

بکاتەوە، نابێ ڕاســتەوخۆ. ڕەق و ڕاست بڵێ: ئەوەت هەڵەیە و چۆن ئەو هەموو تەمەنەت هەیە و هێشــتا فێر نەبووی ئاوا بکەی و ئاوا بڵێی. نەخێر، پێویستە لە ڕێگای کینایە و ناڕاستەوخۆوە، بۆی بکاتە ناواخنی کۆمەڵێ قسە و بابەت و ئاگاداری بکاتەوە، هەروەکو کاتێ کە دووکچەزا بەڕێزەکەی پێغەمبەری ئازیز، دوو ڕەیحانە بۆنخۆشەکەی پێغەمبەر (ﷺ) ئیمامی حەســەن و حوسەین. بینیان وا پیاوێکی بە تەمەن کە هەموو ســەر و ڕیشی ســپی بوە دەستنوێژ دەشوات. بەڵام چۆن دەســتنوێژ شــتنێك هەر بە حاڵ دەموچــاوی تەڕکرد و قۆڵی وا نەشــت ئانیشــکی ئاوی بەرکــەوێ. کە قاچی شــۆرد قولەپێی بە وشــکی مایەوە. کە لە ڕووی شەرعەوە ئەو دەستنوێژە درووست نییە و بەتاڵــە لەم کاتەدا حەزرەتی حەســەن و حوســەین. کە دوو تازە لاوی پێگەیشــتوو بوون، ســەیرێکی یەکتریان کــردو بە چرپەوە بە یەکتریان گوت: باشە ئەگەر قسە نەکەین و ئەم پیاوە بە تەمەنە لەم دەســتنوێژگرتنە هەڵەی ئاگادار نەکەینــەوە، نابێ و ئێمە گونەهبار دەبین. ئەی ئەگەر ئاگاداری بکەینەوە. ئەترســین گوێمان لێ نەگرێ و بڵێ: من بە تەمەنی ئێوە موسڵمانم تازە ئێوە من فێری دەستنوێژ دەکــەن؟! لەبەر ئــەوە بۆچوونی هەردووکیان هاتنەســەر ئەوەی کە بە شــێوازێکی ناڕاستەوخۆ لە هەڵەکەی ئاگاداری بکەنەوە. ئەوە بوو چوونە لای مامەپیــرە و بە ئەدەبەوە پێیان وت: ئەگەر یارمەتیمان بــدەی بێی ببی بە حەکەم و دادوەر لە نێوانماندا، چونکە ئێمە دوو براین و ناکۆکین لە ســەر ئەوەی کە ئایا کاممان دەســتنوێژەکەمان

جوانتر و شــەرعیانەتر دەشــۆین. جەنابت پیاوێکــی بە تەمەن بە ئەزموونی لە دینداری و ئیســلامەتیدا. وەرە سەیرمان بکە و حوکم بکە لە نێوانماندا، بەڵێ کابرای بە تەمەن بە دیاریانەوە وەستا هەتا دەستنوێژیان هەڵگرت. کە تەواو بوون. مامەی بە تەمەن هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشــا و وتی: بە خوا کوڕەکانم، دەستنوێژی هەردووکتان تەواوە و ئەوەی کە نازانێ دەستنوێژ بگرێ، ئەوە مامەپیرەی خۆتانە و وامنیش فێربووم!!..

١٤. دەبــێ هەموو لایەك ئەو ڕاســتییە بزانن کــە: چاودێریکردنی کەسانی بە تەمەن و بە ساڵاچوو بۆ خۆی جۆرێك لە فەن و هونەر و زانســت و لێزانین و پسپۆڕی پێویستە. بە ڕاستی هیچی کەمتر نییە لە چاودێری و بەخێوکردنی منالی ساوا، چۆن هەموو کەس منالی پێ ژیر نابێ و ناتوانێ هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکا و دڵی ڕابگرێ و ئاگاداری لێ بکات. کەسی بە تەمەنیش بە هەموو کەس دڵی ڕاناگیرێ.. مامۆستا هەژار موکریانی، لە وەرگێڕانی شعرێکی د.عەلی شەریعەتیدا دەڵێ:

پلە پلە بەرەو ژوور چووی .... پێت نایە ساتەوە پیر بووی.
چویتەوە دەقی منالی .... نەبەگە و شلی و بەتالی.
هەتا ساوا و لەبەرچاو بووی .... گەمەجاڕی دای و باو بووی.
ئێستا لە پاش دەیان ساڵان .... بویتە گەپجاڕی منالان.
خوێن شیرنۆکە بووی بە منالی .... ئێستا منالی خوێن تالی..

١٥. دەبێ کاتێ پیر و بەساڵاچوویەك دێتە مەجلیسێکەوە ئەوانەی لە خوار تەمەنی ئەوەوەن لە بەری هەستن. کە ئیشی هەبوو ئەوانەی

گەنجن بچنە خزمەتی. نەك بڵێ خۆئەو ئیشی بە منە با بێ بۆ لام. تەماشای ڕابەر و پێشەوامان حەزرەتی محمدی موصطەفا بکەن (ﷺ) لەو بارەیەوە کە: لە ڕۆژی فەتحی مەککەدا. ئیمامی ئەبوبەکر (ئەبی قوحافــە)ی باوکی برد بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)، کە ئەوەندە پیر ببوو موەکانی وەکو قارچکی سپی لێ هاتبوو سەر و ڕیشی یەك مووی ڕەشی تێدا نەمابوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە بەری هەڵسا و زۆر بە گەرمی بە خێرهاتنی کرد و پاشــان ڕووی کردە ئیمامی ئەبوبەکر و فەرمووی: (لَوْ أَقْرَرْتَ الشَّيْخَ فِي بَيْتِهِ لأَتَيْنَاهُ). ئەگەر ئەم پیاوە بە ڕێزەت عەزیەت نەدایە و لە ماڵەوە دات بنیشاندایە، ئێمە دەهاتین بۆ لای و سەردانمان دەکرد!! ئەم فەرموودەیە: (صَحيحٌ، رَواهُ أَحمد (١٢٢٢٤) وَصَحَّحَهُ الأَلْباني في السِلْسِلَة الصَّحيحَة (٤٩٦)

١٦. لە کاتی جەنگ و جیهاددا دەبێ پیر و بە ســاڵاچوو نەکوژرێ، هەرچەنــدە کافریــش بێ، مــادام چەکی بە دەســتەوە نییــە. نابێ بکوژرێ لەبەر ئەوەی کافرە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) کاتێ ســوپایەکی لە موسڵمانان بە ڕێ دەکرد، وەصیەتی بۆ دەکردن بە تەقوای خوا و پاشــان دەیفەرموو: (اغْزُوا باسْمِ اللهِ، وَفِي سَبيلِ اللهِ، قاتِلُوا مِنْ كَفَرَ اللهَ، لاتَغْلُوا وَلاتَغْدِرُوا، وَلاتُمَثِلُوا، وَلاتَقْتُلُوا وَلِيداً، ولاشَيْخاً كَبيراً). رَواهُ مُسْلِمٌ (١٧٣١)

واتــە: بە نــاوی خوا و بەرەکەتــی ناوی خواوە بــەڕێ کەون. وە نیەت و مەبەســتتان تەنهــا و تەنها ڕەزامەندی خــودا بێ، نەك بۆ حەزی نەفس و خۆدەرخستن و پلەوپایە وەرگرتن، شەڕ بکەن لەگەڵ ئەوانــەی دژایەتی ئیســلام دەکەن و دەبنە لەمپەر و بەربەســت لە

بەردەم بڵاوبوونەوەیدا.. تاڵان و برۆ نەکەن و فەرهود نەکەن، ستەم لە کەس مەکەن، لاشــەی کوژراوی دوژمن ئەتك نەکەن و دەســت بۆ لاشــەی مردووی کافر مەبەن و ئیهانەی پــێ مەکەن.. دەی فەرموو: ئامــان نەکەن منالی ســاوای بێتاوان بکــوژن. ئامان نەکەن پیر و بە ســاڵاچوو بکــوژن. دەبێ زۆر ئاگاداری ئەوە بــن لە جیاتی رەحمەت، نەبنە مایەی زەحمەت..

داواکاریــن لەخوای گــەورە کە منالیمان ســەلامەتی و گەنجیمان دامەزراوی و پاکی و پیریمان عاقیبەت خێری بێت. اللّهُمَّ آمین..

## سەرچاوەکان:


١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.

٢. آياتُ الله في الإنْسان. د.محمد راتب النابُلُسي، ص٥٩.

٣. في ظِلالِ القُرْآن. سَيِّد قُطب، ج٥ ص٢٧٧٦.

٤. لــە پەنای ســفر و خاڵی بــێ برانــەوە. د.عەلی شــەریعەتی، و: هەژار موکریانی ل٢٣.

٥. تەفسیری رەوان. مەلا محمودی گەلاڵەیی، ب٧ جزمی١٤، ل١٦٦.

٦. الحُقُوقِ الإسْلامِيَّة. محمود المصري ج٢ ص٧٥٨، ص٧٤٨.

٧. فَتاوى وَقَضايا فقهِيَّة مُعاصرة. د.عبداللطيف صالح الفرفور، ص١٥٩.

**وتاری یەکەم بۆ مانگی ذي القعدة**

# ماف و ئەرکی بە ساڵاچووان
## بەشی دووەم

الحَمْدُلله رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: لە وتاری ڕابردوودا، هەندێك لە بارەی بەساڵاچوان و ڕێز و قەدر و حورمەتی ئەو کەسانەمان کرد، کە لە دینداری و خواناسی و خزمەتی دین و ژینی خۆیان و خەڵکیدا، تەمەنێکی زۆریان بەسەر بردوە و چوونەتە تەمەنی پیرییەوە. بە پشتیوانی خودای تاك و تەنها لەم وتارەشدا هەندێکی تر لەو بابەتە دەدوێین و دەڵێین وَباللهِ التَّوْفيق:**

**چەند دابەشکردنێك بۆ قۆناغ بەندکردنی تەمەنی مرۆڤ کراوە، لەو دابەشکردنانەدا بە گشتی لە دیاریکردنی ماوە و جیاکردنەوەی قۆناغەکاندا، جیاوازی هەیە. یەکێك لەو دابەشکردنانە لە کتێبی (العَوامِلِ النَّفْسِيَّة في جُنُوح الأَحْداث)ی (د. وهبیە شوکت)دا هاتوە بەم شێوەیە:**

**١. قۆناغی پێش لە دایکبوون، لە پیتاندنەوە بۆ لەدایکبوون.**

**٢. قۆناغی شیرە خۆری – (لە دایکبوون تا دوو ساڵی).**

**٣. قۆناغی ساوایی لە (٢ ساڵ بۆ ٦ ساڵ).**

**٤. قۆناغی منالی لە (٦ – ١٢) ساڵی.**

٥. هەرزەکاری لە (١٢ — ١٨)ساڵی.

٦. قۆناغی لاوی لە (١٨ — ٢٥) ساڵی.

٧. قۆناغی کامڵبوون لە (٢٥ — ٤٥) ساڵی.

٨. قۆناغی بەرهەمدانان لە (٤٥ — ٦٠) ساڵی.

٩. قۆناغی پیری لە (٦٠ وەفاتکردن).

هەروەها زانای بەناوبانگ، (د.وَهْبَة الزُّحَيلى) لە (الفِقهُ الإسْلامي وَأدِلّتُهُ ج٨ ص٧٩ )دا دەفەرموێ:

قۆناغەکانی تەمەن بەم شێوەیە دابەش دەبن:

١. الطِفْل، مەلۆتکە، لە شیرە خۆرییەوە هەتا ئەو کاتەی کە پاکوخاوێنی خۆی دەپارێزێ.

٢. الصَّبي وَالغُلام وَاليافِع، تا کاتی باڵغبوون.

٣. الشاب وَالفَتَى، لە باڵغبوونەوە تا تەمەنی سی ساڵی.

٤. الكَهْل، لە تەمەنی سی ساڵی تا تەمەنی پەنجا ساڵی.

٥. الشَّيْخ، لە تەمەنی پەنجا ساڵی تا تەمەنی حەفتا ساڵی.

٦. الهرم، لەحەفتا ساڵی تا کۆتایی تەمەن..

هەروەها ڕێکخراوی یارمەتیدانی بە ساڵاچوانی جیهانی: (H.A.I) بڕوای وایە لە سەروو (٦٠) ساڵەوە ئیدی ئەو کەسە دەبێ پێی بوترێ بە ساڵاچوو. بۆ ڕەگەزی مێینەش، لە تەمەنی (٥٥) ساڵییەوە بە ساڵاچووە.

بۆچوونی باویش ئەوەیە کە لە (٦٠) ساڵ بەرەو ژوورتر ئیتر قۆناغی شۆڕبوونەوە (پیربوون) یان بە ساڵاچوون دەست پێدەکات..

بەهەرحاڵ: بە وانە دەوترێ بە ساڵاچوو کە:

١. لە ڕووی تەمەنەوە، تەمەنی لە (٦٠) ساڵ تێپەڕی بێت.

٢. لە ڕووی تواناوە، توانای هەموو جۆرە کارێکی نەمابێت.

٣. دیاریدەکانی جەستەیی لە ڕەنگ و ڕوخساریدا بەدەر بکەوێت.

بۆ نمونە: کزبوونی چاو، پەیدابوونی ئاوی سپی، کەوتنی ددان بە هۆی پیریەوە، چەمانەوە، بێتاقەتبوون، هەناسەسواری و زووو ماندوبوون و.... خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِن كُنتُمۡ فِي رَيۡبٖ مِّنَ ٱلۡبَعۡثِ فَإِنَّا خَلَقۡنَٰكُم مِّن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ مِنۡ عَلَقَةٖ ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٖ مُّخَلَّقَةٖ وَغَيۡرِ مُخَلَّقَةٖ لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡۚ وَنُقِرُّ فِي ٱلۡأَرۡحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى ثُمَّ نُخۡرِجُكُمۡ طِفۡلٗا ثُمَّ لِتَبۡلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمۡۖ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرۡذَلِ ٱلۡعُمُرِ لِكَيۡلَا يَعۡلَمَ مِنۢ بَعۡدِ عِلۡمٖ شَيۡـٔٗاۚ وَتَرَى ٱلۡأَرۡضَ هَامِدَةٗ فَإِذَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡهَا ٱلۡمَآءَ ٱهۡتَزَّتۡ وَرَبَتۡ وَأَنۢبَتَتۡ مِن كُلِّ زَوۡجِۢ بَهِيجٖ ٥ ﴾ الحج: ٥

واتە: ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئێوە لە زیندووبوونەوە دوودڵ و بە گومانن، وەرن تەماشایەکی سەرەتا و بنەڕەتی دروستبوونی خۆتان بکەن و چاکیش بزانن کە ئێمە ئەسڵتانمان (ئادەم) لە گڵ دروست کردوە. کەوابوو مرۆڤ ڕۆڵەی زەوییە و لە زەوی لە دایك بووە. لە سەر پشتی ئەو پێگەیشتوە و ژیاوە. بژێوی لە سەر زەوی دەست کەوتوە، هەموو ئەو توخمانەی لە پێکهاتەی جەستەیی مرۆڤدا هەن، لەگەڵ توخمەکانی ناو خاکدا چوونیەکن، مەگەر تەنیا (ڕۆح) جیایان بکاتەوە. ﴿ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ﴾ لە پاشان نەوەکانی لە تنۆکە ئاوێك کە لە پشتی باوك هەڵدەقوڵێ، بەڵێ نوتفەیەکە و بە سەدان ملیۆن حەیوانی

مەنەوی هەڵگرتوە. هەر نوتفەیەك (٣٠٠) ملیۆن سپێرمی تێدایە، هەمووی سەر و مل و کلکی هەیە و مەلە دەکات و دەجولێتەوە. تەنها یەکیان دەگاتە هێلکۆکەی ئافرەتەکە و لە منداڵدانەدا جێگیر دەبێ و باقیەکەی دەفەوتێ. کە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) لە فەرموودەیەکیدا، دەفەرموێ: (مامِنْ كُلِّ الماءِ يَكُونُ الوَلَدُ). رَواهُ مُسْلِم (١٤٣٨) وَأَحمد (١١٤٥٦)

واتە: لەو ئاوەی لە پیاو دێتە دەرەوە، لە هەمووی منداڵ درووست نابێ، بەڵکو لە بەشێکی یەکجار زۆر کەمی ئەو منداڵە درووست دەبێ!، سبحان الله، لە ناو ئەو تەنها خانەدا کە ئەگەر (١٤٠) جار هێندەی خۆی گەورە بکرێ، ئەمجا دەبینرێ. هەموو ئەو مرۆڤە تەواوەی تێدایە، ڕەنگی، جوانی و ناشرینی، قەد و باڵای، قەڵەوی و لاوازی و ئازایەتی و جوامێری، بێ ورەیی و ترسنۆکی، زیرەکی و بلیمەتی، تەمەڵی و کەودەنی، تەنانەت درێژی و کورتی برژانگی چاوی هەمووی تێدا تۆمار کراوە، ئەمە سەرباری ئەوەی کە هیچ کاتێك دوو ئادەمیزاد لە یەك ناچن لە هەموو شتێکدا!!. ﴿ثُمَّ مِن عَلَقَةٍ﴾ ئەمجا لە خوێنپارەیەك وەك زەروو ﴿ثُمَّ مِن مُّضۡغَةٍ﴾ پاشان لە گۆشتپارەیەك ﴿مُّخَلَّقَةٍ﴾ منداڵێکی کامڵی تەواوی سەرو سیما پێدراو ﴿لِّنُبَيِّنَ لَكُمۡ﴾ تا دەسەڵاتی خۆمانتان بۆ دەرخەین و تێ بگەن کە دەسەڵاتێك کە خوای گەورەیە، بتوانێ لە سەرەتاوە ئێوە بەو شێوەیە درووست بکات بە ئاسانی دەتوانێ جارێکی تر سەرلەنوێ درووستتان بکاتەوە، بەڵکو زۆر بە ئاسانتر. ئینجا ئەو کۆرپەلانەی لەبار ناچن،

دەیان هێڵینەوە لە منداڵداندا تا ماوەیەکی دیاریکراو و مەزەندەکراو لای خودا. پاشان بە قودرەتی خۆمان لە سکی دایکتان دەرتان دێنین و دەتان خەینە سەر زەوی، ساوا و بێهێز و بێعەقڵ و فام و هەستی تەواو. ئەمجا وردە وردە، ئەو کۆرپە ساوایە گەشە دەکا و پێ دەگا و فام دەکاتەوە و فێری شت دەبێ، ﴿ ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْ ﴾ پاشان هێز و توانای عەقڵی و جەستەییتان گەشە دەکا و پێ دەگا تا دەگەنە ئەندازەی کەماڵ و پێگەیشتن لە هەرەتی لاویەتیدا..

﴿ وَمِنكُم مَّن يُتَوَفَّىٰ ﴾، هەتانە پێش پلەی لاویەتی، هەر بە منداڵی، یان لە هەرەتی لاویەتیدا دەمرێ. ﴿ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ ﴾ هی واشتان هەیە دەمێنێ و تەمەنی درێژ دەبێ تا دەگاتە کەلالەیی و سەختترین پلەی ژیانی و بە تەواوی کەنەفت و پیر دەبێ، وەکو منداڵی ساوای لێ دێتەوە و لە بێهێزیدا، لە دڵناسکی و هەڵچوون و توورەبوندا، لە تێگەیشتن و فێربووندا، لە نەخشە و پلان و بیروبۆچوندا. بە کەمترین شت ڕازی دەبێ، بە کەمترین شت تورە دەبێ و ئاشت دەبێتەوە. وەکو منداڵی ساوای لێ دێتەوە لە وەدا کە هەستی وەرگرتن و حافیزەی شت گل ناداتەوە، شت گل ناداتەوە، شتی بیرناکەوێتەوە، تاوای لێ دێ دوای زانین و وشیاری هیچی لە بیر نامێنێ و ئەو زانیارییانەی هەی بوو، هەمووی لە دەست چوو. دۆست و کەسوکاری خۆی ناناسێت، وە تەنانەت ڕێگای ماڵی خۆی لێ تێك دەچێ و ڕوو دەکاتە ماڵی خەڵکی تر و ڕێ ناباتەوە. بۆ خانە و لانەی خۆی. بەڵێ پیری کە گەیشتە ڕادەی ﴿ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ ﴾ ڕێك

وەکو قۆناغی منالّی لێ دێتەوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ ﴾ النحل: ٧٨

واتە: خوا ئێوەی لە سکی دایکتان دەرهێناوە بێ ئەوەی هیچ شتێك بزانن، ئینجا دەزگای بیستن و بینین و تێگەیشتنی بۆ دابین کردوون. بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

ئیمانداران: بە پێویستی دەزانم ڕوونکردنەوەیەك لەسەر ﴿ وَنُقِرُّ فِى ٱلْأَرْحَامِ مَا نَشَآءُ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى ﴾ بدەین و بڵێین: ماوەی حەمل، کە منالّ لە سکی دایکیدا دەمێنێتەوە ئەم ماوەیە، لایەنی کەمەکەی (شەش مانگە). لە کاتی جووتبونی ژن و مێردەوە، یان لەو کاتەوە کە ئەم ژن و مێردەی کە بوونەتە حەلاڵی یەکتر دەرفەتی جووتبونیان بۆ دەرەخسێ. لە لای جمهوری عولەمای شەرع. واتە: ئەگەر کوڕ و کچێك مارەبڕان لە یەکتر و لە ماوەی دەزگیرانیدا بە یەکەوە سەفەرێکیان کرد و دەرفەتی ئەوەیان بۆ ڕەخسابوو کە جوت ببن بە یەکەوە، هەرچەندە هێشتا بە ڕەسمی نەشی گواستبۆوە. ئا لەو بەروارەوە دوای شەش مانگ ئەو ئافرەتە منالّی بوو، ناتوانرێ بوختانی پێ بکرێ و منالّی شەرعی خۆیەتی، هەرچەندە ماوەی گواستنەوەکەش لە شەش مانگ کەمتر بێ! تەنانەت لای پێشەوا (ئەبی حەنیفە). لە وەختی مارەبڕینەکەوە حیساب دەکرێ و ئەگەر ئافرەتێك دوای شەش مانگ لە مارەکردنی لە کوڕێك منالّی بوو. هەچەندە پێنج مانگیش بوو گواسترابۆوە، ئەوە ئەو منالّە هەر بە هی ئەو مێردەی دادەنرێ

و کەس مافی ئەوەی نییە بوختانی پێوە بکات!!..

بەڵگەش لە سەر ئەوەی کە کەمترین ماوەی مانەوەی منداڵ لە سکی دایکیدا شەش مانگە، ئەم ئایەتەی قورئانە کە دەفەرموێ: ﴿ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴾ الاحقاف: ١٥

واتە: ماوەی سکپڕبوون و لە شیربڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندوە.

لە ئایەتێکی تریشدا ماوەی لە شیربڕینەوەی دیاری کردوە بە دوو ساڵ کە (٢٤) مانگە، وەکو دەفەرموێ: ﴿ وَفِصَٰلُهُۥ فِي عَامَيْنِ ﴾ لقمان: ١٤

کەواتە: ٣٠ — ٢٤ = ٦ مانگ کەمترین ماوەی دووگیانی ئافرەتە.

ئەمجا لای هەرە زۆری دووگیانی ئافرەت چەندە؟ چەند بۆچوونێکی جیاواز هەیە، وەکو:

١. دوو ساڵ، لای ئەبو حەنیفە، کە دەفەرموێ: (فَإِن وُلِدَ الحَمْلُ لِسَنَتَيْنِ مَنْ يَوْمِ مَوْتِ الزَّوْجِ أَوْ طَلاقِهِ. ثَبَتَ نَسَبَهُ مِنْ أَبِيهِ المُطَلَّقْ أَوْ المَيْتِ).

واتە: ئەگەر ئافرەتێك مێردەکەی مرد، یان تەڵاقی دا، لە وەختی مردنی مێردەکەوە، یان تەڵاقدانیەوە، دوای دوو ساڵ ئەو ئافرەتە منداڵی بوو. ئەوە لە ڕووی شەرعەوە بە منداڵی ئەو باوکە مردوە، یان ئەو باوکەی کە دایکی ئەم منداڵەی تەڵاق داوە، دەچەسپێ و ئافرەتەکە بوختانی بۆ ناکرێ.

٢. چوار ساڵ، واتە: لانی هەرە زۆری مانەوەی منداڵ لە سکی دایکیدا چوار ساڵە، کە ئەمەش ڕەئی شافیعیەکان و حەنبەلیەکانە. چونکە هەرشتێ بەڵگەیەکی ڕوونی لەسەر نەهاتبێ بە ئایەت یان حەدیس. ئەوە لەم کاتانەدا دەگەڕێینەوە بۆ لای بوونی ئەو شێوە منداڵبوونە لە

ناو کۆمەڵێ ئەوکاتەدا و ئەو شوێنەدا هەبووە. کە ڕووشی داوە منالْ چوار سالْ لە سکی دایکیدا مابێتەوە و پاشان بە سەلامەتی لە دایك بووە. هەروەکو وتراوە: ئافرەتانی (بەنی عەجلان) ماوەی چوار سالْ حامیلە دەبن ئەمجا منالْەکەیان دادەنێن!!

٣. بۆچوونێکی تر ئەوەیە کە دەڵێ: ماوەی مانەوەی منالْ لە سکی دایکیدا (پێنج ساڵە). کە ئەمەش ڕەئی بلاّوی ئیمامی مالیکە. ئیمامی مالیك فەرموویەتی: پێم گەیشتوە کە ئافرەتێك هەبوە، ماوەی حەملەکەی تا وەختی دانانی حەوت ساڵی خایاندوە.

٤. زۆربەی هەرە زۆری ماوەی لە دایکبوونی منالْ و مانەوەی لە سکی دایکیدا، ئەغلەبی (٩) مانگە.

بەڕێزان: خاڵێکی تر کە پێویستە ڕوونکردنەوەی لەسەر بدەین، بریتییە لە: سەرسوڕهێنەری (نوطفە)، ئافرەتێکی بەریطانی، پاش سێ سالْ لە مردنی مێردەکەی منداڵێکی دەبێت. (لیزا ڕۆبەرتس) و (جیمس)ی (٣٣) ساڵە. بڕیاری دا کە نوطفەی پیاوەکە وەربگیرێت و بە شێوەیەکی زانستی هەڵبگیرێت، بەرلەوەی (جیمس) دەست بکات بە چارەسەرکردنی نەخۆشی شێرپەنجەکەی. ئەوە بوو (جیمس) لە نەشتەرگەریەکەیدا مرد. ژنەکەشی سەردانی پزیشکانی کرد بۆ ئەوەی بەو (نوطفە) هەڵگیراوەی مێردەکەی کرداری چاندنی دەستکردی بۆ بکرێت. بەلاّم ئەوان پێیان ڕاگەیاند کە ڕێژەی سەرکەوتنی (٢٠٪)ە، بەلاّم (لیزا) سور بوو لە سەر داوایەکەی و خەرجی کارەکەی گرتە ئەستۆی خۆی کە گەیشتە (٤٠٠) جونەیە. ئەوەبوو دوای ماوەیەك،

منالێك بوو كه دایكەكەی زر دڵی پێی خۆش بوو. ئاواتی دەخواست لەو كاتەدا لە نێوان خۆی و هاوسەرەكەیدا بوایە، شایەنی باسە دوای دوو ساڵ لە مردنی پیاوەكەی (لیزا) ئەو نوطفەیەی مێردەكەی وەرگرتەوە و لە ڕێگەی چاندنەوە بە نەشتەرگەری دوای (٣) ساڵ لە مردنی مێردەكەی منالی بوو!!

بەڵێ ئیمانداران: گەورەیی و عەزەمەت هەر بۆ خوایە كە ئەو نوتفەیەی وا دروست كردوە كە توانای مانەوەی بەو شێوەیە هەیە. تەنانەت دوای دەرچوونی لە لاشەی كەسەكەش و مردنیشی، كەواتە زۆر ئاسانترە كە خوای گەورە جارێكی تر دوای مردن ئاوا مرۆڤ درووست بكاتەوە..

بەرێزان: لەم وتارەشدا بە پشتیوانی و ویستی خوای پەروەردگارە وەكو تەواوكردنی وتاری ڕابردوو باسی قۆناغی پیری و تەمەنی بە ساڵاچوون دەكەین. كە دەبێ ئەوە بزانین كە لەم سەردەمەی ئێستاماندا، لە هەر كاتێكی پێشتر ڕێژەی بە ساڵاچوان ڕوو لە زیادبوونە. هەرئەمەش وای كردوە كە ڕێكخراوە حكومی و ناحكومیەكان و حكومەتەكانیش بە هەند ئەو بابەتە وەربگرن. بە پێی ئامار و پێشبینیەكانی (H.A.I) بە ساڵاچوان لە ماوەی (٥٠) ساڵ لەمەو بەرو (٢٥) ساڵی داهاتودا بەم جۆرە دەبێت: لە ساڵی (١٩٥٠)دا. (٢٠٠) ملیۆن سەر و (٦٠) ساڵ هەبووە، لە هەموو جیهاندا. لە دوای (٥٠) ساڵ، واتە: لە ساڵی (٢٠٠٠)دا، ئەم ژمارەیە گەیشتە: (٥٥٠) ملیۆن. لە دوای ساڵی (٢٠٢٥)دا، پێشبینی دەكرێت ئەم ژمارەیە بگاتە: (یەك ملیار و دوو

سەد ملیۆن) کەس.. کەواتە: لە مەودای (٥٠) ساڵی نێوان (١٩٥٠ - ٢٠٠٠) تەنها (٣٥٠) ملیۆن بە ساڵاچوو چۆتە سەر ژمارەی پێشوو، کەچی لە (٢٥) ساڵی ئایندەدا (٦٥٠) ملیۆن دەچێتە سەر ژمارەی بە ساڵاچوان...

بەڵێ ئیمانداران: ڕەحمەتی خوا لەو شاعیرە بێ کە زۆر جوان فەرموویەتی:

نرخی تەمەن،

هەر لای پیرە،

پڕ بەهایە ئەم کاڵایە.

هەموو دنیا گەر ببەخشی

نایەتەوە ئەم سەرمایە....

ئیمانداران: بە ڕاستی پیر و بە ساڵاچوان، نەك هەر ئەرك نین لەسەر کۆمەڵگا بە گشتی و ئەو خێزانانەی کە تێیدا دەژین بە تایبەتی، بەڵکو کۆمەڵێ خێر و بەرەکەتن. وەکو:

١. پیر و بە ساڵاچوان، بە تایبەتی ئەوانەی کە کەفتار و زەلیلی سەر جێگان و پێویستیان بە خزمەت و چاودێری هەیە. هۆکارن بۆچوونە بەهەشتی ئەوانەی کە خزمەتیان دەکەن. پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) فەرموویی: (رَغِمَ أَنْفَهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفَهُ، ثُمَّ رَغِمَ أَنْفَهُ، قيلَ مَنْ يارَسُولَ اللهِ؟! قال: مَنْ أَدْرَكَ والِدَيْهِ عِنْدَهُ الكِبَرَ أَحَدُهُما أَوْ كِلَيْهِما، ثُمَّ لَمْ يَدْخُلِ الجَنَّةَ). رَواهُ مُسْلِم (٢٥٥١)

بە کوردی خۆمان مانای ئەم فەرموودە گەوهەرینەی سەروەرمان ئەوە دەگرێتەوە کە: دوای ناسینی خوا و پێغەمبەر (ﷺ) بە حەق

و بەجێهێنانی فەرزەکان، بەهەشتی خوا بۆ کەسێك مسۆگەرە کە خزمەتی دایك و باوکی یان یەکیان بە پیری بکات. ئەگەر نەی کرد ئەوا بەهەشت هاتۆتە ناو ماڵی و ئەم نەچوە ناویەوە، دەی عەمری نەمێنێ و لوتی بشکێ. لە (ئەثەر) ێکدا هاتوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: ئافرەتێك هەبوو، کچ بوو شووی نەکردبوو. دایکێکی پیرەژنی لە قاچ و دەست کەوتووی هەبوو. ڕۆژێکیان هەواڵ هات بۆ ئەو هۆزەی کە ئەم کچ و دایکە پەککەوتەی تێدا دەژیان کەوا دوژمن وەکو نەریتی خێڵگەری دەمیان دا بە سەر یەکتردا و کێ بەهێزتر بوایە ئەوی تری لە ناو دەبرد و ماڵ و سامانی بە تاڵان دەبرد و کچ و کوڕی دەکرد بە کۆیلە، هەواڵیان بۆ هات وا دوژمنێکی گەورە بە لەشکرێکی بە هێزەوە بەرەو هۆزەکەتان دێن و دەیانەوێ هێرشتان بکەنە سەر. بەڵێ سەرۆکی ئەم خێڵ و هۆزە کە زانی بەرەنگاری و ڕووبەڕووبونەوەی بۆ ناکرێ لەگەڵ ئەو لەشکرە داگیرکەرە بەهێزەدا، بڕیاری هەڵاتنیان دا و داوای لە دانیشتوانی گوند و دەڤەرەکەی کرد کە ڕەو بکەن بەرەو شوێنێکی ئەمین و سەلامەت بڕۆن. بە ئومێدی ئەوەی لە لەناوچوون و شەڕی بە خۆرایی ڕزگاریان بێ و ماڵ و سامانیان ببێ بە قوربانی خۆیان و لە ناوچەیەکی تردا بتوانن خۆیان بگرنەوە و دروست بکەنەوە. هەر بۆیە خەڵکەکە کەوتنە خۆو هەریەکەی بە وەی کە هەی بوو لە وڵاخی سواری و بە پێ کەوتنە ڕۆیشتن، ئەم کچە نەی دەزانی ئەم دایکە پیرەی چی لێ بکات، خۆ وڵاخی سواری نییە، خۆ کەس ئەم دایکەی بۆ هەڵناگرێ، چونکە

هەرکەس خەمی خۆیەتی. بۆیە بڕیاری دا کە ئەم دایکە پیرەی بە جێ نەهێڵێ و لەگەڵ خۆی ڕەوی پێ بکات. بەڵام چۆن؟! هات دایکەکەی لە کۆڵ بەست و دەستی کرد بە ڕۆیشتن. زۆر ماندوو شەکەت بوو. هەرکات ماندوو دەبوو، دەیویست دایکی دابنێ و دایکی بخەوێ، چونکە هیچ نوێن و دۆشەك و لێفەی پێ نەبوو، هیچی بۆ هەڵنەگیرا بوو، دڵیشی نەدەهات ئەم دایکە پیرەی کە وەکو مناڵی ساوای لێ هاتۆتەوە لە سەر زەوی دابنێ و بەردوچکە و کەرسەکە گڵ و دڕك و داڵی پێدا بچێ. بۆیە ئەم کچە بە ڕەحمەت و بە لوتفە بەرامبەر ئەم دایکە پیرە، دەهات بۆ خۆی لە سەر پشت ڕادەکشا و خۆی بۆ دایکی دەکرد بە دۆشەك و سکی دەخستە ژێر پشتی دایکییەوە و قاچەکانی دەخستە ژێر قاچی دایکییەوە بۆ ئەوەی دایکی پشوو بدات و ئازاری نەبێ بە هۆی ئەو زەویە ڕەقەوە، بەم شێوەیە چەندان شەو و ڕۆژ ئاوا بە کۆڵ دایکی هەڵگرت، هەتا لە مەترسی ڕزگاریان بوو. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: خوای گەورە لەو کچە خۆش بوو، بەهەشتی پێ بەخشی لە پاداشتی ئەو حورمەت و ڕێز و دڵسۆزیەی کە ئەم کچە بەرامبەر ئەم دایکە پیرەی نواندی!.

یەکێ لە پیاوچاکان و زانایانی بە ناوبانگی ئیسلام کە ناوی: (محمدی کوڕی مونکەدیر)ە. دەفەرموێ: من لەگەڵ برایەکمدا کە ناوی (عەمر) بوو. لەگەڵ دایکێکی پیر و پەککەوتەدا دەژیاین. ئەم برایەم کە ناوی عەمر بوو. نیوەی شەوان هەڵدەستا شەونوێژی دەکرد و قورئانی دەخوێند و زیکر و فیکری دەکرد. بەڵام منیش کە دەمویست

هەستم وەکو براکەم نوێژ بکەم، شەونوێژ بکەم. لەو نیوەشەوەدا گوێم لە دەنگی دایکم دەبوو. کە هاواری دەکرد لە دەست ئازاری قاچی. منیش لە تاوی دایکم و لە خۆشەویستی و سۆز بۆ دایکم، بەرماڵەکەم بەجێ دەهێشت و دەچووم دەستم دەکرد بە شێلانی قاچی دایکم، هەتا بەیانی ئاوا قاچم بۆ دایکم دەشێلا، چونکە بەو شێلانە ئازارەکەی لەسەر سووك دەبوو. ئیتر من شەونوێژم بۆ نەدەکرا. بەڵام سوێند بەخوا ئەو قاچشێلان و لەخزمەت بوونەی دایکمدا، کە لەبەر خاتری ڕەزامەندی خوا کردوومە نایگۆڕمەوە بە پاداشتی ئەو هەموو شەونوێژ و زیکر و فیکرەی کە عەمری برام کردوویەتی، چونکە شەونوێژ سوننەتە. بەڵام خزمەتکردنی دایك و باوك واجبە، دەی ئاشکرایە کە پاداشتی فەرز گەورەترە لە سوننەت.. بەڵێ پێشینان ئاوا خزمەتکردنی کەسی بەساڵاچویان بە عیبادەت ناودەبرد و نەیان دەگۆڕیەوە بە پاداشتی شەونوێژ و عیبادەتی سوننەت.

٢. بەرەکەتی دووەم  کە لە خزمەتکردنی کەسانی بە تەمەن و بە ساڵاچوودا دەستمان دەکەوێ، بە تایبەت دایك و باوك. کە بە پیری و پەککەوتەیی کەوتنە لات و بە جوانی و بێ دریغی خزمەتت کردن، بریتییە لە وەی کە: خودای گەورە لە بەڵا دەتپارێزێ  لە کاتی تەنگانە و لێقەوماندا،  بە هاوارتەوە دێ و دەبێتە هۆکاری ڕزگاربوون، چۆن تۆ بە دەم ئەو باوك و دایکە بەساڵاچوەدا چووی. هەروەکو لەم فەرمودە زێڕینەدا دەردەکەوێ کە: (عبدالله ی کوڕی عومەری کوڕی خطاب) گێڕاویەتیەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: سێ

کەس لە وانەی پێش ئێوە چوون بۆ سەفەر، شەویان بە سەردا هات و بۆ خۆپاراستن لە سەرما و مەترسی شەو لە ڕێگای سەرەکی هاتووچۆ دوورکەوتنەوە و پەنایان بردە بەر ئەشکەوتێك لە نیوەی شەودا لە کاتی بارانبارینێدا بەردێکی گەورە و زەبەلاح لە سەر شاخەکەوە ترازا و هات لە دەرگای ئەشکەوتەکە وەستایەوە و دەرگاکەی گرت. ئەم سێ کەسە ئەو دەنگە بەهێزە بە خەبەری کردنەوە و خۆیان لە تاریکیەکی سامناکدا بینیەوە، کە تاریکی شەو، تاریکی ناو ئەشکەوتەکە، تاریکتربوونی ناو ئەشکەوتەکە بە هۆی ئەوەی ئەو تۆزە ڕووناکیەی لە دەرگای ئەشکەوتەکەوە دەهاتە ژوورەوە، ئەویش نەما!! بۆیە بە پەلە و پڕتاو پەلاماری لای ئەشکەوتەکەیان دا و پاڵیان بە بەردەکەوە نا، بەڵام نەخێر. ئەم بەردە هێندە گەورە بوو، نەك بە سێ کەس بەڵکو بە (سی) کەسیش لانەدەچوو!!، ئەم سێ هاوڕێیە، بە ڕاستی بێئومێد بوون لە ڕزگاربوون. (بەڵێ ژیان وەکو ناو ئەو ئەشکەوتە وایە، ڕۆژانە چەند جار تاشە بەردی بەلا و موصیبەت، فیتنە و ئاشوب، بەڵای ناگەهان، شەڕی شەیطان، ناخۆشی، نەخۆشی، خەمباری، لەو لاوە دێت و دەرگای ئەشکەوتی ژیانت لێ دادەخات. بەڵێ، ئێمەی مرۆڤ هەموومان لامان داوەتە ناو ئەشکەوتی ژیان و بە ئومێدی ئەوەین، پشوویەك بدەین، چەند شەوێك بمێنینەوە و بڕۆین. بەڵام زۆرجار ئەو بەردە گەورانە کە ناڕەحەتییەکانی ژیانن دەرگای ئەشکەوتەکەمان لێ دادەخەن و نازانین چۆن ڕزگارمان ببێ. تەنها شتێ کە مرۆڤ پشتی پێ ببەستێ و پێی دڵخۆش بێ ئەوەیە

کە: پێشتر کاری چاکەت لە بەر خوا ئەنجام دابێ، تەنها و تەنها لە بەر ڕەزامەندی خوا، دوور لە هەموو ڕیایی و ڕوپامایییەك، ئا لەو تەنگانە گەورەدا، ئەگەر بەو کردەوە، چاکە، پاکە، بێ ڕیایەت لە بەر خوا بپارێیتەوە کە خوا ڕزگارت بکات، ئەوە (إنْشاءَ اللّٰه) خوای گەورە دەرگای تەنگانەت لەسەر دەکاتەوە و ڕزگارت دەبێ) هەروەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) باسی ئەو سێ کەسە گیرخواردوەی ناو ئەو ئەشکەوتەمان بۆ دەگێڕێتەوە. کە لە ناو خۆیاندا کەوتنە گفتوگۆ و وتیان: (إِنَّهُ لايُنْجيكُمْ مِنْ هذهِ الصَّخْرَةِ إلاّ أَنْ تَدْعُوا اللهَ تَعالى بِصالِحِ أَعْمالِكُمْ). واتە: بە دڵنیاییەوە هیچ شتێ لەم تاوێرە زەبەلاحەی کە بەردەمی ئەشکەوتەکەی لێ گرتووین ڕزگارمان ناکات. مەگەر ئەوەی کە بە کردەوەیەکی جوان و چاك و پاك کە لەبەر ڕەزامەندی و ئەمری خوا ئەنجاممان داوە لە خوا بپارێینەوە، کە بێت بە هانا و هاوارمانەوە و ڕزگارمان بکات. بەڵێ یەکێ لەو سێ کەسە وتی: خوایەگیان: (اللّٰهُمَّ كانَ لِي أَبَوانِ شَيْخانِ كَبِيرانِ) خوای پەروەردگارم، خۆت ئاگاداری و بینا و بیسەری کە من دایك و باوکێکی پیری بە ساڵاچووم هەبوو. لە پیریان وەکو منداڵی ساوایان لێ هاتبۆوە، دەبوایە نان و ئاو و خۆراکم بە دەمەوە کردنایە، پاکم بکردنایەوە. لەبەر حورمەتی ئەو دایك و باوکە بە ساڵاچوەم، خواردن و شیرم پێش ژن و منداڵەکانم دەدا بە وان و بە دەستی خۆم خزمەتم دەکردن. (بەڕێزان: جیاوازی زۆرە بۆ دڵ و دەروونی باوك و دایکی پیر و پەککەوتە کە بە دەستی خۆت خزمەتی بکەی و نانی بۆ دانێ و پاکی بکەیتەوە. لەگەڵ ئەوەی بە ژن

و منالەکەت بلێی: ئادەی نان و ئاویان بۆ بەرن، لە خزمەتیاندا بن، ئەوەی کە خۆت بە دەستی خۆت خزمەتیان بکەی لە ڕووی دەروونی و نەفسییەوە ئەو دایك و باوکە بە ساڵاچووە کەفتەکارە، بە وەیان ئیسراحەت دەکا و دڵی ئارام دەبێ). بەڵێ ئەم پیاوە بەردەوام دەبێ لە قسەکانی و دەڵێ: ئێوارەیەکیان بە هۆی ئەوەی کە زۆر لە ماڵەوە دوور کەوتبوومەوە بە هۆی گەڕان بە دوای لەوەڕگای خۆشدا بۆ ئاژەڵەکانم، کە گەڕامەوە شەو درەنگی کردبوو. دایك و باوکم خەویان لێ کەوتبوو!.. (فَكَرِهْتُ أَنْ أُوقِظَهُما وَأَنْ أَغْبِقَ قَبْلَهُما أَهْلاً أَوْ مالاً، فَلَبِثْتُ — وَالقَدَحُ عَلى يَدِي). بە خوا دڵم نەهات خەبەریان بکەمەوەو لە خەو هەڵیان بستێنم. وە دڵم بڕوای نەدا کە پێش ئەوان ژن و منالم نان بخۆن!.. بۆیە بەسەر سەریانەوە وەستام و هەرچەندە گەلێك ماندوو شەکەت بووم. بەڵام دانەنیشتم و نەخەوتم و هیچم نەخوارد. (وَالقَدْحُ عَلى يَدَيَّ) قاپە شیر و نانەکەش لە سەر سینیەکە هەر بە دەستمەوە بوو!! ئەمە فەرقی هەیە لەگەڵ ئەوەی کە لەسەر زەوی دایان بنێ و بۆ خۆی لە لایانەوە دانیشتبێ!! ئای چەند ماندوو بووم و شەوگاری زستان درێژ بوو. بەڵام لەبەر حورمەتی ئەو دایك و باوکە پیرەم کە هەرچەندە ئاگاشیان لە هیچ نەبوو. بەڵام هەر بە پێوە وەستام و لە خزمەتیاندا بووم. (أَنْتَظِرُ اسْتِيقاظَهُما حَتَّى بَرَقَ الفَجْرُ) بەڵێ چاوەڕێی بە خەبەربوونەوەیانم دەکرد، هەتا شەبەقی بەیانی. دیمەنی شایانی باس ئەوەیە: (وَالصِّبْيَةُ يَتَضاغَوْنَ عِنْدَ قَدَمي).. منالەکانم، کە ساوابوون لە دەوری قاچم و قولم ئالابوون و داوای نان و شیر خواردنەکەیان

دەکرد!! ئەم پیاوە دەبێ لە نێوانی دوو ڕێگادا کامیان هەڵبژێرێ:

١. خواردنەکە بدات بە منداڵەکانی کە لە قاچی ئاڵاون و دەگرین و برسیانە.

٢. هەروەکو جاران چاوەڕێ بێ، هەتا باوك و دایکی تێر نەخۆن، نەی دات بە منداڵەکانی.

ئیمانداران: ئا ئەوەیە خزمەتکردنی ڕاستەقینە. نەك بەرماوەی منداڵ و ژنەکەت، یان میوانەکەت، لە خواردن و میوە، کە لەبەر ئەوان مایەوە بڵێی ئادەی بۆ ئەو ژوورەی دایك و باوکمی بەرن. نەخێر ئەگەر ڕاست دەکەی لە خزمەتیان دای، دەبێ ئەوانە لە بەرماوەی دایك و باوکت بخۆن! هەروەها نەچی جامانە کۆن و کراسە کۆنی خۆتیان بدەیە، بەڵکو تازەکە لەبەر ئەوان بکە!. نەك لەبەر ئەوەی میز ڕاناگرێ دۆشەکەڵەی بۆ ڕاخەی و لە زستاندا لە هەیوان بی خەوێنی، بەڵکو باشترین ڕاخەری بۆ ڕاخە!.. بە داخەوە زۆر کەس هەیە، هەر ئەوەیە کە دایك و باوکە بە ساڵاچووەکەی، یان کەسە بە تەمەنەکەی ناو منداڵەکەی لەبەر لۆمە و عەیبەی خەڵکی فڕێ نەداوە، ئەینا بە کردەوە فڕێی داوە و لێی بێزارە!! بە خوا هەبوە پرسیویەتی ئەرێ مامۆستا لە ڕووی شەرعەوە سەرفترە و زەکات بە دایکە پیرەکەم دەشێت، بی دەم بە ئەو؟!.. بەڵام ئەم پیاوەی پاڵەوانی بە سەرهاتەکەمان کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆمان دەگێڕێتەوە، زۆر مەرد و پیاو بوو. ڕێگای دووەمی هەڵبژارد، کە دەبێت هەمووکات دایك و باوکم پێش منداڵەکانم خواردن بخۆن. بۆیە لە سەر سەریان بە خواردنەوە وەستا هەتا شەبەقی بەیانی و

(فَاسْتَيْقَظا) پاش ئەوە خەبەریان بۆوە، (فَشَرِبا غَبُوقَهُما) خواردنەکەیان، شیرەکەیان خواردەوە.. ئا لێرەدا ئەم پیاوە، لەم تەنگانەدا کە ڕووناکی ژیانیان لێ بڕابوو. دونیای لێ تاریك ببوو، بەم کردەوە جوانە، چاکە، لە دەرگای ڕەحمەتی خوای دا و فەرمووی: (اللّهُمّض إنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ذالِكَ إبْتِغاءَ وَجْهِكَ).. ئەی پەروەردگارم، ئەگەر ئەوەی کە باسم کرد، لەبەر خاتری ڕەزامەندی تۆ بووە. بەڵێ لێرەدا پێویستە بوەستین: (إبْتِغاءَ وَجْهِكَ) لەبەر خاتری خوا ئەوە بکەی، نەك لەبەر چاوی خەڵك و میوان ئاوا خزمەتیان بکەی و هەدەف و ئامانجت ئەوە بێ، کە خەڵکی مەدح و ستایشت بکەن و بڵێن: بە خوا کوڕی چاکە، ئاوا خزمەتی دایك و باوك دەکرێ ئەگەر کەسی لێ نەبێ و بزانێ کەس باسی ناکات، گوێیان پێ نەدات، یان بە ئومێدی میراتی خزمەتیان بکات، چونکە کەسی واش هەیە کە وتوویەتی: با دایك و باوکم کە پیر و پەککەوتەن لای من بن و خزمەتیان دەکەم. بەڵام: بەو مەرجەی ئەم خانوە کە هی ئەوانە بۆ من بێ. کە مردن کەس داوای میراتیان نەکات!!. ئەم جۆرە خزمەتکردنە بۆ ڕەزامەندی خوا نییە، بەڵکو ئەو پیاوە فەرمووی: خوایە ئەگەر من تەنها لەبەر ڕەزامەندی تۆ خزمەتم کردن بەو شێوەیە: (فَفَرِّجْ عَنّا مانَحْنُ فيهِ مِنْ هذهِ الصَّخْرَةِ).

یا ڕەبی خوایە داوات لێ دەکەم کە دەرگایەکی ڕەحمەتمان لێ بکەیەوە و ڕزگارمان بکەی لە وەی کە بە هۆی ئەم تاوێرە بەردەوە تووشی هاتووین و لەم ئەشکەوتەدا گیرمان خواردوە!! (فانْفَجَرَتْ شَيْئاً) ئەم کردەوەیە هێندە گەورە بوو لای خوا، بەردەکەی جووڵاند!!

ئاسۆی ڕزگاربوونیان لێ دەرکەوت.. ئەم فەرموودەیە: (رَوَاهُ البُخارِيُّ (٢٢٧٢) وَمُسْلِم (٢٧٤٣)

ئیمانداران: ئای چ موژدەیەکی گەورەیە بۆ ئەو کەسانەی کە پیر و بە ساڵاچوویەك لە ماڵیاندایە، بە تایبەت دایك و باوك. کە بە خزمەتکردنیان، ئەندامانی ئەو خێزانە وا لە قەلایەکی پتەوو بەهێزدان، ئەمجا ئەی ئەو کەسەی کە خزمەتی دایك و باوکی بە ساڵاچووت دەکەی، یەقینت ببێ و بزانە: تۆ لە پەنای ئەواندا حەواویتەوە و خودای گەورە لە هەموو بەلا و موصیبەت و ناخۆشی و نەخۆشییەی ئەمرۆ خەڵکی پێیانەوە گیرۆدەیە، دەتپارێزێ، نەك وا بزانی ئەوان لە پەنای تۆدا حەواونەوە. ئەوان بارگرانی نین بۆ تۆ، ئەوان خەڵاتی خوان بۆ تۆ، هەر لە ژێر ڕۆشنایی ئەم فەرموودەیەدا، دەڵێم: ئەگەر تۆ بەرماوەی دایك و باوکت یان کەسە بە ساڵاچوەکەی ناو ماڵت. وەکو خەسوو خەزوور بۆ بووك، بدەی بە ژن و مناڵت. ئەوا بزانە کاتێ تۆش پیر بووی، بەرماوەت دەدرێ بە خەڵکی، ئەگینا دەبێ چاوەڕێی بەرماوە خواردن بی، (الجَزاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَلِ) گوێ لەم بەسەرهاتە بگرن: پیرەمێردێکی بە ساڵاچوو، ناچار بوو دوای مردنی خێزانەکەی لەگەڵ کوڕ و بووکەکەی و کوڕەزاکەیدا بژی. ئەم پیرەمێردە هەژارە دەی ناڵاند بە دەست لەرزۆکی و کزی چاوەکانییەوە، ماڵ و مناڵەکەی بە جۆرێك ڕاهاتبوون لە سەر خوانێك پێکەوە کۆببنەوە، ئەم پیاوە پیرەش بەو ناڕەحەتیەوە لە نێوانیاندا دادەنیشت. بە هۆی خراپی باری تەندرووستییەوە تام و چێژی لە نانخواردنەکە وەرنەدەگرت.

قاپە شوشەکان لە دەستی دەکەوتنە خوارەوە و دەشکان، بە هۆی لەرزۆکی دەستەکانیەوە خواردنەکەی بڵاودەکردەوە و خواردنەکەی دەرِشت. کورِ و بووکەکەشی هەستیان بە بێزاری و نیگەرانی دەکرد و لەم کارەی نارەحەت بوون. رِۆژێك کورِەکە چرپاندی بە گوێی ژنەکەیدا: بێزار بووم لە شێوازی نانخواردنی باوکم، بێزم نایەت لە گەڵیدا نان بخۆم، ئەو شێوە نانخواردنە مرۆڤ بێزی لێ دەکاتەوە!! بۆیە کورِ و بووکەکەی برِیاریان دا کە دووری بخەنەوە لە خوانەکە و بە تەنها نانی بۆ دابنێن. پیاوە پیرەکەیان لە سوچێکی دوورەپەرێزی ماڵەکەدا دانا و کورِەکەی لە چەند قاپێکی تەختەدا خواردنی بۆ دادەنا، بۆ ئەوەی ئەگەر لە دەستە لەرزیوەکەی کەوتە خوارەوە نەشکێت!! لە کاتێکدا هەموان لە سەر خوانێك کۆ دەبونەوە و لەقاپ و قاچاخی فەخفوری و شوشەدا تام و چێژیان لە نانخواردنەکەیان وەردەگرت، بە جۆرێك بیریان دەکردەوە کە کەسانی پیر و پەککەوتە هەست و سۆزیان لە دەست داوە و بیر لەو هەڵوێستانە ناکەنەوە، بەڵام بێئاگا بوون لەو فرمێسکانەی کە بە چاوەکانی ئەو پیرەمێردە هەژارەدا دەهاتنە خوارەوە. بەڵکو لەوە خراپتر مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرد. بەردەوام سەرزەنشتیان دەکرد. بە قسەی ناخۆش و توانجی دڵتەزێن، تەنانەت ئەگەر پارچە نانێك لە دەستی بکەوتایەتە خوارەوە، یاخود کەوچکە چێشتێکی برِشتایە!! رِۆژێکیان پاش ئەوەی پیرەمێردەکە تەواو بوو لە نانخواردنەکەی، کورِەزا بچوکەکەی چوو ئەو قاپە تەختەیەی کە باپیری چێشتی تێدا دەخوارد هەڵی گرت و پێچایەوە!!

باوکی پرسیاری لێ کرد: ڕۆڵە چی لەو پارچە تەختەیە دەکەیت؟!
منداڵەکەش زۆر بە سادەیی وەڵامی پرسیارەکەی باوکی دایەوە و وتی:
هەڵی دەگرم و دەی پارێزم بۆ ئەو کاتەی کە تۆ و دایکم وەکو باپیرم
پیر دەبن، خواردنتان تێدا دەدەمێ!!! بەڵێ منداڵ فیطرەتی پاکە و
لە دڵە پاکەکەیەوە قسە دێتە سەر زمانی و دەری دەبڕێت.. باوکەکە
ئەمەی لە منداڵەکەی خۆی گوێ لێ بوو، زمانی بەسترا، فرمێسك بە
چاوەکانیدا هاتنە خوارەوە، بێ ئەوەی هیچ قسەیەك بکات. بڕیاری
دا کە هەڵسوکەوتی لەگەڵ باوکە پیرەکەیدا بگۆڕێت و بە چاکی
مامەڵەی لەگەڵدا بکات، هەمان شەو کوڕەکە دەستی باوکە پیرەکەی
گرت و هێنایە سەر خوانەکە، تا پێکەوە لە سەر یەك سفرە تا کۆتایی
تەمەنیان پێکەوە نان بخۆن.. بە بێ هیچ بێزاری و نیگەرانییەك!...

٣. سێیەم خاڵ لە بەرەکەتی خزمەتکردنی کەسانی بە ساڵاچوو،
ئەوەیە کە: خوای گەورە بە هۆی خزمەتکردنیانەوە لە گوناهەکانت
خۆش دەبێ، جا لە حوکمی خزمەتکردنی دایك و باوکی پیر و
بە ساڵاچودایە، مام و خاڵ و پوور. (عبدالله ی کوڕی عومەر)
دەفەرموێ: (أَتَى النَبِيَّ (ﷺ) رَجُلٌ، فَقالَ: إِنّي أَذْنَبْتُ ذَنْباً عَظْيماً، فَهَلْ لِي مِنْ
تَوْبَةٍ؟ فَقالَ: هَلْ لَكَ مِنْ أُمٍ؟! قالَ: لا قال: فَهَلْ لَكَ مِنْ خالَةٍ؟! قالَ: نَعَمْ، قالَ:
فَبِرْها). رَواهُ الترمذي، وإِبْنُ حَبّان في صَحيحِهِ

مانای فەرموودەکە بە کوردی بەم شێوەیەیە: پیاوێك هاتە خزمەت
پێغەمبەری خوا (ﷺ) عەرزی کرد: من گوناهێکی زۆر زۆر گەورەم
کردوە. ئایا بۆم هەیە تەوبە بکەم؟!

جا تەماشا کەن بەڕێزان: پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەم کەسە ناپرسێ گوناهەکەت چی بوو، لە کوێ کردت، چۆن کردت، دەی با ئێمەش دەم لە گوناهی خەڵکیەوە وەرنەدەین و لێگەڕێین با گوناهبار، گوناهەکە هەر لە نێوان خۆی و خوای خۆیدا بێت و کەس پێی نەزانێت..

بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمجارەیان ڕووی لە پرسیارکەرەکە کرد و فەرمووی: ئایا دایکت لە ژیاندا ماوە؟! کابرا وتی: نەخێر. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی پورت خوشکی دایکت ماوە؟! کابرا وتی: بەڵێ. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دەی برۆ لە خزمەت پورتدا بە و دەبێتە هۆی گیرابوونی دوعاکانت و لێخۆشبوونی خوا لە بەندەکانی و دەبێتە کەفارەتی گوناهە گەورەکەت..

بەڵێ ئیمانداری بەڕێز: ئەگەر کەسێکی بە ساڵاچوو لە ماڵتا هەیە زۆر ئاگاداری بە، چونکە ئەوە بەرەکەتی ماڵتە و ڕەشکەرەوەی گوناهتە. ئای چەند کەس هەیە لە قیامەتدا کە تەماشا دەکات وا گوناهی زۆر گەورەی کردوە و ترس و لەرز دای گرتوە و چاوەڕێی ئەوەیە کە خوای گەورە غەزەبی لێ بگرێ و سزای بدات، بەڵام کە نامەی کردەوەکانی وەردەگرێ، تەماشا دەکات ئەو گوناهە گەورە نەماوە و ڕەش بۆتەوە. بۆیە خەریکە باوەڕ بە چاوی خۆی ناکات، ئەمجا پەروەردگار دەفەرموێ: دیارە چاوەڕێی بزانی ئەم گوناهە گەورە بۆ نەنوسراوە؟! نەخێر نوسرا بوو. ئەگەر بمایە ئەمرۆ ئەی کردی بە ناو دۆزەخدا، بەڵام بە هۆی ئەوەی کە لە دنیادا چاکەت لەگەڵ دایکت، پورت، کرد خزمەتت کردن، لە کاتی بە ساڵاچویی و

کەفتەکاریدا بە هانایانەوە چووی و ئامێزی میهرەبانیت بۆ گرتنەوە مەردانە خزمەتت کردن و دڵت ڕاگرتن، منیش فەرمانم کرد کە لە پاداشتی ئەو چاکەدا، ئەو خزمەتەدا، ئەو گوناهە گەورەت لەسەر ڕەش بکەمەوە!! وە ئەمڕۆ سەرفراز بی!.

٤. ئەگەر نەتتوانی بەرزترین لوتکەی ئیسلام بە دەست بێنی، کە جیهاد و تێکۆشانە لە پێناوی خوا و دینی خوادا، کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (ذَرْوَةُ سَنامِ الإِسْلامِ الجِهادُ في سَبيلِ الله) ئەوا وەرە خزمەتی دایکە پیرەکەت بکە، لە فەرموودەیەکدا کە: (نەسائی و ئیبن ماجە و حاکم) ڕیوایەتیان کردوە هاتوە کە: (جاءَ رَجلٌ إلى النَبيَّ (ﷺ) يَسْتَشيرُهُ في الغَزْوِ) کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە ڕاوێژی پێ کرد دەربارەی غەزا و بەشداریکردنی لە جیهاد، جا لەم کاتەدا، یان کەسەکە لە لەش و جەستەدا توانای لاشەیی جیهادی نەبووە، یان سوپای موسڵمانان لەو کاتەدا زۆر بوە، یان ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن نەبوە لەو کاتەدا. بۆیە پێغەمبەری خوا (ﷺ) نەی فەرموو: جیهاد مەکە، یان پێت ناکرێ، بەڵکو مادام ئەم کەسە حەزی لە خێرە دەرگایەکی خێری وەکو جیهادی نیشان دا و فەرمووی: (أَلَكَ والِدَةٌ؟!) ئایا دایکت لە ژیاندا ماوە؟! کابرا وتی: بەڵێ، فەرمووی: (فَألْزِمْها فَإنَّ الجَنَّةَ تَحْتَ قَدَمِها) واتە: بڕۆ بۆ خزمەت دایکت و هۆگری بەو درێغی مەکە لە خزمەتکردنی، چونکە بەهەشت وا لە ژێر پێی دایکتدایە. بەڵێ جیهادکردن لە پێناوی خوا. کە مەرد و پاڵەوانی مەیدانی دەوێ، کە غیرەت و شەهامەتی تێدا دەردەکەوێ، کە ڕۆح بەو شیرینیەوە

دەخرێتە سەر لەپی دەست و چاوەڕێی دواچرکەی ژیانی تێدا دەکرێ، ئەم جیهادە لەگەڵ خمەتکردنی دایك و باوکدا بە یەکەوە هاتوون.
کەسێك پرسیاری کرد لە پێغەمبەری خوا (ﷺ): (أَيُّ العَمَلِ أَحَبُّ إلى اللهِ؟! قالَ: الصَّلاةُ عَلى وَقْتِها، قالَ: ثُمَّ أَيُّ؟! قالَ: برُّ الوالِدَيْنِ، قالَ: ثُمَّ أَيُّ، قالَ: ثُمَّ الجِهادُ في سَبيلِ اللهِ). رَواهُ البُخاريُّ (٥٠٤) وَمُسْلِم (٨٥)

واتە: ئایا چ کردەوەیەك خۆشەویستترین کردەوەیە لای خوای گەورە؟! پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نوێژکردن لە کاتی خۆیدا. وتی: ئەی دوای ئەوە؟! فەرمووی: چاکەکردن و خزمەتکردنی دڵسۆزانە و مەردانەی دایك و باوك. وتی: ئەی دوای ئەوە؟! فەرمووی: جیهاد و تێکۆشان لە پێناوی خوای گەورەدا.

٥. لە بەرەکەتی خزمەتکردنی پیر و بە ساڵاچووەکانە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (البَرَكَةُ مَعَ أَكابِرِكُمْ). أَخرجه الحاكم في المُسْتَدْرَك (٦٢/١) وَالأَلْباني في الصَّحيحة (١٧٧٨)

واتە: بەرەکەت لەگەڵ بە تەمەن و بە ساڵاچووەکانتاندایە، هەر سفرە و خوانێك پیر و بە ساڵاچوو لە سەری بخوات، بەرەکەتی تێ دەکەوێت. هەزاران ڕەحمەتی خوا لە مامۆستا سەعیدی نورسی بێت. کە دەفەرموێ: ئەی موسڵمانی بەڕێز، سەرنج بدە و پەند وەربگرە و بزانە، ئەگەر نەمریت، ئەوا چار نییە و ڕۆژێك دەبیتە پیرێکی بە ساڵاچوو. جا ئەگەر ڕێز لە دایك و باوکت نەگریت، ئەوا ڕۆژێکت بە سەردا دێت کە منداڵەکانیشت ڕێز لە خۆت نەگرن. جا ئەگەر قیامەتی خۆتت خۆش دەوێ ئەگەر دنیاشت خۆش دەوێ، ئەوا گەنجینەیەکی

گەورە وا لەبەر دەمتایە کە ئەمەیە: خزمەتی دایك و باوکت بکە و ڕەزامەندیان بە دەست بهێنە. بزانە: کۆڵەکەی بەرەکەتی ماڵەکەت و هۆی بوونی ڕەحمەت تێیدا و مایەی دوورخستنەوەی بەڵا و موصیبەت لێی، تەنها ئەو دایك و باوکە پیرەی ماڵەکەتە، کە بوونیت بە لاوە گرانە، چونکە ئەگەر لە ناوچەوانی ئەو پیرانەوە بەرەکەتت بە سەردا نەباریایە، ئەوا بێگومان ژیان و گوزەرانت تاڵ دەبوو. بەڵێ بەدیهێنەری (ذُو الجَلالِ والإِكْرام) کە خوێ (الرَّحْمنُ الرَّحيمَ) و (اللَّطيفُ الكريم)ە. بە شاهیدی ئەوانەی کە وان لە گەردووندا. هەرکە خوای گەورە منداڵ دەنێرێتە سەر ڕووی دونیا، خێرا لەوپەڕی لوتفدا، ڕزق و ڕۆزی خۆیانیان بە دوادا دەنێرێ، وەك دەرپەڕینی شیری ناو مەمکەکان بۆ ناو دەمیان بە وێنەی کانیاو. هەروەها ڕزقی ئەو پەککەوتانەی کە گەڕاونەتەوە ڕیزی منداڵان، بەڵکو ئەوان بە سۆز و میهرەبانی ئاتاجترن و شیاوترن، ڕزقی ئەوانە خوای پاك و بێگەرد، لە شێوەی بەرەکەتدا دەینێرێت بۆیان و ژیاندنی ئەوانە ناخاتە ئەستۆی مرقە پیسکەکان و نای سپێرێت پێیان. ئەو حەقیقەتەش ئەم ئایەتە پیرۆزانە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ هُوَ ٱلرَّزَّاقُ ذُو ٱلْقُوَّةِ ٱلْمَتِينُ ﴾ الذاريات: ٥٨

﴿ وَكَأَيِّن مِّن دَآبَّةٍ لَّا تَحْمِلُ رِزْقَهَا ٱللَّهُ يَرْزُقُهَا وَإِيَّاكُمْ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿٦٠﴾ ﴾ العنكبوت: ٦٠

دەی گەیەنن، حەقیقەتێکی پڕ سەخاوەتە و زمانحاڵی هەموو گیانلەبەرە بەدیهێنراوە جۆربەجۆرەکان دەری دەبڕێ، جا وە نەبێ هەر ڕزقی دایك و باوکە پیرەکان لە شێوەی بەرەکەتدا بۆیان بێت،

بەڵكو هەتا هەندێ گیانلەبەر كە بۆ هاوەڵیەتی و دۆستایەتی مرۆڤ درووست كراون بە وێنەی پشیلە، ڕزقی ئەوانیش لە شێوەی بەرەكەتدا لەگەڵ ڕزقی مرۆڤدا بۆیان دەنێرێت، ئەوەش كە بەڵگەیە لە سەر ئەمە، مامۆستا نورسی دەفەرموێ: ماوەیەكی زۆر بەشە خۆراكێكی ڕۆژانەم هەبوو، كە نیو كولێرە بوو، كولێرەی ئەو شوێنەش بچووك بوو، زۆرجار بەشی نەدەكردم، پاشان چوار پشیلە هاتن و بوونە میوانم، كەچی ئەو خۆراكە بەشی منیش و ئەوانیشی دەكرد. بگرە هەندێ جاریش لێی دەمایەوە. ئەم حاڵەتە چەند جارێك لەگەڵم دووبارە بۆوە، بە ڕادەیەك كە قەناعەتی تەواوم كرد كە من لە بەرەكەتی ئەو پشیلانە سوودم وەردەگرت و ئێستاش بە شێوەیەكی گومانبڕ ئاشكرای دەكەم كە ئەو پشیلانە هیچ كات بەسەر شانی منەوە بار نەبوون و لەژێر منەتی مندا نەبوون، بەڵكو من لە ژێر منەتی ئەواندا بووم.. جا موسڵمانی خۆشەویست: كە گیانلەبەرێكی درندە ئاسا دێت و دەبێتە میوانی ماڵێك، ئەبێتە تەوەرەی بەرەكەت ئەی ئەگەر بەڕێزترین بەدیهێنراو كە مرۆڤە و كامڵترین كەس كە ئیماندارە و ئەوانەی كە دەسەوسان و نەخۆش و بە تەمەنن لە نێوان ئەهلی ئیماندا، وە ئەوانەی كە دڵسۆزترین دۆست و ڕاستگۆترین خۆشەویستن كە دایك و باوكن، بێنە ئەو ماڵەوە چۆن دەبێ؟! خۆت دەتوانی لێكی بدەیتەوە كە ئەمە هۆیەكی چەند گەورەیە بۆ بەرەكەت و ڕاكێشانی سۆز و ڕەحمەت و دورخستنەوەی بەلا و موصیبەت، هەروەك لە مانای فەرموودەی شەریفدا دەردەكەوێ: ئەگەر پیرە

خواناسەکان نەبوونایە بەلاَ و موصیبەت بە سەرتاندا دەباری!...

کۆتایی وتارەکەشمان بە چەند پەندێکی (پیرەمێردی) شاعیر دێنین کە فەرموویەوتی:

دە پەند و یەکی (دە) دینار دێنێ.

دیاری ژیانە خەڵکی بیخوێنێ.

لەگەڵ خودادا سەر ڕاست بی چاکە.

هیچ لەو گوم نابێ خراپە و چاکە.

لەگەڵ خەڵکیدا ئینصاف بنوێنە.

هەتا دەتوانی نەفست بشکێنە.

بۆ هەژار دڵسۆز، بۆ گەورە حورمەت.

بۆ لە خۆت خوارتر لوتف و شەفەقەت.

بۆ دۆست ڕابەر بە، بۆ دوژمن بە حیلم.

بە تەوازوع بە لەگەڵ ئەهلی عیلم.

لەگەڵ جاهیلدا بێدەنگ و خامۆش.

ئەم (دە) پەندەی من نەکەی فەرامۆش.

کلیلی گەنجی پەند دیانەتە.

دین نەبێ پەندت لەلا زەحمەتە...

## سەرچاوەکان:

١. کەشکۆڵی کاروان. ناصح محمد شاربازێڕی، ل٣٥.

٢. الفِقْهُ الإسْلامي وَأَدِلَّتُهُ. د.وَهْبَة الزُّحَيلي. ج٨ ص٧٩. ج١٠ ص٧٢٥١

٣. بەساڵاچوان، کتێب گەلێکی لە بیرکراو، لەتیف فاتح فەرەج، ل٧، ل٩.

٤. آياتُ الله في الإنْسان. د. محمد راتب النابُلُسي. ص١٥٩.

٥. تەفسیری ڕەوان. مەلا محمودی گەلاڵەیی، ب٩ جزمی ١٧، ل١٥٣.

٦. تەفسیری ڕامان، أحمد کاکە محمود، ل٥٢٦.

٧. في ظِلالِ القُرْآن. سَيد قُطب. ج٤ ص٢٠٤٩.

٨. ڕۆژنامەی (ستاندەر) ژ ٢٢ لە ٢٠٠٨/٣/٣١.

٩. گۆڤاری (بڕیار) ژ٥، ل٤٢.

١٠. حقوق الإنْسان في الإسْلام. خَديجَة النبراوي. ص٢٥٨.

١١. پەندەکانی پیرەمێرد، ل١٠١.

١٢. لِسانُ المِنْبَر. محمد المدني. ص٣٧٦.

وتاری دووەم بۆ مانگی ذي القعدة

# ماف و ئەرکی بە ساڵاچووان
## بەشی سێیەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: ئەم سەردەمەی ئێستا ئێمەی تێدا دەژین، پیربوون و چوونە ناو ساڵەوە زۆرترە لە جاران. خەڵکی ئێستا بە شێوەیەکی گشتی زوو پیربوونی لێ دەردەکەوێ، ئەویش لە ئەنجامی ئەم هۆکارانەدا:**

**١. خـــۆراك: بەکارهێنانـــی مـــادەی کیمیاوی لـــە پێگەیاندن و زوو بەرهەمهێنانی ســـەوزە و میوەکان. لە ڕاســـتیدا هەموو دەستکاریەکی قۆناغەکانی ژیانی سرووشـــتی میوە و سەوزەکان (بەرهەمی گۆشتیش کـــە بە عەلەف و پرۆتین گەورە دەبێ) زیانی گەورە بە بەکاربەرانی دەگەیەنێـــت. چونکە لەش لە ڕێگـــەی ئەو خواردنەوە، ئەو ڤیتامینە وەرناگرێ کە پێویســـتی پێیەتی.. وە خواردنی ناو قوتوو (ماســـت و بەرهەمەکانی تری شیر، یان گۆشتی بەستوو لە قوتونراو، ئەو موادی پارێـــزەرەی (حافظـــەی) کە تێی دەکرێ، کاریگـــەری خراپی هەیە بۆ سەر تەندروستی. جاران خەڵکی خواردنێکی دەخوارد تازە و خۆماڵی بوو، بۆی دەبوو بە شـــیفای نەخۆشـــی، بەڵام ئێستا ئەم خواردنانەی ئەمڕۆ لاشـــەی مرۆڤ لێك هەڵ دەوەشـــێنێ و ســـەرەنجام مرۆڤ بە زوویی پیری لێ دەردەکەوێ.**

٢. ژینگــە: مرۆڤ لە کۆندا هاوینەهەوار و زســتانەهەواری بووە. هەوای پاك و بێگەردی هەڵ مژیوە و ئاوی ســازگاری نۆش کردوە و خواردنی پاکی خواردوە، بەڵام لەم سەردەمەدا، ئەو هەموو دووکەڵی ئۆتۆمبێــل و ئامێرە هەڵ دەمژێ، هەوای پــاك زۆر کەم بوە. بوونی کارگەکان لە نزیك شــوێنی نیشــتەجێبوونی دانیشتوان.. کە ژینگەی هــەوا بە تــەواوی پیس دەکەن. جاران مرۆڤ ئــاوی کانی و کارێزی دەخواردەوە کە سارد و سازگار بوو، ئێستا ئاوی ناو تانکی چەند ڕۆژ مــاوەی گەرمی قەوزاوی دەخواتــەوە. دەی هەوا و ئاوی پاك خوێنی پاکی پێ دروســت دەبێ و هەوای ئاوی پیس خوێن ژەهراوی دەکات، بە بێ ئەوەی هەست بە خۆت بکەی لە ناوت دەبات. وە سەرنج بدە: خەڵکی کوێســتانەکان لاشەیان ســاغترە و درەنگتر نیشانەی پیریان لێ دەردەکەوێ. کە یەکێ لە نیشــانەکانی پیری بێتوانایی جەستەیە، با ئەو کەســە بە ســاڵیش تەمەنی کەم بێ.. دەی هەموومان دەزانین ئەوەی کەســێکی پێشــوو، دەیدا بە کۆڵیا لە شــارەوە بۆ لادێ، ئێستا گەنج بە ئۆتۆمبێلیش تاقەتی گواستنەوەی نییە!.

٣. دەروون: مرۆڤــی جاران دەروونی ئاســوودە بوو، هەموو غەم و هەمی تەنها نانی ساڵ و کولانە خانوویەك بوو، ئێستا دەروون ڕۆژانە تووشی (شــڵەژان و دڵەڕاوکێ و ترس و.....هتد) دەبێتەوە. هەمووشی کار دەکاتە ســەر لاشــە و چرچبوونی پێست. چونکە بە زەردەخەنە دەموچاو دەکرێتەوە و پێســت گەشــە دەکات، بــەڵام بە تورەبوون و قەلەقی پێست دەچێتەوە یەك و گرژ دەبێ.

٤. بەکارهێنانــی زۆری ئامێرەکانی دروســتکراوی دەســتی مرۆڤ. وەکو ئامێــرە تەکنەلۆجیــەکان: (کۆمپیوتەر، مۆبایــل، ئینتەرنێت، تەلەفزیۆن) کە هەرچەندە ســوودیان هەیە. بەڵام لەگەڵ سوودەکاندا تیشــکی زیانبەخشــی هەیە، ئەگەر مرۆڤ زیاد لە پێویست بە کاری بهێنێت زیانی زۆری پێ دەگەیەنێت و ئەو تیشــکە زیانبەخشــانە لە ناوچەوانی مرۆڤدا کۆدەبنەوە و ڕوخســاری بەرەو چرچبوون و زوو پیربوون دەبەن. جا ئەگەر مرۆڤ ناوچەوانی بە ڕووتی لە سەر زەوی دابنێ ئەو تیشکە زیانبەخشانە خاڵی دەبنەوە و دەچنەوە زەوییەوە، ناوچەوان وەکو ئەو ئامێرەی ســەر بینا بەرزەکان و بورجەکان وایە، کە تیشکی هەورە تریشقە وەردەگرن و لەناو زەویدا خاڵی دەکەنەوە و ماڵەکان پارێزراو دەبن. ئا لێرەدا یەکێ لە حیکمەتەکانی سوجدەی نوێــژ دەردەکەوێ کە یەکێ لە مەرجەکانی ســوجدەی نوێژ ئەوەیە دەبێ ئەو کەسە نێوچەوانی بە ڕووتی بخاتە سەرزەوی! بەڵێ ئیسلامی ئێمە عیبادەتەکەشی هەمووی زانست و زانیاریە.

بەرێــزان: پیریەك هەیــە کە کەس لێــی ڕزگار نابێ، هەرچەندە خۆشــی بپارێزێ. ئەویش: بە ســاڵاچوونە.. خوای گەورە دەفەرموێ:

﴿ثُمَّ لِتَبْلُغُوٓاْ أَشُدَّكُمْ ثُمَّ لِتَكُونُواْ شُيُوخًاۚ﴾ غافر: ٦٧

واتە: دوای ئەوەی کە خوای گەورە لە نوتفەیەك درووســتی کردن و پاشان لە دایك بوون و بوونە مناڵ، بەرە بەرە گەورەتان دەکات بۆ ئەوەی بگەنە ئەوپەڕی هێز و توانا و ژیریتان پاشان بۆ ئەوەی ببنە پیر و پەککەوتە..

زانایـــان دەفەرموون: مرۆڤ لە کاتی دروســـتبوونییەوە لە ســـکی دایکیـــدا و دوای لـــە دایکبوونـــی بەردەوام ڕوو لە گەشـــەکردن و بە هێزبـــوون و پتەوبوونـــە هەتا دەگاتە تەمەنی (چل) ســـاڵی. کە ئەوە لوتکەی گەشەکردنە و دوای ئەوە هەڵگەڕانەوەیەکی (فیسیۆلۆجی) لە تەواوی لاشەدا ڕوو دەدات و ئەمجا کاری داڕووخان و لە ناوچوون لە ناو لەشی مرۆڤدا، بە هێزتر و بە گوڕتر دەبێ لە کاری دروستکردنەوە و بنیاتنان. ســـەرەتا کەم کەم ئەو داڕووخانە درووســـت دەبێ، پاشان بەرە بەرە دەســـت پێ دەکات و مرۆڤ هەســـت بە داڕوخان دەکات و ئەگەر شکســـتێکی لاشەیی بە سەر بێ، بۆ نموونە ئێسقانێکی بشکێ، زۆر بـــە گران خۆی دەگرێتەوە. لە کاتێکدا پێشـــتر لە گەنجیدا زۆر بە ئاســـانی چاك دەبۆوە و دروســـت دەبۆوە. وە ئەم دیاردەی بێهێزی و بێتواناییە لە ســـەر هەندێ ڕژێن (الغُدَد) دەردەکەوێ، وەکو ڕژێنی نوخامی کە لە مێشـــکدایە و هۆرمۆنی ڕەنگەکان (MAS) دەردەدات!.. بەو هۆیەوە موەکان ڕەنگی ڕەشیان لە دەست دەدەن و سپی دەبن.

هەروەها ڕژێنی چەوری چالاکیەکانی کەم دەبێتەوە و وەکو جاران توانای دەردانی چەوری نامێنێ و پێست ئەو تەڕ و لووسییەی جارانی نامێنێ و بەرەو وشکبوونەوە دەڕوات! هەروەها هێزی جووڵە و چالاکی و جموجۆڵـــی کـــەم دەبێتـــەوە و مرۆڤ بە جوانی هەســـت بە خۆی دەکات کە دەڵێی بەو قۆناغەدا کە پێیدا ســـەرکەوتوە و گەیشـــتۆتە لوتکـــە بەرە بەرە دادەبەزێتە خوارەوە و بـــە هەمان پلیکانەدا دێتە خوارەوە کە پێیدا سەرکەوتوە. کە هی یەکەمیان قۆناغی گەشەکردن

بوە و ئەمەی ئێستا قۆناغی داکشان و لاوازبوونە.

شاعیر (موحسین شوانی) دەڵێ:

بەهاری تەمەن بەسەرچوو

لە ناکاو گەیشتمە پایز.

گوڵی لاوی کە هەڵوەری

هەر خەزانە عومری ئازیز..

مەرگ هاتۆتە بەر دیدەم

کێ دایدەخات ئەم دەرگایە.

بە تەنیایی جێیان هێشتم

گەنجی و تەمەن

لەم دونیایە...

ژینی لاویم ڕابورد هەمووی

لە نێو کۆڕی بەزم و ئاهەنگ

ئەمڕۆ پیری هاتۆتە ڕێم

بە گۆچان و

سەدان ئاستەنگ.

تا تەمەن تامی تیا بوو

وازی نەهێنا ئارەزوو

لە دوا چرکەی عومری دونیام

بە ئومێدی بەخشینی خوام.

نرخی تەمەن هەر لای پیرە

پڕ بەهایە ئەم کالاّیە.

هەموو دونیا گەر ببەخشی

نایەتەوە ئەم سەرمایە...

بەڵـــێ ئیماندارانی بەڕێز: قۆناغـــی پیری لە ژیانی مرۆڤدا، وەکو هەر قۆناغێکی ژیان ڕەحمەتە، پیر بە خۆیدا دەچێتەوە و کتێبێکی گـــەورە دەبێ لـــە ئەزموون. پاشـــان قۆناغێکی زۆر پـــڕ بایەخە بۆ تەوبەکـــردن و ئاوڕدانەوە لە ژیانی ڕابردوو، کە چی کردوە لە کاتی گەنجی و گوڕ و هێزیدا و چۆن پێویستی بە بەخۆداچوونەوە هەیە و لە دەرگای تەوبە دەدات و فرمێسکی پەشیمانی بە چاوە کزەکانی و ســـەر ڕیشە سپییەکەیدا دێتەخوارەوە و ئەوکات دەرگای ڕەحمەتی خوای لەسەر دەکرێتەوە و بە ڕووی سپییەوە بەرەو لای پەروەردگاری دەگەڕێتەوە. کەواتـــە: پیری ڕەحمەتە و پیری مەردیش ئەوەیە کە ئەو ڕەحمەتە لە دەست نەدا و ڕەحمەتی خوای (ڕەحمان و ڕەحیمی) تێدا بە دەست بێنێ.

بۆ ئەو کەسەش کە کەسێکی بە ساڵاچووی دەکەوێتە لا، جا باوکی بـــێ، یان دایکی بێ، پووری بێ، خـــاڵ و مام و باپیرە و داپیرەی بێ، وەکو پێشتر باسمان کرد. ئەوە هۆکاری چوونە بەهەشتیەتی. بە هۆی بەرەکەتی ئەو پیرەوە، خوای گەورە لە بەلاّ و موصیبەت دەت پارێزێ، کەفارەتـــی گوناهی کەبیرەیە، جیهـــادە و لە ناو ماڵی خۆتدا دەیکەی، بەرەکەتی ســـەر ســـفرە و ناو ڕزق و ڕۆزییە، جا لە ناو بەساڵاچواندا خوای گەورە بە تایبەت باسی دایك و باوکی کردوە کە لە کاتی پیریدا

زیاتر ئاگاداریان بین. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ۚ إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴾ الإسراء: ٢٣

مانـــای ئایەتەکە بە کـــوردی و بەکورتی ئەمەیە: پەروەردگاری تۆ بڕیاری داوە کە جگە لەو کەسی تر نەپەرستن. هەروەها بڕیاری داوە چاکەکاریـــش بن لەگەڵ دایك و باوکتانـــدا. هەرکاتێك یەکێکیان یان هەردووکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ تەنانەت ئۆفیان لە دەست مەکە و هەرگیز پیایاندا هەڵمەشاخێ و هاواریان بە سەردا مەکە. بەردەوام قسە و گفتوگۆت لەگەڵیاندا با چاك و جوان و بەجێ بێت..

ئیماندارانی بەڕێز: ئەگەر بە وردی لە وشـــە بە وشـــەی ئایەتەکە ورد بینەوە، کە لێـــرەو لە تەواوی قورئاندا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، کە تەنها یەك پیتیش بێ مەبەســـتێکی گەورە نەهاتوە. دەبینین کە: خوای گەورە ئاگادارمان دەکاتەوە و دەفەرموێ: ئەی مرۆڤ تۆ تەنها بۆ بەندایەتی خوا دروست کراوی و نابێ هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار بدەی. وە هەروەها خوای گەورە لەگەڵ باســـی عیبادەتی خۆیدا باسی چاکەکردنـــی لەگەڵ دایـــك و باوك کردوە. کە ئەمـــەش گەورەیی و خزمەتکردنـــی دایك و باوکمان بۆ دەردەخات. ئەگەر هیچ شـــتێ لە دوای عیبادەتـــی خوا لـــە خزمەتکردنی دایك و باوك گەورەتر بوایە، خوای گەورە باسی ئەوەی دەکرد.

بەڕێـــزان، ســـەرنجی وردەکاریەکـــی گـــەورەی قورئان بـــدەن: بۆ عەبدایەتی خوا دەفەرمـــوێ: عیبادەتی غەیری خوا مەکە (بەنەفی).

بەڵام بۆ دایك و باوك نافەرمویٚ: (لاتَسْیئوُا لِلْوالِدَیْن). کەواتە: نەك هــەر نابیٚ خراپە دەرهەق بە دایك و بــاوك بکریٚ، بەڵکو نابیٚ بیر لە ئازاردانیشــیان بکرێتەوە. چونکە: (نَفي العَیْب عَمَّنْ لایَسْــتَحِقُّ العَیْــبَ عَیْــبٌ). وەکو بڵێــی: فلاّن پیاو چاکە عــەرەق ناخوا.. ئەمە عەیبدارکردنە!.

بەڵــیٚ ﴿ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾ باســی ئەوە ناکات کــە ئەو دایك و باوکــە کافرن یان موســڵمان، بەڵکو دەبیٚ ڕۆڵــە لە خزمەتی دایك و باوکیــدا بــیٚ، ئەگەر کافریش بــن، تەنها ئەگەر دایــك و باوك پێت بڵێن وەرە کافربە و لە ئیسلام پەشیمان ببەوە. ئەو کاتە بە قسەیان ناکــەی. ئەینا لە هەموو حاڵەتێکــدا دەبیٚ چاکەکار بی بەرامبەریان، ئەمجــا دەفەرمویٚ: ئەگــەر یەکیٚ لە دایك و باوکت، یان هەردووکیان کەوتنــە لای تۆ ﴿ عِندَكَ ﴾ پێویســتیان بە تۆ هەبوو کە خزمەتیان بکــەی، لــە چ کاتێکدا؟! ﴿ ٱلْكِبَرَ ﴾ لە کاتی بە ســالاّچووندا. بە پیری و پەککەوتەیی، کە بە ڕاستی قۆناغێکی حەساسە. چونکە ئەو پیرە بە گەنجی دەی بەخشــی، ئێســتا دەبێتە وەرگر، جاران ڕەئیس عائیلە بوو. ئێستا کوڕەکەی بۆتە ڕەئیس عائیلە و ئەم بۆتە ئەندامی خێزان، جاران پارە پەیداکەر بوو. ئێســتا خەرجکار و پارە خۆر، ئا لــەو کاتەدا دەبیٚ ئاگات لە بواری دەروونیان بیٚ و قســەیەك نەکەی کــە دڵیان ئازار بــدات، تەنانەت نابیٚ بڵێی (ئــۆف) نەوەك بزانیٚ کە لێــی وەڕس بووی ﴿ وَلَا تَنْهَرْهُمَا ﴾ (نَهــر) دەنگ بەرزکردنەوەیە بیٚ ئــەوەی فکــر و عەقڵی لەگەڵدا بیٚ، وەکو ئــەوەی باوکت یان دایکت،

بــە هۆی پیریەوە لەرزۆك بوو. پیاڵە چایەکەی، یان ئاوەکەی ڕشــت تۆش بێ هیچ مەبەستێك، بێ تورەبوونێك لێیان، یەکسەر وتت: ئای ئەوە چیت کرد، ڕشــتت؟! نابێ ئەمەشــیان پێ بڵێ ی. ﴿وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾ سُــبْحانَ الله قورئــان چەند وردە لــە دەربڕیندا، کە هەر وشــەیەکی تایبەتە و مانای تایبەتی خۆی هەیە. نافەرموێ: (وَقُــلْ لَهُما قَوْلاً حَسَــناً). بەڵکو ﴿قَوْلًا كَرِيمًا﴾ بەکار دێنێ. بە مانای دەبێ قســەکەت بەخشینی تێدا بێ، چۆن پارەبەخشین بە بێ ڕیا و منەت بە کەســێکی ئاتاج دڵخۆشــی دەکات، ئاواش قسەی جوان و پوخت ئەو کەســە بە ساڵاچوە دڵخۆش دەکات. هەروەها لە ﴿قَوْلًا كَرِيمًا﴾ ئەوە تێ دەگەین: کە کەسی وا هەیە هیچ قسەی ناخۆش بە دایك و باوکی بە ســاڵاچووی ناڵێ، بەڵام قســەیەکی خۆشیشــیان لەگەڵ ناکات. ئەمەش بە قســەی خوای نەکردوە. ﴿قَوْلًا كَرِيمًا﴾ ئەوەیــە: ئەگەر باوکت، یان دایکت، لە کاتی پیری و پەککەوتەییاندا بــە باوەش برد بۆ ســەر ئاو و پاکت کــردەوە، بە ڕوویەکی خۆش و زمانێکی نەرمەوە پێی بڵێی: تو خوا باوە گیان، دایە گیان، شــەرەفی ئــەوەم پێ ببەخشــە کە لــە خزمەتتا بم و بە دەســتی خۆم پاکت بکەمەوە، بەڵکو بتوانم کەمێکی زۆر کەم لە ئەرکی سەرشــانی خۆم بەرامبەرت جێبەجێ بکەم، ئای تۆ چەندە ئاوا خزمەتی منت کردوە، بــۆ تۆ کەمت من خاوێن کردۆتەوە؟! بەم شــێوەیە پێی دەڵێی: نەك هــەر منەتت بە ســەردا ناکەم، بەڵکو ئەمە وەفــاداری نواندنە، نەك چاکە لەگەڵکردن. چونکە چاکە لەگەڵکردن ئەوەیە بەرامبەر کەسێك

چاکە بکەی، کە ئەو پێشــتر هیچ چاکەی لەگەڵ تۆ نەکردبێ. بەڵام وەفــاداری ئەوەیــە: جەزای چاکە بە چاکە بدەیتەوە، لە کۆنیشــەوە وتــراوە (لَيسَ البادِيءُ المكافــِيء). دەی هەرگیز چاکەی تۆ ناگات بە چاکەی دایك و باوکت لەگەڵت.

بەڕێزان بەشــێکی تر لە مانای ﴿ قَوۡلٗا كَرِيمٗا ﴾ ئەوەیە: ئەگەر باوك و دایکی پیرت شــتێکی بە نرخی ماڵەکەتیان شــکاند، وە پێی دڵناڕەحەت بوون، تۆ نەك هەر نەڵێی بە خوا حەیفە ئەوە شکا، لەوە دەســت ناکەویتەوە، بەڵکو بڵێی: بە خوا باش بوو شــکا دەمێك بوو بیرم لە گۆڕینی کردبۆوە بە شــتێکی جوان و باشتر، بەڵام دەرفەتم بۆ نەدەڕەخسا. یاخوا دەســتت خۆش بێ کە بە دەســتتەوە شــکا و ڕزگارمان بوو لێی!! بەم شێوەیە ئەو دایکە یان ئەو باوکە هەست بە غەریبی و نامۆیی ناکات و دەروونی ئازار ناچێژێ..

بەڵێ، هەر لەمانای ﴿ قَوۡلٗا كَرِيمٗا ﴾ ئەوەیە: ئەگەر لەو پیریەدا نەخۆش کەوت، بڵێ ی: إِنْشَــاءَ اللّٰه هیچ نیە. هەر زوو خوا شــیفات بۆ دەنێرێ. ئاها فلاَن کەســیش هەمان نەخۆشــی تۆی هەبوو کەچی چەند زوو خوای گەورە شــیفای بۆ نارد. ئێستا هەر دەڵێی قەت ئەو نەخۆشیەشــی نەگرتوە. نەك پێی بڵێی: بە خوا وا دەشــتبەم بۆ لای دکتــۆر بەڵام بە خــوا زەحمەتە چاك ببی!! ئەمە لە دەروونەوە دەی ڕوخێنــێ!. جا ئەو ئەی کوڕ و کچانەی کە باوك و دایکتان بە پیری و کەنەفتەیــی و نەخۆشــی و لاوازی وەکــو ئەمانەتێکــی خوایی لە ماڵەکانتاندان، بیر لەوە بکەرەوە: کاتێ کە تۆ منداڵ بووی و ئەم دایك

و باوکە بەخێویان دەکردی. نەك هەر لێت بێزار نەبوون، بەڵکو هەتا تۆ لاوازتر و بێ دەسەڵاتتر بووی. کە تازە لەدایك بووبووی لە هەموو کاتێك زیاتریان خۆش دەویستی. کاتێ نەخۆش دەکەوتی زیاتریان خۆش دەویستی لەو کاتەی کە ساغ بووی..

ئا لێرەدا پێم خۆشە ئاماژە بکەم بە لاوێکی خواناس کە: باوکێکی پیری بەساڵاچووی هەبوو، دەستی لەرزۆك ببوو. هەر خواردن و خواردنەوەیەکی بخواردایە بە خۆیدا دەڕشت. ئەم کوڕە باشە، صاڵحە، نەك هەر بە دەستەسڕ پاکی بکاتەوە، بەڵکو دەچوو بە زمان ئەو خواردنەی لەسەر دەستی یان قاچی یان بیجامەکەی باوکی دەلستەوە و دەیگوت: باوکە گیان یاخوا خوا پاداشتت بداتەوە و لە خواردنی بەهەشت دەرخواردت بدات، وەکو ئەوەی کە تۆ ئەم خواردنە خۆشەی سەر لاشەی خۆتت پێ بەخشیم، کە ئەگەر بەر جەستەی تۆ نەکەوتایە هەرگیز ئاوا بە تام نەدەبوو..

ئیمانداران: تا ئێرە دایك و باوك هەر پیرن، بەڵام زەلیلی سەرجێگا نین، قورئان دوای ئەوە باسی ئەو قۆناغەشمان بۆ دەکات کە باوك و دایك لە دەست و قاچی خۆیان بوون و لە جێگادا کەوتوون و چاوەڕێی کەسێکن قومە ئاوێك، پارووە نانێکیان بداتێ. دەفەرموێ:

﴿ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحۡمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ٢٤ ﴾ الإسراء: ٢٤

واتە: باڵی میهرەبانی خۆتیان بۆ ڕاخە و ملکەچ بە بۆیان، نزا بکە و بڵێ: پەروەردگارا ڕەحمیان پێ بکە و میهرەبان بە بۆیان. هەروەکو

چۆن ئەوان ڕەحمیان بە من کردو منیان پەروەردە کردوە بە بچوکی و منداڵی..

بەڕێــزان: هەروەکو پێشــتر وتمــان قورئانی پــڕ بەرەکەت هەر وشەیەك بەکار دێنی، تایبەتمەندی و ئاماژەی خۆی تێدایە. لێرەشدا کــە دەفەرموێ: ﴿ وَٱخۡفِضۡ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ ﴾ ئەمە باڵندە ئەنجامی دەدات. کەواتە: خوای گەورە ئاگاداری مرۆڤ دەکاتەوە کە چۆن باڵندە باڵەکانی خۆی نزم دەکاتەوە و ڕای دەخات بۆ بەچکەکانی و لە ئامێزی میهرەبانیان دەگرێ، بە ڕاستی مرۆڤ شتی زۆر سەرنجڕاکێش دەبینێ. کاتــێ کە ئــەم باڵندەیە بەو هەموو ســۆز و خۆشەویســتییەوە ئەو خواردنە بە ناڕەحەتی و ماندووبوونێکی زۆرەوە پەیدا دەکات، پاشان لە دەمی خۆیەوە دوای شــلکردنەوە و ئامادەکردنی بۆ هەرســبوون، دەیخاتــە دەمــی بەچکەکانیەوە، ئەو خۆراکەی بــۆ ئەو زەرنەقووتە بچکۆلەیە وا لێ کردوە کە زۆر بە ئاسانی بتوانێ قووتی بدات. ئەمجا سەیرکە ئەو بەچکە بێدەسەلاتە کە هەر دەزانێ دەم بکاتەوە کە ئەو خواردنە دەخوات، هەســت دەکات دایك و باوکەکەی چەندە شادمانن، بۆیە هەســت ناکات هیچ منەتێکی لە سەر بێت. بۆیە زۆر خۆشحاڵە و دەنگ و ئاوازی خۆشــی لێوە دەبیســترێ.. ئای چ دیمەنێکی جوانە کاتێ کە ئەو دایك و باوکە بەوپەڕی خۆشەویســتی و میهرەبانیەوە، بێ هیــچ منەتکردنێك پارووی دەمی خۆیان کە زۆرجار خۆیان پێی موحتاجــن و برســیانە، دەیخەنە دەمی ئەو بەچکەیــەوە، بێ هیچ منەتکردنێــك ئەو بەچکانەش خۆشــترین تــام و چێژ و لەزەتی لێ

دەکەن. جا خوا دەفەرموێ: ئەی ئەولاد، ئەی کوڕ و کچ کاتێ دایك و باوکت وەکو ئەو بەچکە ساوایەیان لێ هاتەوە، وایان لێ هات پارووبان بە دەمەوە بکەی. تۆش مەردانە ئاوا وەکو باڵندەکە بە خۆشەویستی و سۆزەوە باوەشی میهرەبانیان بۆ بکەوە، نەك لێیان بێزار بی و خوا خوات بێ بمرن.

دەی مــوژدە بێ بۆ ئەوانەی کە دایك و باوکیان، یان یەکێکیان بە پیــری ئاوا وەکــو بەچکەی باڵندە خزمەت دەکــەن.. با گوێ بۆ ئەم بەســەرهاتە بگرین. دەگێڕنەوە: موســا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێــت) کە یەکێکە لــە پێغەمبەرانی (أُولُو العَــزم)، ڕۆژێکیان داوا لە خوای پەروەردگار دەکات کە دراوسێی خۆی لە بەهەشتا پیشان بدات، هەر لە ئێستەوە ئەو کەسەی نیشان بدات کە لێی نزیکە لە بەهەشتدا (دیارە پلــەی پێغەمبەرایەتی لە پلەی هەموو مرۆڤەکان بەرزترە لە بەهەشتا، مەبەست ئەوەیە ئەو کەسەی کە لە ئوممەتەکەی موسا لە بەهەشــتا لە موسا پێغەمبەرەوە زۆر نزیکە). خوای گەورە فەرمووی: بــڕۆ بــۆ لای قەصابێك لە شــاری فلان لە بازاڕی فــلان!! حەزرەتی موسا فەرمووی: خوایە گیان، قەصابێك، گۆشتفرۆشێك!، خوای گەورە فەرمــووی: بەڵێ، حەزرەتی موســا ڕۆیشــت و قەصابەکەی دۆزیەوە و نیوەڕۆ وەختی دوکان داخســتن داوای لــە کابرای قەصاب کرد کە نیوەڕۆ بیباتەوە ئەویش مەردانە پێشوازی لێ کرد و کە چوونەماڵەوە کابرای قەصاب جۆلانەیەکی لە ناوەڕاستی ژوورەکەیدا هەڵواسی بوو، دای گرت و پیرەژنێکی لێ دەرهێنا کە وەکو منالی ساوای لێ هاتبۆوە

لە پیریدا، بە باوەش بردی پاکی کردەوە و جلوبەرگی خاوێنی لەبەر کرد و پارچەیەك جگەری بۆ برژاند و بۆی وردورد کرد و بە هەندێ نانی بچکۆلەوە دەی کرد بە دەمییەوە و ئاوی دایە هەتا تێری خوارد. حەزرەتی موسـا سـەرنج دەداو هیچ نالێ کـە دایکەکە تێری خوارد هەردوو دەسـتە بچکۆلە باریکەکەی بۆ لای ئاسـمان بەرزکردەوە و لەژێر لێوەوە هەندێ قسـەی کرد، کە حەزرەتی موسـا لە قسەکانی نەگەیشـت. ئەمجا خەوی لێ کەوت و کابرای قەصابیش خسـتیەوە جۆلانەکەوە و بە شـوێنەکەی خۆیدا هەڵی واسـییەوە!. ئەمجا هات بۆ لای حەزرەتی موسا کە نەیدەزانی ئەوە، خواردن و ئاوی بۆ هێنا و زۆر بەخێرهاتنـی کرد و حورمەت و ڕێزی بۆ دەربڕی! حەزرەتی موسا فەرمووی: ئەوە چیتە؟! وتی: ئەوە دایکمە لە پیریدا ئاوای لێ هاتووە، غەیری منیش کەسـی نییە. منیش تا ئێسـتا ژنم نەهێناوە، لە ترسـی ئـەوەی نەوەکو لە خزمەت دایکمدا نەبێ و شـەرمەزاری دایکـم ببـم. بۆ خـۆم قەصابی دەکەم و بەیانی و نیـوەڕۆ و ئێوارە و شـەوان ئاوا وەکو مناڵ خاوێنی دەکەمـەوە و نانی دەدەمێ و لەو جۆلانەدا هەڵی دەواسـم لە ترسی ئەوەی نەوەکو مارێك، پشیلەیەك، حەشەرەیەك، لە سەر زەوی ئازاری بدات!! حەزرەتی موسا فەرمووی: ئـەی ئەوە چی بوو کە دەسـتی بەرز کـردەوە و وەکو دوعا بکات وا بـوو؟! وتی: بەڵێ ئەوە هەموو جارێ دوعام بۆ دەکات و دەڵێ خوایە من هیچم بەرامبەر ئەم کوڕە چاکەم پێ ناکرێ، خوایە بۆ خۆت بی کەی بە دراوسێی حەزرەتی موسا پێغەمبەر لە بەهەشتدا!!. حەرزەتی

موسا هەستا و باوەشی بە کابرادا کرد و ماچی کرد و موژدەی دایە کە دایکی دوعاکەی گیرا بووە و ئەمیش موسا پێغەمبەرە!! ئەمە پێچەوانەکەشی ڕاستە، کە هەرکەسێك بێحورمەتی و کەمتەرخەمی بەرامبەر بە سالاّچوویەك بکات و درێغی بەرامبەر بکات، هەمان چارەنووس تووشی خۆشی دەبێت، با بە یەکەوە سەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەین؛ کوڕێك دوای ئەوەی باوکی دەمرێ، دایکی لە لای دەمێنێتەوە و پیر دەبێ و سەرەنجام نابینا دەبێ، ئەم کوڕە ژن و منالّی دەبێت و کاری بازرگانی دەکات و جاری وا دەبێ بە مانگ ناکەوێتە مالّەوە. بەلاّم بە ژنەکەی دەلّێ: ئەوە دایکم ئەمانەتی تۆ بێ و گەردنت ئازا نەبێ دایکم حەزی لە چی بوو بۆی ئامادە نەکەی. ئەو هەموو کەو و کۆتر و مریشك و پەلەوەرەمان هەیە. چی حەز لێ بوو ئەوەی بۆ ئامادە بکە. من بازرگانم و بۆم ناکرێ لە مالّەوە بە دیار دایکمەوە دابنیشم. ژنەکەش وتی: خەمت نەبێ وەکو دایکی خۆم ئاگام لێ دەبێ، بەلاّم ئەم بووکە لە دلّەوە زۆر لە خەسوی پەست دەبێ و بە درکی بەرپێی خۆی دەزانێ لە مالّەکەیدا، بۆیە هەر کە مێردەکەی سەفەر دەکات، لە خەسووی دەپرسێ: حەزت لە چییە؟! دەلّێ: حەزم لە گۆشتی کەوە بە برژاوی. ئەویش دوو کەو سەردەبڕێ و وا دەکات کە خەسووی گوێی لە دەنگی کەوەکان بێت لە کاتی سەربڕیندا و خەلّووز ئامادە دەکات و لەو لاشەوە مالّیان لە نزیك ئەستێلە ئاوێکی گەورە دەبێ کە پڕە لە بۆق، دەچێ چەند بۆقێکی گەورە دەگرێ و دەیانکوژێ و لە شیشی دەدا و کەوەکان بۆ خۆی

و منالەکانــی دەبرژێنێ و بۆقەکانیش بۆ خەســووی!!، ئەم پیرەژنە بەسالاچوە نابینایە دەڵێ: ئەرێ ئەم گۆشتە هەر ئێسقانە، تامی زۆر ناخۆشە، ئەمە چ جۆرە کەوێکە؟! بووکەکەشی دەڵێ: تۆ خۆت ددانت لە دەما نەماوە و تامی دەمت گۆڕاوە و خۆت نەخۆشی، خەتای گۆشت کــەو چییە! بخۆ و دەنگ مەکــە!! بەڵێ ڕۆژان ڕۆژیان لە دوایە، ئەم خەســوە (دایکی کوڕەکە) دەمرێ و بووکەکەشی پیر دەبێ و سُبْحانَ اللّه ئــاوا نابینا دەبێت کــە کاتی خۆی خەســووی نابینا بوو!! ئەم ئافرەتەش بووکی دەبێ و ماوەیەك کە خواردنی بۆ دادەنێن، هەســت دەکات گۆشــتێکی زۆر تام ناخۆشــە. بۆیە لە بووکەکەی دەپرسێ: لە بەرخاتــری خوا پێم بڵێ ئەو گۆشــتەی بۆ منت برژاندوە گۆشــتی چییە؟! ئەویش دەڵێ: ئامۆژن گۆشتی کەوە، یان کۆترە، یان مریشکە، هەرجارەی شــتێکت بۆ سەردەبڕم! خەسوەکە -بوکەکەی دوێنێ- بە بووکەکەی دەڵێ: کچم بەلام من دەتوانم ســوێندت بۆ بخۆم کە ئەوە گۆشــتی بۆقە!!! بووکەکەی دەڵێ: ئەوە تــۆ دەڵێی چی، بۆقی چی؟! خەسوەکە دەڵێ: من هیچ لۆمەی تۆ ناکەم، خەتای تۆ نیە و بەرهەمی کــردەوەی خۆمە. بە خوا منیش کاتی خۆی ئاوا بۆقم بۆ خەســووم دەبرژانــد و بە گۆشــتی کەو و پەلەوەر دەرخــواردم دەدا. وا ئەمڕۆ هاتــەوە ڕێگای خــۆم و (الجَزاءُ مِنْ جِنْسِ العَمَــل). ئەمجا بووکەکەی پەشــیمان دەبێتەوە و بڕیار دەدات ئیتر کاری وا نەکاتەوە بۆ ئەوەی بەیانی بۆقی بۆ نەخرێتە ســەر خواردن و بەگۆشــتی کەو لە سەری حیساب بکرێ. لەبەر ئەوە تەوبەی کرد و خزمەتی خەسووی کرد.

بەڵێ ئیمانداران: پاشــان کە باوك و دایك گەیشــتنە قۆناغێك کە ئیتر ئاگایان لە خۆیان نەما و لە خواردن و خواردنەوە و قسەگوتن و گوێ لە قسەبوون، بوون. لەو کاتەدا خوای گەورە دەفەرموێ، دوعایان بۆ بکە و بڵێ: ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرٗا ٢٤﴾ الإسراء: ٢٤

جا لێرەدا سەرنج بدەنەوە لەو هەموو وردەکاریەی کە لە قورئاندا هەیە، دەفەرموێ: ﴿كَمَا رَبَّيَانِي﴾ لێرەدا ئەگەر (کاف)ەکە بۆ تەشــبیه بــێ ئەوە مەعنای وایە: خوایە گیــان ڕەحم بە دایك و باوکم بکەی هەروەکو ئەوان لە منالی و کاتی ســاوایی و بێدەســەلاتی مندا، سۆز و میهرەبانیــان هەبــوو بەرامبەرم و پەروەردەیــان کردم.. وە ئەگەر (کاف)ی ﴿كَمَا رَبَّيَانِي﴾ بــۆ تەعلیــل بێ، ئــەوە ماناکەی وای لێ دێ: (إرْحَمْهُمــا لأنَّهُما رَبَّياني صَغيــراً). خوایە ڕەحمیان پێ بکە چونکە ئەو دایك و باوکەم لە منالێدا، لە کاتی بێدەســەلاتی و موحتاجی و لاوازیمدا ڕەحم و بەزەییان بە مندا هاتەوە و خزمەتیان کردم و سۆز و میهرەبانیان بە سەردا باراندم.

زانایــان دەفەرمــوون: وشــەی ﴿رَبَّيَانِي﴾ هەموو پــەروەردەکار و بەخێوکارێکی منداڵ دەگرێتە خۆی. با ئەو بەخێوکارە دایك و باوکی منداڵەکــەش نەبن. بە ڕاســتی ئەمە موژدەیەکــی گەورەیە بۆ هەر کەســێ کە منالی غەیری خۆی بەخێــو دەکات و ناهێڵێ بێناز بێ و بفەوتێ. وەکو ئەولادی خۆی خزمەتی دەکات و تێی دەگەیەنێ و پێی دەگەیەنــێ، بە تایبەت ئەو بەخێوکــراوە منالە هەتیو بێ نازدارێکی بــێ باوك و دایك بێ یان لە حوکمــی منالی هەتیودا بێ، باوکی یان

دایکی بە لاشە زیندوو بێ، بەڵام عەقڵی لە دەست دابێت، یان بەندی هەمیشـەیی کرابـێ و نەتوانێ لە خەمی پێگەیانـدن و تێگەیاندنی کۆرپەکەیدا بێت، هەرکەس ئەم منداڵە بەخێو بکات و پەروەردەیەکی موسڵمانانەی جوانی بکات، بەر ئەو موژدەیە دەکەوێت.. وە موژدەیەکی گەورەشی تێدایە بۆ دایك و باوکان کە هەرچەندە ئەولادەکەشی خراپ بـێ، دوعاش بۆ دایك و باوکی نەکات، خزمەتیشـیان نەکات، سـالار نەبێ و لاسار بێ، مادام تۆ بە پێی دەستوری ئیسلام بەخێوت کردبێ و پـەروەردەت کردبـێ و کەمتەرخەمیت نەکردبێ، ڕەنجبەخەسـار نابی و چۆن تۆ ڕەحم و سـۆزت هەبووە لەگەڵ منالە سـاواکەت ئاوا خوای گەورەش ڕحمت پێ دەکات و بەزەیی پیاتا دێتەوە و پاداشتت دەداتەوە. چونکە ئایەتـی: ﴿وَقُل رَّبِّ ٱرۡحَمۡهُمَا﴾ فەرمانی خوایە و ئەگـەر ئەولادیش نـەی کات، خوای گەورە هەر ڕەحمت پێ دەکات و ئەوەش یەکێکە لە سودی منال بۆ دایك و باوکی. لە کۆتاییدا، قورئان دەفەرمـوێ: ﴿رَّبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا فِي نُفُوسِكُمۡۚ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلۡأَوَّٰبِينَ غَفُورٗا ﴿٢٥﴾﴾ الإسراء: ٢٥

واتـە: پەروەردگارتـان زۆر زاناترە لە خۆتان بە وەی کە لە دڵ و دەروونتانـدا هەیـە، خۆ ئەگەر چاك و پاك و ڕێکوپێك بن. ئەوە بە ڕاسـتی ئیتر ئەو زاتە بۆ تەوبەکاران و پەشـیمانان زۆر لێخۆشـبوو بەخشندەیە.

بەڕێزان: لێرەدا لە خزمەت ئەم ئایەتەدا پێم خۆشە هەڵوێستەیەك بکەین و بچینە خزمەت زانای گەورەی ئیسـلام. موفەسیری قورئان:

(شێخ محمد متولی الشعراوی) کە دەفەرموێ: مرۆڤ کاتێ لە خزمەت ئەم ئایەتەدا دەوەستێ لە خۆی دەپرسێ: باشە بۆچی ئەم ئایەتە باسی نیفاق دەکات، لە کاتێکدا کە لە سەرەتای باسەکەوە باسی عیبادەتی خوا و چاکەکاری و خزمەتکردنی دایك و باوکی دەکرد؟! لێرەدا خوای کاربەجێ دەیەوێت کە ئاماژەیەکی گرنگمان پێ بدات و تێمان بگەیەنی و ئاگادارمان بکاتەوە کە چۆن نیفاق و دووڕوویی و درۆ لە ئیمان بە خوا و بیروباوەڕی موسڵمانانەدا ڕوو دەدات و کەسی دووڕوو بە درۆ شایەتمان دێنێ، بەڵام لە ناخی دڵەوە بڕوای بە خوا نییە. بە هەمان شێوەش لە چاکەکردن لەگەڵ دایك و باوکدا نیفاق و دووڕوویی دەکرێ، چونکە هەندێ کوڕ و کچ هەیە لە خزمەت دایك و باوکیدا دەبێ و خزمەتیان دەکات، بەڵام لەبەر خاتری خوا نییە. لەبەر دڵسۆزی و خۆشەویستی ناو ناخی دڵی نیە بەرامبەر دایك و باوکی، بەڵکو بۆ ئەوەیەتی کە لەبەر چاوی برا و خوشکەکانی خۆی پێوە هەڵکێشێ، یان بۆ ڕیایی وا دەکات تاوەکو خەڵکی مەدحی بکەن و بڵێن بە ڕاستی مەردە و چاك خزمەتی دایك و باوکی کردوە. بەڵام خوای گەورە ئاگای لە ناخ و دڵیەتی کە ئەم خزمەتکردنەی دایك و باوکی لەبەر خاتری خوا نییە و دڵسۆزی نییە بۆ دایك و باوکی و لەبەر حورمەتی ئەوان نییە.. یاخود: لە کوڕ و کچ هەیە لە کاتێکدا کە خزمەتی دایك و باوکی دەکات. بەڵام لە دڵەوە لێیان وەڕسە و دەڵێ: خوایە گیان لە کۆڵیان بکەیتەوە و ڕزگارم ببێ لە دەستیان. ئەمەش ڕیابازە و لە چاکەکارانی دایك و باوك حیساب ناکرێ!!

بەرێــزان: لە ئایەتەکەدا: ﴿ إِن تَكُونُواْ صَٰلِحِينَ ﴾ باس لە ئیخلاص و دڵســۆزیە لــە خزمەتکردنی دایك و باوکــدا و دوور لە هەموو ڕیا و مــەدح و ســەنایەکی خەڵکی. هەروەهــا ﴿ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴾. ئاماژە بەوە دەکات کە ئەگەر ئەولاد لە خزمەتکردنی دایك و باوکیدا قســەیەك، کردەوەیەکی هەڵەشــی لێ ڕوودا، مادام عەمدی نەبوە و بێ ئاگابوە و داوای لێخۆشــبوونی لە خوا کردوە. إِنْشاءَ اللّٰه خوا لێی دەبووریێ و لە ئەجر و پاداشتەکەی کەم ناکاتەوە.

بەڵێ ئیمانداران: ئەمە ئیسـلامە کە ئــاوا ڕێزی مرۆڤ دەگرێت، ســەیر کە ئەم ناوە جوانانە کە ناخی مرۆڤ دەهەژێنن. باوك، دایك، چەند شــیرینە، نابێ بە باوکت بڵێــی: حاجی!! یان بە دایکت بڵێی: حاجی ژن. بۆ خۆشەویســتیش ناتوانــی وایان پێ بڵێی، چونکە هیچ وشەیەك جێگای باوکە و دایکە گیان ناگرێتەوە. پاشان سەیری ناوی (پوور، مام، خاڵ، خەســوو، خەزوور....هتد) بکە. (دایکی شــیری) هەر کەسێ شــیرت لێ خواردبێ، بە مەرجە شــەرعیەکان، دەبێتە دایکی شیریت! وەکو دایکت حیسابی بۆ دەکرێ و دەبێ وەکو دایکت تەماشای بکــەی و لە خزمەتیــدا بی و حورمەتی بگری. پاشــان: هەموو پیر و بە ســاڵاچوویەك دەبــێ ڕێزی لێ بگیــرێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (أَمَرَنِي جبريل أَنْ أُقَدِّمَ الأَكابِر).

واتە: جوبریل فەرمانی پێ کردم بە وەی کە پیر و بە ساڵاچووەکان پێش بخەم.

وە هەروەها لە کاتی ئاوگێڕانی مەجلیســدا، پێغەمبەری خوا (ﷺ)

دەیفەرموو: (إِبْدَءُ وا بالأَكابِر) أَخْرَجَهُ أَبُويَعْلي. واتە: لە بە تەمەنەکانەوە دەســت پێ بکەن با لە پێشــدا ئەو پیر و بەساڵاچوانە ئاو بخۆنەوە. ئەمجــا بی دەن بە گەنجــەکان. ئیبن عومەر دەفەرمویٚ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (أَراني في المَنام أَتَسَّــوَكُ بِسواكٍ، فَجاءَني رَجُلان، أَحَدُهُما أَكْبَرُ مِنَ الآخَرِ، فَناوَلْتُ السِّواكَ الأَصْغَر، فَقيلَ لي كَبِّر، فَدَفَعْتُهُ إِلى الأَكْبَرِ مِنْهُما) رَواهُ البُخاري تَعْليقاً وَمُسْلِم مُسْنَداً

واتە: لە خەومدا ســیواکم دەکرد و دارسیواکەکەم بە دەستەوە بوو، لەو کاتەدا دوو پیاو هاتن بۆ لام یەکێکیان بەتەمەنتر بوو لەوی تریان. داوای ســیواکەکەیان لێ کردم، منیش دام بە وەیان کە تەمەنی کەمتر بوو. لە خەوەکەمدا پێم وترا: بیدە بەوەیان کە تەمەنی زیاترە، منیش لەوم وەرگرتوە و دام بەوەیان کە تەمەنی گەورەتر بوو.

بەڵێ، دەبێ ڕێزی هەموو پیر و بە ساڵاچوویەك بگیرێ. خۆ ئەگەر ئەو پیرە کافریش بوو دەبێ قەدر و حورمەتی مووی سپی بپارێزرێ. (زانای گەورەی ئیسلام -ئەبو یوسف- لە کتێبە بە نرخەکەی خۆیدا -الخَــراج- باس دەکات و دەفەرمویٚ: خەلیفەی موســڵمانان عومەری کــوڕی خطــاب، بــە لای ماڵێکدا تێپــەڕی، لە بــەردەرگای ماڵەکەدا کەســێك ســواڵی دەکرد و داوای یارمەتی دەکرد، ئیمامی عومەر کە تەماشــای کرد، ئەم ســواڵکەرە پیاوێکی بە تەمەنی پشــت چەماوەی جوولەکەیە. حەزرەتی عومەر فەرمووی: ئەوە بۆ چی بەو تەمەنەوە ســواڵ دەکەی؟! کابرا نەیزانی ئەوە حەزرەتی عومەرە وتی: ناچاری و فەقیری و هەژاری لە لایەك و پیری و بەســاڵاچوویم لە لایەکی

تـــرەوە کە توانای کارکردنی جارانم نەماوە و ناچارم بۆ دابینکردنی بژێوی ژیانم، ســوالْ بکەم، ئەمە ســەرباری هەمووشی دەبێ (جزیە) بدەم بە موســڵمانان، چونکە بە ئــازادی عیبادەتی خۆم دەکەم و لە ســەر دینی خۆمم کە جولەکایەتییە و ئەرکی گەورەم لە سەر لاچوە و وەکــو هاووڵاتیەکــی ئازاد دێم و دەڕۆم. جــا منیش دەبێ (جزیە) بدەم وەکو (بەدەلی عەســکەری) وە بۆ پەیداکردنی پارەی جزیەکەش دەبێ سوالْ بکەم!.. ئیمامی عومەر کە ئەمەی بیست زۆر غەمبار بوو. دەســتی گرت و بردیەوە بۆ ماڵی خۆیان و زۆر خزمەتی کرد. پاشان بە خەزنەداری (بَيْتُ المال)ی وت: تەماشــای ئەم پیرە بە ســالآچوە و هاوتەمەنەکانــی بکە. (فَــوَ اللهِ ما أَنْصَفْناهُ. إذا أَكَلْنا شَــبِيبَتَهُ، ثُمَّ نَخْذُلُهُ عِنْدَ الهَرَمِ).

واتە: بە ڕاستی بێویژدانی و بێئینصافیە لەگەڵ ئەم پیرە جولەکەیە کە تا گەنج بوو پارەمان لێ وەردەگرتن، دەی دەبێ حکومەت لە پیریدا تۆڵەیان بۆ بکاتەوە و موچەی مانگانەیان بۆ دابین بکات. بۆیە دەستبەجێ جزیەی لەســەر ئەوانە لابرد و موچەی مانگانەی بۆ بڕینەوە. چونکە: ئەو پیر و بە تەمەنانەی ئەمڕۆ گەنجیەتی دوێنێی خۆیان لە خزمەتی ئەم وڵاتەدا بەخشیوە، دەبێ لە پیریدا تۆڵەی بۆ بکرێتەوە.

کەواتــە: واجبی سەرشــانی حکومەتــە موچەی تــەواو بداتە بە ســالآچوانی خانەنشــینکراو یان ئەوەی لە دائیــرەش نییە. موچەی باشی بۆ دابین بکرێ خۆ خزمەتی ئەم وڵاتەی کردوە بەگەنجی. نەك (سی) هەزاری بێوەژنانەی بە منەتەوە بدرێتێ.

خـــوای گەورە و میهرەبـــان، پیرەکانمان عاقیبـــەت خێر بکەی و گەنـج و لاوەکانمان زیاتر هیدایەت بدەی و ڕەحم بە هەموو لایەکمان بکەی. اللّهُمَّ آمین.

## سەرچاوەکان:

١. قورئانی پیرۆز و تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.
٢. ووزە، دەروازەیەك بۆ ئاوێزان بوون، پەری حمە جەزا، ل٥٧.
٣. دليل الانفس، دكتور: محمد عيزالدين توفيق، ص١٦٤.
٤. خلق المسلم، (محمد متولى الشعراوى)، ص٢٣٣، ص٢٤٦.
٥. موسوعة الحقوق الإسلامية، محمد المصرى، ج٢ ص٧٨٤.
٦. هەفتەنامەی (پەیام) ئۆرگانـــی ڕاگەیاندنی مەکتەبی تەنفیزی یەکیەتی زانایانی ئیسلام.

وتاری سێیەم بۆ مانگی ذي القعدة

# ماف و ئەرکی بە ساڵاچووان
## بەشی چوارەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز: لە وتارەکانی ڕابردوودا، بە ویست و فەزڵـــی خوای پـــەروەردگار لە خزمەت قورئـــان و فەرموودەکانی پێغەمبەردا (ﷺ) باسی ڕێز و حورمەتی کەسانی پیر و بەساڵاچومان کرد لەئاینی پیرۆز و بەرەکەتی ئیســـلامدا. لەم ووتارەشـــدا (إنْشـــاءَ اللّه) باســـی ئـــەوە دەکەین کە: کاتێ ئیســـلام ئـــاوا حورمەتی پیر و کەسی بە تەمەن دەگرێ، ئایا دەبێ مرۆڤی بە ساڵاچوو بۆ خۆی چۆن بێ؟! ئایا دەبێ کاتی پیریشی هەروەکو کاتی هەرزەکاری بێ؟! نەخێر، پێویستە کەسی بە تەمەن کۆمەڵێك تایبەتمەندی خۆی هەبێ وەکو:**

**١. پێویســـتە کەسی بە ســـاڵاچوو ڕێزی خۆی بزانێ و هەوڵی ئەوە بـــدات، دوای تەوفیقی خوای گەورە بـــۆی، کارێك بکات کە عاقیبەت خێر بێ. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:** (خَيْرُ النّاسِ مَنْ طالَ عُمُرُهُ وَحَسُـــنَ عَمَلُهُ، وَشَرُّ النّاسِ مَنْ طالَ عُمُرُهُ وَساءَ عَمَلُهُ) حَديث صَحيح رَواهُ الترمذي (٢٣٣٠) وَأَحمد (١٩٩٠٢) وَصَحَّحَهُ الأَلْباني في صَحيح الجامِع (٣٢٩٧)

**واتـــە: چاکترینی خەڵکی ئەو کەســـەیە کە تەمەنی زۆرە و کار و کردەوەی جوانە، خراپترین کەســـیش ئەو کەسەیە کە تەمەنی زۆرە،**

بەڵام کار و کردەوەی بەد و نالەبار و خراپە..

بەڵێ بەڕێزان: بە ساڵاچوویی و چوونە تەمەنەوە دەرفەتێکی زێڕینە بۆ بە خۆداچوونەوە، بۆ لە خۆپرسینەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُم مَّا يَتَذَكَّرُ فِيهِ مَن تَذَكَّرَ وَجَاءَكُمُ النَّذِيرُ فَذُوقُوا فَمَا لِلظَّالِمِينَ مِن نَّصِيرٍ ﴿٣٧﴾﴾ فاطر: ٣٧

ئەم ئایەتە قورئانیە باسی حاڵی دۆزەخیەکان دەکات، کاتێ گریە و زاری و هاوار و قیژە و ناڵەیان لە ناو دۆزەخدا لێ بەرزدەبێتەوە و بە کەساسییەوە دەڵێن: پەروەردگارا: دەرمان بهێنە و ڕزگارمان بکە لەم حاڵە، مەرج بێت کار و کردەوەی چاك ئەنجام بدەین. نەك ئەوەی کە جاران دەمان کرد. لە وەڵامیاندا خوا دەفەرموێت: ئایا ئەوەندە تەمەنمان پێ نەبەخشین؟ ئەوەی بیەوێت بیرێك بکاتەوە تیایدا بیر بکاتەوە؟! بێدارکەرەوەشتان بۆ هات. ئیمامی قورطوبی، لە تەفسیرەکەیدا ج٧ ص٢٧٦ لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا دەفەرموێ: مەبەست لە -النَّذير- بێدارکەرەوە (الشَّيْبُ) پیری و چوونە تەمەنەوەیە. هەروەها: قالَ إبْنُ عَبّاس وَالمُحَقِّقُونَ: مَعناهُ: (أَوَلَمْ نُعَمِّرْكُمْ سِتينَ سَنَةً) ئایا شەست ساڵ تەمەنمان پێ نەبەخشین کە لەو هەموو تەمەنەدا بیرێك بکەنەوە و بە خۆتاندا بچنەوە و گۆڕانکاریەك لە خۆتاندا درووست بکەن و تەوبە بکەن و بەرەو لای خوا بگەڕێنەوە؟! ئەم قسەیەی -إبنُ عبّاس -یش بە پاڵپشتی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی کەخۆشەویستمان فەرمویەتی: (أَعْذَرَ اللهُ إلى امريءٍ أَخَّرَ أَجَلَهُ حَتّى بَلَغَ سِتينَ سَنَةً) رَواهُ البُخاري

واتە: بە ڕاستی خوای گەورە مۆڵەتی داوەتە کەسێك کە تەمەنی پێ بەخشی تا عومری گەیشتە (٦٠) ساڵ. کە لەو ماوەیەدا بە خۆیدا بچێتەوە و بەرەو خوا بگەڕێتەوە.

قالَ العُلَماء: مَعْناهُ: لَمْ يترك لَهُ عُذراً، إذ أَمْهَلَهُ هذهِ المُدَّة) وَقالُوا: إنَّ أَهْلَ المَدينَةِ كانُوا إذا بَلَغَ أَحَدُهُمْ أَرْبَعينَ سَنَةً تَفَرَّغَ لِلْعِبادَةِ). بە مانای: هەر کەسێ خوای گەورە تەمەنی پێ بەخشی و نەی مراند هەتا تەمەنی گەیشتە (٦٠) ساڵی هیچ عورز و بەهانایەکی نییە لە قیامەتدا کە بڵێ خوایە خۆزگە مۆڵەتێکی ترم بدەیتێ و بگەڕێمەوە بۆ دونیا بۆ ئەوەی کردەوەی چاك بکەم و دەست لەم کردەوە بەدانەم هەڵگرم، هەر بۆیە زانایان فەرموویانە: خەڵکی مەدینە، کاتێ یەکێکیان تەمەنی دەگەیشتە (٤٠) ساڵی خۆی بۆ عیبادەت و خواپەرستی -بە مانا فراوان و گشتگیرەکەی، کە بۆ هەموو کارێك تەنها ڕەزامەندی خوای لە بەرچاو بێ- یەکلایی دەکردەوە..

ئای حەیفە بە ساڵاچوو هەر خەمی قیامەتی نەبێ و هەروەکو هەرزەکاری و گەنجی هەر باسی دونیا و ئەم و ئەوی بێت. سەرنجی پیر و بە ساڵاچوانی زەمانی پێغەمبەر (ﷺ) بدەن: پیرەژنێکی چەماوەی سەرسپی، هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و داواکارییەکی هەبوو، با بزانین داواکاری ئەم پیرەژنە چییە؟! ئایا پارەی دەوێ، خانووی دەوێ، کەلوپەلی دەوێ، دونیای دەوێ؟! با بزانین خۆی داوای چی دەکات، (قالَت: يارَسُولَ اللهِ أُدْعُ اللهَ أَنْ يَدْخلَني الجَنَّةَ) ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) داوام بۆ لە خوا بکە کە بمخاتە بەهەشتەوە! ئەمە هەموو

خـــەون و خوليـــا و ئاواتی ئـــەم پيرەژنەيە كە خوای گـــەورە بيخاتە بەهەشتەوە، بە ڕاستی چاك تێگەيشتوە، حەيف نييە مرۆڤی موسڵمان بە تايبەت لە كاتی پيری و بە ســـاڵاچوييدا، غەيری بەهەشـــت هيچی تـــری لە بير بێ و ئاوات بۆ هيچی تر بخوازێ! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمـــووی: (يا أُمَّ فُـــلانٍ، إِنَّ الجَنَّةَ لاتَدْخُلُها عَجُوزٌ) ئـــەی دايكی فلان، بە ڕاســـتی پيرەژنەكان، ئەوانەی بە ســـاڵاچوون و ســـەريان ســـپی بوە و پشتيان چەماوەتەوە، ناچنە بەهەشتەوە! (فَوَلَّتْ تَبْكِي) پيرەژنەكە هيچ موناقەشەی لە خزمەت پێغەمبەری خوادا نەكرد، چونكە پێغەمبەری خـــوا هەرچـــی بيڵێ حەق و ڕاســـتە، تەنها ئەوەی پێ كرا، كە پشـــتی هـــەڵ كرد و بە گريان و فرمێسكڕشـــتنەوە بەرەو ماڵەوە ڕۆيشـــتەوە، كەمێك دووركەوتەوە و پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (أَخْبِرُوها) بڕۆن بـــۆ خزمەت ئـــەو پيرەژنە بە تەمەنە، عاقيبـــەت خێرە، كە تەنها لە خەمـــی قيامەتيەتی بڕۆن خەبەری پێ بدەن و پێی ڕابگەيەنن، ئێوە بـــڕۆن و بـــۆ خزمەتی و با ئەو عەزيەت نەكێشـــێ بگەڕێتەوە بۆ لای ئێمە!! هەواڵی پێ بدەن كە: (أَنَّها لاتَدْخُلُها وَهِيَ عَجُوزٌ، إِنَّ اللهَ تَعالى يَقُولُ:

﴿ إِنَّآ أَنشَأْنَٰهُنَّ إِنشَآءً (٣٥) فَجَعَلْنَٰهُنَّ أَبْكَارًا (٣٦) عُرُبًا أَتْرَابًا (٣٧) ﴾ الواقعه: ٣٥ - ٣٧

واتە: ئەو حۆريانەمان بە تايبەت بۆ دروست كردوون، كردوومانن بـــە حۆريانی هەميشـــە كيژ، هاوســـەرەكانيان زۆر خـــۆش دەوێت و هەموويان هاوتەمەنن..

فەرمـــووی: بـــڕۆن ئەو ئايەتـــەی بۆ بخوێننـــەوە و تێی بگەيەنن كـــە ئـــەو بەو پيرەژنەييەوە، بەو پشـــتە چەماوە و ســـەرە ســـپی و

چـاوە کزەیــەوە ناچێتە بەهەشــتەوە، بەڵکو بە کچـی و گەنجی و لاویەوە دەچێتە بەهەشــتەوە. ئەمەی وەکو سوعبەت و قسەی خۆش لەگــەڵ پیرەژنەکەدا فەرموو، کە ســەرەتا فەرمووی پیرەژن ناچێتە بەهەشتەوە.. (ئەم فەرمودەیە: حَسَنٌ، أَخْرَجَهُ الترمذيُّ، الصَّحيحَة: ٢٩٨٧).

ســوپاس بۆ خوا ئافرەتی بە ساڵاچووی سەرسپیمان هەیە، هەموو غەم و هەمی ئیســلام و قیامەتی خۆیەتی. بەردەوام لەگەڵ قیامەت دەژی.. بە داخەوە پیرەژنی بە ســاڵاچووی واشــمان هەیە، بە سەری ســپییەوە هەزار و یەك مەکر و فرت و فێڵ فێری ئەم و ئەو دەکات و ئاژاوە دەخاتە نێوان خێزانەکانەوە، قسە دێنێ و دەبات، حەزی لە شایی و تێکەڵی کوڕ و کچانە!. لە فەرموودەیەکی تردا: کە ئافرەتێکی بە ســاڵاچووی عاقیبەت خێر بۆمان دەگێڕێتەوە و موژدە دەدات بە بەساڵاچوان و ڕێگا و کاری ڕۆژانە و شەوانەیان بۆ دیاری دەکات. (عَنْ أُمِّ هانئ، قالَتْ: مَرَّبِي رَسُــولُ الله (ﷺ) ذاتَ يَوْمٍ، فَقُلْتُ يارَســولَ الله: قد كبرت سِنِّي وَضعفتُ ، فَمُرْنِي بِعَمَلٍ وَأَنا جالِسَةٌ).

واتە: ئومو هانی دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: جارێکیان پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە لامدا تێپەڕی و منیش چوومە خزمەتی و عەرزم کرد: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، پیر بووم و چوومەتە ســاڵەوە و لاشــەم بێهێــز بوە، حــەز دەکەم کارێکم پێ بڵێی، کە لە کاتێکا دانیشــتووم ئەنجامــی بدەم. ئای لــەو عاقیبەت خێرییە، تەماشــاکە داوای چی دەکات؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (سَبِّحي الله مائة تَسْبِحةٍ، فَإِنَّها تَعْدِلُ مائة رَقَبَةٍ تَعْتَقينَها مِنْ وَلَدِ إِسْماعيلَ).

واتە: ســەد جار بڵێ (سُــبْحانَ اللّٰه)، بەمە خێری ئەوەت دەســت دەكــەوێ، كە ســەد كۆیلــە و عەبد و بەندەت لە نەوەی ئیســماعیل پێغەمبەر ئازاد كردبێ.

(وَاحْمِدي الله مائَةَ تَحْمِدَة، فَإنَّها تَعْدِلُ مائة فَرَسٍ مسرجَةٍ ملجَّمَة تَحْمِلينَ عَلَيها فِي سَــبيلِ اللهِ) واتــە: هەروەها ســەد جار سوپاســی خوا بكــە و بڵێ: (الحمد لله)، بەمەش پاداشتی ئەوەت دەست دەكەوێت. كە سەد وڵاخی سواری، ئەسپی جەنگیت بە هەموو پێویستیەكیەوە لە پێناوی خوادا ببەخشی و غەزایان لەسەر بكرێ لە پێناوی خوای گەورەدا.

(وَكَــبِّري الله مائة تكبيرَة، فأنَّها تَعْدِلُ مائة بَدَنَة مُقَلَّدَة مُتَقَبَّلَة). وە هەروەها (سەد) جاریش بڵێ -الله أكبر- بەمەش خوای گەورە ئەجر و پاداشتی ئەوەت بۆ دەنووسێ كە سەد حوشتری قەڵەوی دابەستە، كە بەچكەیان لەگەڵ بێ، لە پێناوی خوادا بكەی بە صەدەقە و خێر.

(وَهَلِّلي الله مائَةَ تَهْليلَة، فَإنَّها لاتَذَرُ عَلى ذَنْبٍ إلاّ مَحَتْهُ) وە هەروەها (ســەد) جاریش بڵێ (لا إلـه إلاّ اللّٰه). ئەجر و پاداشی ئەم سەد (لا إلـه إلاّ اللّٰه) یە. بەسەر گوناهێكدا بڕوات، ڕەشی دەكاتەوە و نای هێڵێت!!..

لــە ڕیوایەیەكــی فەرموودەكەدا ئاوا هاتوە: (فَإنَّها تَمْلأُ مابَيْنَ السَّــماءِ وَالأَرْضِ، وَلايَرْفَعُ يَوْمَئِذٍ لاحَدٍ عَمَلٌ أَفْضَلُ مِمّا يَرْفَعُ لَكَ إلاّ أَنْ يَأْتِيَ بِمِثْلِ ما أَتَيْتَ).

واتە: پاداشــتی ئــەم زیكرە نێوانــی ئاســمان و زەوی پڕ دەكات. لەو ڕۆژەدا پاداشــتی هیچ كەســێك بەرز نابێتەوە بــۆ لای خوا، كە چاكتر بێ لەوەی تۆ كە بەرزكراوەتەوە، مەگەر كەســێ ئەوەی كە تۆ كردووتە، ئەویش هاوشێوەی ئەوەی وتبێ.

**ئەم فەرمودەیە:** (حَسَــنٌ، أَخْرَجَهُ النّسَــائي في الكُبْرى – ١٠٦٨٠ – وَإبْنُ ماجَة (٣٨١٠) وَحَسَّنَهُ الأَلْباني في الصَّحيحَة (١٣١٦)

**دووەم: دەبــێ کەســی بە ســاڵاچوو، فەرهەنگێك بــێ لەعەقڵ و تەجروبەی ڕۆژگار و ئەدەب و ئیصلاح و قســەی خێر. ئاها دەوترێ: (پیرەمێــرد) بەڵام لە ڕاســتیدا: (پیرەمەردە) کــە بە داخەوە هەموو پیــرێ مــەرد نییە!!، لە زمانی ئەو پیرەمەردانــەوە وتراوە: (ئای بۆ هێــزی جوانیــم و عەقڵی پیری!).. بەڵێ حەیفە پیر و بەســاڵاچوو، خەزوور و خەســوویەکی باش نەبن و دڵســۆز و بە ڕەحم و لێبوردە نەبن بۆ بووکەکانیان، یان بۆ زاواکانیان. حەیفە لە جیاتی لە هەگبەی پــڕ تەجرووبــەی ڕۆژگار کە وەریان گرتوە، بــە زمانی پڕ حیکمەت و بــە دڵی پڕ لە بەزەیی و ئامــۆژگاری بووك یان زاوای خۆیانی پێ نەکەن. بە داخەوە هی وا هەیە بۆتە (خەسو و خەزوور) کەچی چاوی ڕەخنەگرتن و جاسووســی هەیە لەســەر بووك، یان هەیە بە سەری ســپییەوە دەچێتە لای فاڵچی و نوشتەنووســی ناشــەرعی و دوعای ڕەشــی و ترشــی و شــیرینی بە دەمی بووکەکەیدا دەکات!!!. چەند پیاوی بە تەمەنی ســەر و ڕیش و برۆ سپی هەن، هۆکاری تەڵاقدانی بووکەکانیانن!!. بڕوا بکەن. پیاوی ڕیشسپی هەبوە، بە کچەکەی وتوە: کچــم بــڕۆ بــرۆت هەڵگرە و قــاچ و قۆڵت ڕووت بکە و بە قســەی مێردەکەت نەکەی و خۆت دانەپۆشی و لەچك نەکەی و خۆت نەکەی بە پیرەژن و سبەینێ ژنت بەسەر بێنێ!!.**

**ئەی کەســی بە ساڵاچووی بەڕێز، کە خوا ڕێزی لێگرتووی هەموو**

کەســی بــە ڕێز ڕێزت لێ دەگرێ ئاگاداری خــۆت بە و ڕێز لە خۆت بگرە و ئاگاداری ئەم چەند خاڵە بە:

١. هــەر کارێك پەیوەندی بە تۆوە نەبێ، خۆتی تێ هەڵمەقورتێنە و لێی مەکۆڵەوە و ســەری خۆتی پێوە مەهێشــێنە و لە جیاتی ئەو قسانە کە جێ ناگرێ، یاد و زیکری خوا بکە..

٢. هەوڵ بدە داواکاریەکانت با بە پێی پێویست بن و کەم و پوخت بن لەو ماڵەی لێی دەژی.

٣. ئــاگادار بــە و بزانە کــە ڕۆڵە و ڕۆڵەی نەوەکانــت، کوڕەزا و کچەزاکانت، خاوەنی ڕۆشــنبیری و دید و بۆچوونی تایبەتی خۆیانن، کە هی ئەم ســەردەمەیە و جیاوازە لەوەی کە تۆی بە ســاڵاچووی بە تەمەن و دنیادیدە، لە درێژەی ژیانی ڕابردوودا وەرت گرتوە هی ئەم ســەردەم و زەمانە بووە. لەبەر ئەوە تەنها نەصیحەت و ئامۆژگاریان بکە بە زمانی شیرین و زۆریان لێ مەکە و هەوڵی ئەوە مەدە بیروڕا و بۆچوونی خۆتیان بە ســەردا فەرز بکەی! چونکە ئەوکات لێشــت وەرناگرن و قسەت خەسار دەبێ.

بەڕێزان: لە وڵاتانی دونیادا، مەجلیســی پیران هەیە. وەکو وڵاتی ئەمریــکا، نــەك بڵێن عەقڵی پیــرەکان بە کەڵك نایــەت. جا ئەگەر عەقڵی پیران و بازووی گەنجان یەك بگرێ، ئەو وڵاتە پێش دەکەوێ، کەواتە: ئەی گەنجان دەستی پیرەکان ماچ بکەن. وە ئەی پیران سەری گەنجەکان ماچ بکــەن. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَمْ يَرْحَمْ صَغِيرَنَا وَيُوَقِّرْ كَبِيرَنَا).. بەلام بەداخەوە: زۆر پیر و بە ســاڵاچوو

دەبینیــن ڕۆژانــە خەریکی دامەکــردن و دۆمینەکردنە. لە کوێش؟! زۆرجــار لــە هەیوانی مزگەوت، یان لەناو حەوشــەی مزگەوتدا!! کە مرۆڤ بە چاوپێکەوتنی مزگەوت یادی خوای دەکەوێتەوە و هەســت بەوە دەکات فرسەتی زێڕینی بۆ هەڵکەوتوە و عیبادەتی خوای خۆی بکات و شتێ بخاتە توێشە بەرەیەوە..

سێیەم: مرۆڤی بە ساڵاچوو، دەبێ قەدر و حورمەتی خۆی هێندە بگــرێ، ئەوەنــدە خۆی قورس ڕابگــرێ، کە مناڵ و مــەزن نەتوانن بیکەنــە گاڵتەجاڕی خۆیان. پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: یەکێ لەو کەســانەی کە خوا زۆر ڕقی لێیەتی (وَشَــيْخٌ زان). پیری زیناکار!! بەڵێ ئەوانە ئەو کەسانەن کە لە گەنجیەتیەوە خەریکی بەدڕەوشتی بــوون، کاتێکیــش کە پیر بوون، لە جیاتی تەوبە بکەن و شــەرم لە ڕابردووی خراپیان بکەن، کەچی هەر سوورن لەسەر ئەو خراپەکاریەی لە ســەری بوون و بــە پیریش چاو لەکچ و ژنــی خەڵکی لانادات و بەو تەمەنەوە تەماشــای کەناڵی ناشەرعی دەکات!! وە لەگەڵ هەرزە و مناڵاندا باســی ســێکس و ئەو شــتانە دەکات، بە ڕاستی ئەو جۆرە پیرانە خوا زۆر ڕقی لێیانە!..

خوای پــەروەردگار لە فەرمودەیەکی قودســی دەفەرموێ: (عَبْدي ضَعُفَ بَصَرُكَ وشابَ شَعْرُكَ، وانحَنى ظَهْرُكَ، فاسْتَحِ مِنّي، فَأَنا أَسْتَحي مِنْكَ).

واتــە: ئەی بەندەکــەم، چوویتە تەمەنــەوە و قۆناغی گەنجیەتیت تــێ پەڕاند، ئەوە چاوت کز بــوە و هێز و گوڕی جارانی نەماوە و کە تەماشــای دوور دەکەی دەستێك دەخەیتە ســەرچاوت. موەکانت سپی

بوون و لە ڕەشەوە بوونە سپی، ئەو ڤیت و قنجیەی گەنجیت ڕۆیشت و وا پشتت چەماوەتەوە و گۆچانت بە دەستەوەیە! دەی بەندەکەم، وەرە شـەرمم لێ بکە، تەوبە بکە، بگەڕێوە بۆ لام. قسـەی خێر بکە، واز لە شەڕ بێنە، چونکە من شەرمت لێ دەکەم!!! الله أكبر، خوا دەفەرموێ: مـن شـەرم دەکەم عەزابت بـدەم، بت خەمە جەهەنـەم. دەی توخوا ئەوپەڕی بێشەرمی نییە مرۆڤ لەو کاتەدا شەرم لە خوا نەکات؟!

چوارەم: بە سـاڵاچوو دەبێ پشـت بە خوا، کارێك بکات، کە کوڕ و کچ و نەوەکانی پێوەی سـەربەرز بن، نەك ئەوەندە کاری نابەجێ بکات، خەڵکی لای کوڕەکەی شـکات لە باوکی بکات!! (رحِمَ اللّٰه والِداً أَعـانَ إِبْنَـهُ بِرِّهِ). ڕەحمەتی خوا لەو کەسـە بێ، کـە باوکە و کارێکی وا دەکات کە ڕۆڵەکەی تووشـی چاکە ببێ، بە داخەوە بیسـتراوە کە خەڵکی وتویانە: بە خوا حەیفە فلان کەس کوڕی فلان کەسی پیری خراپەکار بێ. ئەم باوکە پیرە بۆتە هۆی ڕیسـوابوونی نەوەکانی لە جیاتی سـەربەرزکردنیان. بەسـاڵاچووی وا هەیە، بە سـەر و ڕیشی سـپییەوە جیاوازی لە نێوان ئەولادەکانیدا دەکات. ئەولادی ئەمیانی خۆشـتر دەوێ لەویـان و وادەکات کـە بەم فـەرق و جیاوازیکردنە، یەکێ لە ئەولادەکانی پێی دلگران بێ و وەکو پێویسـت لە خزمەتی ئـەم باوکەی، یان دایکەیدا نەبێـت. دەی ڕەحمەتی خوا لەو دایك و باوکە بە ساڵاچوەی کە بە قسەی خۆش و دڵی گەورەی و بە یەکسان تەماشـاکردنی کوڕ و بووك و نەوەکانی و وەکو یەك پێ بەخشینیان وا دەکات هەموویان لە خزمەتیدا بن و گوناهبار نەبن!!

پێنجەم: ئەی پیر و بە ساڵاچووی بەڕێز: موی سپی سەر و ڕیشت نوورە. دەی ئەم نوورە سـپییە ڕەش مەکەوە. پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (مَنْ شابَ شيبَةً فِي الإِسْلامِ، كانَتْ لَهُ نُوراً يَوْمَ القِيامَةِ). صَحيحٌ، رَواهُ الترمذي (١٦٣٤) وَالنَّسائي (٣١٤٤)

کەسـێ سەری ڕەشی لە ئیسـلامەتی و دینداری و خواناسیدا سپی بکات، ئەو مووە سپییانەی بۆی دەبنە نورو ڕۆشنایی لە قیامەتدا..

ئیمانـدارانی بەڕێز: حەزدەکەم لێرەدا لە سەر موو إنشاء الله هەندێ زانیاری بخەینە بەرچاو:

لـە زانیاریە ئاشـکراکانە لای زۆربەی خەڵکی کە لە سـەری هەر مرفێکـدا (١٠٠) هـەزار تـا (٢٥٠) هـەزار تاڵە موو هەیـە. هەر تاڵە موویەکیش بۆ ماوەی (٣) سـاڵ یان زیاتر دەژی. مرۆڤیش پێویسـتی بەمـاوەی (٢٠٠) ڕۆژە تاوەکـو موەکانی بە تەواوەتـی نوێ دەبنەوە، هەروەهـا لە جەسـتەی مرۆڤدا، بـە ئەندازەی هەر تاڵـە موویەك، کارگەیەکی دروسـتکردنی موو هەیـە. هەر تاڵە موویەك کە تۆ دەی بینی کارگەیەکی تایبەتی خۆی هەیە. موەکە دروست دەکات و پاشان گەشـەی پـێ دەدات، هەتا تـەواو گەورە دەبێ و ئەمجـا موەکە پیر دەبێ و دوای ئەوە موەکە دەمرێ و هەڵ دەوەرێ، هەر تاڵە موویەك بـۆری خوێنی بە تایبـەت پێ دەگات و خۆراکی خۆی پێ دەگەیەنێ، وە ماسـولکەیەکی پێوە بەستراوە بۆ ئەوەی ئەو مووە بجوڵێنـێ، ئەم ماسـولکەیە لە کاتی سـەرمادا ئەم موە دەجوڵێنێ و موەکە ڕاسـت دەبێتـەوە لە سـەرمان، هەروەها هەر تاڵە موویەکی لاشـەی مرۆڤ

ڕژێنێکی چەوری پێوە بەســتراوە، کە مووەکە بە چەوری و شێداری دەهێڵێتەوە و لە وشــکبوونەوە دەی پارێزێ.. وە ڕژێنێکی ڕەنگکردنی پێوە بەستراوە کە ئەو موە ڕەنگ دەکات. جا زانایان هەتا ئەم ڕۆژگار و ســەدەمەی ئێســتاش نازانن کە بۆ چی موو لە ڕەشــەوە دەگۆڕێ بۆ ســپی! بەڵام هەندێ لــە لێکۆڵەرەوان لە تازەتریــن لێکۆڵینەوەدا وتویانە: (سپیبوونی موو - پیربوون) کاتێ دروست دەبێ، کە خڕۆکە ســپییەکان دەســت دەکەن بە خواردنی ڕەنگی ڕەش لە موەکاندا، کە دەبێتە هۆی ڕەشبوونی موەکان و سەرەنجام موەکە سپی دەبێ.

بەڕێــزان: لــە جیاتــی هەڵکەندنــی مــووی ســپی بــە موکێش و ڕەشــکردنەوەی لە لایــەن پیرەمێردی بە ســاڵاچووەوە، هەق وایە ئەم کەســە پرســیارێکی گەورە و گرنگ لە خۆی بکات و حیکمەتی خوای گەورە ببینێ و بپرســێ: باشــە بۆچی مووی سەر زیاد دەکات و درێژ دەبــێ. کەچی مووی برۆ و برژانگ، کە هەر چەند ســانتیمەترێك لە ســەرەوە دوورن، زیاد ناکەن و درێژ نابن و لە ئاســتی تایبەتی خۆیان کــە بۆیان دیاری کراوە زیاتر درێژ نابن؟! ئەزانی ئەگەر مووی برۆ و برژانگ وەکو مووی سەرمان زیادی بکردایە و پێویستی بە کورتکردنەوە هەبوایە تووشی چی دەبووین؟! بڕوا بکەن ڕەنگە زۆربەمان مقەستمان لــە چاوی خۆمان بدایە و نابینا ببوینایە، یــان ئەگەر دەرفەتمان بۆ نەڕەخســایە کورتی بکەینەوە موەکە دەهاتە ناو چاومانەوە و تووشی زۆر نەخۆشــی دەبوویــن!!. هەروەها حەق وایــە مرۆڤی پیر لە خۆی بپرســێ، وە هەموومان لە خۆمان بپرســین: باشــە بۆچی موو لە ناو

لووت دەڕوێ و لە ناو دەم ناڕوێ؟! خۆ هەر لەیەك گۆشــتن و لە پەنا یەکــن؟! پەنا بە خوا ئەگەر موو لە نــاو دەم بڕوایە ژیانمان نەدەما! ئەگەر موو لە ناو لوتمان نەڕوایە دووبارە مێشکمان پڕ دەبوو لە تەپ و تۆز و پیسی!!، ئەی بیرمان لەوە کردۆتەوە کە بۆ چی موو لە پشتە دەســتمان دەڕوێ و لە لەپی دەســتمان ناڕوێ، ئەزانــی ئەگەر موو لە لەپی دەستمان بڕوایە پارووە نانێکی پاکمان نەدەخوارد؟!

(فَوا عَجَبا كَيْفَ يُعْصي الإلهُ ......... أَوْ كَيْفَ يُجْحِدُهُ الجاحِدُ.
وَفـي كُـلِّ شَـيءٍ لَهُ آيَةٌ ......... تَدُلُّ عَلـى أَنَّهُ واحِدُ)..

بە خوا حەیفە، کەسی پیر و بە ساڵاچوو، لە جیاتی بیرکردنەوە لە دەســەڵاتی خوا و ڕێزگرتنی مووی سپی خۆی، هەر خەریکی موو بۆیاخکردن و موو هەڵکەندن و ڕیش تاشین بێت .. وە دەشتوانێ موە ســپییەکانی ڕەنگ بکات بەڵام بە ڕەنگی ڕەشــی تۆخ نا. پێغەمبەری خــوا (ﷺ) بە (أَبي قُحافــە)ی باوکی ئەبو بەکری فەرموو: (غَيِّرُوا هذا وَاجْتَنِبُوا السَّــواد) رَواهُ مُسْــلِم (٢١٠٢) ئەم مووە سپییە ڕەنگ بکەن بۆی و خۆشتان بپارێزن لە وەی بە ڕەنگی ڕەش بۆیەی بکەن..

لە فەرمودەیەکی تردا، پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (إِنَّ اليَهُودَ وَالنَّصارى لايَصْبَغُونَ، فَخالِفُوهُم). واتە: جولەکە و گاورەکان مووی سپیان بۆیە ناکەن، ئێوە پێچەوانەی ئەوان بکەن..

بەڵێ بەڕێزان: مووی سپی ئاگادارت دەکاتەوە کە با کردەوەکانیشت سپی ببنەوە، لە کاتی مووی ڕەشدا. ئەگەر کردەوەیەکی ڕەشت کردوە، ئێستا با وەکو موە سپیەکەت کردەوەکەشت سپی بێ!!

ئیمانداڕانی بەڕێز: پێویستە ئێمەی موسڵمان چاو لە پێغەمبەری خۆشەویستمان (ﷺ) بکەین و هەرکات تەمەنمان زیاتر بەرەو هەڵکشان ڕۆیشت زیاتر لە خوای خۆمان نزیك ببینەوە. ئەوەتا کاتێ سورەتی -النصر- هاتە خوارەوە، کە دەفەرموێ: (إذا جاءَ نَصْرُ اللهِ وَالفَتْح ......... إنَّهُ كانَ تَوَّاباً) إبْنُ عَبّاس دەفەرموێ: ئەم سورەتە مانای ئەوەیە ئەجەلی پێغەمبەری خوا نزیك بۆتەوە.

خاتوو عائیشەی دایکی ئیمانداران و خێزانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێت: (كانَ النَبِيُّ (ﷺ) بَعْدَ إذْ أنْزلَت عَلَيْهِ هذهِ السُورَة، كان يكثر أَنْ يَقُول في رُكُوعِهِ وَسُجُودِهِ: سُبْحانَكَ اللّهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمْدِكَ، اللّهُمَّ اغْفِرْلِي). رَواهُ البُخاري

واتە: کاتێ کەپێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم سورەتەی بۆ دابەزی، بەردەوام لە ڕکوع و سوجدەی نوێژەکانیدا ئەم نزایەی دەکرد و دەیفەرموو: (سُبْحانَكَ اللّهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمْدِكَ، اللّهُمَّ اغْفِرْلِي). پاك و بێگەردی بۆ تۆ ئەی پەروەردگارم، سوپاس و ستایشت دەکەم، خوایە گیان لێم خۆش بی..) جا ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) وا بفەرموێ، ئەی ئێمەی گوناهبار چی بڵێین؟!، دەبێ هەمووومان بەگشتی و بە ساڵاچوان بە تایبەتیتر چۆن بەردەوام دەم بەزیکر وأَسْتَغْفِرُ الله بین. ئا لەو کاتەدا کە کەسی بە ساڵاچوو دەستی لە دوعاکردندا بۆ ڕاناوەستێ بابڵێ:

ئێستا دەستم لەبەر لەرزین .... ناگرێتە خۆی ئەم دوعایە.
شەرمە ئەمڕۆ چاو هەڵهێنم .... لەئاست تۆدا ئەی خودایە.
بۆ گوناهی کۆڵم بگریم .... یا بۆ تەمەنی بابردوو.
دەبێ خودا لێم ببورێ .... سزای سەردەمی ڕابردوو.

وا گوڵزاری تەمەن ڕابورد .... ئیتر وەرزی هەڵوەرینە.

گوڵی گەنجی پووکایەوە .... گریان لە شوێن پێکەنینە.

شعری شاعیر (موحسین شوانی)

بەڵێ، هەر ئێســتا تەوبە بکە، نەك کاتی ســەرەمەرگ. ئەو کاتەی کە مرۆڤ بە تەواوی دەســتی لە دنیا بەر بوە و ئەمجا دەڵێ خوایە تەوبە بێ، چونکە لەو کاتەدا تەوبەکردنەکە ســودێك بە خاوەنەکەی ناگەیەنــێ. ﴿ وَلَيْسَتِ ٱلتَّوْبَةُ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلْمَوْتُ قَالَ إِنِّي تُبْتُ ٱلْـَٰٔنَ ﴾ النساء: ١٨

بەڵام ئەگــەر لە کاتی گەنجیتدا، لە کاتی پیریتدا، لەو ســاتانەی کە هێشــتا دڵت بە دنیا خۆشــە، دەم بە زیکر و دوعا و پاڕانەوە بی، دڵــت پــڕ بێ لە خۆشەویســتی خوا و پێغەمبەری خوا و ئیســلام و قورئان و موســڵمانان. هەتا لە ســەر ئەو حاڵە دەمری و دونیا جێ دێڵــی ئەوا (إنْشــاءَ اللّٰه) کاتێ کە لە قیامەتــدا زیندوو بوویتەوە لە جیاتی هاتوهاوار لە مەیدانی مەحشەردا، کە کافرەکان دەڵێن:(ياوَيْلَنا مَــنْ بَعَثَنا مِنْ مَرْقَدِنا).. تۆی موســڵمان لەوکاتەدا دەڵێی: (سُــبْحانَ اللّٰهِ وَالحَمْدُلِلّٰهِ وَلا إلهَ إلاّ اللّٰه واللّٰه أَكْبَر) ئیتر دڵنیا دەبی لە ترســی مەحشــەر و خەمی هیچت نییە. پێغەمبــەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ: (يُبْعَثُ كُلُّ عَبْدٍ على ماماتَ عَلَيْهِ) رَواهُ مُسْلِم

هەموو کەسێك لە سەر ئەو حاڵەتە زیندوو دەبێتەوە کە لە سەری مردووە..

داوا دەکەین لە پەروەردگارمان و دەڵێین:

(رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ) اللّٰهُمَّ آمين..

## سەرچاوەکان:

١. فَتاوى وَقَضايا فِقهِيَّة مُعاصِرَة. د. عبداللّطيف صالح الفرفور, ص١٧٨.
٢. مِنْ صَحيح القصص النَبَويّ. سَعْد يوسف أبو عزيز. ص٢٦٦.
٣.النَّفائِس الزَّكِيَة مِنَ الخُطَب المِنْبَرِيَّة. محمود رِضوان أحمد. ص١٩٢.
٤. گۆڤاری (چرای ڕووناکی) ژ: ١١، ل٥٢.
٥. آياتُ الله في الإِنْسان. د. محمد راتب النابُلُسي. ص٣٢٣.
٦. شَرح رياض الصّالِحين. إبْنُ عُثَيْمين. ج٤ ص٢٥٤.

وتاری چوارەم بۆ مانگی ذي القعدة

# ماف و ئەركی بە ساڵاچووان

## بەشی پێنجەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: لە بەشـــی پێنجەمی زنجیرە باســـەكەمان، لە باسی ئەرك و مافی بە ساڵاچوان ڕوو دەكەینە هەریەك لە ئیمانداران و بە تایبەت ئەو كەســـانەی كە ئەمـــڕۆ گەنجن و لە هەڕەتی هێز و توانـــا و لاویەتیـــدان. پێیان دەڵێین: ئەگـــەر دەتەوێ كاتێ پیر بووی ڕێزت بگیرێ و قەدر و حورمەتت بگیرێ، ئەمانە بكە:**

**١. ڕێزی كەســـی پیر بگـــرە. پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) فەرمویەتی:**
(ماأَكْرَمَ شـــابٌ شَيْخاً لِســـنّةٍ إلاّ قَيَّضَ اللهُ لَهُ مَنْ يُكْرِمُهُ عِنْدَ سِنّهِ) أخرجه الترمذي (٢٠٢٣) والطَّبَراني في الأَوْسَط (٦/٩٤)

**واتـــە: هەرگەنجێك ڕێـــزی پیرێك بگرێ، تەنهـــا لەبەر ئەوەی بە تەمەنـــە و چۆتە ســـاڵەوە، بە بـــێ ئەوەی خزمی بێ، ناســـیاوی بێ، تەنها لەبەر ئەوەی ڕێزی بگرێ كە بە ســـاڵاچوە، ئەوە خوای گەورە قەرەبـــووی بۆ دەكاتەوە بەوەی كە هەركاتێ ئەمیش پیر بوو، خوای گەورە كەسێكی دێنێتەوە ڕێگا كە قەدر و ڕێزی بگرێ..**

**٢. بـــە گەنجی خۆت لە گوناهو بێشـــەرعی بپارێزە و ئەندامەكانی لاشـــەت لـــە بێفەرمانی خوادا بـــەكار مەهێنە. خوای گـــەورە لە كاتی**

پیریــدا هێز و توانات لێ ناســەنێتەوە و موحتاجی دەســتی کەســت نــاکا و هێز و گــوڕت لێ نابڕێ، یەکێ لە زانــا و پیاوچاکان بە ناوی (ئەبو طەیبی طەبەری) تەمەنی لە (١٠٠) ساڵی تێپەڕی کردبوو. لەگەڵ ئەوەشدا هێز و توانای جەستەیی و لاشەیی وەکو گەنجێکی سی ساڵان وابوو. وە عەقڵ و بیر و هۆشــی هیچ نەشــێوا بوو. جارێکیان لەگەڵ کۆمەڵێــك لە قوتابیەکانیدا گەشــتێك دەکەن و ڕێیــان دەکەوێتە ناو دەریا و سواری کەشتی دەبن، لە کاتی دابەزیندا لە کەنارەوە کەشتیەکە دەوەســتێ و شــوێنەکە وا دەبــێ کە پێویســتیان بە بــازدان دەبێ بۆ ئەوەی لە ســەر کەشــتییەکەوە بگەنە کەناری ئاوەکە، ئەم مامۆستایە کــە تەمەنی لە (١٠٠) ســاڵیدا بــوو. زۆر بە گورج و گۆڵــی بازی دا و گەیشــتە کەناری ئاوەکە. فەقێکانی کــە گەنج و لاو بوون، ئەم هێز و هەڵمەتەی مامۆستاکەیان بە لاوە سەیر بوو، چونکە ئەوان بە ترسەوە بازیان دا و گەیشتنە کەنار. بۆیە لێیان پرسی: (ماهذا یا أَبا الطَّیِّب؟!) ئەوە چی بوو مامۆســتا. یاخوا هەر ئاوا لەشســاغ و بەتوانا بی، چۆن بــوو ئاوا توانیت بپەڕیتەوە. خــۆ ئێمە خەمی تۆمان بوو کە نەتوانی بپەڕێتەوە؟! ئەویش فەرمووی: : وَلِمَ؟! وَماعَصَیْتُ اللّٰه بِواحِدَةٍ مِنْها قَــطُّ. بۆچــی ئاوا نابم، لە کاتێکا هیچ کام لەم ئەندامانەی جەســتەم بێفەرمانی خوای پەروەردگارم نەکردوە. ئەو کاتەی کە گەنج و بەهێز بووم. ئەو ئەندامانەی لاشــەمم پاراست لە خراپە و بێشەرعی، ئەوەتا کاتێکیــش کە گەیشــتمە تەمەنی پیری و بێهێــزی، خوای گەورە بۆی پاراستووم و هێز و گوڕ و توانای جارانی گەنجیان تێدا ماوە.

٣. بـۆ ئـەوەی لـە کاتی پیری و بە سـاڵاچوییدا، ڕێـز و قەدرت بگیرێ، لە خزمەت قورئاندا بە. عیکریمە دەفەرموێ: (مَنْ قَرَأَ الْقُرْآن، لَمْ يُرَد إِلى أَرْذَلِ العُمُر، حَتَّى لايَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَـيْئاً).. هەر کەسـێ بـەردەوام لە خزمـەت قورئاندا بێ و قورئـان بخوێنێ، ئەوە ناگاتە تەمەنی پەککەوتەیی و پەرتبوون. کە مرۆڤ وای لێ دێ نازانێ چی بوە و چی دەکرێ و عەقڵ و هۆشـی لە دەسـت دەدات! ئەو کەسـەی قورئانخوێنی بەردەوام بێ تووشـی ئەو حاڵەتانە نابێ. لە تەفسیری (أَضْواءُ البَيان) دا جزء: ٩ ص٣٣٤) دا دەفەرموێ: (أَنَّ حافِظَ كِتاب اللّهِ، المُداوِمُ عَلى تِلاوَتِهِ لايُصابُ بالخرفِ، وَلا بالْهَذَيانِ)..

بەرێزان: لەو کەسە پیر و بە تەمەنانەی، کە تا دواساتی تەمەنیان لە خزمـەت قورئاندا مانەوە، یەکێ لەوانە (عُثمانی کوری عەففان) بوو. ئیمامی عثمان کە خەلیفەی سـێیەمی ڕاشـیدینە و زاوای پێغەمبەری خوا خۆشی ویستوە، دوای ئەوەی کچی یەکەمی وەفاتی کرد کچی دووەمی دایە و دوای ئەوەی ئەویش وەفاتی کرد. فەرمووی: بە خوا ئەگەر کچی سێیەمیشـم ببوایە پێشـکەش بە (عثمان)م دەکرد!. ئیمامی عثمان سێ ڕەوشتی زۆر بەرز، سێ کردەوەی زۆر جوانی هەبوو. یەکەم: کۆکردنەوەی قورئان. کە بە ڕاستی خزمەتێکی هەرە گەورەی بە قورئانی پیرۆز کرد. بە وەی کە لەسەر یەك شێوە نوسییەوە و بە هەموو جیهانی ئیسلامی ئەو کاتەدا دابەشـی کرد و هەتا ئێسـتا ئەو قورئانە ماوەتەوە. دووەم: ئیمامی عثمان پیرێك بوو. حەزی لە خوێنڕشتن نەبوو. نەی دەویست لە سەر ئەو و بۆ دیفاع لە ئەو خوێنی هیچ کەسێك بڕژێ، کاتێ دەوری

ماڵەکەی گیرا، حەســەن و حوســەینی کوڕی ئیمامی عەلی و عبدالله ی کــوڕی عومــەر و عبدالله ی کوڕی زوبەیر و دەیــان گەنجی تر بە شمشــێرەوە چوونە خزمەتی و ئامادەیی خۆیان دەربڕی کە بە هەموو شێوەیەك دیفاعی لێ بکەن و خۆیان بکەنە قوربانی لە پێناویدا. بەڵام ئیمامی عثمان ڕووی کردە ئەو کۆمەڵە گەنجە بە هیمەتە، دڵســۆزە و فەرمــووی: توخوا لەبەر خاتری خوا واز بێنن و بڕۆنەوە بۆ ماڵەکانی خۆتــان و تــکام وایە کە هیچ کەس لە ســەر من دڵۆپێــك خوێنی لێ نەیەت!! ئەوە پیری عاقیبەت خێرە.

سێیەم: ئیمامی عثمان کاتێ کە دەوری ماڵەکەی گیرا، ژنەکەی ویستی لەچکەکەی دابنێ و بەسەری ڕووتی خۆی نیشانی ئەو کەسانە بدات کە دەوری ماڵەکەیان گرتووە، بۆ ئەوەی شەرم بیانگرێ و چاویان داخەن و ڕوو بکەن بەو لاوە و لەو کاتەدا ئیمامی عثمان دەرفەت بێنێ و هەڵێ و دەربازببــێ. بەڵام ئیمامی عثمان فەرمووی: هەرگیزاو هەگیز ڕێگات پێ نادەم کە کاری وا بکەیت. بکوژرێم پێم خۆشترە، نەك تۆ ناچاری ئەوە بی کە سەرت ڕووت بکەی و قژت لە بەرچاوی نامەحرەم دەر بخەی..

بە ڕاســتی دەبێ پیر و بە ســاڵاچوو، ئاوا ماڵ و منالی داپۆشــراو بــێ!! نەك بە داخــەوە هەندێ پیرمان هەیە لە پیــاوان و لەژنان کە کــچ و بووکەکانیان ڕووت و قووتن و لــە بەردەمیاندا دێن و دەچن و لەگەڵیاندا دەچنە بازاڕ و خەڵکی چاویان تێ دەبڕن، کەچی جارێك لە جاران ئامۆژگاریەکی خێری لە دەم نایەتە دەر و بە دوو قسەی جوان و نەرم پێیان نالێ ئەمە بێشەرعییە و ئێمە موسڵمانین خۆتان داپۆشن!!.

بەڵــێ ئیمامــی عثمان کە خاوەنی ئەو رەوشــتە بــەرز و کارە بە نرخانە بوو. لە تەمەنی پیریدا کە بە تەواوی سەر و ریشی سپی ببوو. لە تەمەنی (٨٠) ساڵی بەرەو سەردا، شەهید کرا. ئا لەو کاتەدا ئەم پیرە نورانیەی عاشــقی قورئان. قورئانەکەی لە ســەر باوەش بوو. قورئانی دەخوێنــد کە شــەهید کرا و خوێنی ئیمامی عثمــان بەناحەق رژاوی شــەهیدکراو بە ســەر قورئانەکەدا رژا و کەوتە سەر ئەو ئایەتەی کە دەفەرموێ: ﴿فَسَيَكْفِيكَهُمُ اللَّهُ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ ﴿١٣٧﴾﴾ البقرة: ١٣٧

بەڵــێ، ئەم پیاوە بەرێزە بە تەمەنــەی ناو ئەصحابەی پێغەمبەر (ﷺ) بــەو تەمەنــی (٨٠) ســاڵی زیاترەوەی چاوی هــەر بەهێز بوو، قورئانی بە بێ عەینەك و چاویلکە پێ دەخوێند. وە فکر و هۆشــی وەکــو گەنجێــك کاری دەکرد و خەلیفەی موســڵمانان بوو، هەروەها ئیمامی عثمان کە هەموو تەمەنی لەخزمەت قورئاندا بەسەر بردبوو. خوای گەورە ســەختترین تۆڵەی لە بکوژانی ئیمامی عثمان کردەوە. (یەزیدی کوری حەبیب) دەفەرموێ: (إنَّ عامَةَ الَّذينَ ساروا إلى عُثمان جُنُّبوا). هەموو ئەوانەی کە دەستیان هەبوو لە شەهیدکردنی ئیمامی عثمان و هەڵیان کوتایە ســەری شــێت بوون و عەقڵیان لە دەست دا و لە کۆڵانان دەســوورانەوە و دەستیان لە پیسی دەنا و مناڵان یاریان پێ دەکردن!!

یەکێکی تر لەو کەسانەی کە لە خزمەت قورئاندا ژیا و تەمەنێکی زۆری لە خزمەت ئیسلامدا بە رێ کرد، (ئەنەسی کوری مالیك)ە، کە ماوەی (١٠) ســاڵی رەبەق شــەو و رۆژ لە خزمەت پێغەمبەری خوادا

بــوو، کاتێ دایکی بــردی بۆ خزمەت پێغەمبــەر (ﷺ) کە خزمەتی پێغەمبەری خوا بکا و ئیش و کاری ماڵەوەی بۆ جێبەجێ بکا. بەڵێ (أُمُّ سُلَيم) هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا و دەستی ئەنەسی تەمەن (١٠) ســاڵانی گرتبــوو. فەرمووی: (يارَسُــولَ الله، هذا أُنْيسُ إِبْــني أَتَيْتُكَ بِهِ يُخْدِمُكِ، فَادْعُ الله لَهُ). ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەوە ئەنەسی کوڕمە، هێناومەتــە خزمەتت بۆ ئەوەی شــەرەفی خزمەتکاری جەنابتی پێ ببڕێ (کە بە ڕاستی خزمەتکاری هەموو کەس خراپە و مرۆڤ دەبێ بە خزمەتکاری ڕازی نەبێ. بەڵام خزمەتکاری فەخری عالەم، خاتەمی ئەنبیا و مورســەلین. ئەوپــەڕی فەخر و شــانازی تێدایە. هەمووی غیرەتە هەمووی بەختەوەرییە، هەمووی سەربەرزییە). ئەمجا ئومو سەلیم فەرمووی: دە توخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) تۆش دوعای خێری بۆ بکە، پێغەمبەری خواش (ﷺ) زۆر سوپاسی دایکی ئەنەسی کرد و دوعای خێری بۆ ئەنەس کرد، ئەنەسی کوڕی مالیك بۆ خۆی بۆمــان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چ دوعایەکی بۆکردوە. فەرمووی: (اللّهُمَّ أَكْثِرْ مالَهُ، وَوَلَدَهُ، وَأَطِلْ حَياتَهُ).

واتــە: خوای پــەروەردگار داوات لێ دەکەم، کە ئەم کوڕە (ئەنەس) زۆر دەوڵەمەنــد بێ و ماڵ و ســامانی زۆر بێ، هەروەها تەمەنی پڕ خێــر و بەرەکــەت بێ و لە ســەر خێر درێژ بــێ. وە مناڵ و نەوەی زۆریشــی پێ ببەخشــی.. بەڵێ ئەم ســێ دوعایەی بــۆ کرد. ئەنەس دەفەرموێ: (فالله أَكْثَر مالي، حَتَّى إِنَّ كرماً لي – شــجَرَة – لَتْحميلُ في السَّــنَةِ مَرَّتَيْنِ، وَوُلِدَ لِصَلْبي مِئَة وَسِتَّة). رَواهُ البُخاري في الأَدَب المُفْرَد (٦٥٣) سَنَدُهُ حَسَن

واتـــە: خـــوای گەورە دوعـــای پێغەمبەرەکەی گیرا کـــرد و ماڵ و ســـامانم بەرەکەتـــی تـــێ کەوت و زۆر بـــوو. تا ئەوە بـــوو کە باخ و باخاتی من. زیاد لە هەموو خەڵکی ساڵی دووجار بەرهەمی دەدا!! وە هەروەها (ســـەدو و شەش) کەسم لە نەوەی خۆم بینیوە!!، بۆ تەمەن درێژیەکەشـــی، ئەنەس دەفەرموێ: (قَدَّمَ رَسُـــولَ اللهِ (ﷺ) المَدِينَةَ وَأَنا إِبْنُ عَشْرٍ، وَماتَ وَأَنا إِبْنُ عِشرين) رَواهُ مُسْلِم (٢٠٢٩)

واتە: کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی هاتە مەدینە من تەمەنم (١٠) ساڵان بوو، کە وەفاتیشی کرد تەمەنم (٢٠) ساڵ بوو.. وە لە دوای وەفاتی پێغەمبەری خواوە (ﷺ)، ئەنەس هەشتا و ئەوەندە ساڵە ژیا. واتە: تەمەنی لە سەد ساڵ زیاتر بوو!!.

جـــا ئەنەس بەو هەمـــوو تەمەنەیەوە، لە هێز و توانا نەکەوتبوو. فکر و هۆشی زۆر لە سەر خۆی بوو. بە بەڵگەی ئەوەی کە لە باسی ئەنەســـی کوڕی مالیکدا هاتوە کە: (فَقَدْ أَفْطَرَ أَنَس بَعْدَ ماكبر عاماً وَعامَيْنِ. وَأَطْعَمَ عَنْ كُلِّ يَوْمٍ مِسْكِيناً خُبْزاً وَلَحْماً).

واتە: دوای ئەو هەموو تەمەنە درێژە کە لە ســـەد ســـاڵ تێپەڕی کرد. ئەنەس ســـاڵێك یان دوو ســـاڵ توانای ڕۆژووگرتنی نەمابوو. وە لە جیاتی هەر ڕۆژێکیش کە تێیدا بە ڕۆژوو نەدەبوو، نان و گۆشتی دەدا بە هەژارێك هەتا تێری دەخوارد..

سُـــبْحانَ اللّٰه، بە بەرەکەتی خزمەتکردنی قورئان و پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەنەس کە تەمەنی لە سەد ساڵ تێپەڕی کردبوو. تەنها دوو ساڵیان توانای ڕۆژووگرتنی نەما، واتە هیچ بێهێزی و بێتوانایی ڕووی تێ نەکرد..

نوســەری تەفســیری (أَضْــواءُ البَيــان) دەفەرمــوێ: مامۆســتای قورئانخوێنانی مەدینەی مونەوەرە، کە شــێخ: (حَسَــن الشّــاعِر)ە و تا نووسینی ئەو دێڕانە مەبەستی (أَضْـواءُ البَيـانَ)ە. لە ژیاندایە. تەمەنی زۆر لە (ســەد) ســاڵی تێپەڕی کردبووە، سوپاس بۆ خوا بە بەرەکەتی لە خزمەتدابوونی قورئان بەو تەمەنە زۆرەوە هێشــتا هەر خەریکی وانەوتنەوەیــە بــە فەقێکانــی و بە دەیان خوێنــدکار لە خزمەتیدا (قیرائاتی عەشر) دەخوێنن و بە هەموویان ڕادەگا و گوێیان لێ دەگرێ و وەڵامی پرســیارەکانیان دەداتەوە!. ئەمەش هەمووی بە بەرەکەتی خزمەتکردنــی قورئــان ئاوا خــوای گەورە هێز و توانای جەســتە و لاشــە و هێز و بیر و مێشــکی بۆ پاراستون. ســوپاس بۆ خوا لە ناو میللەتی کوردی خۆشماندا، سەدان کەسایەتی ئاوا هەڵکەوتوون کە بە بەرەکەتــی لە خزمەت قورئان بووندا. بە تەمەنێکی یەکجار زۆرەوە، وەکــو گەنجیەتیــان بەهێز و پێز ماونەتەوە و هــەر بەردەوام بوون لە خزمەتکردنی قورئان و زانســتەکانی خزمەتــکاری قورئان. وەکو نموونەی: (شــێخ محمد عثمان ســراج الدين)ی نەقشبەندی. کە (١٠٣) ساڵ تەمەنی موبارەکی بوو. بەردەوام لە خزمەت قورئاندا بوو. تا دوا ساتەکانی تەمەنی زۆر بەهێز و توانا و بیروهۆشی لە سەرخۆی بوو، وە خەریکی ئامۆژگاری و ڕێنمایی موســڵمانان بوو. ئەمەش هەمووی لە بەرەکەتی بەسەربردنی ئەو تەمەنە زۆرە لە خزمەتکردنی قورئان و خزمەتکارانــی قورئانــدا، کە هەندێ لە وانــەی زۆر لە خزمەتیدا بــوون دەفەرموون: ڕەنگە زیــادەڕەوی نەبێ ئەگەر بڵێــی لەو (١٠٣)

ســاڵ تەمەنەدا (٣) غەیبەتی نەکردووە!.. وە هەروەها مامۆســتا مەلا عبدالکریمــی مدرســی بیارە، کە مامۆســتای هەموو مامۆســتایان و مێژەربەســەرانە، تەمەنــی پڕ بەرەکەتی (١٠٢) ســاڵ بوو. تا (ســەد) ساڵی قەڵەمی هەر بە دەستەوە بوو هەر خەریکی نووسین بوو. فکر و هــۆش و بیری هەر بە جوانــی کاری دەکرد. ئەمەش هەمووی بە بەرەکەتــی لــە خزمەت قورئاندا بوونە.. دەی کــێ دەیەوێ کاتێ کە تەمەنی گەیشتە پیری و بە ساڵاچویی. (کە عومری درێژ شەرمی لە کەس نییە) با بە گەنجی لە خزمەت قورئاندا بێ و پشت بە خوا و بە ویســتی خوا لە پیریدا، خوای گەورە هێز و توانای جەســتەیی و فکری بۆ دەگێڕێتەوە و دەهێڵێتەوە و سەربەرز و ئاسودە بژی.

٤. بــۆ ئەوەی کاتێ کە پیر بووی و چویتە ســاڵەوە، خوای گەورە هێز و توانات بۆ بپارێزێ و موحتاج و ئاتاجی دەســتی کەس نەبی: (تا گەنجی بەردەوام دوعا بکە، کە خوای گەورە ئەندامەکانی لاشــەت بە ســاغ و دروســتی بۆ بهێڵێتــەوە).. صەحابی بەڕێــز: (عبدالله ی کوڕی عومەر) دەفەرموێ: (قَلَّما كانَ رَسُــولُ اللهِ (ﷺ) يَقُومُ مِنْ مَجْلِسٍ حَتَّى يَدْعُوا بِهَؤُلاءِ الدَّعَواتِ لأَصْحابِهِ: اللَّهُمَّ أَقْسِــمْ لَنا مِنْ خَشْيَتِكَ مايَحُولُ بَيْنَنَا وَبَيْنَ مَعاصيكَ، وَمِنْ طاعَتِكَ ماتُبَلِّغُنا بِهِ جَنَّتَكَ، وَمِنَ اليَقِينَ ماتَهُونَ بِهِ عَلَيْنا مصيبات الدُّنيا، وَمَتِّعْنا بِأَسْماعِنا وَأَبْصارِنا وَقُوَّتِنا ماأَحْيَيْتنا وَاجْعَلْهُ الوارِثَ مِنّا) حَديثٌ حَسَــن رَواهُ الترمذي (٣٥٠٢) وَحَسَّنَهُ الأَلْباني في صَحيح الجامِع (١٢٦٨)

واتــە: کــەم وا هەبوە پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە کۆڕ و دانیشــتنێك هەڵبســتێ و هاوەڵانــی بەجێ بێڵێ، هەتــا ئەم دوعــا و پاڕانەوانەی

بـــۆ ئەصحابەکانی نەکردبێ، کـــە دەیفەرمووو: پـــەروەردگارە لە ترس و هەیبەتـــی خۆت ئەوەندەمان پێ ببەخشـــە کە ببێتە بەربەســـت لە نێـــوان ئێمە و ســـەرپێچی فەرمانەکانی تـــۆدا، وە ئەوەندەمان هێز و توانـــا پێ ببەخشـــی لە تاعەت و عیبادەتی خۆت کـــە بمان گەیەنێتە بەهەشـــتەکەت. وە ئەوەندەمـــان یەقیـــن و دڵنیایی پێ ببەخشـــی کە موصیبەت و نارەحەتیەکانی دونیامان لە ســـەر سووك بکەی. وە ئەی پەروەردگارا لێت دەپاڕێینەوە کە گوێ و چاو و هێز و توانامان بەردەوام بـــێ لەگەڵمان و پێیان ئاســـودە بین هەتا ئـــەو کاتەی کە لە ژیانداین، وە بیانکە بە میراتگر لە نێوان خۆمان. واتە کاتێ کە دەمرین گوێ و چاو و هێز و تینمان وەکو خۆی مابێتەوە و لە ژیاندا و لە پیریدا بە تایبەتی تووشی گوێگرانی و چاوکزی و لاوازی و لەرزۆکیمان نەکەی..

دەبا ئێمەش ئەم دوعا پیرۆزە لەبەر بکەین و بەردەوام بیڵێینەوە، بـــە ئومێدی ئـــەوەی کە خـــوای پـــەروەردگار لە کاتی پیـــری و بە ساڵاچوویيدا. موحتاج بە دەستی کەسمان نەکات و ئەو خەڵاتانەی کە خوای گەورە پێی بەخشیوین لە سەرمان بەردەوام بن. یا ڕەبی خوایە هیدایەتـــی زیاتری گەنج و لاوەکانمان بـــدەی، پیرەکانمان عاقیبەت خێر کەی. لە شەڕی شەیطان و بەڵای ناگەهان و فیتنەی ئاخر زەمان ئێمە و هەموو موسڵمانان پارێزراو بکەی.

(رَبَّنا آتِنا فِي الدُّنيا حَسَنَةً وَفِي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ)

اللّهُمَّ آمين

**سەرچاوەكان:**

١. موسُوعَة الحقوق الإِسْلامية، محمود المصري، ج٢ ص٧٤٢، ص٧٥٧.

٢. أَصْحاب الرَّسُول، محمود المصري، ج١ ص١٨٣، ص٣١٦، ص١٨٠.

٣. خُلَفاء الرَّسُول (ﷺ) عمر و خالد، ص١٧٢.

وتاری پێنجەم بۆ مانگی ذي القعدة

# ماف و ئەركی بە ساڵاچووان
## بەشی شەشەم

الحَمْدُللّهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعِينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: بە پشتیوانی خوای گەورە و لە فەزڵ و كەرەم و هاوكاری و یارمەتی ئەو بە زیاد بێ، بەردەوامین لە سەر باسی ئەرك و مافی بە ساڵاچوان و لە ئەڵقەی كۆتایی ئەم زنجیرە باسەدا دەڵێین: پیری ڕێزێكی گەورەیە بۆ مرۆڤی موسڵمان، چونكە ئیماندار ئەگەر تەمەنی درێژ بێ و كردەوەی جوان بێ، ئەوە باشترینی كەسە. هەر بۆیە تەماشا دەكەین ڕێزدارترینی مرۆڤەكان، كە پێغەمبەرانی خوا بوون. زۆربەیان گەیشتونەتە تەمەنی پیری و بەساڵاچویی وەكو: حەزرەتی شوعەیب، كە ئەوەندە پیر بووبوو. توانای ئەوەی نەمابوو لە ماڵ بێتە دەر و مەڕوماڵاتەكەی بلەوەڕێنێ، چونكە كوڕیشی نەبوو، كچەكانی ئەو ئەركەیان دەگرتە ئەستۆ، هەروەكو یەكێ لە كچە بەڕێزەكانی، لە وەڵامی (موسا) پێغەمبەردا كە لێی دەپرسێ: چۆنە وا ئێوەی ئافرەت شوانی ئەم مەڕوماڵاتەن و پیاوێكتان لەگەڵ نییە؟! لە وەڵامدا فەرمووی: (أَبُونا شَـيْخٌ كَبِير) باوكمان پیاوێكی بە ساڵاچووی زۆر پیرە، كە توانای ئەوەی نەماوە لە ماڵ بێتە دەر و مەڕوماڵاتمان بۆ بلەوەڕێنێ..**

هەروەهــا حەزرەتی ئیســحاق، وە حەزرەتی یەعقــوب، پیر و بە ســالآچوو بوون و سەر و ڕیشــیان لە پیریدا سپی بووە، هەروەکو لە باســی حەزرەتی (یەعقوب)دا، لە سورەتی (یوسف)دا لە ئایەتی (٧٨)دا، لەو کاتەدا کە حەزرەتی یوسف بە فێڵێك و پلانێکی نەخشەبۆدارێژراو (بنیامیــن)ی بــرای دەگێرێتــەوە بۆ لای خــۆی، براکانــی تری لێی دەپاڕێنەوە کە یەکێك لەوان لە جیاتی بنیامین گل بداتەوە. چونکە بنیامیــن باوکێکی پیر و بە ســالآچووی هەیە، هەروەکو دەفەرموێ: ﴿ قَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْعَزِيزُ إِنَّ لَهُۥٓ أَبًا شَيْخًا كَبِيرًا فَخُذْ أَحَدَنَا مَكَانَهُۥٓ ۖ إِنَّا نَرَىٰكَ مِنَ ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾ یوسف: ٧٨

واتە: براکانی وتیان: جەنابی پاشــا، بە ڕاستی ئەم کوڕە باوکێکی پیری بەســالآچووی هەیــە. کەواتە یەکێك لە ئێمــە لە جیاتی ئەو گل بــدەرەوە. چونکــە بێگومان ئێمە تۆ بە پیاوچــاك و چاکەخواز دەزانیــن.. کەواتە: حەزرەتی یەعقوبیش گەیشــتۆتە تەمەنی پیری و بــە ســالآچوویی. هەروەها حەزرەتی إبراهیــم، تەمەنی زۆر بوە و بە ســالآ چوە و چۆتە ڕیزی پیرانــەوە. هەروەها حەزرەتی زەکەریا پێغەمبەر سەلامی خوای لە سەر بێ تەمەنێکی زۆری بە سەر بردوە لــە خزمەتی ئاینی خوادا و چۆتە ناو ســاڵەوە و پیر بوە، هەروەکو لــە زمانی خۆیــەوە قورئانی پیرۆز ئاماژە بــە پیربوونی حەزرەتی زەکەریــا دەدات، ئــەو کاتەی کە لە خوا پاڕایەوە کە منداڵێکی صاڵحی پێ ببەخشێ. زەکەریا فەرموی: ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّى وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّى وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا ﴾ مریم: ٤

واته: زەكەریا فەرمووی: پەروەردگار، بە ڕاســتی من ئێســكەكانم لاواز بوون و قژی سەرم هەر هەمووی سپیەتی دای گرتوە.. كە ئەمە نیشانەی پیریەتی و بە ساڵاچوییە.

بەڵێ ئیمانداران: پیربوون و بە ساڵاچوون، یەعنی ڕێز و حورمەت بۆ ئەو كەسە، پیر یانی مامۆستا و حەكیم و لێزان، هەروەكو لە كۆندا بە كەســانی خاوەن ئەزموون و بەڕێز و ســەركردە و چاوساغی گەل و میللەت و هۆز وتراوە (پیر)، هەروەكو: پیر شــالیاری شــارەزووری، پیر خدری شاهۆ، پیر مەنصور، پیرەمەگرون، پیری شەوكێل...هتد.

كە لەبەر قەدر و حورمەت و چاكی و پاكی و خزمەتی زۆریان بە موســڵمانان، ناوی (پیر)یان بۆ زیــاد كراوە. كە وابوو حەیفە پیریش قەدری خۆی نەزانێ و ئەو پلە و پایە گەورە ڕانەگرێ و لێی سودمەند نەبێ.. بەڵێ پیری، دیاردەیەكی تەنها بەرەو ڕووی مرۆڤەكان نابێتەوە. بەڵكــو گیانلەبەران و ڕووەك و ســاڵ و ڕۆژیش، دەرفەتی خۆلادان و قوتاربوونیــان نییە. بەڵێ تەنانەت ئەســتێرەكانیش قۆناغی ژیانیان هەیــە. وەك مرۆڤ چۆن لە ژیانیدا بە قۆناغەكانی (منداڵی، لاوێتی، كامڵبوون، پیری و مردن)دا دەڕوات. ئەستێرەكانی گەردوونیش هەمان حاڵەتیان بە ســەردا دێ، كاتێك دەڵێن ئەســتێرەیەك گەنجە یان لە لاویەتی دایە، ئەوە مانای ئەوەیە، كە زۆربەی زۆری ئەو ئەستێرەیە لــە گازی هایدرۆجیــن پێك هاتوە، بەرەبەرە ئــەم هایدرۆجینە كەم دەبێتەوە بۆ نمونە (خۆر)ی خۆمان ئەستێرەیەكی گەنجە، هایدرۆجین ماددەی سەرەكیەتی بۆ دروستبوونی ئەو وزە و ڕووناكییەی كە پێمان

دەگات، لــە خــۆردا لە هەر چرکەیەکــدا (٦١٦) ملیۆن تەن لە ماددەی خۆر کە هایدرۆجینە دەگۆڕێت بۆ (٦١٢) ملیۆن تەن لە گازی هیلیۆم. واتــە: لە هەر چرکەیەکــدا (٤) ملیۆن تەن لە ماددەی خۆر نامێنێت. لە کردارێکدا کە پێی دەوترێ کرداری (ناوکە یەکبوون). بەشی زەوی خۆمــان لەو گەرمییە تەنها بریتییــە لە: (یەك بەش لە دوو ملیۆن) بەش!! بەم پێیە قۆناغ بە قۆناغ خۆر هایدرۆجینەکەی سەرف دەکات و دەبێــت بــە هیلیۆم. پاشــان ئەویــش ســەرف دەکات و دەبێت بە مادەیەکی قورســتر وەك (کاربۆن). ئەویش سەرف دەکات و تا دەگاتە قۆناغێك ئەو ئەســتێرەیە مادەی ناوی دەبێت بە ئاســن و پاشان کە ئەو ئاسنە بە سەر ناوکی ئەستێرەکەدا کەڵەکە دەبێت، ئیتر ناگۆڕێت و ئەو ئەســتێرەیە دەگاتە قۆناغی کوژانەوە و مردن.. بەڵێ هەروەکو مرۆڤ لە گەنجییەوە پیر دەبێ و پاشــان دەمرێ، هەموو شــتەکانی دەورووبەریشمان ئاوا ڕۆژێك لە گەنجییەوە پیر دەبن و پاشان دەمرن و ســەرەنجام ژیــان لە ســەر گــۆی زەوی کۆتایی پێ دێــت و دواتر گەردوونیــش کۆتایی پێ دێت. ئەو کاتەی ﴿إِذَا ٱلشَّمۡسُ كُوِّرَتۡ ۝١ وَإِذَا ٱلنُّجُومُ ٱنكَدَرَتۡ ۝٢﴾ التكوير: ١ – ٢، ئەمجا قیامەت دەست پێ دەکات..

کە وابوو ئێمەی مرڤ کە ئەگەر تەمەنمان هەبێ، ڕۆژێك دەگەینە قۆناغی پیری، خۆئامادەکردن بۆ ئەو جیهانە، ئەو قۆناغە سەختە و گرنگەی تەمەن، تا دوور بین لە هەندێ خەم و خەفەت کە بەرهەمی ڕەفتــار و گوفتارەکانــی ئێســتای خۆمانن و لە ئەنجامی ســادەیی و کورتبینی خۆمانەوە ئەنجامیان ئەدەین، کارێکی زۆر پێویستە. چونکە

هەرکە پێمان نایە ئەو قۆناغەی تەمەنەوە هێدی هێدی ئەندامەکانی لەشمان بە شێوەیەکی گشتی هیلاك ئەبن و توانای کارکردنمان چ بۆ دنیا بێت یان قیامەت سست و لاواز ئەبێت.

جا کاتێ کە مرۆڤ پیر بوو، گەر لە گەنجیدا شوێنکەوتەی نەفس بێــت. بیر ئەکاتەوە کە توێشــوویەکی وای لە هەگبــەدا نییە و لەو لاشەوە هاوتەمەنەکانی خۆی جێیان هێشتوە و قەبریش وا دەمی بۆ کردۆتــەوە و چاوەڕێی ئــەکات کە لە ئامێزی بگرێ. لەم کاتەدا خەم و خەفــەت و بێئومێدی ئەبێتە لیباســی بۆ ئــەو وزە و توانا زۆرەی بە هەدەر چوە و بۆی ناگەڕێتەوە. ئێســتاش وەك (د. محمدی خانی) دەڵــێ: پیر ئەزانــێ بەڵام ناتوانێ!.. ئەو کاتە خــۆی بە خۆی دەڵێ: داخی بە جەرگم چیم کرد بە خۆم!. بەڵام ئەو مرۆڤەی لە تەمەنی لاویدا خوای ناســیوە و بە ڕەفتار و گوفتاری شــوێن فەرمیشتەکانی کەوتوە و خزمەتی مرۆڤایەتی کردوە. ئیتر لە هەر بوارێکدا بووبێت. کاتێك کە پیر ئەبێت وەك کەسی یەکەم خەم و خەفەت نابێتە بەرگ و خۆراکی. بەڵکو بە زەردەخەنەوە پێشوازی لەو جیهانە ئەکات.

بەڵــێ بەڕێــزان: ئەگــەر نەمرین خــۆ ئەبێت پیر بیــن. کەواتە ڕۆیشتن بۆ لای ئەو کەسانەی کە لەو جیهانەدا ئەژین تا ئامۆژگاریان لــێ وەربگرین و ئــەو جیهانەمان پێ بناســێنن. کارێکی ژیرانەیە و وتراویشە: سەد حەکیم هێندەی دەردەدارێك نازانن.

با بــی هێنینە بەرچاوی خۆمان، ئەم واقیعەی کە لە ناو جیهانی بە ساڵاچواندا هەیە. کە دابەش بوون بە سەر دوو بەرەدا. یەکەمیان

پیرێکە کە ئاوا باسی خۆی دەکات و دێتە گۆو دەڵێ: من تەمەنم تەواو بوو، وا کۆتایی هات، من ئەبێت دڵم بە چی خۆش بێت لە کاتێکدا کار و کردەوەیەکی وا شـــك نابەم لەبەر خوا ئەنجامم دابێت، یان خۆمم لێ بە دوور گرتبێ، تا گەنج بووم و توانای کارکردن و بەخشـــین و ســـیلەی ڕەحم و بەندایەتی خوای گەورەم هەبوو، وام ئەزانی پیری بـــۆ ئێمە نییە، یان ئەگەر هەشـــبێت کاریگەریەکی ئەوتۆی نییە لە سەرمان، کەچی وا ئێستا وەك ئەبینین بە چۆکا هاتووم و هەرچەند کۆشش ئەکەم ناتوانم کارێ ئەنجام بدەم ئاسودەم بکات.. ئای حەیف بۆ تەمەنی لاویم کە چۆن بە بەلاش بە سەرم برد، لەو لاشەوە پیر و بە سالآچوویەکی تر هەیە کە زۆر نورانی و بە کەیفە. لەم دیدەوە گوێی بۆ دەگرین کە باسی ڕابردووی خۆی و چارەنووسی لە داهاتوودا دەکات و دەڵێ: من زۆر دڵخۆشم بەم جیهانە و هیچ لێی زویر نیم و نیگەرانی نەکردووم. چونکە سوپاس بۆ خوا لە هەگبەکەمدا کەمێك توێشـــوو هەیـــە و ئومێـــدی زۆرم هەیە کە خواوەندی بەخشـــندە و میهرەبـــان لەو ســـەفەرە دوور و درێژەدا ســـەلامەتم بکات.. من هەر لە کات و ســـاتی گەنجییەوە، ســـوپاس بۆ خوا بە پێی توانا بە پاکی بەندایەتیم ئەنجام داوە و لەو ســـەروەت و ســـامانەش کە بوومە لێم بەخشیوە، ڕێزی مرۆڤەکانم بە گشتی گرتووە، خوای گەورەش چاوی لە بەندەکانیەتی و حەتمەن پاداشتیان دەداتەوە.

دەی خـــۆش بـــە حاڵی ئەو کەســـەی کە دەگاتـــە تەمەنی پیری و لـــە جـــۆری دووەمیانە و کە ســـەیری ڕابردووی دەکات دڵشـــادە

بــە ڕەحمەتی خــوا، چونکە بەردەوام خوای خۆی لــە یاد بووە و گوێڕایەڵــی کردوە و کاتێ لە ڕێگا لای داوە و تووشــی خزان بووە، هەر خێرا تەوبەی کردوە..

ئیماندارانی بەڕێز: مامۆستای شاعیر (جمال حبیب الله -بێدار) لە ژێر ناونیشــانی (چپەیەك لەگەڵ پیری)دا، بەم شێوەیە لەگەڵ پیری دەدوێ و دەڵێ:

پیری، بێ ویست و داوای خۆم هاتی.
نازانم (هات)ی یاخۆ (نەهات)ی.
گەر (هات)ی سەد جار سەرچاوم هاتی.
ئەگەر (نەهات)ی بریا نەهاتی.
پیری بۆ گیانم خۆری و هەڵهاتی.
جوانی، پیری هات. تۆ بۆ هەڵهاتی؟!
ساڵەهای ساڵە دەسماڵی دەم بام.
پەروانەی شەیدای گوڵزاری دونیام.
هەنگی ئاوارەی (ئاوارە)ی هیوام.
ئەوا ئێستاکەش ماندووی نا بەکام.
جوانی خوات لەگەڵ، خێرهاتی پیری.
گەر لەگەڵتا بێن ئارامی و ژیری..
پیری ئاخۆ تۆش وەکو جوانی بی؟!
هەر سەرگەردانی و پەشیمانی بی؟!
تۆش هەڵپەی هەڵمی کامەرانی بی؟

یانی سەراپی شادمانی بی؟
کاتی بەسەرچوو، شوانی جوانی.
مەرجی ئەوە بوو چوو پیری هانی.
پیری! تا پار و پێرێ جوانێ بووم.
من نالێم میر و ئاغا و خانێ بووم.
لەوە بگەرێ بێ سامانێ بووم.
لە دەریای حەزدا مەلەوانێ بووم.
پیری ئاخۆ تۆش هەروەکو جوانی
تەنها خەوێکی کورتی شەوانی؟
پیری! هەتا سەر هەر لەگەڵمانی؟
یان ماوەیەکە و لامان میوانی؟
پیری وەرزێکیت پڕ زوقم و سەرما.
بەفرێکی قورست باراند بە سەرما.
دڵ بە جێی هێشتم بە تەنها سەرما.
کەی بەرگی سپی ئەکەی بە بەرما؟!
پیری! من نالێم کۆت و قۆرتێکی.
چونکە دەزانم پاساپۆرتێکی.
سنورێك نییە تۆ نەی بەزێنی.
کام پاسەوانە تۆ نەی تەوێنی؟
پیری، دەردێکیت دەرمانی دەردان.
ئەگەیتە فریای هەناسە سەردان..

نە پێت مەست دەبم، نە پێت پەست دەبم.

سات بە سات ئاشنای سۆز و هەست دەبم.

پیری، تۆ نامەی بێ وشە و ڕستەی.

مەقامی (هجران)، بەڵام بێ بەستەی.

پیری! ئەگەر چی بێ ویستم هاتی.

بۆچ بڵێم (نەهات)؟، بۆچ نەڵێم (هات)ی؟..

ئیماندارانی بەڕێز: لە دوا بەشی ئەم زنجیرە باسەماندا، باسی ئەوە دەکەین، ئەگەر گەنجێك لەگەڵ پیرێکدا بوو بە کێشەیان. ئایا دەبێ هەڵوێستی گەنجەکە و پیرەکە چۆن بێ؟! لە ئیسلامدا پیر و بە ساڵاچوو دەبێ لە خەمی گەنجدا بێ، وە گەنجیش قەدر و حورمەتی پیر لە یاد نەکات.. سەرنجی ئەم بەسەرهاتە شیرینە بدەن.. ئەم بەسەرهاتە لە (موسنەدی ئیمام ئەحمەددا (٥٨/٤) هاتووە. وَقالَ الهَيْثَمي في المجمع (٢٥٦/٤) رَواهُ أحمد، حَديثٌ حَسَن).. کوڕێکی گەنجی دڵسۆزی ئیسلام. کە دڵی پڕاوپڕ بوو لە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ناوی (ڕەبیعەی ئەسلەمی)یە، دەفەرموێ: من لە خزمەت پێغەمبەری خوادا بووم (ﷺ). هەر کە لە ماڵ دەهاتە دەرەوە لە خزمەتیدا بووم. هەتا ئەو کاتەی کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ڕۆژێکیان دوای ئەوەی کە بە تەواوی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناسیمی و شارەزای ڕەوشت و ئەخلاقم بوو، پێی وتم: (يارَبيعَة: ألا تَزَوَّجَ؟) ئەی ڕەبیعە، ئەوە بۆ ژن ناهێنی و ژیانی هاوسەری بۆ خۆت پێکەوە نانێی؟! بەڵێ، ئەمەش دینە. نابێ هەر بڵێی وەرە غەزا بکە و خۆت بە کوشت بدە و ماڵ و سامانت بە

قوربانی ئیسلام بکە. دەبێ خەمیشی لێ بخۆی، بزانی ئەم گەنجە وا تەمەنی ژنهێنانیەتی و ئەگەر لەوە تێ بپەڕێ، وردە وردە وای لێ دێ هەموو کچێك پێی ڕازی نابێ. لەبەر ئەوە پێش ئەوەی ڕەبیعە قسە بکات و ئەو ئاواتەی کە هی هەموو کوڕ و کچێکی گەنجە، بدرکێنێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو سەرکردە و پێشەوایەکی دڵسۆز، وەکو پێغەمبەرێك کە سەرتاپای ڕەحمەتە، ئەم باسەی لەگەڵ ئەم گەنجە پاکە، دڵسۆزە کردوە. بە ڕاستی دەبێ سەرکردە بۆ شوێنکەوتوانی ئاوا خەمخۆر بێ، نەك شوێنکەوتوانی بە دڵ و بە گیان خۆیان بکەن بە قوربانی، بەڵام ئەو تەنها چاوی مەصڵەحەتی خۆی و بەرژەوەندی بنەماڵە و منداڵەکانی خۆی بوێ، دەبێ هەروەکو لە خەمی دامەزراندنی کچ و کوڕی خۆی دایە. ئاواش لە خەمی دامەزراندن و پێکهێنانی ماڵ و حاڵ بێ بۆ ئەو کەسانەی کە شوێنی کەوتوون. کە لەمەشدا، هیچ ڕابەر و سەرکردەیەك لە جیهاندا نەبوە و هەرگیز ناشبێ کە ئاوا دڵسۆزی شوێنکەوتوانی بێ.. بەڵێ فەرمووی: ئەی ڕەبیعە ئەوە بۆ ژن ناهێنی؟ ئەوە بەنیاز نی خێزان درووست بکەی و لە تەنهایی ڕزگارت بێ و هاودەم و هاوخەم و هاوسەرێکت ببێ؟! ڕەبیعە دەفەرموێ: منیش لە وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) وتم: (وَاللهِ يارَسُولَ اللهِ ماأُرِيدُ أَنْ أَتَزَوَّجَ، ماعِنْدِي مايُقِيمُ المَرْأَةَ وَما أُحِبُّ أَنْ يَشْغَلَنِي عَنْكَ شَيْءٌ).. سوێند بەخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەی دڵسۆز و خەمخۆرەکەم. ئەی لە جێگای باوك و هەموو کەسەکەم. نامەوێ ژن بهێنم و بیریشی لێ ناکەمەوە، ئەویش لەبەر دوو هۆ، یەکەم: من کەسێکی دەستکورت

و هــەژار و بێ ماڵ و حاڵ و بێ پــارە و پارووم. ئیتر چۆن ژنەکەم بخــوازم و بی گوازمەوە و پاشــان خەرجی ماڵ و حاڵ دابین بکەم؟! بەڵێ ئا ئەمە قســەی گەنجی موســڵمانی تێگەیشتوە، هەر ئەوە نییە ژن بخوازی و حەزت لێی بێ و حەزی لێت بێ، ئەبێ وەکو دڵت پڕە لە خۆشەویســتی کچێك کاسە و قاسەشــت، ئەگەر زۆریش پڕ نەبێ، لانــی کەم ئەوەندەی تێدا بێ، کە ژیــان و گوزەرانی بۆ دابین بکەی، چونکە ژن بە سروشتی ژنانەی خۆی، خوای گەورە وا دروستی کردوە بەردەوام حەزی لە ماڵ و خانووی باش و کەلوپەلی جوانە! دەی ئەو داوای بکا و ئەم گەنجە باشە هیچ لە دەست و گیرفانیا نەبێ و هیچ کار و کەسابەت و موچەیەکیشی نەبێ، ئەی لە کوێی بێنێ، ئایا قەرز بکا و پاشــان پێی نەدرێتەوە و ئابــڕووی بچێ؟ یان وەڵامی ژنەکەی نەداتــەوە و ناکۆکی و دووبەرەکی دروســت ببــێ و ژیانیان ببێ بە ژان؟! خاڵیبوونی ماڵیان لە کەلوپەل و پێداویســتی ژیان و گوزەران، وا یان لێ بکات کە دڵیشیان خاڵی ببێ لە خۆشەویستی یەکتر.. بەڵێ ڕەبیعەی ژیر و زیرەك، زۆر بە وردبینییەوە بیری لە داهاتوی ژیانی خێزانــی کردبۆوە و عەرزی پێغەمبەری خوای کرد (ﷺ) کە هۆکاری یەکەم کە نامەوێ ژن بهێنم، دەستکورتی و هەژاریمە.

هــۆکاری دووەمیــش ئەوەیــە: نامەوێ هیچ شــتێ لە تــۆم دوور بخاتــەوە و وام لــێ بکات بەردەوام هۆش و بیــرم هەر لای تۆ نەبێ ئەی پێغەمبەری خۆشەویســتم (ﷺ).. ئەگەر ژن بێنم دەترســم بە هۆی سەرقاڵیم بە ژن و ماڵ و حاڵەوە، وام لێ بکات کە نەتوانم وەکو

ئێستا بەردەوام لە خزمەتتدا بم. کە نزیکی لە تۆوە بە هیچ خۆشی و خەڵاتێکی دونیا ناگۆڕمەوە.

(فَأَعْرَضَ عَنّي) جا کاتێ کەئەو ڕونکردنەوەیەم لەخزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) باس کرد، هیچ قسەی نەکرد و لەسەری نەڕۆیشت و باسەکەی داخست و هیچی تری نەوت (فَخَدَمْتُهُ ماخَدَمْتُهُ). ئیتر خزمەتم کرد. تا ئەوەندەی توانیم لە خزمەتیا بم و ماوەیەکی تری پێ چوو، ئەمجا بۆ جاری دووەم پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتمەوە: ئەی ڕەبیعە ئایا ناتەوێ ژن بهێنی، منیش هەر هەمان وەڵامی یەکەمجاریم دایەوە و پێغەمبەری خواش (ﷺ) بێدەنگ بوو، لە سەری نەڕۆیشت. (ثُمَّ رَجَعْتُ إِلى نَفْسي) دوای ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێم جیا بۆوە، بە خۆمدا چومەوە و لەگەڵ خۆمدا کەوتمە گفتوگۆ و بە خۆمم وت: (وَاللهِ لَرَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِما يُصْلِحُني في الدُّنيا وَالآخِرَةِ أَعْلَمُ مِنّي). سوێند بە خوا پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە وەی کە بۆ دونیا و قیامەتی من چاکە و خێرە، زۆر زۆر چاکتر دەزانێ لە خۆم، (وَاللهِ لَئِنْ قالَ تَزَوَّج، لَأَقُولَنَّ: نَعَمْ يارَسُولَ اللهِ) سوێند بە خوا ئەگەر ئەمجارەیان ئەم باسەم لەگەڵ بکاتەوە، یەکسەر دەڵێم: بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئامادەم ژن بهێنم و جەنابت فەرمانت بە چییە لە خزمەتتدام.. (مُرْني بِما شِئْتَ) چیت پێ باشە، فەرمانم پێ بکە و من جێبەجێی بکەم.. پاش ماوەیەك پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێی وتمەوە: ئەی ڕەبیعە ئایا ناتەوێ ژن بێنی؟! منیش یەکسەر وتم: (بَلى، مُرْني بِما شِئْتَ) بەڵێ دەمەوێ ژن بێنم و، چیت پێ خۆشە بەوە فەرمانم پێ بکە تاوەکو جێبەجێی

**بکەم ئەی پێغەمبەری خۆشەویستم (ﷺ)، فەرمووی:** (إنْطَلِقَ إلى آل فُلان، حَيٍّ مِنَ الأنْصارِ، فَقُلْ لَهُمْ: إنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) أرْسَلَنِي إلَيْكُمْ يَأْمُرُكُمْ أنْ تُزَوِّجُونِي فُلانَةَ، لأمْرَأةٍ مِنْهُم).

**واتە: ئەی ڕەبیعە برۆ بۆ لای فلان هۆز، لە فلان گەڕەکی مەدینە پێیان بڵێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی ناردوە بۆ لای ئێوە و داوای لێ کردوون کە فلان کچتان بدەن بە من.**

**بەڕێزان: تەماشاکەن، پێغەمبەری خوا (ﷺ) وەکو ئەم کوڕە گەنجەی ئاگا لێبوە کە وەختی پێکهێنانی ژیانی هاوسەریەتی، لە هەمان کاتدا ئاگای لەوەش بوە کە کچێکی موسڵمانی ڕەوشتبەرزی ڕێکوپێک لەماڵی فلان کەسی مەدینەیی، وەختی شووکردنیەتی و با ئەم کوڕ و کچە باشە بۆ یەك بن و ژیانێکی پوخت بۆ خۆیان دروست بکەن. کە ئەمەش خەمخۆریی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەردەخات بۆ ئافرەتی ئوممەتەکەی..**

**بەڵێ ڕەبیعە دەفەرموێ:** (فَذَهَبْتُ، فَقُلْتُ لَهُمْ: إنَّ رَسُولَ الله (ﷺ) أرْسَلَنِي إلَيْكُمْ يَأْمُرُكُمْ أنْ تُزَوِّجُونِي فُلانَةَ). **دەفەرموێ: منیش ڕۆیشتم بۆلایان و پێم وتن کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) منی ناردوە بۆ خزمەت جەنابتان و فەرموویەتی ئەگەر ڕازی بن، کچەکەتان کە ناوی فلانە بدەن بە من و ژیانی هاوسەری لەگەڵ پێك بێنم.** (فَقالُوا: مَرْحَباً بِرَسُولِ الله، وَبِرَسُولِ رَسُولِ الله، واللهِ لايَرْجِعُ رَسُولُ رَسُولِ الله إلاّ بِحاجَتِهِ، فَزَوَّجُونِي، وَألْطَفُونِي وَما سألُونِي البَيِّنَةَ).

**ئەوانیش زۆر بە حورمەتەوە، بە ڕووی گەشەوە وتیان: مەرحەبا لە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێ و ڕێزی لە سەر سەر و سەرچاومان.**

وە مەرحەبا و سڵاو و حورمەت بۆ ئەو کەسەش بێ کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردوویەتی بۆ لامان. بە خوا ئەو کەسەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناردوویەتی نابێ بە دەستی خاڵی بگەڕێتەوە. چوون پرسیان بە کچەکە کرد و یەکترمان بینی و هەردوو لامان یەکترمان زۆر بە دڵ بوو. وە زۆر ڕوویان خۆش بوو لە گەڵم و داوای شاهید و بەڵگەشیان لێ نەکردم و کچەکەیان پێشـــکەش کردم.. ئا لێرەدا پێویستە ئێمەی ئیمانداریـــش ئـــاوا بین، گێڕانەوەی ئەم بەســـەرهاتە وەکو حیکایەت گێڕانـــەوە نییە. بـــۆ ئەوەیە پەند و ئامۆژگاری لێ وەربگرین و کاری پـــێ بکەین. دەبـــا ئێمەش ئەگەر کەســـێك هاتـــە خوازبێنی کچمان، خوشـــکمان، ســـەیر کەین، ئەگـــەر ڕەفتار و ڕەوشـــتی (محمدی) بوو، ئـــەوە وا بزانین کە پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) بۆ لای ناردووین و ڕەتی نەکەینەوە، ئەمجا تەماشـــاکە: ئەم گەنجە کە ڕەبیعەیە، هەســـتی بە چـــی کردوە، دەفەرمـــوێ: (وَأَلْطَفُونِي) زۆر ڕێزیـــان گرتم، زۆر ڕوویان گـــەش و دەم و چاویـــان کراوە بوو لەگەڵم، بـــەڵام بە داخەوە هی وا هەیە کە کچەکەشـــی پێشکەش بە کوڕێکی گەنج دەکات، کە هەرچی عەیـــب و کـــەم و کورتی بێ نیەتی، کەچی ئـــەو ڕۆژە نان ناخوا کە کچەکەی شووی کردوە، یان دەم و لچی داوە بە یەکدا، یان دەڵێ: حەز ناکەم زاوا زۆر بێتە ماڵمان!! بەمە ئەم زاوایە، هەســـت بە نارەحەتی دەروونی دەکات. وە (ڕەبیعە) دەفەرموێ: (وَمَا سَأَلُونِي البَيِّنَة) داوای بەڵگە و شـــاهیدیان لێ نەکـــردم. ئەمە ئامۆژگاریە بۆ ئێمـــە کە مادام ئەو کوڕەی دەیەوێ زەواج لەگەڵ کچەکەمان بکات ڕێکوپێك بوو. خاوەنی

دین و ڕەوشتی بەرز بوو، ئیتر پێویست بەوە ناکات کە حەوت پشتی بناسـی، یان بەهانەی ئەوەی پـێ بگری کە چۆن دەوڵەمەندە و چی هەیە و باوکی چ کارەیە. نەخێر، مادام گەنجێکی ڕێکوپێکە و کاسبە و چـاوی لە حەرام نییە. إنْشـاءَ اللّه، ئەو کەمەی زۆر دەبێ و خوا بەرەکەتی بە سـەردا دەڕێژێ. (فَرَجَعْتُ إلى رَسُولَ اللهِ (ﷺ) حَزيناً) ڕەبیعە دەفەرمـوێ: زۆر بـە غەمباری و مەحزوونـی گەڕامەوە بۆ خزمەت پێغەمبـەری خـوا (ﷺ)، ئای کـە دڵ بە خەم بووم. (فَقـالَ لي: مالَكَ يارَبيعَـةُ)؟! هەر کە پێغەمبەر (ﷺ) چاوی پێم کەوت، یەکسـەر زانی کـە دڵم تەنگە و غەمێکی گەورەم هەیـە. فەرمووی: ئەوە چییە بۆ وا غەمباری ئەی ڕەبیعە، چی ڕووی داوە؟! (فَقُلْتُ: يارَسُـولَ الله، أَتَيْتُ قَوْماً كِراماً، فَزَوّجُوني، وَأَكْرَمُوني وَأَلْطَفُوني، وَما سَأَلُوني بَيِّنَةً، وَلَيْسَ عِنْدي صَداقٌ) وتـم: ئەی پێغەمبەری خـوا (ﷺ) ئاخر چۆن غەمبار نەبم، چوومە لای ئـەو قەومە بەڕێزە کە جەنابت بۆت دەسـت نیشـان کردم. بە خوا هەتا بڵێی کەسی بەڕێز و چاکن، کچەکەیان پێشکەش کردم زۆر ڕێزیان گرتم، زۆر ڕوویان لەگەڵم خۆش بوو، هیچ بیانوو پەڵپێکیان پێ نەگرتم. بەڵام هەرچی سەر دێنم و دەبەم، هیچ شتێ شك نابەم کە بی کەم بە مارەیی ئەو کچە باشـە ڕێکوپێکە. نازانم چۆن و چی بـەو ماڵە بە حورمـەت و ڕێکوپێکە بڵێم.. (ئای چەند کوڕی گەنجی پاکداوێـن هەیـە لە هەموو زەمـان و زەمینێکدا، کە ئـاوا بێپارەیی تووشـی خەمی گەورەی کردوون. کە ماڵـی باش و کچی باش هەیە، بەڵام ناتوانن بچنە پێشـەوە و لە دەرگایان بدەن چونکە مارەییەکی

کەمیشـیان پـێ پەیدا ناکرێ) بـەڵام ئایا دڵسـۆزێك هەیە کە وەکو پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەمی ئەو گەنجە بخوات؟! خۆ بە خوا ئەمەش سوننەتی هەرە گەورەی پێغەمبەرە (ﷺ) کە ئاوا یارمەتی ئەو جۆرە گەنجانـە بـدەی، با بزانین پێغەمبەر (ﷺ) چـی بۆ ڕەبیعەی گەنج کـرد؟! پێغەمبـەری خوا (ﷺ) لەو کاتەدا خۆی هیچی بە دەسـتەوە نەبوو تا بی دات بەم کوڕە گەنجە، بەڵام چارەسـەری کێشەکەی کرد بە وەی کە فەرمانی بە خزمەکانی کرد کە دەبێ یارمەتی بدەن. بە خزمەکانی ڕەبیعەی بە هۆزی ئەسـلەم فەرموو: (إِجْمَعُوا لَهُ وَزْنَ نَواةٍ مِنْ ذَهَبٍ) ئەی خزمەکانی ڕەبیعە، بە هەمووتان دەسـتبار و کۆمەك بۆ ئەم کوڕە باشـەتان بکەن و بە ئەندازەی ناوکە خورمایەك ئاڵتوونی بۆ کۆ بکەنەوە (لێرەدا گەورەیی مارەیی دەردەکەوێ، پێغەمبەر (ﷺ) نەی فەرموو مارەیی هەر ناوێ. نەخێر، بەڵکو فەرمووی بە ئەندازەی دەنکـە خورمایەك ئاڵتوون ئامادە بکەن، واتە با مارەیی هەبێ، بەڵام کەم بـێ، ڕەبیعە دەفەرموێ: (فَجَمَعُوا لِي وَزْنَ نَواةٍ مِنْ ذَهَبٍ) خزمەکانم بەئەنـدازەی دەنکـە خورمایـەك ئاڵتونیان بۆ کۆکردمـەوە، منیش بەخۆشـحاڵیەوە ئاڵتونەکەم وەرگرت و بردم بۆ خزمەت پێغەمبەر (ﷺ). ئەویـش فەرمووی: (إِذْهَبْ بِهذا إِلَيْهِـمْ فَقُلْ: هذا صَداقُها) برۆ بۆ لای ماڵی دەزگیرانت و بڵێ: ئەمە مارەیی کچەکەتانە.. منیش لەسەر فەرمایشـتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) چووم بۆ لایان و وتم: ئەوە مارەیی کچەکەتانە. (فَرَضُوهُ، وَقَبِلُـوهُ، وَقالُوا: كَثيرٌ طَيِّبٌ) ڕەبیعە دەفەرمووێ: کە بـۆم بـردن زۆر ڕازی بـوون و ئاڵتوونەکەیـان وەگـرت و دایان بە

کچەکەیـــان و وتیان: هـــەر زۆر زۆرە و زۆر ماڵێکـــی پوخت و پاکە. (ئای ئەمڕۆ موســـڵمانی وا هەیە بە حیســـاب دیندار و مولتەزیمە بە ئیســـلامەوە، بەڵام لە کاتی کچ بەشـــوودانیدا، دەیـــان بەهانە دەگرێ، وەکـــو ئـــەوەی دەبێ ئاڵتوونی مارەییەکەی عەیـــارە (٢١) بێ، (١٨) مان قبوڵ نییە!!. دەبێ پاشـــەکی (موئەخەرە)ی مارەییەکەی (١٠٠) لیرەی ڕەشـــادی بێ!!!)، بەڵێ ڕەبیعـــە دەفەرموێ: ئاڵتوونەکـــەم دانێ و (ثُمَّ رَجَعْتُ إلى النَبيِّ (ﷺ) حَزيناً). پاشـــان گەڕامەوە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) بۆ لای خەمخۆری هەموو خاوەن خەمەکان، ئەمجارەشیان زۆر غەمبار و مات و مەلووڵ بووم.. ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر کـــە چاوی پێم کـــەوت فەرمووی: (يارَبيعَةَ مالَكَ حَزيـــنٌ؟!) ئەی ڕەبیعە ئەوە چییە دیســـان دەبینم غەمباری؟! ئەمجارەیان کێشـــەت چییە؟! (فَقُلْتُ: يارَسُولَ الله، ما رَأَيْتُ قَوْماً أَكْرَمَ مِنْهُمْ، رَضُوا بِما آتَيْتُهُمْ وَأَحْسَنُوا وَقالُوا: كَثـــيراً طَيِّباً، وَلَيْسَ عِنْدي مـــا أُولِمَ) وتم: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەتا ئێســـتا ماڵی ئاوا چاك و بەڕێزم نەدیـــوە، زۆر ڕازی بوون بەوەی کە بـــۆم بردن بۆ مارەیی کچەکەیان و زۆر پێی ئاســـودە بوون و وتیان: زۆر زۆرە و هیـــچ عەیبی نییە. ئێســـتا بیر لەوە دەکەمەوە لە ڕۆژی بووك گواســـتنەوەدا چی بکەم بە نانی شـــایی و چی دەرخواردی ئەو خەڵکە بدەم؟! پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) ئەمجارەش بانگی خزمەکانی ڕەبیعەی کرد و فەرمووی: (إجْمَعُوا لَهُ شـــاةً، قالَ: فَجَمَعُوا لي كَبْشـــاً عَظيماً سَميناً) فەرمووی: ئەی خزمەکانی ڕەبیعە ئەرکی خزمایەتی بەرامبەر ئەم کوڕە گەنجە باشـــەتان جێبەجێ بکـــەن و مەڕێك، بەرخێکی بۆ

بکـــرن بۆ ئەوەی بـــی کات بە نانی شـــاییەکەی.. ئەوانیش بەرانێکی گـــەورەی قەڵەویان بۆ کڕیم. ئەمجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی ڕەبیعە: (إذْهَبْ إلى عائشَةَ، فَقُلْ لَها: فَلْتَبْعَث بالْمِكْتَلِ الَّذي فيه الطَّعامُ، قالَ: فَأَتَيْتُها، فَقُلْتُ لَها ما أَمَرَني بِهِ رَسُولُ الله (ﷺ). واتە: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمـــووی: ئـــەی ڕەبیعە بڕۆ بۆ ماڵی ئێمە، بۆ لای عائیشـــە و پێی بڵـــێ: بـــا ئەو کەندوەی کە ئاردی تێ دایە، چـــی تێ دایە بۆت بکاتە گوێنیـــەوە و بداتێ، منیش چوومە خزمەت دایکی ئیمانداران، خاتوو عائیشە و پێم وت کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) شتێکی ئاوای فەرموە. فَقالَتْ: (هذا المِكْتَلُ فيهِ تِسْـــعَ آصُعِ شَـــعيرٍ، لا وَالله إنْ أَصْبَـــحَ لَنا طَعامٌ غَيْرُهُ، خُذْهُ). خاتوو عائیشـــە فەرمووی: ئەوە کەنـــدوی ئاردەکەیە. نۆ ڕبە جۆی تێدایە. ســـوێند بە خوا هەرچی خۆراك بـــێ لە ماڵماندا نییە غەیری ئەوەندە جۆیە. وەرە بی بە بۆ خۆت و چی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی جێبەجێی بکە.. (دەبێ ســـەرکردە ئاوا بە کردەوە خەمخـــۆری شـــوێنکەوتوانی بێ، هەر بە قســـە خەمخـــۆر نەبێ، یان هـــەر نەڵێ ئەوەی بۆ بکەن و ئـــاوا بکە. بەڵکو دەبێ لە دەمی ماڵ و منداڵـــی خـــۆی بگرێتەوە و قوربانی بە خۆی و بە ماڵ و منداڵی بدات، لـــە پێناوی بەختەوەرکردنی گەنجێکی شـــوێنکەوتەیدا، بەڵام توخوا هەرچی مێژووی ســـەرکردەکانی دونیایە، لە کۆنەوە هەتا ئەمڕۆ ئایا ســـەرکردەیەکی وەکو (محمد المصطفى) (ﷺ) دەست دەکەوێ، ئەمڕۆ سەرکردە ئەگەر پارەی دەوڵەت کە هی میللەتەکە خۆیەتی. بدات بە کەســـێکی داماو، یان موچەیەکی بۆ ببڕێتەوە، کە حەقی خۆیەتی و

پارەی خۆیەتی لە لای حکومەت، ئەوا ئەو سەرکردە بە باشترین و دڵنەرمترین سەرکردە و خەمخۆری هەژاران ناو دەبرێ و کارەکەی دەبێتە مانشێتی ڕۆژنامەکان!!). بەڵێ ڕەبیعە دەفەرموێ: (فَأَخَذْتُهُ، فَأَتَيْتُ بِهِ النَّبِيَّ (ﷺ) وَأَخْبَرْتُهُ مَاقَالَتْ عَائِشَةُ) منیش جۆیەکەم هەڵگرت و بردم بۆخزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) وە ئەوەم پێ ڕاگەیاند کە عائیشە پێی وتبووم. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: تۆ خەمی ئێمەت نەبێ ئەم جۆیە بەرە بۆ ماڵی خەزوورت و بڵێ با بی هاڕن و بی کەن بە ئارد و بی کەن بە نان.

ڕەبیعە دەفەرموێ: منیش فەرمایشتەکەی پێغەمبەری خوام (ﷺ) پێ ڕاگەیاندن و جۆیەکەم لای ئەوان بە جێ هێشت و پاشان بەرانەکەم لەگەڵ خۆم برد بۆ ماڵی خەزوورم و کۆمەڵێ پیاویشم لە خزم و کەسوکارم لە هۆزی (ئەسلەم) لەگەڵ خۆم برد. کاتێ کە چووینە لای صاڵحی خەزوورم وتیان: (أَمّا الخُبْزُ فَسَنَكْفِيكُمُوهُ) بە نسبەت نانەکەوە، خۆمان نانەکە لە ئاردی خۆمان دەکەین و ئەوە دەبێ لە ئەستۆی خۆماندا بێ و جۆیەکە بەرەوە بۆ خۆت، ئا لەو گرانیەدا ماڵی کچ ئاوا سەخی تەبیعەت بوون. ئەو تۆزە ئاردەی هەیان بوە، بۆ نانی شایی کچەکەیان لە ماڵی خۆیان، بە دەستی خۆیان ئامادەیان کردوە، کەچی ئەمڕۆ، سوپاس بۆ خوا کە ئارد و نان بە بێ پارە دەچێتە هەموو ماڵێکەوە، هێشتا ماڵی هەندێ لە باوکی کچەکان، چاوەڕێی ئەوەن ئەگەر پاروە نانێکیان لەماڵ بخورێ، ماڵی زاواکەیان لەگەڵ خۆیان بی بەن!!. بەڵێ ڕەبیعە دەفەرموێ: ماڵی خەزوورم وتیان: نانەکە بۆ

**خۆمــان دەی کەیــن.** (وَأَما الكَبْشُ فَاكْفُونا، أَنْتُــمَ. فَأَخَذْنا الكَبْشَ أَنا وَأُناسٌ مِنْ أَسْــلَم، فَذَبَحْناهُ وَسَــلَخْناهُ وَطَبَخْناهُ). **بەڵام بەرانەکە ئێوە یارمەتیمان بدەن و با گۆشــتەکە لەسەر ئێوە بێ و خۆتان سەری ببڕن. ئێمەش، من و هەندێ خزمانم لە ئەســلەم، بەرانەکەمان سەربڕی و کەوڵمان کــرد و کردمانە مەنجەڵەوە و ئاگرمان ژێردا.** (فَأَصْبَحَ عِنْدَنا خُبْزٌ وَلَحْمٌ، فَأَوْلَمْــتُ وَدَعَوْتُ رَسُــولَ اللهِ (ﷺ)) **ئیتر نان و گۆشــتمان ئامادە کردو، بوکمان گواســتەوە و نانی شــاییمان دروست کرد و پێغەمبەری خوام (ﷺ) دەعــوەت کرد. بەڵێ لە خانوویەکــی بچکۆلەدا لەگەڵ خێزانم ژیانێکی سادە و بە قەناعەتمان پێك هێنا، پێغەمبەری خواش (ﷺ) پارچەیەك زەوی پێ بەخشیم، ئیمامی ئەبوبەکریش پارچەیەك زەوی پێ بەخشیم بۆ ئەوەی کاری لەسەر بکەم و بێبەرهەم نەبم.** (وَجاءَتِ الدُّنيا، فَاخْتَلَفْنا في عِذْقِ نَخْلَةٍ). **ئیتر دونیا بە ڕووماندا کرایەوە و تەماح هاتــە مەیدان و ڕۆژێکیان لەگەڵ ئیمامی ئەبوبەکر لەســەر نەمامە خورمایەك کێشــە کەوتە نێوانمانەوە.** (سُــبْحانَ اللّٰه) **هەرچی کێشە هەیە لەســەر ماڵی دونیا درووست دەبێ، ئەوەی زۆر خۆشەویستییە کە کاتێ تەماحی دونیا کەوتە نێوانیانەوە ئەگەر وریا نەبن، کێشە و ناکۆکی و دووبەرەکی دەکەوێتە نێوانیانەوە. بەڵێ ڕەبیعە دەفەرموێ: من دەمگوت ئەو نەمامە دارخورمایە** (فِي حَدِّي) **کەوتۆتە بەشــەکەی لای منــەوە. ئیمامی ئەبوبەکریش دەیفەرموو:** (هِيَ فِي حَدِّي) **نەخێر، لە بەشی مندایە و هی منە..** (فَكانَ بَيني وَبَيْنَ أَبوبكر كَلامٌ) **ئیتر لەسەر ئــەوە لــە نێوان مــن و ئیمامی ئەبوبەکردا قســەمان تێــك گیرا و**

دەمەبۆڵەیەك لە نێوانماندا درووست بوو، (فَقالَ أَبوبكر كَلِمَةً كَرِهَها وَنَدِمَ) ئیمامی ئەبوبەکر لەو کاتەدا تووڕە ببوو. قسەیەکی پێ وتم، جوێنێکی پێ دام. بەڵام هەر قســەکەی لە دەم دەرچوو، یەکسەر پەشیمان بۆوە و زۆر پێــی ناخۆش بوو. فەرمووی: ئەی ڕەبیعــە: (رُدَّ عَلَيَّ مِثْلَها حَتَّى تَكُونَ قِصاصاً). ئەی ڕەبیعە وەرە قسەکەم پێ بڵێوە. بۆ ئەوەی ببێ بە تۆڵە بۆم و لەو بارە گرانەی کەوتە سەرشانم ڕزگارم بێ. منیش وتم: (لا أَفْعَلُ) هەرگیز شــتی وا ناکەم. حەدم چییە قســە بە تۆ بڵێمەوە. ئیمامی ئەبوبەکر فەرمووی: (لَتَقُولَنَّ أَوْ لأَسْــتَعدِيَنَّ عَلَيْكَ رَسُــولَ (ﷺ) فەرمووی: یان دەبێ قســەکەم پــێ بڵێیتەوە، یان لە لای پێغەمبەری خوا (ﷺ) شــکاتت لێ دەکەم کە بە قســەت نەکردووم و ئەو قســە ناخۆشەت پێ نەوتوومەوە. منیش وتم: (ما أَنا بِفاعِلٍ) هەرگیز شتی وا ناکەم و قسەکەت پێ ناڵێمەوە. ئەمجا ئیمامی ئەبوبەکر (رَفَضَ الأَرْضَ وَانْطَلَــقَ إِلى النَبِيِّ (ﷺ) وَانْطَلَقْتُ أَتْلُــوهُ) وازی لە زەویەکە هێنا و ئەوەی بە لاوە گرنگ نەما و ڕۆیشــت بــۆ خزمەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) و منیــش شــوێنی کەوتم. لەو کاتەدا کۆمەڵێــك لە خزمەکانم هاتن و پێیان وتم: خوا ماڵی ئەبوبەکر ئاوا کات، شــوڵی لێ هەڵکێشــاوە، لەســەر چی لەخزمەت پێغەمبەر (ﷺ) شکاتت لێ دەکات. لە کاتێکا کە ئەویش قسەی پێ وتوی!، ڕەبیعە دەفەرموێ: بە خزمەکانمم وت: (أَتَدْرُونَ ماهــذا؟!) ئەزانن ئەوە کێیە؟ ئەوە ئەبوبەکری صدیقە، ئەوە (ثاني اثْنَيْنَ) ئەوە ڕیشسپی و سەرگەورەی موسڵمانانە. تکایە هەتا زووە دووركەونــەوە و بڕۆن، هەتا ئیمامــی ئەبوبەکر ئاوڕی نەداوەتەوە و

(فَيَراكُـــمْ تَنْصُرُونِي عَلَيْهِ) بتان بینێ كه له‌ســـه‌ر مـــن گه‌له‌كۆمه‌كێتان دژ كـــردوه. (فَيَغضَـــبَ) ئه‌مجا ڕقی هه‌ســـتێ و عاجز ببـــێ و توڕه ببێ، بـــڕوا بۆ پێغه‌مبه‌ری خـــوای (ﷺ) باس بكا و ئه‌ویش توڕه و عاجز بێ له ســـه‌ر أبوبكر، (فَيَغْضَبَ اللهُ عَزَّوَجَلَّ لِغَضَبِهِما، فَيُهْلِكَ رَبِيعَةَ). ئه‌مجا خـــوای گه‌وره به هۆی توڕه‌بوونـــی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) و ئیمامی ئه‌بوبه‌كره‌وه توڕه ببێ و ئه‌م ڕه‌بیعه بێچاره به‌دبه‌خت ببێ، وتیان: ده‌ی ئێســـتا چی بكه‌یـــن؟! وتم: هه‌تا زووه بگه‌ڕێنـــه‌وه و كارتان به سه‌رمه‌وه نه‌بێ، ئیمامی ئه‌بوبه‌كر به‌ره‌و لای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌ڕێ كـــه‌وت و منیش بـــه ته‌نها شـــوێنی كه‌وتم، هه‌تـــا چووینه خزمه‌ت پێغه‌مبـــه‌ری خـــوا (ﷺ) (فَحَدَّثَهُ الحَدِيْثَ كَمـــا كانَ) ئیمامی ئه‌بوبه‌كر تـــه‌واوی به‌ســـه‌رهاته‌كه‌ی وه‌كو خۆی بۆ پێغه‌مبـــه‌ر (ﷺ) گێڕایه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) گوێی بۆ قســـه‌كانی ئیمامی ئه‌بوبه‌كر گرت و پاشـــان (فَرَفَعَ إِلَيَّ رَأْسَـــهُ فَقالَ: يارَبِيعَةُ مالَكَ وَلِلْصِّدِيقِ، قُلْتُ: يارَسُولَ اللهِ، كانَ كَذا، كانَ كَذا) پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) سه‌ری به‌رز كردوه‌و و فه‌رمووی: ئـــه‌ی ڕه‌بیعه ئـــه‌وه چی بوه له نێوان تـــۆ و صدیقی ئه‌م ئومه‌ته‌دا؟ (لێره‌دا بۆمان ڕوون ده‌بێته‌وه كه دادوه‌ر كاتێ دوو كه‌س ده‌چنه لای بۆ كێشـــه‌یه‌ك، نابێ بـــه ته‌نها گوێ بۆ یه‌ك كه‌ســـیان بگرێ، با ئه‌و كه‌ســـه ڕاســـتگۆترین كه‌س بێ و هه‌رگیز درۆ نه‌كات، با ئه‌و كه‌ســـه ئه‌بوبه‌كری صدیق بێت، ئه‌بێ گوێ له به‌رامبه‌ره‌كه‌شی بگرێ، ئه‌مجا حوكـــم بدات) ڕه‌بیعه ده‌فه‌رمـــوێ: منیش چی لـــه نێوانماندا ڕووی دابـــوو، وه‌كو ئیمامی ئه‌بوبه‌كر هه‌موویم گێڕایه‌وه.. پێغه‌مبه‌ری خوا

(ﷺ) فەرمـــووی: (أَجَـــلْ، فَلا تَرُدَّ عَلَيْهِ) چاكت كرد، نابێ قســەكەی پێ بڵێیتەوە، چونكە أبوبكر هەر زوو هەســتی بە هەڵەی خۆی كردوەو تەوبـــەی لێ كردووەو داوای لێ كردووی پێـــی بڵێیتەوە تۆش چاكت ردووە كە قســـەكەت پێ نەگوتۆتەوە چونكە ئەو لە تۆ گەورەترە، با گـــەورە و گچكەیی هەر بمێنێ. (وَلَكِنْ قُـــلْ: غَفَرَاللهُ لَكَ يا أَبابكر) بەڵكو ئەی ڕەبیعە بڵێ: خوا لێت ببورێ ئەی ئەبوبەكر. (ئەمە قسەی گەنجی موسڵمانە كاتێ ڕیشسپییەك هەڵەیەكی بەرامبەر دەكات و دەڵێ: دەی خوا لێت ببورێ ئـــەی مامەم، ئەی خاڵەم) ڕەبیعە دەفەرموێ منیش وتم: (غَفَرَاللهُ لَكَ يا أَبابكر). كە ئەمە مانای ئەوەی تێدا شاردراوەتەوە، كە منیش وا لەحەقی خۆم گەردنم ئازاد كردی و خواش لێت ببورێ، بەڵام بۆیە ئەوە بە ئاشـــكرا ناڵێ، لەبەر حورمەتی ڕیشسپییەتی. كە گەنجەكە ڕاســـتەوخۆ نەڵێ، وا من عەفووم كـــردی!! (فَوَلَّى أبوبكر وَهُوَ يَبْكِي) ئیمامی ئەبوبەكریش هەســـتا و خواحافیزیان لە پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) كـــرد و باوەشـــیان بەیەكدا كرد لەگـــەڵ ڕەبیعە و هەر دەڕۆشـــت و دەگریـــا. بەڵێ دەبێ كەســـی بە تەمەن و بە ســـاڵاچوو. ئەگەر هەڵەیەكی كرد ئاوا بۆ هەڵەكانی بگری.. نەك بە پیرییش هەر خەریكی فیتنە و ئاژاوەنانەوە بێ..

خۆزگایە گەنجەكانی ئێمەش ئاوا وەكو ڕەبیعە بوونایە بۆ حورمەتی پیر و كەسانی لە خۆیان گەورەتر، خۆزگایە پیرەكانیشمان ئاوا وەكو ئەبوبەكـــری صدیق، دڵنـــەرم و خاكی و لێبوردە و بەســـۆز بوونایە بەرامبەر بە گەنجەكان و قەدر و حورمەتی خۆیان بپاراستایە. خوای

گــهوره و میهرهبان لێــت دهپارێینهوه لــه گوناههکانمان خۆش به، گهنجهکانمان هیدایهت بده بۆ ئهم ڕێبازه ڕاستهی ئیسلام. عاقیبهتی پیرهکانمان و ههموو لایهکمان خێرکهی. اللّهُمَّ آمین.

### سهرچاوهکان:


١. تهفسیری ئاسان، بورهان محمد أمین.

٢. گۆڤاری (سۆز) ژماره: ٤، ل١٢٦، ل١٦٧.

٣. القصَص النَبَوي - عِبَرٌ وَ عِظات. محمد صالح المُنَجِد. ص٣٢٩.

وتاری یەکەم بۆ مانگی ذي الحجة

# قوربانیکردن و وەڵامدانەوەی خودای گەورە

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانـــداران: لە مانگـــی حەجداین، لە مانگـــی قوبانداین، کە بەم مانگــە دەوترێ مانگی قوربان. چونکە قوربانی تێدا دەکرێ، وە پێی دەوترێ مانگی حەج، چونکە فەرزی حەجی تێدا دەکرێ. ئەم مانگە زۆر خاوەن قەدرە لای خوای گەورە، تەنانەت خوای گەورە (سُبْحانَهُ وَتَعالى) ســوێند دەخوات بە (دە) شــەوی یەکەمــی مانگی قوربان و دەفەرموێ:** ﴿وَٱلْفَجْرِ ﴿١﴾ وَلَيَالٍ عَشْرٍ ﴿٢﴾﴾ الفجر: ١ - ٢

**واتە: ســوێند بە کاتی بەری بەیان، وە ســوێند بێ بە دە شــەوی یەکەمی مانگی قوربان.. بەڵێ ئیمانداران: ئەوەی لە مێشــکی هەموو لایەکماندایــە و ئەوەی توانای مــاددی هەیە خۆی بۆ ئامادە کردووە و پرســیاری لە بارەوە دەکات. (قوربانی) کردنە. بەڵام قوربانیکردن، هەرتەنهــا حەیوان ســەربڕینێك نییــە. بەڵکــو زۆر گەورەترە لەو، قوربانیکــردن وەڵامدانەوەی خوای گەورەیــە، کە کاتێ خوای گەورە دەفەرمــوێ: (فَصَلِّ لِرَبِّــكَ وَانْحَرْ). ئیماندار دەڵێ: ئــەی پەروەردگارم وەڵامی فەرمانەکەی تۆم دایەوە و نوێژم کرد و نوێژی جەژن دەکەم و حەیوانی قوربانی ســەر دەبڕم.. خوای گــەورە بانگەواز دەکات بۆ**

ئیمانداران و دەفەرموێ: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱسۡتَجِيبُواْ لِلَّهِ وَلِلرَّسُولِ إِذَا دَعَاكُمۡ لِمَا يُحۡيِيكُمۡۖ ﴾ الانفال: ٢٤

بەڵێ ئیسلام بەرنامەیەکی ژیانبەخشە. بە وەڵامدانەوەی خالیقی مرۆڤ و هەموو بوونەوەر، ژیان دەبێتە ژیان و دوور دەبێت لە ژان.. لــە قوربانیــدا ئەم حەقیقەتــە بە ڕوونی دەر دەکــەوێ، بۆیە دەبێ هەموو ســاڵێ قوربانی بکرێ و قوربانیکــردن گەورەترە لە حەیوان سەربڕین و گۆشت بەشینەوە.

یەکــەم: هەرچی لــە کەوندایە وەڵامی خوا دەداتەوە و ئەمەش لە قوربانیدا دەردەکەوێ:

١. لــە ڕووی زەمــان و کاتەوە: خوای گەورە (١٠) شــەوی یەکەمی مانگــی قوربانی هەڵبژاردوە و لە دەیەمیــن ڕۆژیدا قوربانی دەکرێ، تەماشــاکەن خوای گەورە دەفەرموێ: (وَالفَجْر، وَلَيالٍ عَشْرٍ). فەجر و بەری بەیان، یانی ســەرەتای جوڵان و ژیان. (لَيْل)یش کۆتایی ڕۆژوو هاتنــی کاتی تاریکییە. (ئەمــە پێمان دەڵێ کە دەبــێ تۆی ئیماندار هەمــوو ژیانت لە خزمەتی خوادا بێ، نەك تەنها هەر چەند کاتێکی کەمی وەکو کاتی نوێژە فەرزەکان و جومعە و ڕەمەزان و حەج. دەبێ هەموو کاتەکانت لە ســەر نەخشەی ئیسلام بەڕێوە بچێت. بۆ ئەوەی ژیانت بە ڕاســتی ژیان بێ، بەڕێزان: بیر بکەنەوە، بۆ دەبێ سەرنجی مانگ بدەی بۆ نوێبونەوە و دیاریکردنی مانگی یەك شەوە؟! چونکە ئەگەر لە (١٠)ی ذي الحِجّـةدا قوربانی نەکەی و پێشــتر بێ. درووســت نابــێ و دەبێ هیچ گومانێکــت نەبێ کە ئەو ڕۆژەی جەژنی قوربانی

تێیدا دەکەی و قوربانی تێیدا ســەر دەبڕی (١٠)ی مانگی قوربانە. ئەمە ئامازەیە بۆ ئەوەی کە ئەی مرۆڤ ســەرنجی مانگ بدە چۆن وەڵامی خــوای داوەتــەوە.. بیر بکەوە مانگ چۆن بە ملیارەها ســاڵە ئاوا لە نوێبوونەوە و کۆتایی پێ هاتندایە. ئەی مرۆڤ، سەرنجی ڕۆژ و مانگ و ئەســتێرەکان بدە. چۆن لە ســەر ئەو نەخشە دەڕۆن کە خوا بۆی دانــاون.. ﴿ وَٱلشَّمۡسُ تَجۡرِي لِمُسۡتَقَرّٖ لَّهَاۚ ذَٰلِكَ تَقۡدِيرُ ٱلۡعَزِيزِ ٱلۡعَلِيمِ ٣٨ وَٱلۡقَمَرَ قَدَّرۡنَٰهُ مَنَازِلَ حَتَّىٰ عَادَ كَٱلۡعُرۡجُونِ ٱلۡقَدِيمِ ٣٩ لَا ٱلشَّمۡسُ يَنۢبَغِي لَهَآ أَن تُدۡرِكَ ٱلۡقَمَرَ وَلَا ٱلَّيۡلُ سَابِقُ ٱلنَّهَارِۚ وَكُلّٞ فِي فَلَكٖ يَسۡبَحُونَ ٤٠ ﴾ يس: ٣٨ - ٤٠

دەی وەرە بیر بکەوە لە وەی کە ئەگەر ئەو ڕۆژ و مانگ و هەموو ملیۆنەها ئەســتێرەیە، بەڵکو ملیارەها ئەستێرەیە، یەکی یەك (ملم) لە خولگەی خۆیان لا بدەن، چ کارەساتێك ڕوو دەدات و چۆن ژیان و ژینگە دەپێچرێتەوە. ئایا ئەمە هەموو خالقی ئەرز و ئاسمانت نیشان نادات؟! دەی ئەوانە هەمووی وەڵامی خوا دەدەنەوە، تۆش ئەی مرۆڤ وەڵامی خوا بدەرەوە.

٢. ئاژەڵەکان وەڵامی پەروەردگاریان داوەتەوە و هەمویان بەشدارن لەم شــەعیرەی خــوادا، (وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُمْ مِنْ شَــعَائِرِ اللَّهِ) حەیوانی دابەستەی قوربانی بۆتە یەکێ لە دروشمەکانی خوای گەورە.. سەرنجی قورئــان بدەن لەو ئایەتانەی کە باســی قوربانــی دەکات، لە ئایەتی (٣٦ -٣٧)ی ســورەتی (الحــج)دا، چەند وشــە هاتووە: (سَــخَّرْناها لَكُمْ) وە (سَــخَّرَها لَكُمْ).. سُــبْحـانَ اللّٰه. ئەو ئاژەڵە وەڵامی خوای گەورەی داوەتەوە کە ملکەچە بۆت، بە خوا گۆلکێ، مانگایەك، بزنێك، مەڕێك،

بەرانێك، حوشـــترێك) سەركەش ببێ، مرۆڤێك نییە بتوانێ خۆی لە قەرە بدات ئەوە خوای گەورە موســـەخەری كردوە بۆ مرۆڤ، كە ئاوا بە ئاسانی لە بەردەستی دەوەستێ و دەتوانێ سەری ببڕێ، بەڵێ، ئەو ئاژەڵە لە سەر ئەو بەرنامە دەڕوات كە خوا بۆی دیاری كردوە، خوای گـــەورە لە قورئاندا دیاری كردوە كە ئاژەڵ بەرهەمی ڕوەكی دەخوات و گۆشـــتخۆر نییە و پاشـــماوەی ئاژەڵ ناخوات، دەبێ پرۆتینی گیایی بخوات نەك حەیوانی وەكو لەســـوڕەتی (عَبَـــس) ئایەتی: (٢٧ -٣٢)دا، ڕوونی كردۆتەوە، كە بەرهەمی كشـــتوكاڵی، ئێـــوە بەرەكەی دەخۆن (مَتاعـــاً لَكُمْ) ئاژەڵیش توێكڵ و كایەكەی. (وَلأنعامِكُمْ). یان دەفەرموێ لـــە بارەی زەرعات و بەرهەمی كشـــتوكاڵی و ڕووەكیەوە: ﴿تَأْكُلُ مِنْهُ أَنْعَٰمُهُمْ وَأَنفُسُهُمْ أَفَلَا يُبْصِرُونَ ۝٢٧﴾ السجدة: ٢٧

بـــەلام مرۆڤ ئەگەر وەلامی خوای نەدایـــەوە (وَاعْتَمَدَ عَلى عَقْلِهِ فَقَط أَضَلَّهُ) پشـــتی بەست بە عەقڵی خۆی بە تەنها، بەبێ وەحی و نوری دین، ئەوە گومڕا دەبێ، قورئان دەفەرموێ: ﴿فَإِن لَّمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَكَ فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يَتَّبِعُونَ أَهْوَآءَهُمْ ۚ وَمَنْ أَضَلُّ مِمَّنِ ٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ بِغَيْرِ هُدًى مِّنَ ٱللَّهِ ۚ﴾ القصص: ٥٠

لـــە وڵاتێكی وەكو (بەریطانیا) عەقڵی مـــرۆڤ بە بێ گەڕانەوە بۆ وەحـــی خوا، كە قورئانە و هیدایـــەت و ڕێنمایی مرۆڤە، بڕیارێكیان دەركـــرد و وتیـــان: پاشـــماوەی خەســـتەخانەكان وشـــك بكرێتەوە و بهاڕدرێ، ئێســـك و پاشەڕۆی بەراز وشـــك بكرێتەوە و بكوڵێندرێ و پاشان وشك بكرێتەوە و بهاڕدرێ و پاشان بكرێتە ئالیكی مانگا، بزانن

چۆن ئابووری وڵاتمان گەشە دەکات و ئەو پاشەڕۆیانە وەکو عەلەفی ئاژەڵ بەکار دەهێنینەوە.

بەڵـێ ئەمە بڕیارێکی عەقڵی مـرۆڤ بوو. مرۆڤێکی خوێندەواری شارنشـینی خاوەن چەندەها شـەهادەی پلە بەرزی زانسـتی، بە بێ گەڕانەوەو حیسابکردن بۆ وەحی خوا، بۆ گەڕانەوە بۆ قورئان بزانن خالیق چی فەرموە و بڕیار داوە.. سُبْحانَ اللّٰه لە ئەنجامی ئەم ئالیکە پیسەوە (جُنُون البَقَر) شێتی مانگا پەیدابوو. خۆ ئەگەر ئەو مانگایەی ئەو نەخۆشـییەی گرتوە، ئەگـەر مرۆڤ لە بەرهەم و گۆشـتەکەی بخوات، ئەویش شـێت دەبێ و دەست دەوەشێنێ. ئەو مرۆڤەش وەکو ئەو مانگا شێتەی لێ دێ و لە (٣) مانگ تا (ساڵێك) دەمرێ، سُبْحانَ اللّٰه، ئیمانداران بەڕێز، باشـە بۆچی لەناو ئەو هەموو نەخۆشییەی لـە سـەر زەوی هەیە. ئەو ئاژەڵەی لە یاسـا و دەسـتورێك کە خوا بـۆ خواردنی لادا، دایناوە، دەبێ (شـێت) ببێ بۆ تەنها (شـێتی)؟! تا بسـەلمێ ئـەوەی لە مەنهەجی خـوا لابدات کە قورئانە، ئاوا شـێت دەبێت و عەقڵی لە دەست داوە، ئەگەر پرۆفیسۆریش بێ بە شەهادە و خوێـدەواری. هاتن وتیان: ئـەو مانگایانە هەرچۆنێك بێ بکوژن و سەریان ببڕن و گۆشتەکەیان بکوڵێنن، تا ئاستێکی زۆر بەرزی کوڵان. ئەوسـا ئەو میکرۆب و ڤایرۆسـەی ئەو نەخۆشییەی هەڵگرتوە و لە گۆشـتەکەدایە چاك دەبێ و نامێنێ. بەڵام کاتێ ئەو گۆشـتەیان بە پلەی (١٢٠) پلە کوڵاند و پاشـان پشـکنینیان بۆ کرد. سـەیریان کرد کە ڤایرۆسـی ئەو میکرۆبی شـێتی مانگایە، هێشـتا هەر لە گەشەدا

بووا! بەمجۆرە (١١) ملیۆن مانگایان سـوتاند، کە نرخەکەی (٣٣) ملیار جونەیهی ئیسترلینی بووا!.. بۆ؟! (لأَنَّهُمْ خالَفُوا مَنْهَجَ اللهِ سُبْحانَهُ وَتَعالى في تَغْدِيَةِ هذا الحَيْوان!!). بەڵێ ئاژەڵیش وەڵامی خوای گەورە دەداتەوە و بەشداری دەکات لە قوربانیدا.

پاشان لە شەرعدا جۆری حەیوانەکە دیاری کراوە، کە ئەم جۆرانەن: حوشتر، ڕەشەوڵاخ، بزن، مەڕ.. لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ: ئەی بۆچی ئاژەڵی کێوی یان باڵندە چ کێوی بێ یان ماڵی بۆ قوربانی نابێ و دروست نییە بکرێن بە قوربانی؟! لە وەڵامدا دەڵێین: وَاللهُ أَعْلَم.

١. ئـەم ئاژەڵـە ماڵیانە لـە ناو ناچن بە سـەربڕین، بەڵام ئاژەڵی کێـوی و باڵندەکان، بە سـەربڕینی زۆر بەو ڕادەیەی کە دەکرێن بە قوربانی و دەفەوتێن و نامێنن. بە تایبەتی کاتێ ئاژەڵی کێوی پارەی پـێ نادرێ، ئـەو کاتەی زۆربەی هـەرە زۆری خەڵکی، بـە تایبەتی ئەوانەی کە توانـای کڕینی حەیوانی قوربانیان نییە. بۆ ئەوەی لەو خێرە گەورە بێبەش نەبن، هەڵدەستن بە ڕاوکردنی حەیوانی کێوی، یـان لەبەر ئەوەی باڵندە ئاسـان ڕاو دەکرێ، یـا لەنرخدا هەرزانە، زۆربەی خەڵکی باڵندەیان دەکرد بە قوربانی و سەرەنجام هەم ئاژەڵ و هەم باڵندەکان مەترسـی لە ناوچوونیان لەسەر دەبوو. کە ئەمەش مەترسـییەکی گـەورەی لە سـەر دواڕۆژی وڵات لە بـواری ژینگەوە دروست دەکرد و ئەوسا ناحەزانی ئیسلام چۆن دەمیان لە ئیسلام و موسـڵمانان دەکردەوە بە وەی کە مەترسیە بۆ سەر ژیانی خەڵکی و ژینگە و ئاژەڵ و باڵندە!! لە لایەکی تریشەوە کاتێ کە شەرع مەنعی

کــــردوە  کە ئاژەڵی کێوی بکرێ بـــە قوربانی، ئەوەمان پێ دەڵێ کە: نابێ سامانی گشتی بکرێ بە صەدەقە و لە لایەن تاکە کەسەوە سودی لێ ببینرێ..

٢. ئاژەڵی ماڵی، ئەو چوار جۆرەی کە بۆ قوربانی دەشێن، سەرچاوەی داهاتــی ملیۆنەهــا کەســە، کە پیشــەی ئاژەڵــداری و بەخێوکردنی حەیوانی دابەســتەیە بۆ بەرهەمی گۆشــت. کە بــە (قوربانی) کردن بازاڕی ئاژەڵ دەجوڵێتەوە و بە هەزاران کەس لەو بوارەدا ســودمەند دەبــن. کە ئەگەر قوربانی نەبێ ڕەنگە زۆربەی خاوەن ئاژەڵەکان ئاوا لە ماوەیەکی کورتدا ئاژەڵەکانیان لە بازاڕدا نەفرۆشرێ..

٣. ئەگــەر دەزگایەکــی حکومی تایبەتی هەبێ ســود لە خوری و موو و پێســتەی ئەو هەموو حەیوانە ببینێ کە ســاڵانە دەکرێت بە قوربانی. وە لە کارگەی ڕســتن و چنین و پێڵاو و جانتادا بە کاریان بهێنــێ، چەندین کارگەی گەورە لــە وڵاتدا دەخرانە کار و بەرهەمی خۆماڵیــان پێشــکەش دەکرد و لەم بوارەشــدا بە ســەدان کەس لەو کارگانە سودمەند دەبن.

پاشان: لە قوربانیدا گرنگی بە سەربڕین دراوە، دەبێ ئەو کەسەی حەیوانی قوربانی ســەر دەبڕێ دەبێ کەسەکە شارەزا بێ لە حەیوان سەربڕیندا، چونکە حەیوان ئەگەر جوان سەرنەبڕدرێ و ئەو خوێنە پیســە لە لاشــەی دەرنەچێ، چەندین نەخۆشــی دەخاتــەوە. لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە: ئەی ماسی بۆ سەرنابڕدرێ؟!
لە وەڵامدا زانایان دەفەرموون: کاتێ ماسی لە ئاو دەرهێنرا، هەرچی

خوێنـــی پیس هەیە بە هــورژم دەڕوات بۆ ڕیشــوی لاگوێکانی و پڕ دەبن لە خوێن و ســوور دەبێ. بۆیە ئەگەر ماســییەکە تازە بێ، ئەو ڕیشاڵانە پڕن لە خوێن. ئەگەر ماسیەکە ماوەیەکی بە سەردا تێپەڕی و کۆن بوو، خوێنەکە دەگەڕێتەوە بۆ لاشــەی ماســیەکە و گوێچکەی ماسییەکە ڕیشوەکانی ناوەوەی کاڵ دەبنەوە و ماسییەکە بۆگەن دەبێ و ناخــورێ. بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئــاوی دەریا (حِلٌّ مَيْتَتُهُ). مردارەوەبووەکەی حەلاڵە. چونکە ئەوەی کە باسمان کرد سەربڕینی ماســییە لە نــاو خۆیدا. ئایا ئەگــەر پێغەمبەری خــوا (ﷺ) نەبێ، ئەم زانســتەی ئەمڕۆ دەربارەی ماســی چۆن زانی؟! سُبْحَانَ اللّٰه لە گەورەیی و عەظەمەتی خوا. ماســی بێ ئاو ناژی، بە پێچەوانەشەوە ئاژەڵێك هەیە لە بیاباندا وەکو (کەنغەری ئوستوڕالی) وایە. لە هەموو ژیانیا دڵۆپێك ئاو ناخواتەوە!! ئەی باشــە خوا نافەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ﴾ الانبياء: ٣٠

ئــەی ئــاوی ئەم ئاژەڵە لــە کوێدایە؟! زانــاکان دەفەرموون: کاتێ بــە وردی لــەم ئاژەڵە کۆڵدرایــەوە بۆیان دەرکەوت کە (ئۆکســجین) لە ڕێگەی هەناســەدانەوە هەڵدەمــژێ وەکو هەر گیاندارێکی تر، لەو خۆراکــەش کــە دەی خوات، غازی (هایدرۆجیــن) دەردەچێ و لە ناو گەدەی ئەو ئاژەڵەدا ئەو هایدرۆجینە لەگەڵ ئەو ئۆکسجینەی کە لە کاتی هەناســەوەرگرتندا هەڵی مژیوە یەك دەگرن و دەبێ بە ($H_2O$) واتە: ئاو. کەواتە: لە ناو سکی ئەو ئاژەڵەدا کارگەی درووستکردنی ئاو هەیە. کە لە هیچ کارگەیەکی سەرزەویدا بەو شێوە ئاو دروست نابێ

و ئەگــەر بکــرێ، کارگەیەکی زەبەلاحی دەوێ و ســەدان ئەندازیاری پســپۆڕ و کرێــکار و کارمەندی دەوێ! بەڵام خالیق کــە (الله)یە. لە ناو ســکی ئەم ئاژەڵە تایبەتەدا، کە هەرگیز ئاو ناخواتەوە، ئەو کارە سەرسوڕهێنەرە لەو شوێنە بچووکەدا، بەو بێ دەنگیە ئەنجام دەدات!!.

٣. ئەم قوربانیکردنە، یادی دوو کەسە. دوو پێغەمبەری خوایە. کە لە هەموو بارودۆخێکدا تاقی کرانەوە و بە جوانی وەڵامی بانگەوازی خوایــان دایەوە. یەکەمیان: ئیبراهیم پێغەمبەرە، بەم قوربانیکردنە، هەمــوو ســاڵێ بە ملیۆنەها جــار یادی دەکرێتەوە و بەشــداری ئەو هەمــوو خێرەیــە. ئیبراهیــم گەنجیەتی خۆی بە خوا بەخشــی، لە ســەر بانگەواز بۆ یەکتاپەرستی خوا، خستیانە ئاگرەوە، لەوێوە ئەوە چەســپا. چوونە ناو ئاگر لە ســەر خوا بۆت دەبێتە بەهەشــتی پڕ لە گوڵ و گوڵزار. ئیبراهیم لە ســەر گەیاندنی پەیامی خوا تووشــی دەربەدەری کرا. تەمەنی لە دەورووبەری (٨٠) ساڵی دایە، خاوەنی دوو خێزانــە و منداڵی نییــە، بەڵام دوعا دەکات و لە خــوا دەپاڕێتەوە و دەفەرموێ: (رَبِّ هَبْ لِي مِنَ الصّالِحِينَ) خوایە پێم ببەخشــی لە منداڵی صالــح و خواناس بەڵێ ئەمە گرنگە (مِــنَ الصّالِحِينَ) بێ، گرنگ ئەوە نییە هەر منداڵت هەبێ، یان کوڕ و کچت زۆر بێ، بەوە وەجاخت ڕوون نابــێ. گرنــگ ئەوەیە صالح و چاکەکار و خواناس و خەڵك دۆســت بــێ، جا ئەی ئەو کەســەی کە منداڵت نییە دڵتەنــگ مەبە، دڵنیا بە حیکمەتێکــی تێدایەو تۆ نایزانی. (فَبَشَّــرْناهُ بِغُلامٍ حَلِيم) خوای گەورە دەفەرموێ: دوعــا و پاڕانەوە و داواکەمان وەرگرت و موژدەمان دایە

بـــە وەی کە منداڵێکی کوڕی پێ دەبەخشـــین. کـــە خاوەنی صیفەت و ڕەوشـــتی بەرزی حەلیمـــی و خۆگری و لە ســـەرخۆییە. کەواتە: لە وەرگیرانی دوعا و پاڕانەوەکانت هەرگیز نائومێد مەبە.

بەڵـــێ ئیمانـــداران: موژدەی خوایی گەیشـــتە ئیبراهیم و کوڕپەی موژدە پێدراو لە کاتی خۆیدا لە دایك بوو.. ئای ئیبراهیم و خێزانی ئەبـــێ چەنـــد دڵشـــاد بووبن. بە تایبـــەت بە وەی کە خـــوای گەورە شاهیدی بۆ ئەم کۆرپەیان داوە کە لە ڕیزی صالحان و چاکەکاراندایە و کەســـێکی هێمن و سالار و ســـەنگینە.. بەڵێ ئیسماعیل گەورە بوو. بوە مێرد منداڵێکی هەتا بڵێی گوێڕایەڵ و چالاك و جوانخاس. ئا لەم کاتەدا کە لەوپەڕی خۆشەویســـتیدا بوو لەبەر دیدە و دڵی ئیبراهیم و خێزانەکـــەی، تاقیکردنەوەیەکی نوێ بۆ ئیبراهیم و خانەوادەکەی دەستی پێ کرد. ﴿ فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ ٱلسَّعْىَ قَالَ يَٰبُنَىَّ إِنِّىٓ أَرَىٰ فِى ٱلْمَنَامِ أَنِّىٓ أَذْبَحُكَ فَٱنظُرْ مَاذَا تَرَىٰ ۚ قَالَ يَٰٓأَبَتِ ٱفْعَلْ مَا تُؤْمَرُ ۖ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ مِنَ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ الصافات: ١٠٢

واتە: کاتێك ئیسماعیل گەیشتە ئەو تەمەنەی کە دەر و ماڵ لەگەڵ باوکیـــدا بکات. بەیانیەکیـــان ئیبراهیم بە ئیســـماعیلی گوت: کوڕی شـــیرینم، ڕۆڵەکەم، تاقانەکەم، بێگومان من دەمبینی لە خەونمدا کە تـــۆ ســـەردەبڕم، تۆ دەڵێی چی؟! ڕات چۆنـــە؟ کوڕی چاك و خواناس و خۆگـــر، بە زمانی شـــیرین فەرمووی: بابە گیـــان، ئەی باوکی زۆر خۆشەویســـتم، هەر فەرمانێکت پێ کراوە جێبەجێی بکە. دەمبینیت ئەگەر خوا حەز بکات، خوا بیەوێت، لە ئارامگران دەبم..

بەڵــێ ئیمانداران: خوای گــەورە و کاربەجێ ئەم هەموو حاڵەتانە کۆدەکاتەوە بۆ حەزرەتی  ئیبراهیم تاوەکو ڕادەی تەســلیمبوونی بۆ فەرمانەکانی خوا گەورەتر دەر بکەوێ:

١. ئیبراهیــم لــەو کاتەدا وەکو ئاوارەیــەك وایە و دوورە لە زێدی خۆی کە خاکی فەلەسطینە.

٢. ئیبراهیــم لە تەمەنی بە ســاڵاچوویی و پیریــدا منالّی بووە. (سُبْحانَ اللّه) لە کاری خوا دوای ئەو هەموو ساڵە، ئەو هەموو دوعا و نــزا و چاوەڕێیــە. ئەمجا لەو پیریەدا خوا منالّی پێ بەخشــی بۆ ئەوەی ئەم حیکمەتەی تێدایە کە لە کاتی پیریدا  تاقی بکرێتەوە و تاقیکردنەوەکە بە وەی کە بە دەســتی خۆی جگەرگۆشــە تاقانەکەی ســەرببڕێ زۆر ســەختترە لە وەی کە ئیبراهیم لە تەمەنی گەنجیدا بوایــە. چونکە ئەگەر ئیبراهیم گەنجێك بوایە، ئومێدی منداڵبوونی تری دەبوو، ئەو کاتە تاقیکردنەوەکەی لەسەر سووکتر دەبوو..

٣. ئیبراهیم تەنها یەك دانە منالّی هەیە کە ئیسماعیلە. خۆ ئەگەر چەند منداڵێکی ببوایە، ئەوا بەخشــینی یەکێکیان ئاســانتر دەبوو، چونکە ئەوانی تری بۆ دەمانەوە.

٤. کوڕە تاقانەکەی گەیشــتۆتە ئاســتی دڵپێخۆشــکردن. (فَلَمَّا بَلَغَ مَعَهُ السَّــعْيَ). وا داری دەســتی باوکیەتی لەو پیریەدا فریای کەوتوە و کاروبــاری بــۆ جێبەجێ دەکات. خۆ ئەگــەر مەلۆتکەیەك بوایە و دوای چەند ڕۆژ لە دایکبوونی بمردایە، ئەو ئازارە گەورەی بۆ ســەر دڵی ئیبراهیم بەو ڕادەیە درووســت نەدەکرد. ئێستا ئیسماعیل بۆی

درووســـت دەکات. چونکە دوای ئەو چەند ساڵ تەمەنەی ئیسماعیل، ئێســـتا ئیبراهیم بە تەواوی هۆگری بوە و هاوڕێ و هاودەمی شەو و ڕۆژیەتی. بە لە دەستدانی بە ڕاستی زۆر بۆی بە پەرۆش دەبێ.

٥. ئیســـماعیل کوڕێکە خوا شاهیدی بۆ دەدات. شاهیدی حەلیمی و نەرمونیانی و لە سەرخۆیی. چونکە ئەگەر کوڕێك لاسار و سەرلار و نەگبەت بێ، باوك نەك هەر زۆر بۆی بە پەرۆش نییە بەڵکو هەندێ جار حەزدەکات بە بێ موصیبەت و بەلا لە کۆڵی ببێتەوە.

٦. پلەی هەرە سەختی تاقیکردنەوەکە ئەوەیە کە دەبێ بە دەستی خۆی سەری ببڕێ، (أَنِّي أَذْبَحُكَ) بە دڵنیاییەوە دەبێ ئەو کارە ئیبراهیم هەر بە دەســـتی خۆی بی کات و وەکیل و وەکیلگرتنی تێدا دروســـت نییـــە. وە نابێ بی نێرێ بۆ جەنگێـــك و لەوێ دوژمن بی کوژێ، کە مردنەکەی بەو جۆرە، ئەگەر بە دەستی خۆی نەبوایە ئاسانتر دەبوو.

٧. شـــێوازی کردنە قوربانیەکە. (أَذْبَحُكَ) دەبێ بە ســـەربڕین بێ!! کە بە ڕاســـتی هەزاران جار سەختترە لە وەی کە بە تیر و کەوانێك لە دوورەوە بی کوژێ، یان لە ســـەر شـــاخێك فڕێـــی بداتە خوارەوە، سەربڕین سەختترین جۆری گیانکێشانە بۆ سەربڕ و سەربڕدراو!!!

٨. خوای گەورە وا فەرمانی پێ کرد کە دەبێ کوڕەکە پرســـی پێ بکرێ. (فَانْظُرْ ماذا تَرى؟) خۆ ئەگەر لە ناکاو پەلاماری بدات و ســـەری ببڕێ، یان لە خەودا ســـەری ببڕێ، هێشتا کەمێك لەو قورسییە کەم دەکاتـــەوە، بەڵام نەخێر دەبـــێ منداڵەکە گەردنی خۆی دەرخات خۆی بێ هیچ فشـــارێك پاڵ کەوێ و ئامادە بێت بۆ ســـەربڕین. ئا لێرەدا

دەوری ئیسماعیل دەر دەکەوێ، کە لە وەڵامی ئەو پێشنیارە سامناکەی باوکیدا، کە داواکردنیەتی بۆ ڕۆحی ئەویش بە سەربڕین، بە (یا اَبَتِ) وەڵام دەداتـــەوە. بە مانای، باوە گیان ئەگەر سەریشـــم ببڕی تۆ هەر باوکی خۆشەویســـتمی و زەڕەیەك خۆشەویســـتیت لە لام کەم ناکات. بۆیـــە نافەرمـــوێ: (یا أَبی) بەڵکـــو (یا أَبَتی) وەڵامی دەداتەوە، پاشـــان دەفەرموێ: (إِفْعَلْ ماتُؤْمَرُ) چیت لە لایەن خواوە فەرمان پێکراوە ئەوە بکە، نەك ســـەربڕین، بەڵکو لەوەش ســـەختتر بێ من هەر ملکەچم. بەڵام ئەمەش ئازایەتی خۆم نییە. (سَتَجِدُنِي إِنْشاءَ اللهُ مِنَ الصّابِرِينَ) بە ویســـتی خوا، بە پشـــتیوانی خوا، ئەگەر خوا ڕەحمم پێ بکا دەتوانم خۆڕاگر بم و ئارام بگرم. چونکە هەرچی پشـــتیوانی و ویستی خوای لەگەڵ نەبێ ناکرێ بە مرۆڤ و مرۆڤ زۆر لەوە لاوازترە خۆی بگرێ بەرامبەر کارەساتێکی لەو شێوەیە.

بەڵێ خوای گـــەورە درێژەی بەســـەرهاتەکەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرمـــوێ: ﴿ فَلَمَّآ أَسْلَمَا وَتَلَّهُۥ لِلْجَبِينِ ﴿١٠٣﴾ وَنَٰدَيْنَٰهُ أَن يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ ﴿١٠٤﴾ قَدْ صَدَّقْتَ ٱلرُّءْيَآ ۚ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجْزِى ٱلْمُحْسِنِينَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ وَفَدَيْنَٰهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ ﴿١٠٧﴾ ﴾ الصافات: ١٠٣ - ١٠٧

واتـــە: کاتێك باوك و کوڕ تەســـلیمی فەرمانی پـــەروەردگار بوون، ئیبراهیم ئیســـماعیلی بە ڕوودا خســـتە ســـەرخاك بۆ ئەوەی سەری ببڕێت. ئێمەش بانگمان لێ کرد ئەی ئیبراهیم، بە ڕاستی خەوەکەت هێنایـــە دی، ئێمـــە هەر ئاوا پاداشـــتی چاکـــەکاران دەدەینـــەوە. لە تاقیکردنەوەکاندا سەریان دەخەین، چونکە لێبڕاون. بە ڕاستی ئەمە

خۆی تاقیکردنەوەیەکی ئاشکرا و ڕوونە. ئێمەش قۆچێکی گەورەمان کردە قوربانی ئیسماعیل تا لە جیاتی ئەودا سەری ببڕێت.

ئیمانداران بەڕێز، ئێستا کە بە کوردی و کورتی مانای ئایەتەکانمان کرد. هەڵوێستەیەکیش لە خزمەت هەندێ وشــەدا بکەین. دەفەرموێ: (أَسْــلَما) ئیبراهیم و ئیســماعیل تەســلیم بە فەرمانی خوا بوون، وەکو سەرەتای وتارەکە وتمان وەڵامدانەوەی خوای پەروەردگارە، هەمووی هەر باســی ئەوەیە بەندەی ڕاستەقینە چۆن وەڵامی بانگەوازی پەروەردگاری دەداتــەوە. ئەمجــا ســەرنجی وشــەی (لِلْجَبــِين) بــدەن. کە بــە مانای خستنبەســەرڕوودا دێت، کە وەکو سوژدەی نوێژ وایە. بە وردی سەرنج بدەن لە سێ شوێنی قورئاندا. نوێژ و قوربانی بە یەکەوە هاتوون:

١. إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي.
٢. فَصَلِّ لِرَبِّكَ وانْحَرْ.
٣. وَتَلَّهُ لِلْجَبِين.

کە لێرەدا مەبەســت ئەوە نییە کە ئیبراهیم بۆیە ئاوا ئیسماعیلی خســتۆتە سەردەم. بۆ ئەوەی چاوی لە چاوی نەبێ و سۆز و بەزەیی زاڵ نەبێ بە سەریدا و بتوانێ ئیسماعیل سەر ببڕێ، نەخێر. نەخێر ئــەوان تــازە بڕیاری خۆیان دابوو. بەڵام بۆیە ئیســماعیلی بە ڕوودا خســتە ســەرخاك، بۆ ئەوەی کە وەکو نوێژکــردن وا بێت بۆی.. کە ئەمــەش گەورەیی قوربانیکردنمان بۆ دەردەخات و تێمان دەگەیەنێ ئەو شــتەی کە لەگەڵ گەورەترین عیبادەتــدا باس کراوە، دەبێ زۆر گەورە بــێ، کە قوربانی زۆر گەورەیە و پاداشــتەکەی یەگجار زۆرە.

ئەمجا خوای گەورە باســی پاداشتی ئیبراهیم دەکات کە کاتێ وەڵامی بانگــەوازی خــوای دایــەوە و ملکەچ و تەســلیم بــوو بەرامبەر ئەو تاقیکردنەوە گەورەیە. خوای گەورەش بە سێ شت پاداشتی دایەوە:

١. وَفَدَيْناهُ بِذِبْحٍ عَظيم.. هەر کە تۆ خۆت تەسلیم بە خوا و شەرعی خــوا کــرد، ئیتر دڵنیا بە کە خــوا دەت پارێزێ، ژیانــت دەپارێزێ، ڕۆڵەت دەپارێزێ.

٢. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ ﴿١٠٨﴾ ﴾ الصافات: ١٠٨

واتــە: پاشــان ئێمە لە نــاو گــەلان و نەوەکانی داهاتــوودا ناوی ئیبراهیممــان هێشــتەوە. بەڵــێ خوای گــەورە هەتا قیامــەت ناوی ئیبراهیمی بە زیندوویی هێشتەوە. ڕۆژانە بە بەردەوامی بە ملیۆنەها جــار دەوتــرێ. (كَما صَلَّيْــتَ عَلــى إبراهيم) لە تەحیاتــی کۆتایی نوێژەکاندا. وە لە قورئاندا بە هەمیشــەیی ناوی ئیبراهیم دەبرێ و بە ئەوپەڕی حورمەت و ڕێزەوە ناوی دەبرێ و دەکرێ بە مامۆستا و چاوساغ و پێشەنگ و پێشەوا.

٣. خــوای گەورە پاداشــتی ئیبراهیمی دایەوە بــەوەی کەفەرموێ: ﴿ سَلَامٌ عَلَىٰ إِبْرَاهِيمَ ﴾ الصافات: ١٠٩

واتە: ســلاو و دروود و ڕێز لە ســەر ئیبراهیــم، وەعد و بەڵێنی پەروەردگار حەقە و هەتا قیامەت ناوی ئیبراهیم زیندوە و هەمیشە لە یادە. ﴿ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴿١١٠﴾ ﴾ الصافات: ١١٠

لێــرەدا جارێکی تــر ﴿ كَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ ﴾ی دووبارە کردەوە، بــۆ ئەوەی تێی بگەین، ئەمە هەر بۆ حەزرەتی ئیبراهیم نییە. هەر

کەسێ ئاوا وەڵامی خوا بداتەوە، خوا لە بەڵا ڕزگاری دەکات ناوی بە نەمــری دەمێنێتەوە.. سُــبْحانَ اللّٰه، ئیبراهیم تەنها و بێکەس بوو. تەنانەت باوکیشــی دوژمنی بوو. لە هەمــوو قەومەکەی تەنها لوطی برازای و ســارە و هاجەرەی خێزانی و ئیســماعیلی کوڕی و پاشــان ئیســحاق ئیمانیان پێ هێنا. کەچی کە ئاوا لە هەموو هەڵوێستەکاندا وەڵامی خوای دایەوە، خوا لە دنیادا نەوەی زۆری پێ بەخشی. ئیسحاق یەعقوبی بوو. بەنی ئیســرائیلی لێ کەوتەوە. هەتا قیامەت ناوی لە ســەر زوبانە و لــە ناو دڵی ملیارەها ئیمانداردایــە. بەڵام (نەمروود) کــە بڕیاری دابوو ئیبراهیم بســووتێنێ، زۆربەی دونیای ئەوکاتی لە بەردەستا بوو. کەچی هەمووی لەناو چوو. مەگەر وەکو عیبرەت ناوی لــە مێژوودا بهێندرێ. کە ئەوەش چارەنووســی هەموو ئەوانەیە کە دژایەتی خوا و پەیامەکەی دەکەن.

ئیمانداران، کەسی دووەم، کە لە باسی قوربانیدا یادی بەردەوام دەکرێ و بە ڕاستی وەڵامی خوای گەورەی داوەتەوە. وە فِعْلاً تەسلیمی ئەمری پــەروەردگار بوو، حەزرەتی (محمد المصطفی)یە (ﷺ). ئەم ســەروەر و سالارەشــمان، دنیا خرایە بەر دەســتی، وتیان تەنها واز لە بانگەوازی پێغەمبەرایەتیت بێنە و باســی بتەکانمان مەکە بە خراپە. ئەوە دەت کەین بە پاشــا. وەکو حوکم و سیاسەت هەموو دەسەڵات و بڕیارێك لە ژێر دەســتی خۆتدا بێ، وە لە بواری دارایی و ســاماندا، دەت کەین بە دەوڵەمەندتریــن کــەس، ئەوەندەت پارە دەخەینە بەر دەســت!. وە لە بواری خێزاندا، جوانترین ئافرەت دەستنیشان بکە و پێشکەشت بێ، کە

بە ڕاستی هەوڵ و تێکۆشانی مرۆڤیش ئەگەر دوور بێ لە پەیامی خوا هەر بۆ بە دەســتهێنانی ئەم سیانە و لە پێناو بە دەستهێنانیدا هەموو شتێ دەکات. بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەمووی ڕەت کردەوە و ڕەفز کرد، وە لە وەڵامیاندا بە (أَبوطالب)ی مامی فەرمووو: مامەگیان، سوێند بە خوا، ئەگەر خۆر لە ئاسمان بهێننە خوارەوە و لە سەر شانی ڕاستمی دابنێن، وە مانگیش بێننە خوارەوە و لە سەر شانی چەپمی دابنێن. کە ئەمە لە توانای هیچ کەسدا نییە و بۆ کەسیش ناکرێ. ئەگەر ئەوەشم بۆ بکەن بۆ یەك چاو تروکانیش واز لەم ئیســلامە ناهێنم، یان خوای گەورە سەری دەخات، یان لە پێناویدا سەرم دادەنێم..

بەڵــێ (محمد المصطفــى) (ﷺ) خوای گەورە تاقــی کردەوە. بە مردنی هەموو کوڕەکانی، بە مردنی کچەکانی و تەنها خاتوو (فاطمە) ی بــۆ مایەوە، تەنها وشــەیەکی ناڕەزاییش بــە دەمیا نەهات و هەر شــوکری خوای دەکرد. خاتوو خەدیجەی هاوســەری دڵسۆزی وەفاتی کــرد (أَبوطالب)ی مامی کە هەرچەند ئیمانیشــی نەبوو بەڵام وەکو هێزێك لە پشتیەوە وەستا بوو. ئەویش مرد، حەمزەی مامی و دەیان هاوەڵی شــەهید بوون. بەڵام ناشــکوریەك بە دەمیا نەهات. تەسلیمی فەرمانی پەروەردگار بوو، ئەوە بوو پاداشتەکەی بریتی بوو لە ﴿إِنَّآ أَعْطَيْنَـٰكَ ٱلْكَوْثَرَ ۝١ فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَٱنْحَرْ ۝٢ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣﴾ الكوثر: ١ – ٣ .

بەڵــێ خوای گەورە، ناوی حەزرەتی محمدی (ﷺ) بەرزکردەوە لە دنیا و قیامەتدا. لە دنیادا لە هەر چوار دەقیقەیەکدا لەم ســەرگۆی

زەوییــە بانگێك دەكــرێ، كە لێرە تەواو بوو لە جێگایەكی تر ئەمجا بانگ دەبێ، بۆیە سوننەتە بانگدان پەلەی تێدا نەكرێ و نزیكەی (٤) خولــەك بخایەنێ. بۆ ئەوەی هەر كە لێــرە بانگ تەواو بوو، لەگەڵ (أَشْــهَدُ أَنَّ لا إِلــه إلا اللّه)دا، وترا (أَشْــهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً رَسُــولَ اللّه) یەكسەر لە شوێنێكی تر بانگ بدرێ و بەم شێوەیە هەتا قیامەت یەك كاتێك نییە كە ناوی محمدی (ﷺ) تێدا نەوترێ و بەملیۆنەها كەس ئەبوبەكــر ئاســا نەڵێن: بەخۆمان و بــاوك و دایكمانەوە فیدات بین ئــەی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لە قیامەتیشــدا لەو رۆژەدا كە خەڵكی نازانن هاناو هاواریان بۆ لای كێ بەرن، حەزرەتی محمد (ﷺ) دەبێتە شــەفاعەتكار و بە هانای ئــەم ئوممەتە و هەموو ئوممەتانەوە دێت. لێــرەدا ڕوو دەكەینە ئەو كەســانەی كە خوای گــەورە پلە و پایە و دەســەڵاتێكی پێ بەخشــیون، دەڵێین: لە خوا بترســن، بیر بكەنەوە كاتێ خوای گەورە لە ناو ئەو هەموو مرۆڤەدا، ئەو حورمەت و ڕێز و پلە و پایە و دەسەڵات و زانیاری و زانستەی بە تۆ بەخشیوە، دەتۆش شوكری خوا بكە و لە خوا غافڵ مەبە و لە نێوان خۆت و خوادا نوێژ بكە، بەڵام (فَصَلِّ لِرَبِّكَ) با نوێژەكەت تەنها و تەنها بۆ خوا بێ، نەك بۆ بەرچاوی كامێرا و ڕاگەیاندن، نەك بۆ خەڵەتاندنی موســڵمانانی دڵپــاك. بەڵام كە لە ناو خەڵكا نەبووی نوێژ نەكەی. نەخێر بۆ خوا نوێــژ بكە نێوانی خۆت و خوای پەروەردگارت بە نوێژكردن ئاوەدان بكــەوە، بۆ ئاوەدانكردنەوەی نێوان خــۆت و خەڵكیش وەرە قوربانی بكە. حەیوان سەر ببڕە و هەژارانی پێ تێر بكە. داماوان و بێباوكانی

پێ دڵخۆش کە. وەرە با لەم قوربانییەوە بەردەوام بی لە بەخشین و خێر و خێرات و ئەو ماڵەی کە خوا بە ئامانەت پێی بەخشیوی، پێش خۆتی بخە بـۆ قیامەتت.. بەڵام گرنگە ئـەو قوربانییەش هەروەکو نوێژەکە تەنها و تەنها بۆ ڕەزامەندی خوای پەروەردگار و بێ غەیری ڕەزامەندی الله. ڕەزامەندی هیچ کەسـی تری تێدا نەبێ. هیچ ڕیا و مەبەسـت و مەرامێکی دونیایی تێدا نەبـێ. چونکە لەئایەتی (فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ)دا ئەوە ئاشـکرا و ڕوونە کە چۆن نوێژەکەت هەر (لِرَبِّكَ) یە و تایبەتە بە ڕەزامەندی خواوە، قوربانیەکەشـت دەبێ بە هەمان شێوە بێ.. پاشـان خوای گەورە موژدەی بە پێغەمبەری خۆشەویست دا و فەرمووی: ﴿ إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ ٱلْأَبْتَرُ ۝٣ ﴾ الکوثر: ٣

واتـە: بێگومان هەر دوژمنان و ناحەزانـت ئەی محمد (ﷺ) بێ ناونیشان و وەجاخکوێر و دوابڕاون.. (لە هەموو خێر و چاکەیەك لە هەردوو جیهاندا)..

بەڵێ، کەسـێ بڕوای بە خالیق و دروستکەری خوای نەبێ، بڕوای بە ڕابەرایەتی و چاوساغی ئەو پێشەنگ و پێشەوایە نەبێ کە محمد (ﷺ) ڕقـی لـێ بێ، دژایەتی خـۆی و پەیـام و بەرنامەکەی بکات. بـڕوای بە قیامـەت و زیندووبوونەوەی دوای مـردن نەبێ. بڵێ بە مردن کۆتاییم پێ دێ. توخوا من لە ئێوە دەپرسم ئەی ئیمانداران، ئەو کەسـە بەم قسانە و بەو بیروباوەڕەی خۆی. بە دەمی خۆی، پڕ گـەرووی هاوار ناکات، (مـن دوا براوم؟!!). بەڵێ بێبڕوایان. ناحەزانی محمـد و ئیسـلام و قورئان و مزگەوت و منـارە دوابڕاون، فەوتاون،

دەم لــە قوڕ چەقاون، جێگایان جەهەنەمــە. ئەگەر تەوبە نەکەن و نەگەڕێنــەوە بۆلای خوا. بەڵام ئیماندار وەجاخی ڕوونە، پاشــەڕۆژی ڕووناکە، دوارۆژی گەشــە، ئێســتای ئاوەدانە، ئەگەر بە تەنهاش بێ، کەســیش نەبێ پشتیوانی لێ بکات، چونکە قیامەتی نەبڕاوەی هەیە، ئەگەر هەموو ژیانی ژەنگ و ژار و ژەهر بێ، هەژاری بێ، کلۆڵی بێ، کزۆڵی بێ، ســتەمی لێ بکــرێ، مادام دەزانێ قیامــەت هەیە و (يَوْمُ الدِّين) هەیە و پاداشتی چاکەکاران و خواناسان لای خوا پارێزراوە (إنَّ اللهَ لايُضيعُ أَجْرَ الْمُحْسِنِين). خوای گەورە پاداشتی ئەو هەموو ژانەی بە ژیانی نەبڕاوە دەداتەوە. بە چوونە ناو بەهەشــت هەرچی ناخۆشیە هەر بە بیریشی نایەتەوە.

دەی ئیماندارانی بەڕێز: بە قوربانی سەربڕین وەڵامی خوای گەورە بدەنــەوە کەفەرموی: (وَانْحَر) قوربانــی بکە. دڵی خەڵك خۆش کە تا خوا دڵت خۆش بکات،ماڵت پڕ بکە لە یادی خوا. لە باســی ئیســلام، با بە ڕاستی ماڵت ئاوەدان بێ، نەك خانوو بێ و ڕازاوە بێ. بەڵام کە خاڵی بوو لە زیکر و یادی خوا، ئەوە کەلاوەیەکی وێرانەیە..

ئیماندارانی بەڕێز: ئاگاشــتان لە ڕۆژی عەرەفە بێ. (ئەبی قەتادە دەفەرموێ: سُـئِلَ رَسُــولَ اللهِ (ﷺ) عَنْ صَوْمِ يَوْمِ عَرَفَةَ؟! قالَ: يُكَفِّرُ السَّــنَةَ الماضِيَة وَالباقِيَة) رَواهُ مُسْلِم.

واتە: پرســیار کرا لــە پێغەمبەری خــوا (ﷺ) دەربارەی ڕۆژووی ڕۆژی عەرەفەی جەژنی قوربان، کە ئایا خێر و پاداشــتەکەی چۆنە؟ فەرمووی: دەبێتە کەفارەت و ســڕینەوەی گوناهی ســاڵی ڕابردوو وە

ســاڵی داهاتووش!.. الله أكبر لــەو بەرەكەتە، لەو خەڵاتە گەورەی كە خوای گەورە پێی بەخشیوین. هەزاران هەزار جار سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگارمان. خوای گەورە دەفەرموێ: (يَأَيُّها الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ وَكُونُوا مَعَ الصّادِقينَ). دەی وەرە هاوڕێی چاكان و پاكان و ڕاستگۆیان بە. (ئیبن عومەر) دەفەرموێ: سوێند بە خوا، ئەگەر شەوان هەموو بە عیبادەت ڕۆژ بكەمەوە. ڕۆژان گشــتی بە ڕۆژوو بم، هەرچی ســامانم هەیە لە ڕێگای خوادا سەرفی بكەم. لەو لاشەوە دڵم چۆڵ بێ لە خۆشەویستی خواناسان و ڕقلێبوون لە خوانەناسان، سوودم پێ ناگات!!...

بەڵــێ، قوربانی فێرمان دەكات كە با ئێمەش، ئێمەی مرۆڤیش لەگەڵ مانگ و ڕۆژدا، لەگەڵ ئاژەڵ و گیانلەبەراندا، لەگەڵ خۆشەویستانی خوادا، تەسلیمی فەرمانی خوا بین و وەڵامی بانگەوازی پەروەردگار بدەینەوە. تا خوای گەورە خێری دونیا و قیامەتمان پێ ببەخشــێ. (رَبَّنا تَقَبَّلْ مِنّا إِنَّكَ أَنْتَ السَّميعُ العَليم، وَتُبْ عَلَيْنا إِنَّكَ أَنْتَ التَّوابُ الرَّحيم). اللّهُمَّ آمين.

## سەرچاوەكان:

١. تەفسیری ئاسان، بورهان محمد أمين.
٢. بەرەو ئیسلام – ئاشتی، ئەندازیار عثمان، ل٥٥.
٣. آياتُ الله في الآفاق، د. محمد راتب النابُلسي ص٣٠١، ص٣٣٨، ص٣٢١.
٤. مَوْسُوعَةَ الأَعْجاز القُرْآني، د. نادیَة طَیّارة ص١٥٩.
٥. چیرۆكی پێغەمبەران، عمرو خالد، و: شێخ محمد سميع، ص٤٦.

# وتاری
# جەژنی قوربان

الحَمْدُللّه رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

ئیماندارانی بەڕێز؛ جەژنی قوربانتان لێ پیرۆز بێت. لەم جەژنە گەورەدا دەڵێین: جەژنە، جەژنە دیسانەوە. خۆشی خستە ناومانەوە.... شـــار و دێ خۆی ڕازانەوە.... یاران هەور و باران سلاو.... دەی بارێنێ بۆنـــی گـــولاو.... جەژن ڕۆژێکـــە تازەیە.... لە تەمەندا دانســـقەیە..... لە خۆشـــیدا ناوازەیە.... جوانیەکەی بێئەندازەیـــە.... جەژن خەڵاتە دیاریە.... زایەڵەی (الله أکبر) بەســـتەی سوپاســـگوزاریە.... گسکدەری بێزاریە.... ئاهەنگێکی ئیمانییە.... لە بازاڕی برایيدا خەندە و ســـلاو هەرزانیە.... وێنەی نییـــە.... کەس جەژنی وەك ئێمەی نییە.... یەك ڕیزیە و تەبایيە .... کەرنەڤاڵێکی شادییە.... بە هەر لایەکدا دەڕوانی، تەوقـــە و گەردن ئازادییـــە.... ئێمە کاتێك جەژن دەکەین، ناوی (الله) شکۆدار و مەزن دەکەین.... بە ئیمانەوە بە پێزین.... لە جەژنیشدا هەر بەڕێزین.... ســـنوری خوا دەپارێزین.... جەژن دەڵێ بە خۆشەویســـتی دڵـــی یەك داگیر بکـــەن.... هەڵەی یەکتر لە بیر بکـــەن.... برا بن.... بۆ یەك چرابن.... دوور لە کێشـــە و لە هەرابن.... ئەگەر بێدار و بە هۆشـــن.... ئەمڕۆ جەژنە.... چاو لە ڕابردوو بپۆشن.... شەڕ مەکرن و

مەفرۆشـــن.... پۆشاکی تەقوا بپۆشـــن.... بۆ یەك ئامانج کە بەهەشتە تێ بکۆشن.... بەڵێ ئیمانە، دوای ئەو مەشق و ڕاهێنانە.... کە پڕ بوو لە پەند و وانە.... ئەمڕۆ ئێمە جەژنمانە.... ئاهەنگە شادی گێڕانە.... گوڵبارانە.... داهێنانە.... پڕ لە مانای بەرز و جوانە .... جەژن جەژنی ئیمانییـــە.... هەزار لەگەڵ دەوڵەمەندا برا بەشـــە.... یەکســانیە لەم جەژنەدا ســـەرفترە و لەویان قۆچـــی قوربانیە.... جەژنی خەڵکی تر وانییـــە.... کـــە جەژن دێ و ڕوو لە گوند و شـــارەکا.... نیشـــتمان بە بەهارەکا.... خەم بارەکا.... ڕێچکەی میوان وەکو ماسی تۆمارەکا.... جا کێ لە کێ زویر بووە و نەفرەت لە نەفس و شە یطانی غەددار ئەکا.... بۆ ئاشـــتبوونەوە غارەکا.... ئەوە گوناحـــی کارنامەی بژارەکا.... زامی دەروون ســـارێژەکا.... کۆشکی تەقوا لە ناو دڵدا دیوارەکا.... جەژن بۆ خۆنەویســـتیە.... ئاشتی فەرمانی خواییە و کرۆکی خواپەرستییە.... جـــەژن هەڵە دەشـــواتەوە.... گرێـــی کینە دەکاتـــەوە.... کێ دڵی پاك ناکاتەوە. بانگی کەی لاناکاتەوە.... جوابی سلاوی ئەم و ئەو ناداتەوە.... هەر پیشـــی خۆی دەخواتەوە.... پەڕەی کۆن هەڵدەداتەوەو.... بیر لە تۆڵە دەکاتەوە.... ئەوە واوەیلا بە حاڵی.... نە لە ئیسلام بووە حاڵی.... نـــە جەژن دەچێتە ماڵی.... کەی بە ڕۆژووین و حەج دەکەین.... کەی بـــۆ خودا مل کەچ دەکەین... کەی لەگەڵ شـــەیطان جەنگ دەکەین... جەژنمانـــە و ئاهەنگ دەکەیـــن.... کەی بە تەقـــوا و چاکەخوازی.... خوا لە خۆمان دەکەین ڕازی.... کاتێ لە بڕوادارانین.... پێڕی دۆستی هەژارانیـــن.... خێرخواز وەك نەرمە بارانیـــن.... ئەو ڕۆژەی کە دین

پەروەرین.... عەودالی رێی پێغەمبەرین.... لە ستەمی رۆژگار بەرین.... ئەوسا دڵ پڕ لە سۆزەکەین.... پڕ بە چاو و دڵ و دەممان، جەژنی یەکتر پیرۆزەکەین....

بەڵێ ئیمانداران: ئەگەر فەزڵ و هیدایەتی خوای پەروەردگار و پاشان هەوڵ و رەنجی شەوانە و رۆژی پێغەمبەر (ﷺ) و یارانی ماندوونەناسی نەبوایە، ئێمەش هیچمان لەو هەموو گەل و نەتەوانەی دونیا زیاتر نەدەبوو، کە ئێستاش لە مشك و مانگاپەرستن تا دەگاتە بتپەرستی تێدایە. بۆیە شوکرانەبژێری بەرامبەر بە خوا و ئەرك و بەرپرسیاریەتیمان زیاتر دەکات بەرامبەر بە گەل و ئاینەکەمان.. ئوممەتی ئیسلامی لەم ساتانەدا رۆژێکی پڕ لە خۆشی و سەروەریان بە سەر برد. رۆژانێك خوا سوێندی لەسەر خواردوون. (وَالفَجْرِ وَلَيْالٍ عَشْرٍ). بۆنە و مەوسیمێکی زۆر گەورە و ساڵانەی جیهانییە. سەرزەوی جمە و خرۆشی دێت و دەنگی (لَبَيْكَ اللّهُمَّ لَبَيّكَ) کەشکەشانی ئاسمان و دنیای داگرتووە. خەڵکی سەریان سوڕماوە لەو مەحشەرە، کەدە بینین حاجیان بە ویست و خواستی خۆیان و بە پارە و سامانی حەلاڵ و بە چاوی پڕ لە فرمێسك و بە لێوو دڵی پڕ لە گریانەوە، پشتیان لە هەموو شتێ کردوە و وازیان هێناوە لە کار و بازرگانی و شکۆیی و خۆشی دنیا و کەسوکار و نیشتمان و بە یەك بەرگ و یەك رەنگ و بێ جیاوازی، لە بیری رازیکردنی مەعشوقی راستەقینەیاندان. ئەم دنیایە ئەڵێی سەرزەوی و خەڵکەکانی جاران نین، وەك خەو وایە. جیهانی پڕ بەرائەت و نورانی و رۆحانی فریشتەکانە، کەشی

پاك و ئارام و دوور لە كێشــە و مەشــاكیلی دونیایــە. ڕۆژانێكی پڕ لە زیكر و شــوكر و فیكــرن.. وردبونــەوە و وانەوەرگرتن لە نهێنی ئەركان و واجب و ســوننەت و كارەكانی حەج، لە ئیحرام بەســتن و پۆشــینی بەرگی ســپی ئەو جیهان و لە تەواف و سوڕانەوەی دەوری كەعبــە و بــە لای چەپی دڵ و گیان و لە بــەردی جوڵاوی بێگیانی مەقامی ئیبراهیم و لە حَجَرُ الأَسْوَد، دیاری بەهەشتی خوایەگیان و لە عەرەفات یەكەم مەنزڵی بە یەكگەیشتنی باوك و دایكی ئینسان و لە مینا و هۆكاری ڕەجمكردنی شەیطان و لە ڕاكردنی نێوان سەفا و مەروەی هاجەرەخان و لە ئاوی زەمزەمی شیفادار و بێكۆتا و لە كەژ و كێوێكی وشــك و ڕەق.. لە هێزی ڕاكێشــانی (وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ) و گەورەیی و سەركەوتنی فەرمانی خوایەگیان. لە لاوازی و ڕیسوابوونی ئەبرەهەكانــی زەمــان و.... با دڵ خــۆش بین (قُلْ بِفَضْــلِ اللهِ وَبِرَحْمَتِهِ فَبِذالِــكَ فَلْيَفْرَحُــوا...) با دڵنیابین بە ســەركەوتنی حەق و پەیامی پێغەمبەرانی، وانە و دەرسیش لە (جەژنی قوربان و لە قوربانی) زۆر زەرورە لــە وانەی ئەدەب لەگەڵ باوكا، لەگەڵ دایكا، لەگەڵ فەرمانی خــوا گیانا، وانــەی قوربانی بە گیان و بە ڕۆڵــەی تاقانە و لە كۆتا تەمــەن و دوور لە كــەس و دوور لە ئاوەدانی و شــارانا.. جەژنیش ڕەمزی خۆشی و خۆشەویستی و یەكرێزی و تەبایی و توانەوەی ڕق و كینە و لابەری دەرد و نەخۆشییە، ڕۆژی چاوپۆشی لە هەڵە و تاوانە و ڕۆژی ســۆز و بەزەیی بەرامەر بە هەژار و نەدار و بێناز و پیر و پەككەوتە و زامدار و دڵخۆشی لە سەر ماڵ و بازاڕ و دەزگا و دائیرە...

هتد.. واتای ڕاســتەقینەی جەژن و ژیان لە خۆماندا وێنا بکەین، کە نیشــانەی تەقوا و ئیمانە، داواکارین لە خوا، حەج و عومرە و نزا و پاڕانەوەی حاجیان موبارەك و قەبوڵ بێت. دەڵێین: (حَجٌّ مَبرُور، سَعْيٌ مَشْكُور، ذَنْبٌ مَغْفُور...).

ئیمانــداران: لە ناو دوانــزە مانگەی ســاڵدا دوو مانگ زۆر گەورە و بەڕێــزن لای خوای گەورە، مانگی ڕەمــەزان و قوربان (ذي الحِجَّة). کــە لەو دوو مانگــەدا دوو ڕوکنی ئیســلامەتی جێبەجێ دەکرێن کە ئەوانیش جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانە، بەڵێ ئەم دوو جەژنەی موســڵمانان پەیوەنــددارن بە قورئانەوە و لــە قورئانەوە وەرگیراون. ئەوەتا لە ســەرەتای هاتنــی وەحیدا، کات مانگی ڕەمــەزان بوو. لەو مانگەشدا موسڵمانان بە ڕۆژوو دەبن و جەژنی ڕەمەزان دەکەن. وە لە کۆتایــی هاتنی وەحیشــدا، دوا ئایەتەکانی قورئان لە ڕۆژی عەرەفەی جەژنی قورباندا هاتنە خوارەوە، بەڵێ کۆتا ئایەت کە لە کاتی حەجدا هات و پەیوەندی هەبوو بە تەشریع و ئایەتی ئەحکامەوە، ئەم ئایەتە بــوو: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ ...﴾ المائدة: ٣، جا بە بۆنەی ئەوەی کە خوای پەروەردگار ئەم ئاینی ئیسلامەی بۆ ئەم ئومەتە تەواو کرد و هیچ شــتێ نییە لە گەورە و بچوك. لە بوارێك لە بوارەکانی ژیاندا کە مرۆڤ پێویستیەتی، خوای گەورە ڕێگا و ڕێبازی بۆ ئەم ئوممەتە دیــاری کــردوە کە شــیاوە و گونجاوە بۆ هەموو زەمــان و زەمینێك. هەر کات تەماشــای دەکەی دەڵێی بۆ ئائــەم کاتە دابەزیوە. ئیتر بەم بۆنەیەوە موســڵمانان کردیان بە جەژن و خۆشــی و شوکرانەبژێری

خوای گەورە. کە ئەو جەژنەش بە فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) کراوە و هەر لە خۆوە موسـڵمانان درووستیان نەکردوە. هەندێ لە توێژەرانی قورئانیـش دەفەرمـون. دوای (٨٠) ڕۆژ لە هاتنە خـوارەوەی ئایەتی: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ...﴾ المائـدة: ٣، کۆتـا ئایەتی قورئان هاتە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿وَٱتَّقُواْ يَوۡمٗا تُرۡجَعُونَ فِيهِ إِلَى ٱللَّهِۖ﴾ البقرة: ٢٨١. کە ئەوە ئاماژە پێ دەکات کە ئەمەیە جیاوازی نێوان ئیسلام و کوفر، بیروباوەڕی موسـڵمانانە ئەوەیە کە دەڵێـی: ڕۆژێك دادێ هەموومان دەگەڕێنرێینـەوە بۆ بـەردەم خوای پـەروەردگاری ئێمـە و هەموو جیهانیان و پاداشـت و سزا بۆ هەرکەس بە پێی کار و کردەوەکانی و پاکی و ئیخلاصی ناو دڵی دیاری کراوە. ئەوەی بڕوای بەمە نەبێت و ئینکاری بکات، ئەوە لە ئیسلام دەچێتە دەرەوە و کافرە..

بەرێـزان: لـە جەژنـی قوربانـدا، گەورەترین خێـر و کردەوەی چاك. بریتییە لە سـەربڕینی حەیوانی قوربانی و قوربانیکردن. ئەم قوربانیکردنە لای شـافیعی سوننەتە، لای ئەبو حەنیفە و مالیك، بۆ کەسـی هەبوو دەوڵەمەنـد واجبە، بە بەڵگەی ئایەتـی: (فَصَلِ لِرَبِّكَ وَانْحَر) وە فەرموودەی سـەروەرمان (ﷺ) کـە فەرموویەتی: (مَنْ وَجَدَ سَعَةً فَلَمْ يُضَحِّ فَلا يُقْرِبَنَّ مُصَلاّنا) رَواهُ أَحمد وَإبْنُ ماجَة

واتە: هەر کەسـێ توانای کڕینـی حەیوانی قوربانی هەبێ - زیاد لە پێویسـتیە هەرە گرنگەکانی ژیانی خـۆی و ئەوانەی نەفەقەیان لە سـەریەتی، بەڵام قوربانیەکە نەکات، ئەوە با لەگەڵمان نەیەت بۆ نوێژی قوربان بۆ موصەللا..

ئیمانـــداران: لە قوربانیکرندا، چەنــد دەرس و وانەی گەورە فێر دەبیـــن، وەکو: وانـــەی بیروباوەڕ و عەقیدە. کــە قوربانیکردن دەبێ تەنهــا و تەنهــا هەر بۆ ڕەزامەندی خوا بێ، ئەمــە لە کاتێکدا پێش ئیســلام قوربانـــی بۆ بت ســەر دەبڕدرا. بەڵام ئیســلام ئەوەی ڕەفز کرد و لە قورئاندا دەفەرموێ: (قُلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُـــكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِـــينَ). ئیمانداران با بە وردی لە بەرەکەت و بەخششـــی ئەم ئایەتــە ڕا بمێنین کە دەبینین: نوێژ و قوربانی و ژیان و مردنی بە یەکــەوە باس کردوون و دەفەرموێ: دەبـــێ ئەمانە هەر بۆ خوا بن. لەبەر ئەوە خوای گەورە بۆ نوێژی بە ڕیا و قوربانی بۆ بەرچاوێنی و مــەدح و ستایشـــی خەڵــك ناوێت، یــان کە قورئان باســـی نوێژ و قوربانی بە یەکەوە کردوە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە کەســـی وا هەیە، قوربانی دەکات، بەڵام نوێژ ناکات. ئەمەش بە ڕاســتی ناڕاستە و نوێژکردنەکە لە پێش قوربانیکردنەکەوەیە. پاشــان ســـەرنجی (لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِين) بـــدەن. کە دەفەرموێ: دەبێ ئەو قوربانی و نوێژکردنە تەنهــا و تەنهــا بۆ خوا بـــێ، دوور بێ لە هەموو ڕیا و مەبەســـت و مەرامێکـــی دونیایی. ئەمجا دەفەرمــوێ: (رَبِّ الْعَالَمِين) نەك بە تەنها (رَبُّ الْمُؤمِنـــين) دەی بێباوەڕان، دەی دوور لە دینەکان وەرن ســـەیری عەزەمەتـــی ئیســـلام بکەن.. بەم شـــێوەیە لە ئایەتی: (قُـــلْ إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَاي وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِين). تێ دەگەین و فێر دەبین کە ئەو کەســـەی قوربانی دەکات پێویســـتە: نوێژ بکات، بۆخوا بژی -لە سەر شـــەرعی خوا بژی، بۆ خوا بمرێ- لە شـــوێنێکا نەمرێ کە خوا پێی

ناخۆشــە، ئیخلاص و دڵســۆزی هەبێ لە کارەکانیدا و هەرچی دەیکا و دەیڵــێ تەنهــا بۆ ڕەزامەندی پەروەردگاری بیڵێ و بی کات، پشــت و پەنای تەنها خوای گەورە بێ و پشــت بە هیچ شــتێك نەبەستێ و دوور بێ لە هەموو شــیرکێك. بەڵــێ قورئان تەئکید لەم حەقیقەتە دەکاتەوە کە دەبێ لە کەسی قوربانیکاردا هەبێ و دەفەرموێ: (لَن يَنالَ لُحُومُها وَلا دِماءُها. وَلكِنْ يَنالُهُ التَّقْوى مِنْكُمْ).. جا سەیری خۆت بکە ئەی ئەو کەســەی کە لەم جەژنی قوربانــەدا قوربانی دەکەیت. بزانە ئایا تەقوات هەیە؟ تەقواش لە یەکێ لە پێناســەکانیدا هاتوە ئەوەیە کە: چــۆن کاتێ بە ڕێگایەکی دڕکاویدا دەڕۆیت خۆت دەپارێزی لەو دڕك و دالآنەی کە لە سەر ڕێگاکەت هەن و بە وریایی هەنگاو هەڵدەگری و بە پێ پارێز دەڕۆیت. بە هەمان شــێوەش پێویستە لە هەنگاونانی ژیانــی ڕۆژانەتدا بە وریاییەوە هەنگاو هەڵبگری و خۆت لەو دڕك و داڵی بێشەرعی و حەرامکراوەکان بپارێزی.. دەی ئەی ئەو کەسەی کە قوربانیت کردوە، باســی قوربانیەکەت مەکــە، کە چەند کیلۆ بوە و چــۆن ئاژەڵێکی گران نرخ بوە و چۆنت دابەش کردوە. چونکە خوای گــەورە نیەتی پاکی ناو دڵەکەتی دەوێ و ئەم قوربانی ســەربڕین و دڵخۆشکردنی فەقیر و هەژارە هەر بۆ ئەوەیە کە دڵت پاك بکەیتەوە لە ڕژدی و بەخیلی و حەسودی و خودپەسەندی و ڕق و قین و پڕی بکەی لە خۆشەویستی و ڕێز و وەفا و بەخشندەیی و بەزەیی هاتنەوە و ســۆز بەرامبــەر هەژاران و نەداران و لــە ناخەوە ئەو قەناعەتەت بۆ دروســت بووبێ کە ئەو ماڵە هی خوایە و هیچ ئازایەتیەکی تۆی

تێدا نییە و بە ئەمانەت خراوەتە بەردەستی تۆ.. بەڵێ مادام قوربانی تەنها بۆ خوایە، دەبێ جوانترین و باشترین ئاژەڵ بکرێ بە قوربانی.

لە ڕووی جۆرەوە ئەم ئاژەڵانە دەکرێن بە قوربانی:

١. مەڕ، پێویستە ساڵێك لە تەمەنی ڕۆیشتبێ، یان لە سەرو شەش مانگیەوە بێ، یاخود بەرگنە فیت و قنجەکەی سەر پشتی بوو بێ بە خوری.

٢. بزن، کە پێویستە دوو ساڵی تەواو کردبێ لای مەزهەبی شافعی و لای زانایانی تر یەك ساڵ.

٣. ڕەشەوڵاخ: پێویستە دوو ساڵ تەمەنی تەواو کردبێ.

٤. حوشتر: کە دەبێ (٥) ساڵ تەمەنی ڕۆیشتبێ.

ئەمە لە ڕووی تەمەنەوە، کە دەبێ ئەو کەسەی کە قوربانی دەکات دڵنیا بێ لە وەی کە ئەو ئاژەڵە ئەو تەمەنەی تێ پەڕاندوە و نابێ پێش ئەو تەمەنە بکرێ بە قوربانی. ئەمجا لە ڕووی لاشەوە: نابێ ئەو ئاژەڵەی کە دەکرێ بە قوربانی کەموکوڕی جەستەیی هەبێ، وەکو ئەوەی: نابێ کوێر و یەك چاو بێ، نابێ نەخۆشییەکی وای گرتبێ کاریگەری بۆ سەر گۆشتەکەی درووست کردبێ. هەروەها: نابێ لەڕ و لاواز و بێ مۆخ بێ، نابێ وا بشەلێ کە پێوەی دیار بێ، هەندێ لە زانایان دەفەرموون: کەمێ شەلی زەرەری نییە. ئەگەر ئەو ئاژەڵە یەك تۆز گەڕی پێوە بێ بۆ قوربانی نابێ، نابێ ئەو ئاژەڵە حۆڵ و گێژ بێ، نابێ شێت بێ، نابێ برین بە لەشیەوە بێ، نابێ بالوکەی زۆری پێوە بێ، لای ئیمامی شافیعی: زەرەری نییە شکانی ددانێ

یان دوو ددان، یان سێ ددان یان چوار ددان. هەروەها ئەگەر گوێی قڵشابێ یان کونێکی بچوکی تێ بووبێ، زەرەری نییە بۆ قوربانی. هەروەها زەرەری نییە ئەگەر لە ئەساسدا: گوانی نەبێ، یان شاخی نەبێ، یان گوێی کەڕیلە بێ، یان کلکی نەبێ، یان دووگی نەبێ، وە شکانی شاخ زەرەری نییە.. بەڵام ئەگەر یەك تۆزی کەم لە کلکی بڕا بوو، یان لە کلکی بڕابوو. با زۆریش کەم بێ ئەو لێبڕینە هەر بۆ قوربانی دروست نییە. (چونکە بە دەستی مرۆڤ ئاوا عەیبدار کراوە). وە بزانن: حەیوانی خەسێندراو و ئاوس بۆ قوربانی درووستە. هەروەها ئاگادار بن کە نابێ ئەو ئاژەڵی قوربانییە گوێی بردرابێ و لێی کرابێتەوە.. بەڵام لە (حاشیەی شیروانی لەسەر تُحْفَةُ المُحتاج لە ج٩ ص٣٥٢ دەفەرمووێ: (قالَ أَبو حَنيفَةَ: إنْ كانَ المَقْطوعُ مِنَ الأُذُنِ دُونَ الثُلُثِ أَجْزَأَهُ). واتە: ئیمام ئەبوحەنیفە فەرموویەتی: ئەگەر ئەو پارچەیەی کە لە گوێی ئاژەڵەکە کراوەتەوە کەمتر بوو لە سێ یەکی گوێی ئاژەڵەکە ئەوە درووستە، کەواتە ئەو ئەڵقانەی کە لە لایەنی بەیتەرییەوە دەکرێتە گوێی ئاژەڵەکانەوە زەرەری نییە و بۆ قوربانی درووستن.

ئیمانداران: قوربانیکردن کاتی تایبەتی خۆی هەیە. لە ڕۆژهەڵاتنی ڕۆژی جەژنەوە دەست پێ دەکات و تا سێ ڕۆژی دوای جەژن بەردەوام دەبێ، هەر بۆیە ئەگەر کەسێك لە پێش ئەوەدا بچێ بۆ نوێژی جەژن. یان پێش خۆرکەوتنی ڕۆژی جەژنی قوربان حەیوانی قوربانی سەر بڕی. ئەوە لە جیاتی قوربانی ناکەوێ و وەکو صەدەقەی سوننەت

حیسابی بۆ دەکرێ.. پاشان ئەوە بزانن کەوا چاکە بۆ خۆت بە دەستی خۆت حەیوانی قوربانیەکەت سەر ببڕی. یان کەسێکی نوێژخوێنی لێزان بۆت سەرببڕێ و بڵێ: (بِسْـــمِ اللهِ وَاللهُ أَكبر، اللّهُمَّ هذا مِنْكَ وَلَكَ، اللّهُمَّ هذا عَنّي وَعَنْ أَهْلِ بَيْتِي). واتە: بەناوی خوا، الله أكبر. پەروەردگارم، ئەمــە هی تۆیە و بۆ تۆیە. خــوای پەروەردگار ئەم ئاژەڵە لە جیاتی قوربانــی بۆ خــۆم و بۆ ماڵ و منالم.. ئەگەر کەســێك لە بیر چوو ئەمە بڵێ لە کاتی ســەربڕینی قوربانیەکــەدا. ئەوە هیچ زیانێك بە قوربانیەکەی نەگەیشتوە و لە خێری کەم نەبۆتەوە.

ئیمانــداران: لەکاریگــەری ناوهێنانــی خــوا و (الله أكبــر) لە کاتی سەربڕینی مەڕ و ماڵات و پەلەوەردا: سێ لێکۆڵەر و مامۆستای زانکۆی ســوریا بۆ ماوەی ســێ ســاڵ لێکۆڵینەوەیەکی زۆر گرنگیان کرد کە بە ڕاستی موعجیزەی قورئان دەسەلمێنێ، دکتۆر (سَعْد مُخلص یعقوب) دەڵێــت: بەرنامەیەکــی کارمان دانا بۆ دیراســەکردن و لێکۆڵینەوە، بە پێشکەوتووترین شێوازی زانستی لە تاقیگەدا. وە لیژنەی تایبەتمان دانا لە کەسانی پسپۆڕ و شارەزا بۆ سەردانی قەسابخانەکان و هێنانی نموونەی تایبەت بۆ شــیکردنەوە و فەحصکردن. لیژنەکە نموونەی گۆشتی ئەو مــەڕ و مــاڵات و پەلەوەرانەیان هێنا کە لە کاتی ســەربڕینیاندا ناوی خوایان لەسەر برابوو. هەروەها نموونەی ئەوانەشیان هێنا کە لە کاتی ســەربڕینیاندا ناوی خوایان لە سەر نەهێنرابوو. دکتۆر (نبیل الشریف) کە عەمیدی پێشــووی کۆلێژی دەرمانســازی زانکۆی دیمەشقە و دکتۆر (فایز الحکیم) لە بارەی هەنگاوەکانی دیراسەکەوە دەڵێن: ئەو نموونانەی

دەگەیشــتنە دەستمان دەمانخســتە ناو دیتۆڵەوە کە خەستیەکەی (١٠٪) بوو، بۆ ماوەی کاتژمێرێك تا دەرەوەی گۆشتەکان بە تەواوی پاکژ ببێت و لە دەرەوە هیچ میکرۆب و ڤایرۆسێك نەچێتە ناو گۆشتەکانەوە، ئینجا لە چینەکانی ناوەوەی گۆشــتەکان خانەمان وەرگرت و زەرعمان کردن بۆ ماوەی (٢٤) کاتژمێر، سەرەنجامی لێکۆڵینەوەکان گەیشتنە ئەوەی کە ڕەنگی ئەو گۆشــتەی ناوی خوای لە ســەر براوە (زەری فاتح)ەو ئەوەی تر ســورێکی تۆخە و ئەڵێی شــین بۆتەوە، هەروەها ئەوەی ناوی خوای لەســەر نەبرا بوو میکرۆب و جراثیمی زۆر لە سەری گەشەی کردبوو. هەروەها خڕۆکەی ســور و ســپی زۆر لە سەر ئەو گۆشتەی ناوی خوای لە سەر نەبراوە زۆر بە ئاشکرا دەبینرا و ئەوی تر ئەو خڕۆکە سور و ســپیانەی لە سەر نەبوو. کە ئەمەش بە ڕاستی ئیعجازێکی گەورەیە و ڕاســتیەکی زانستی گەورەشــە، کە بە هۆی سەربڕینەوە کە ناوی خوای لەسەر برابێت گۆشتەکە تا ڕێژەیەکی زۆر پاك و تەعقیمە. دکتۆر خالد حلاوە بەرپرســی ڕاگەیاندنی لیژنەکە بە وەکالەتی دەنگوباسی کومیتی ڕاگەیانــد کە ئەم دۆزینەوە گەورەیە شۆڕشــێکی زانســتی گەورەیە لە بواری تەندروســتی مرۆڤدا.. (عبدالقادر الدیرانی) لێکۆڵەر لە لیژنەکە دەڵێت: خەڵکی بە داخەوە حیکمەت و مەزنی ئەو فەرمانە قورئانیەیان نەدەزانی لە ســەربڕین لە ســەر شــێوازی ئیســلامی، کە ئەم دیراسە زانســتییە ئەو حیکمەتە گەورەیە دەردەخــات کە قورئان دەفەرموێت: ﴿ فَكُلُوا۟ مِمَّا ذُكِرَ ٱسْمُ ٱللَّهِ عَلَيْهِ ﴾ الانعــام: ١١٨، یــــان دەفەرمــوێ: ﴿ وَلَا تَأْكُلُوا۟ مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ ٱسْمُ ٱللَّهِ ﴾ الانعام: ١١٨

بەڵێ ئێمە دینەکەمان هەمووی لە سەر بنەمای زانستی دانراوە و ئەو کەسەی پابەند بێت بەم دینەوە، بەم شەریعەتی ئیسلامەوە، زانایە، عالمە، هەرچەند نەخوێندەواریش بێت، چونکە ئەوەی دەی کات هەمووی زانستییە. بەڵام خوانەناسان ئەگەر بە شەهادەش زانا بێت هەر نەزانە چونکە خالیقی خۆی نەناسیوە کە اللەیە. یان کاتێ کارەکانی ژیانی بۆ نمونە سەربڕینی ئاژەڵ و پەلەوەر لە سەر بنەمای شەرعی ئەنجام نادات، ئەوە بە ڕاستی نەزانە چونکە بسم اللە ناکات ئەو هەموو میکرۆب و ڤایرۆسە لە ڕێگەی ئەو گۆشتەوە دەچێتە لەشییەوە و هەستیشی پێ نەکردوە. دەی هەزاران هەزار سوپاس بۆ تۆ ئەی پەروەردگار کە هیدایەتت داوین بۆ ئیسلام.

بەڵێ بەڕێزان: ئەو ئاژەڵەی کە دەکرێ بە قوربانی نابێ پێستەکەی بفرۆشرێ. بەڵام درووستە بکرێ بە مەشکە و خاوەن قوربانی بە کاری بێنێ بۆ خۆی. بەڵام ناکرێ بدرێ بە کرێ. لای پێشەوا (ئەبوحەنیفە) درووستە پێستەکەی بفرۆشێ و پارەکەی بکرێ بە خێر. وە نابێ پێست یان گۆشت لە جیاتی کرێ بدرێ بە قەصابەکە، بەڵکو دەبێ پارەی وەکو کرێی سەربڕینەکە بدرێتێ.. بەڵام ئەگەر هاتوو قەصابەکە هەژار بوو، یان هاوڕێ و برادەری قوربانی کارەکە بوو. ئەوا دروستە گۆشتی قوربانی پێ بدرێ، لەبەر ئەوەی کە هەژارە، یان لەبەر ئەوەی برادەر و هاوڕێیەتی و وەکو هەدیە و دیاری پێشکەشی دەکرێ.

بەڕێزان: پرسیارێك دەکرێ و دەوترێ: ئایا قوربانی خێری زیاترە یان پارەکە ببەخشی بە هەژاران؟! شَـيْخ الإِسْـلام - إِبْنُ تَيمِيَّة - لە

(مَجموع الفتاوى ج٢٦ ص٣٠٤)دا فەرموویەتی: (وَالأَضْحِيَةُ وَالعَقِيقَةُ وَالهَــدْيُ أَفْضَــلُ مِنَ الصَّدَقَةِ بِثَمَــنِ ذالِكَ. فَــإذا كانَ مَعَهُ مالٌ يُريدُ التَقَرُّوبَ إلى اللّه، كانَ لَهُ أَنْ يُضَحّي بِهِ. والأَكْلُ مِنَ الأُضحِيَةِ أَفْضَلُ مِــنَ الصَّدَقَــةِ). واته: قوربانی و حەوتمی منالّ و هەدی کاتی حەج، چاکترە و خێری زۆرترە لە وەی کە پارەی حەیوانەکە بکەی بە خێر، جا ئەگەر کەســێك پارەیەکی هەبوو. دەیویســت بی کات بە خێر و بەو هۆیەوە لە خوای خۆی نزیك ببێتەوە و خوا لێی ڕازی بێ، ئەوە بۆی هەیە کە پارەکە نەبەخشێتەوە و لە کاتی قوربانیدا، حەیوانێکی قوربانــی لێ بکــڕێ، وە خواردنی گۆشــتی حەیوانــی قوربانیەکەت چاکترە لەوەی پارەکە بکەی بە خێر.

ئیمانــداران: یەکێ لە گەورەیی قوربانــی ئەوەیە، کە خوای گەورە ئەوەندە قوربانیکردنی بە لاوە گەورەیە کە بە (شَعائِرِ اللّه) ناوی بردووە. (ذَلِــكَ وَمَــنْ يُعَظِّمْ شَــعائِرَ اللّهِ، فَإِنَّها مِنْ تَقْوى القُلُــوب). وە لە گەورەیی قوربانییە کە خوای گەورە تەنانەت باســی دابەشــکردنی گۆشتەکەشی کــردوە، چۆن لێــی بخورێ و بدرێ بە کێ، خوای گەورە ئەوەشــی لە قورئاندا تۆمارکردوە کە لە صەدەقەی ســوننەتدا ئەوە باس نەکراوە. خوای گەورە دەفەرموێ: (فَكُلُوا مِنْها وَأَطْعِمُوا القانِعَ وَالمُعْتَرَّ) یان دەفەرموێ: (وَأَطْعِمُوا البائِــسَ الفَقِير). کە ئەمەش گەورەیی قوربانی دەردەخات لای خوای گەورە، کە تەنانەت باســی دابەشــکردنی گۆشتی قوربانیەکەشی لــە قورئاندا کــردوە.. جا بزانن: قوربانی دوو جــۆرە. قوربانی نەزر: ئەوەیە کەســێك لە مانای نەزر تێ گەیشــتبێ کە بە مانای ئەوە دێت

له سـه‌ر نه‌زر و واجب بێ ئه‌م حه‌یوانه ده‌كه‌م به قوربانی و له سـه‌ر خۆمم نه‌زر كرد. هه‌ر كه‌سـێ به‌م جۆره قوربانی بكات ئه‌وه وا چاكه كـه خۆی و ژن و منالْ و دایك و باوكی له‌و قوربانییه نه‌خۆن.. به‌لام ئه‌گه‌ر قوربانیه‌كه سوننه‌ت بوو. كه قوربانی به وتنی (إِنْشـاءَ اللّه) له نه‌زركردن ده‌رده‌چێ و ده‌بێته سوننه‌ت هه‌روه‌كو له (الفِقْهُ الإِسْلامي وَأَدِلَّتُهُ) ج٤ ص٢٧٠٧ دا ده‌فه‌رموێ: ئه‌گه‌ر كه‌سێك حه‌یوانێك (مه‌ڕێك، بزنێـك، مانگایه‌كی دیـاری كرد بۆ ئه‌وه‌ی بی كات به قوربانی، ئه‌گه‌ر وتی: (إِنْشـاءَ اللّه) ئـه‌م حه‌یوانه ده‌كه‌م به قوربانـی، ئه‌وه له نه‌زر ده‌رده‌چێ و ده‌بێ به قوربانی سـوننه‌ت و له‌م قوربانیه‌دا وا چاكه كه گۆشته‌كه بكرێ به سێ به‌شه‌وه. (١/٣)ی بۆ خۆت و مالْ و منالْت، (١/٣) ی بۆ هه‌ژاران و نه‌داران، (١/٣)ی وه‌كو دیاری و هه‌دیه بدرێ به خزم و كه‌سوكار و هاوڕێ و هاوپیشه و دراوسێی خاوه‌ن قوربانیه‌كه. با ئه‌وانه ده‌وڵه‌مه‌ندیـش بن. خۆ ئه‌گه‌ر ئه‌و كه‌سـه‌ی حه‌یوانـی قوربانیه‌كه‌ی سه‌رده‌بڕی، مه‌ڕێك، بزنێكی كردبوو به قوربانی، وه له بواری داراییدا، هـه‌ژار بوو یان كه‌سـێكی مامناوه‌ند بـوو، ده‌وڵه‌مه‌نـد نه‌بوو. ئه‌وه ده‌توانـێ گۆشـتی ئـه‌و حه‌یوانه هه‌مـووی بۆ خۆی و مـالْ و منالْی بگێڕێتـه‌وه و خێـری قوربانیه‌كه‌ی هه‌ر بۆ نوسـراوه، چونكه گرنگ ئه‌وه‌یه ئه‌و درووشـمه‌ی له ڕۆژانی جه‌ژنـی قورباندا به‌رز ڕاگرتووه.. له كتێبی (الفِقْهُ الشَّـرْعي المُيَسَّر) كه زانای ناودار (شێخ محمد علی الصابونی) دایناوه، له‌ج٨ ص٤١ دا فه‌رمویه‌تی: (قالَ الفُقَهاء: يُسْتَحَبُّ لِمَنْ كانَ فَقيراً أَنْ يتركها كُلُّها لِعَيالِهِ تَوْسِـعةً عَلَيْهِمْ). زانای شه‌رع

فەرموویانە: سوونەتە بۆ ئەو کەسەی کە لە بواری دارایی و ماڵیدا هەژارە و خاوەن خێزانی زۆرە و قوربانی دەکات، کە هەموو گۆشتی قوربانیەکەی بۆ ماڵ و منالی بگێڕێتەوە و بە تەواوی تێر و تەسەلیان بکات لە گۆشت!!..

بەڕێزان: وا چاکە هەموو ساڵێك، لە هەموو ماڵە موسڵمانێکدا قوربانی بکرێ، نەك وەکو هەندێ کەس وا دەزانێ یەك جار لە ژیاندا بەسە. نەخێر، هەموو ساڵێك قوربانی سەر ببڕە ئەگەر توانای دارایت باش بوو. لە ولاتی وەکو (ئەندەنوسیا و مالیزیا) لە نەخشەی هەموو خانوویەکدا شوێنی سەربڕینی حەیوانی قوربانی دیاری کراوە، هەروەکو چۆن چێشتخانە و ژووری دانیشتن و نوستن دیاری کراوە. چونکە لەوێ هەموو ماڵێك هەموو ساڵێك قوربانی دەکات.

ئیمانداران: بابەتێکی تری پەیوەندیدار بە قوربانییەوە، بریتییە لە (قوربانیکردن بۆ مردوو) جا ئەگەر کەسێك لە ژیانیدا وەصیەتی کردبوو، کە لە دوای مردنی قوربانی بۆ بکەن. ئەوە دوای مردنی خۆی درووستە قوربانی بۆ بکرێ. بەلام: ئەگەر کەسێك مردبوو، بەلام لە ژیانیدا وەصیەتی نەکردبوو کە قوربانی بۆ بکرێ لە دوای مردنی خۆی، ئەوە لای زۆرێك لە زانایان قوربانی بۆ ناکرێ، بەلام هەندێکیش دەفەرموون: درووستە کەسی زیندوو قوربانیەکە بۆ خۆی بکات و مردوەکەی بکات بە شەریك و هاوبەشی خێرەکەی. جا لەبەر ئەوە ئەی ئیمانداری بەڕێز: تا خۆت لە ژیانداى قوربانی بکە، وە مردوەکانیشت لە خێر و خێرات بێبەش مەکە..

بەڕێزان: ئەگەر ئەو ئاژەڵەی دەی کەی بە قوربانی (ڕەشەوڵاخ) بوو، ئــەوە بۆ حەوت کەس دەبێ و لە جیاتــی (٧) قوربانی دەکەوێ. کەوا بوو، ئەگەر بە حەوت ماڵ، حەوت هاوڕێ و برادەر، حەوت دراوســێ، ڕەشەوڵاخێکی دوو ساڵەیان کڕی و کردیان بە قوربانی، لە جیاتی هەر حەوتیان دەکەوێت. هەروەها ئاگاداری ئەوە بن و بزانن کە: (الشّــاة تَجْــزي عَنِ الرَّجُــلِ وَأَهْلِ بَيْتِهِ). مەڕێك، بزنێــك لە جیاتی خاوەن ماڵ و منداڵەکەی دەکەوێت. با ئەو ماڵە چەند ســەرخێزانیش بن، با ئەو پیــاوە بڵێ: خوایە وا ئەو حەیوانە ســەردەبڕم بۆ قوربانی لە جیاتی خۆم و خێزانم و هەموو ماڵ و منداڵەکەم. (حَتَّــى الجَنينُ فـي بَطْـنِ أُمِّـهِ) تەنانــەت ئەگەر پیاوێــك ژنەکەی حامیلە بوو، کۆرپەکەی لە ســکدا بــوو. درووســـتە بوترێ: ئەم حەیوانە لە جیاتــی قوربانی بۆ خۆم و خێزانم و منداڵەکانم و ئەو کۆرپەیەش کە ئێســتا لە سکی دایکیەتی.. وە بزانن: چاك وایە: ئەو حەیوانی قوربانیە لە ماڵەوە ســەرببڕدرێ، نــەك لە قەصابخانە. بە مەرجێ جــادە و ڕێگاوبان پیس نەکرێ، وە ورگ و ڕیخۆڵە و پیســی ناو ســکی ئاژەڵەکە نەخەیتە بەردەم ماڵان و کــۆڵان و ناو ئاوەڕۆوە و ببیە مایەی زەرەر و ئازار بۆ موســڵمانان. بەڵکــو ئەوەی کە فڕێ دەدرێ لــە ئاژەڵەکە بیخەرە ئوتومبێلەکەوە و لە دەرەوەی ئاوایی. لەشــوێنێکی چۆڵدا فڕێی بدە. بۆ ئەوەی دڕندە و ئاژەڵ و باڵندەی گۆشــتخۆر بی خوات و ئەوانیش لێی ســودمەند بن. ئیمامــی نەوەوی فەرموویەتی: (الأَفْضَلُ أَنْ يُضَحّي في دارِهِ بِمَشْــهَدِ أَهْلِهِ). واتە: چاکتر وایە کە حەیوانی قوربانیەکە لە ماڵی خۆیدا ســەرببڕێ

بە ئامادەبونی هەموو ئەندامانی خێزانەکەی. مەگەر ئەوانەی منالّن و نەگەیشتونەتە تەمەنێك کە سەربڕین لە بەرچاویان مەترسی هەبێ، ئەو منالاّنەی لەو تەمەنەدان نابێ سەیری دیمەنەکە بکەن.

لە کۆتاییدا دەڵێم: ئەی ئەو کەسەی قوربانیت بۆ ناکرێ، دڵتەنگ مەبە، گوێ بگرە بۆ ئەم فەرموودەیە کە لە (صەحیحی مسلم)دا هاتوە بــە ژمارەی: (١٩٦٧) کە دەفەرمــوێ: پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەرانێکی قۆچداری ســپی و ڕەشی سەربڕی و فەرمووی: (بِسْمِ اللهِ اللّهُمَّ تَقَبَّلْ مِنْ مُحَمَّــدٍ، وَمِنْ أُمَّةِ مُحَمَّدٍ) ئەمجا ســەری بڕی. واتــە: (بەناوی خوا، خوایە گیان، ئەم ئاژەڵی قوربانیە قبوڵ بفەرموو لە (محمد) و ماڵ و خێزانی محمد و هەموو ئوممەتی محمد).. دەی إنْ شــاءَ اللّٰه تۆش بەر ئەوە دەکــەوی و قوربانیت بۆ کراوە. وە صەحابی پایەبەرز (جابری کوڕی عبداللــە) دەفەرموێ: جارێکی تر پێغەمبــەری خوا (ﷺ) بەرانێکی ســەربڕی و فەرمووی: (بِسْــمِ اللهِ، وَاللهُ أَكْبَرُ، هذا عَنِّي، وَعَمَّنْ لَمْ يُضَحِّ مِنْ أُمَّتِي). رَواهُ أَبُو داود والترمذي، صَحيح سُنَن أَبِي داود لِلأَلْباني (٢٨١٠)

واتە: بەناوی خوا، الله أکبر، ئەمە لە جیاتی خۆم و هەموو ئەو کەسانەی کە لە ئوممەتم قوربانیان بۆ ناکرێ بە هەر هۆیەك بێ قوربانیان نەکردوە.

هەزاران جار بە قوربانت بین ئەی پێغەمبەری دڵســۆزمان (ﷺ). کە هەرگیز ئوممەتەکەتت لە یاد نەکردوە و هەمیشە لە خەمی یەك بەیەکی ئوممەتەکەتدا بووی هەتا قیامەت.

وە هەروەها: دەکرێ و درووســتە هەموو ئاژەڵی قوربانیەکان، هی هەموو خەڵکەکە لە (مُصَلّی)دا لەو شــوێنەدا کە نوێژی جەژنی لێ

دەکرێ، ســەرببڕدرێن و پاشــان دابەش بکرێن. (عَنْ إِبْنِ عُمَر: أَنَّ النَبِيَّ (ﷺ)، كانَ يَذْبَحُ أضحِيَتَهُ بالْمُصَلَّى). رَواهُ البُخاري وَأَحْمَد وَالنَّسائي

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) قوربانیەکەی لە (مُصَلَّى)دا سەربڕی.

خــوای پەروەردگار قوربانی هەموو لایەك قبوڵ بکات و جەژن لە هەموو موسڵمانان پیرۆز بکات

(ربَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ)

اللّهُمَّ آمين

سەرچاوەکان:


١. خُطَب الشَّيْخ محمد الغَزالي، ج٢، ص٥٣١، ص٥٣٣.

٢. پەخشانە شعرێکی، مامۆستا مەلا غریب پێنجوێنی، بە ناوی: (جەژن دەڵێ).

٣. گۆڤاری (دوانگە) ژ: ٣٩، ل٢.

٤. بەرەو ئیسلام، ئاشتی – ئەندازیار عثمان. ل٥٥.

٥. الصَّحيح مِنَ الأَثَر في خُطَبِ المِنْبَر، ص٦٨٩.

٦. يَسْأَلُونَكَ، د. حسام الدِّين عَفّانَة ج٢ ص٣٤٩، ص٣٥٤، ص٣٤٧.

٧. الفِقْهُ الإسْلامي وَأَدِلَّتُهُ، د. وَهْبَة الزُّحَيلي، ج٤ ص٢٧٣٩، ص٢٧٠٧، ص٢٧٤٤.

٨. الفِقْهُ الشَّرْعي المُيَسَّر، الشَّيْخ محمد على الصّابوني، ج٨ ص٤١.

٩. صَحيح وَصايا الرَّسُول (ﷺ) سَعْد يوسف أَبو عَزيز، ج١ ص٥٨٨.

١٠. مِنْهاجُ المُسْلِم، أَبوبكر جابر الجَزائِري، ص٢٦٦.

١١. التاجُ الجامِع لِلأُصُول، مَنصور عَلي ناصِف، و: نوری فارس حمەخان، ب٤ ل٣٨.

١٢. نِداءات الرَّسُول لأَصْحابِهِ، محمد عبدالعاطي بحيري، ج٢ ص١٧٣.

وتاری دووەم بۆ مانگی ذي الحجة

# تەسلیمبوون بە فەرمانی خوا مایەی سەرفرازییە

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانــداران و خواناســانی بەڕێز: ئاینی ئیســلام تەنها کۆمەڵێك تقوس و تێکســت و دروشــم و شــیعار نییە، کە مرۆڤی موسڵمان بە ناحاڵیبوون و تەنها وەکو چاولێکەری ئەنجامی بدات لە چەند کات و زەمەن و زەمینێکی دیاریکراودا لە ساڵدا و خۆشی نەزانێ بۆچی باشە و بۆچی وا دەکات، نەخێر ئیســلام هەمووشــتەکانی لە سەر بنەمای تێگەیشــتن و بەرچاوڕوونییە. (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لا إِلــه إلاّ الله). لە ئاینی ئیسلامدا، قەدەغە و بقە نیە کەسێك بیەوێ لە گەورەیی خوا بدوێ لە ڕووی زانستەوە بەڵکو: (إِنَّما يَخْشَــى اللهَ مِنْ عِبادِهِ العُلَماء)..**

**بەڕێزان: ئیسلام لە ئاینە ئاسمانیەکانی پێش خۆی جیاوازە لە سێ ڕووەوە:**

**١.ضُولاً: إِسْتَغْرَقَتْ الزَّمَنَ كُلَّهُ إِلى قِيامِ السّاعَةِ..**

**لە باری درێژیەوە ئیســلام هەموو کات و ساتەکانی باس کردووە، هەتــا هاتنی ڕۆژی قیامەت، وەرە ســەیری قورئــان و فەرمودەکانی پێغەمبەر (ﷺ) بکە، دەبینی هەر لە پێش درووســتبوونی ئادەمەوە کە ئەم زەوی و خۆر و مانگ و ئەستێرانە هەمووی بە یەکەوە یەك پارچە بوون. پاشــان لە تەقینە گەورەکەدا لــە یەك جیابوونەتەوە.**

(أَنَّ السَّـــماواتِ وَالأَرْضَ كانَتا رَتْعاً فَفَتَقْناهُما). ئەمجا باسی درووستبوونی ئادەم و حەوا و ژیانی سەر زەوی و مردن هەتا چوونە ناو بەهەشت و دۆزەخ هەمووی لە ئیســلامدا هەیە و وەڵامی هەموو پرسیارەکانی ناو ناخی مرۆڤی داوەتەوە.

٢. عـرضـاً: إِسْـتَـغْـرَقَـتْ الـبَـشَـرَ جَـمـيـعـاً فـي الْمَـعْـمـورِ مِـنْ أَرْضِ اللّٰهِ..

لە باری پانیەوە، ئیسلام هەموو مرۆڤایەتی لە خۆ گرتوە، ئەوەی کەوا رۆژێك لە رۆژان لەم ســەرزەویە ژیابێت، ئیســلام باسی کردوە، جا چاك و خواناس بووبێ یان بێبڕوا و یاخی بووبێ. هەروەکو باسی پێغەمبەران و صالّحان و شــەهیدانی کردوە، ئاواش باس و خواس و ژیان و سەرەنجامی خوانەناسی وەکو فیرعەون و نەمرود و هامان و ئەبولەهەب و ئەبوجەهلەکانی تۆمار کردوە. وە هیچ شارســتانیەت و کۆمەڵگایەکی بەهێز نەماوە ئیسلام باسی نەکردبێ، وە کە ڕوخاوە و تیاچوە، هۆکاری شکســت و بە هیلاکچوونەکەیانی باس کردوە، وەکو باســی فیرعەون و سەمود و ســەبەئو، باسی کیسرا و فارس و...هتد. هەمووی لە قورئان و فەرمودەدا تۆمار کراوە.

٣. عُـمْـقـاً: تـنـاولـت مـا يَـحْـتـاجُ إِلَـيْـهِ الـبَـشَـر مِـنْ: عَـقـائـد وَعِـبـادات وَمـعـامـلات وَأَخْـلاق. ووضـعـت الـقـواعِـد الـعـامَّـة وَالمَـبـادِئ المُـنـيـرَة الَّـتـي تَـوَجَّـهَ الـنّـاسُ إِلـى مـايـضْـمَـنُ لَـهُـمُ الـصّـالِـحُ فـي مَـعـاشِـهِـمْ وَمَـعـادِهِـمْ عَـلـى سَـواءٍ)...

لە باری قوڵییەوە، هەرچی مرۆڤ پێویســتی پێی بێت لە بواری: بیروباوەڕ و عیبادەت و بەندایەتی و کڕین و فرۆشــتن و بوارەکانی تری معامەلات و باســی ڕەوشــت و ئەخلاق. هەمووی لە ئیســلامدا

هەیە و هیچ شـتێ نییە کە مرۆڤ پێویسـتی پێی بێ و لە ئیسلامدا نەبێ، وە بۆ هەریەك لەم بوارە گرنگانەش چەند بنەمایەکی گشتی و مەبدەئێکی رۆشنکەرەوەی بۆ خەڵکی باس کردووە و رێنمایی پێشکەش کردوون کە بەرچاویان روون دەکات بۆ ژیانی دونیا و دوارۆژیان وەکو یـەك. یانی ئیسـلام هەر گرنگی بە بواری دونیـا نەداوە و دوارۆژ و قیامەتـی فەرامـۆش کردبێ، یان هەر گرنگی بـە قیامەت و قەبر و بەهەشـت و دۆزەخ نەداوە و ژیانی ئەم دونیایەی فەرامۆش کردبێ. بە پێچەوانەوە، ئیسـلام بەرنامەیەکی وای پێشـکەش بە مرۆڤایەتی کردوە کە ئەگەر جوان لە سەری بڕوات، پێش قیامەت، هەر لە دنیادا لە بەهەشتدا دەژی و بە مردنیش دەگاتە بەهەشتی نەبڕاوە.

ئیمانداران: ئێمە لەم چەند رۆژەی رابردوودا، لە جەژنی قوربانی پڕ بەرەکەتدا ژیاین. کە قوربانیکردن، یان تەسـلیمبوون بە فەرمانی خوا. چونکە لە دونیادا دوو جۆر مرۆڤ هەیە:

یەکـەم: مرۆڤێکی تەسـلیمبوو و گوێڕایەڵ بـۆ فەرمانی خوا. کە پاداشتەکەی بریتییە لە: ﴿ لِلَّذِينَ ٱسۡتَجَابُواْ لِرَبِّهِمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۚ ﴾ الرعد: ١٨

ئـەم جـۆرە کەسـانە، هەمـوو خۆشـی و شـادی و کامەرانی و ئاسـودەییەکیان بۆ ئامادەیە. با سـەرنج بدەیـن و بە کردەوە ئەمە ببینیـن: لە قوربانیـدا، تەسـلیمبوونی خێزانێـك دەبینین: (ژن و مێردێـك لەگـەڵ کوڕێکی تاقانە) خـوای گەورە فەرمـان دەکات بە ئیبراهیمـی باوك کە هاجەرەی خێزانت و کۆرپەکەی ببە بۆ مەککە بۆ ئەو شوێنەی کە دواتر کەعبەی لێ دروست کرا...

بەڵێ، ئەم دونیایە هۆڵی تاقیکردنەوەیە، ئیبراهیم و خانەوادەکەی تاقـی دەکرێنەوە، بەلآم تاقیکردنەوەیەکی قـورس: دوورکەوتنەوەی ئیبراهیـم لە ژن و کوڕە تاقانەکەی، لـە جێگایەکی چۆڵدا. کە هیچ ئاوەدانیەکـی لێ نییە. هیچ کەس و ماڵێکی لێ نییە، ئاوی لێ نییە، ڕوەکـی لێ نییە، هەوایەکی گەرم و ناسـاز و بیابانـە، بنچینەکانی ژیـان کە بریتین لـە: خواردن، ئاو، هەوای پـاك و فێنك لێی نییە. خوای گەورەش وا فەرمانی پێ کردوە کە دەبێ هاجەرە و ئیسماعیل بـە تەنها لەوێ بەجێ بێڵـێ و نابێ خۆت لە لایان بمێنێتەوە!!. الله أكبر، لەم تاقیکردنەوە قورسـە!، بـەلآم ئیبراهیم پێغەمبەری خوایە و دەزانێ هەرچی خوا فەرمانی پێ بکات بێ حیکمەت نییە و خوای گەورە هەرگیز بەندەی خۆی تووشی زەرەر و زیان ناکات و هەمیشە گوێڕایەڵی پەروەردگار، سـەر بڵندی پێوەیە. هەر بۆیە ئیبراهیم بێ هیچ دوودڵیەك. فەرمانی خوا جێبەجێ دەکات و هاجەرە و ئیسماعیلی کۆرپـەی تازەلەدایکبـووی چاوگەش، دەگەیەنێتـە مەککە، لە وڵاتی شامەوە، کە پڕە لە باخ و باخات و ئاوی سازگار و هەوای خۆش، بۆ ئەو بیابانە، وشکە، کە تەنها یەك مرۆڤیشی لێ نییە. جا گەورەترین ناڕەحەتی ئەوەیە، کە مرۆڤ لە شـوێنێکی خۆشەوە، لە ناو خەڵك و ناسیاوەوە، لە خانو و ماڵی باشەوە، ئاوارەی جێگایەکی ناخۆشی، وشکی، دوور لـە ئاوەدانی، بێ ماڵ و حاڵ، تەنانەت چادر و خێمەیەکیشـی نەبێ، ئاوێك نەبێ بی نۆشـێ، بەرگێك نەبێ بی پۆشێ، ماڵێك نەبێ دای پۆشـێ، یاخود بـە کورتتر بڵێین لە ئەوپـەڕی دەوڵەمەندیەوە

بڕوات بۆ ئەوپەڕی هەژاری!!، بە ڕاستی ئەمە ناڕەحەتترین حاڵەتە. بەڵام ئیبراهیم هاجەرە و ئیسماعیلی گەیاندنە شوێنی دیاریکراو و دای نان و گەڕایەوە و پشتی تێ کردن. هاجەرە بە سەرسوڕمانەوە فەرمووی: يا إبراهيم إلى مَنْ تتركنا؟! ئەی ئیبراهیم ئەی هاوسەری بەڕێزم. ئەوە من و ڕۆڵە جوانەکەت، بەندی جەرگ و هەناوەکەت، ئیسماعیلی تاقانەت بۆ کێ بەجێ دێڵی لەم بیابانە وشکە سامناکەدا (قالَتْ: إلى اللهِ!) ئیبراهیم فەرمووی: بۆ خوای گەورەتان بەجێ دێڵم و دەتانسپێرم بە خوا. (قالَتْ: رَضِيْتُ باللهِ). هاجەرە فەرمووی: ڕازیم بە خوای گەورە. لە ڕیوایەتێکی تردا هاتوە کە: هاجەرە فەرمووی: ئەی ئیبراهیم ئەوە بۆ کوێ دەڕۆی؟! چۆن لەم شوێنە چۆڵەدا بە تەنها بە جێمان دێڵی؟! ئیبراهیم وەڵامی نەدایەوە، چەند جارێك هاجەرە ئەمەی دووبارە کردەوە، پاشان هاجەرە فەرمووی: (أَللهُ أَمَرَكَ بِهذا؟!) ئایا خوا فەرمانی پێ کردووی، کە ئاوا لەم شوێنەدا بە تەنها بەجێمان بێڵی؟! ئیبراهیم فەرمووی: بەڵێ. هاجەرە فەرمووی: (إِذَنْ لايُضَيِّعُنا) دەی بڕۆ ئیتر دڵنیام و بێخەمم لە وەی کە خوا هەرگیز زایەمان ناکات. لەو کاتەدا جوبریل فەرمووی: (إِنَّ اللهَ لايُضَيِّعُ أَهْلَهُ). بەڕاستی و بەبێ هیچ گومانێك خوای گەورە دۆستانی خوا زایە ناکات و نافەوتێن و دەیان پارێزێت!.. سُبْحانَ اللهِ، ئیمان لە چڵەپۆپەدایە. ژنێکی ئیماندار هەر ئەوەندەی بەسە کە بزانێ ئەمە فرمانی خوایە، ئیتر گرنگ نییە چی ڕوودەدات. چونکە هاجەرە خواناسە، نەك ئیبراهیم ناس، ئیبراهیمی وەکو پێغەمبەر و ملکەچی فەرمانەکانی

خوا ناسیوە.. بەڕێزان: ئا لێرەدایە یەکسانی ژن و پیاو، ئیمانی ژنێکی وەکو هاجەرە لە یەقیندا بەکاربەجێیی فەرمانی خوا و تەسلیمبوون بە فەرمانی خوا، یەکســانە بە تەســلیمبوونی ئیبراهیم بە فەرمانی خوا!! بەڵێ ئیســلام لە مەبدەئو پاڵەوانیەتی و نواندنی ڕۆڵدا، ژن و پیاوی یەکسان کرد، نەك بە دروشمی بێ ناوەڕۆك و فریودەر..

بەڵێ ئیمانداران: لە نزیکەوە لەگەڵ هاجەرە خاتوون و ئیسماعیلی کۆرپەیــدا دەژیــن، ئەو ئاوەی لە کوندە و گۆزەکەدا بوو. لەگەڵ نانی نــاو نانەبەرەکــەو ئەو کەمە پێخــۆرەی پێیان بوو هــەر زوو تەواو بوو. چونکە لە ڕێگاشــدا زۆریان لە ئاوەکــە خواردبۆوە و لە نانەکە خواردبوو. لێرەدا تەوەکولی ڕاســتەقینە فێر دەبین، کە تەوەکول لە ســەر خوا ئەوەیە: نابێ دەستە و ئەژنۆ دانیشی، بەڵکو دەبێ لە خوا بپاڕێیتەوە و هەوڵ بدەی. تەماشــاکەن قورئــان چۆن ئەم تەوەکولە ڕاســتەقینەمان بۆ تۆمار دەکات. کاتێ ئیبراهیم پشتی لە هاجەرە و ئیسماعیل کرد، لە خوا پاڕایەوە و فەرمووی: ﴿رَّبَّنَآ إِنِّيٓ أَسۡكَنتُ مِن ذُرِّيَّتِي بِوَادٍ غَيۡرِ ذِي زَرۡعٍ عِندَ بَيۡتِكَ ٱلۡمُحَرَّمِ رَبَّنَا لِيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ فَٱجۡعَلۡ أَفۡـِٔدَةٗ مِّنَ ٱلنَّاسِ تَهۡوِيٓ إِلَيۡهِمۡ وَٱرۡزُقۡهُم مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمۡ يَشۡكُرُونَ ٣٧﴾ إبراهيم: ٣٧

واتە: پەروەردگارا بە ڕاســتی من هەنــدێ لە وەچە و خێزانم لە دۆڵێکی وشکی بێ کشتوکاڵدا جێنشین کردوە، لە پاڵ ماڵە پیرۆزەکەتدا، لە پاڵ (بَيْتُ الحَرام)دا، پەروەردگارا بۆیە لێرە نیشتەجێم کردن تا بە چاکی نوێژ و خواپەرستی ئەنجام بدەن. جا داواکارم دڵی هەندێك لەو

خەڵکــە کەمەندکێش بکەیــت بۆ لایان و لە ڕزق و ڕۆزی جۆراوجۆر بەهرەمەندیان بکەیت، بۆ ئەوەی سوپاسگوزاری بکەن.

ئیمانــداران: لــەم دوعا و داواکاریەی ئیبراهیــم بەرامبەر بە خوای گەورە شتێکی گەلێ گەورەی ئاماژە پێ کردوە. ئەویش ئەوەیە: عیبادەت و خواپەرســتی چــاك و جــوان لە کاتێکا دەکرێ کە ئەم دوو شــتە بۆ مرۆڤ بوونی هەبێ، کە ئەم دووانە هەبوون، ئەمجا موسڵمان بە جوانی و بە دڵی ئارامەوە خواناسی و عیبادەتی خۆی دەکات. ئەوانیش:

١. (فَاجْعَلْ أَفئِدَةً مِنَ النَّاسِ تَهْوِي إِلَيْهِمْ). ئا لەو کاتەوە ئیسلام گۆشەگیری و لە ئەشکەوتا ژیان و بەتەنها ژیان و ڕەبەنی ڕەت کردەوە و ڕەفز کردو، بە یەکەوە ژیان و کاری بە کۆمەڵ و هاوکاری یەکتری هەڵبژارد. تەنانەت زۆرێك لە عیبادەتەکان بە تەنها ئەنجام نادرێن و مرۆڤ ناچار دەبێ کە لەگــەڵ کۆمەڵە خەڵکێکی تردا بژی. وەکــو: نوێژی جەماعەت، جومعە، حەج، هەروەهــا زەکات، ئەگەر کەس نەبێ بی دەیتێ چۆن ئەو ڕوکنەی ئیسلامەتیت پێ جێبەجێ دەکرێ، لەبەر ئەوە ئەگەر بنچینەکانی ئیمان کە شەشــن بە تەنهــا لە ناو دڵی خۆتــدان. بەڵام بنچینەکانی ئیســلام هەندێکیان پێویستیان بەوە هەیە کە مرۆڤی موسڵمان لە ناو کۆمەڵگادا بژی و دوور بێ لە تەنهایی. کە ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێ، ئیسلام یەکەم بیــر و بۆچوونە کە بنیاتی کۆمەڵگەی مەدەنــی ڕاگەیاند. پێش ئەوەی هیچ بیروباوەڕێکی تر هەر بیریشی لێ کردبێتەوە!!.

٢. وارْزُقْهُمْ مِنَ الثَّمَراتِ: خواپەرســتی بە ســکی خاڵی ناکرێ و واجبە ئەو کەســەی بانگەواز بۆ دینی خوا دەکات و داوا دەکات کە شــەریعەتی

ئیسـلامی حوکمڕانی وڵات بکات و خەڵکی بە هەموو ئاین و بیروباوەڕ و ئایدیا و بۆچونێکەوە لەژێر سـایەی دادپەروەری ئیسـلامدا ژیانێکی پڕ ڕێز و کەرامەت بە سەر بەرن. نابێ هەر داوا لە خەڵك بکات کە لە پێناوی ئیسـلامدا کۆچ بکەن و خوێن و ڕۆح و ماڵی خۆیان ببەخشـن. بەڵکـو دەبێ پرۆژەی پێ بێ، بەرنامـەی درێژی هەبێ، بۆ ئەوەی باری ئابـووری ژیانـی خەڵك چاك بکات. خەڵکی تێر و تەسـەل بن، خەڵکی لەو هەموو ڕزق و ڕۆزیەی کە خوا لە سەر زەوی و ژێرزەویدا درووستی کردوە بۆ ئەوەی مرۆڤ لێی سوودمەند بێ، بی خاتە بەردەستی خەڵك و خۆشترین ژیانیان بۆ دابین بکات. بە بەرهەمی وڵات خەڵکی ببوژێنێتەوە نەك تووشی شەڕ و کوشتن و لە ناوچوون و چەوساندنەوەیان بکات.

ئەگـەر دەسـەڵاتێك کە بە نـاوی ئاینەوە حوکـم دەکات بیەوێ، خەڵکی شوکرانەبژێری خوا بن و لە خوا غافڵ نەبن، تێروتەسەلیان بـکات. نـان و ئاو و نـان و ئازادیان بۆ دابین بکات، خانوو شـوێنی نیشتەجێبوون و کەلوپەلی پێویستی ژیانی سەردەمیانەیان بۆ دابین بـکات. ئەمجا چاوەڕوانی ئەوە بێ کە خەڵکی شـوکری خوا بکەن و بە دڵ و بە گیان خواپەرسـتی بکەن. لێرەوە تێ دەگەین کە: ئیسلام هەژاردۆستە. بەڵام تا سەرئێسقان دوژمنی هەژارییە!.

بەڵـێ بەڕێزان: ئیبراهیم ئاوا بە کوڵ لـە خوا دەپاڕایەوە کە بە هانـا و هاواری ژن و منداڵەکەیەوە بێـت. واتە: لێیان بێ ئاگا نەبوو. بڵـێ دوعـای منی ناوێ، خوا خـۆی ئاگای لێیانـە، نەخێر تۆ تەنها توانـای دوعای خێر و پاڕانەوەت لـە خوا هەیە دەی درێغی مەکە و

دامەنیشــە و ئیهمال مەبە. لەم لاشــەوە: هاجەرە بە هەنگاونان، بە جموجــۆڵ و هاتووچۆکردن، کەوتە هەڵدان بۆ ئەوەی ژیانی خۆی و کۆرپەکەی ڕزگار بکات لە برســیەتی و تینویەتی. کە خەریك بوو لە تینوان دەخنکان. لەم کاتەدا هاجەرە خاتوون دانەنیشت بڵێ تەوەکول لە سەر خوا، خوا خۆی ڕزقمان بۆ دێنێتە بەردەم. نەخێر، تەوەکول ئەوەیە کە تۆ لە دڵەوە یەقینت هەیە کە ڕزق و ڕۆزی تەنها و تەنها خوا پێت دەبەخشێ و هی ئازایەتی و لێزانی خۆت نییە. بەڵام ناشبێ دانیشــی و چاوەڕێ بکەی کە پاروە نانەکە خۆی بکات بە ناو دەمتا. چونکە ئەوە لەگەڵ ژیانی دونیادا و کاری مرۆڤ لە ســەر زەویدا کە ئاوەدانکردنەوەی ســەرزەویە. ناگونجێ و بە یەکــەوە ناتەبا و دژە.. بۆیە هاجەرە دانەنیشــت بەڵکــو هەوڵی دا، حەوت جار نێوان (صەفا و مەروە)ی کرد. بە ئومێدی ئەوەی کە کەســێك، ئاوەدانیەك، ئاوێك ببینێ، فریادڕەســێك بێتە بەرچاوی. بەڵام هیچی نەبینی. لە جاری حەوتەمــدا کە گەڕایەوە بۆ لای ئیســماعیل تەماشــای کرد وا کانیە ئاوێکی پاکی ســازگار لە ژێر پێی ئیسماعیلدا هەڵقوڵاوە. هاجەرە لە خۆشــیان فەرمووی: (زَمْزَمْ) ئەی ئاوەکە بوەســتە و لە بەرت نەڕوا و کەم مەکە، ئیتر ئاوەکە لە گۆمە ئاوەکەدا وەستا.

ئیمانداران: ڕەنگە یەکێ بپرســێ: باشــە ئاو چییە. ئەی بۆ خوای گەورە پاداشــتی ئــەم ژنە تێکۆشــەرەی بەوە نەدایــەوە کە کانێکی ئاڵتوونــی بۆ بهێنایە ســەرزەوی. یان ســفرەیەکی پــڕ لە خواردن و خواردنەوەی هەمەچەشنی لە ئاسمانەوە بۆ نەناردە خوارەوە و وەکو

موعجیزەیـــەك هەتا قیامەت باس بکرایـــە و بگێڕدرایەتەوە؟! بەڵام نەخێـــر، کاری خوا ئەوەندە بـــە جێیە هەرگیز ڕەخنەی لێ ناگیرێ. تەماشا کەن و بیر بکەنەوە، ئەگەر لە جیاتی ئەو ئاوە، کانە ئاڵتوونێك بوایـــە، چەند کووپە ئاڵتـــوون بوایە. ڕەنگە ئەو هۆزەی هاتنە ئەوێ، تەماحـــی ئەو هەموو ئاڵتوونە بیگرتنایە و هاجەرەی تەنها و کۆرپە ساواکەیان بکوشتایە!، یان ئەگەر کەس نەهاتایە بۆ لایان ئایا هەموو ئاڵتوونی دنیا پەرداخێك ئاو دێنێ؟! نەخێر. بەڵام بە وەی کە خوای گەورە لەو زەویە وشکە، بێ ئاوە ئەو ئاوەی پێ بەخشین. کە جیاوازە لـــە هەموو ئاوەکانی ســـەرزەوی. زۆر گەورەتریش بوو لە وەی کە لە ئاســـمانەوە ســـفرەیەکی پڕ لە خـــواردن و خواردنەوەیان بۆ بهاتایە، چونکە ئەوە بۆ چەند ژەم و چەند ڕۆژێك بوو. پاشان کۆتایی دەهات و دەبوو بە دەنگوباســـی مێـــژوو. ئەوەی بـــۆی دەگێڕدرایەوە ڕەنگە باوەڕیشـــی پـــێ نەکردایە. بەڵام ئـــەم ئاوی زەمزەمـــە هەتا قیامەت بـــەردەوام دەبـــێ و هەموو چرکەیەك خەڵکی بـــە چاوی خۆیان ئەو ڕێزگرتن و بە هاناوەچوونەی خوای گەورە بۆ هاجەرە و کۆرپەکەی (ئیســـماعیل) بە چاوی خۆیان دەبینن. وە دەبینن چۆن خوای گەورە نـــزا و پاڕانەوەکانـــی ئیبراهیمـــی گیرا کرد، کەوا بـــوو لێرەوە ئەوە تـــێ دەگەین کـــە هەرچی خودا بی دا ئەوە باشـــە. ئەوە خێری تۆی تێدایە بۆ ئێســـتا و داهاتووت. کە زۆرجار مرۆڤ هەر ئێستا دەبینێ. کەواتـــە: ئەگـــەر داوای پارە و ســـامان و زێڕ و زیـــو و پارەی زۆر و دەوڵەمەندبوونت لە خوا کرد. خوای گەورە شتێکی تری پێ بەخشی،

بزانــە ئەوەیان بۆ تۆ باشــە کە خــوا پێی بەخشــیوی.. بەڵێ ئاوی زەمزەم کۆمەڵێ تایبەتمەندی هەیە کە لە ئاوی تردا نییە:

١. ئاوی زەمزەم هەرگیز کەم ناکات!! ئەو هەموو ملیۆنەها خەڵکە بە بەردەوامی شەو و ڕۆژ لێی دەخواتەوە و لێی دەباتەوە بۆ وڵاتانی دونیا و بۆ پێویســتی ڕۆژانەی بە کاری دێنێ. کەچی -سُبْحانَ اللّه- هیچ لێی کەم نابێتەوە!!، خۆ ئەگەر کەســیش لێی نەخواتەوە و بە کاری نەهێنێ هیچ لە بەری ناڕوات و سەرڕێژ ناکات!!

ئەندازیار (ســامی عەنقاوی) سەرۆکی مەرکەزی ئەبحاثی حەج، دەڵێ: کە ویســتمان سەرچاوەی ئاوی زەمزەم خاوێن بکەینەوە بە (سێ) ماتۆڕی زۆر گــەورە ئاومــان لێ بەتاڵ دەکرد. بەڵام هیــچ کەمی نەکرد و نەمان توانــی بەتاڵی بکەیــن، وەکو وتمان بــە بەردەوامــی ملیۆنەها حاجی و عومرەکار و خەڵکی لێی دەخۆنەوە و دەی بەنەوە و بەکاری دێنن، کەچی بە یەك تۆزیش کەم ناکات!! ئایا چ ئاوێك لە سەر زەوی بەو شێوەیە.

٢. ئەو ئاوی زەمزەمە هەرگیز لە بەریشی ناڕوات. لێی مەخۆرەوە و دەستیشــی لێ مەدە هەر وەکو خۆی دەوەســتێ و لە بەری ناڕوات، کە ئەمەش لە هیچ ئاوێکی دونیادا نییە!!.

٣. هەرچــی میکرۆب بێ تێیدا نییە و (١٠٠٪) پاکژترە. مەگەر ئەو بەلوعە و بۆریەی ئاوەکەی پێدا دەڕوات یان ئەو دەبەی تێی دەکرێ، ئاوەکە میکرۆباوی بکات.

٤. ئاوی زەمزەم لە جیاتی خواردنیش دەکەوێ، ئەگەر کەسێ تەنها ئــاوی زەمزەم بخواتەوە و هیچ جۆرە خواردنێکی دەســت نەکەوێت،

ئەوا پێی دەژی و لاشە خۆراکی خۆی لەو ئاوە وەردەگرێت.. بەڵێ ئەوە بە سەرهاتی تەسـلیمبوون بە فەرمانی خوا بوو، لە لایەن ئیبراهیم و هاجەرە خاتوونەوە. خوای گەورە فەرمووی: (لِلَّذِينَ اسْـتَجابُوا لِرَبِّهِمُ الحُسْـنَى). با بزانین ئەم بنەماڵە. ئەم خێزانە گوێڕایەڵە کە ئاوا بە جوانی وەڵامی خوایان دایەوە چیان دەستکەوت؟!

١. ئیبراهیـم هەتا هەتایە ناوی بەرزە، هەموو دینەکان خۆشـیان دەوێ. لایان بەڕێزە، خوای گەورە ئاوا باسی حەزرەتی ئیبراهیم دەکات و دەفەرمویٚ: ﴿ إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ۚ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَـٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْـَٔاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّـٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ النحل: ١٢٠ - ١٢٢

واتـە: بە ڕاسـتی ئیبراهیم هەر خـۆی ئوممەتێك بوو، هەرخۆی پێشـەوایەك بـوو، ملكـەچ و فەرمانبـەرداری خوا بوو لـە هەموو بیروباوەڕێکی چەوت بە دوور بوو، لە موشریك و هاوەڵگەرانیش نەبوو، هەروەها زۆر سوپـاسـگوزاری خوا بوو لـە بەرامبەر نازو نیعمەتی بێشوماری پەروەردگاریەوە ئـەویش هەڵی بژاردبوو ڕێنمویی کرد بۆ ڕێبازی ڕاسـت و درووست. ئێمە هەر لە دنیادا چاکەمان پێ بەخشی و پاداشـتی چاکەمان دایەوە (بە بەخشـینی هاوسەری پاك و نەوەی خواناس) بە ڕاستی ئەو لە جیهانی داهاتوودا لە ڕیزی چاکاندایە (کە ڕێزدار و بەختەوەر و کامەرانن).

بەڵێ ئیمانداران: باشـترین و موژدە و پاداشت بۆ ئیبراهیم هەبوو، لە دنیادا ژنی باش و گوێڕایەڵ و پاك و خواناس. لەگەڵ نەوە و ڕۆڵەی

پاك و خواناس و صالّح و ســالار. کە بە ڕاســتی هەرکەس ژنی باش و ئەولادی چاکی هەبێ، هەموو شتێکی چاکی ئەم دونیایەی هەیە.

وە لە قیامەتیشــدا، چ شتێك لەوە گەورەتر هەیە، کە مرۆڤ هەر لەم دنیایەدا موژدەی ســەرفرازی قیامەتی پێ بدرێ. موژدەی ئەوەی پێ بدرێ کە لە قیامەتا لە ڕیزی صالّحانداییە.

٢. هاجەرە خاتوون، بە بەرهەمی ئەم گوێڕایەڵیەی بوو بە:

١. یەکەم کەس کە نیشتەجێی حەرەم بوو. هاجەرە خاتوون یەکەم نیشــتەجێی ئەو جێگایەیە کــە ڕۆژانە بە ملیــۆن خەڵك ڕووی تێ دەکەن و ســەردانی دەکــەن و بەندایەتی خوای تێدا دەکەن. هاجەرە خاتــوون یەکەم نیشــتەجێی ئەو جێگایەیە کە قیبلەی موســڵمانانە زیاتــر لە یەك ملیار و چەند ســەد ملیۆن مــرۆڤ پێنج فەرزە ڕوو لەو شوێنە دەکەن کە کەعبەی پیرۆزە. ئای چ شانازیەکە کە کەسێك ببێتــە یەکــەم ئاوەدانکەرەوەی ئەو شــوێنەی کــە گەورەترین و بە ناوبانگترین شــوێنی سەرزەوییە هەتا قیامەت. بە هۆی گوێڕایەڵی و تەسلیمبوون بە فەرمانی خواوە، هاجەرە ئەو شەرەفەی پێ بڕا.

٢. هاجــەرە بوو بە یەکەم کەس کە لە ئاوی زەمزەمی خواردەوە! بیری لێ بکەنەوە چ شــەرەفێکی گەورەیە. کە هاجەرە یەکەم کەسی ئەم سەر زەوییە کە لە ئاوی پڕ بەرەکەتی زەمزەمی خواردەوە.

٣. هاجــەرە خاتوون یەکەم کەســە کە هاتووچــۆی نێوان صەفا و مــەڕوەی کردوە، ســاڵانە بە حەج و عەمرەوە بــە ملیۆنەها مرۆڤی ئیمانــدار هاتووچۆی نێوان صەفا و مەڕوە دەکات. هەمووی ســەعی

نێوان سەفا و مەروە دەکەن و دەبێ رێك، بە هەمان شێوەی هاجەرە خاتوون ئەو هاتووچۆیە بکەن. لە کوێ ئەو نیمچە راکردن رۆیشتوە، ئەوانیش ئاوا برۆن و لە کوێش ئەو بە هێواشـــی رۆشتوە، دەبێ ئەو خەڵکەش ئاوا بڕوات.

بەرێـــزان: ئایـــا هاجەرە کێ بوو؟ ناوی باوکی چییە؟ لە چ تیرە و هۆزێکـــە؟ خەڵکی کوێیە؟ هیچی نازانـــدرێ. تەنها ئەوەندە دەزاندرێ کە کۆیلە و خزمەتکاری پاشـــایەکی دەســـەڵاتدار بوو، کاتێ ئەو پاشا ستەمکارە ویستی دەســـت بەسەر (سارا خاتوون)ی هاوسەری یەکەمی حەزرەتی ئیبراهیمدا بگرێ و خوای گەورە لە ئاســـتی سارا خاتووندا وەکو لاشـــەیەکی وشکهەڵاتووی لێ دەکرد و سەرەنجام بە ملکەچی و داوای لێبوردنەوە وازی لە سارا خاتوون هێنا و هاجەرەی خزمەتکار و جاریەشـــی وەکو دیاریەك پێ بەخشـــی و پاشـــان لە ســـەر داوای ســـارا خاتوون ئیبراهیـــم مارەی کرد بەو ئومێـــدەی منداڵێکیان ببێ، چونکـــە تازە ســـارا خاتوون لـــە تەمەنی منداڵبوونـــدا نەمابوو، بەڵێ هاجەرە گومناو بوو، بێناو بوو، ئەی بە چی بوو بەو یەکەمی هەموو کارە یەکەمـــە گرنگـــەکان؟! بە چی بـــوو بەو نـــاودارەی مێژوو، کە هەمـــوو چرکەیەکی ئەم ژیانـــە یادی زیندوو رادەگیرێ و کەس نییە لە ئیمانداران بە دەنگوباس و بەســـەرهاتی شـــارەزا و ئاگادار نەبێ؟! تەنها یەك شـــت بـــوو. ئەویش ئیمان و تەســـلیمبوون بـــە فەرمانی خوای پەروەردگار!! دەی ئەمە رێزی ئیسلامە بۆ ئافرەت، ئافرەت بە گوێڕایەڵـــی فەرمانی خوای پـــەروەردگاری ئاوا بەرز دەبێتەوە. ژیانی

هاوسەریەتی خۆش و گەش و عاقیبەت خێر دەبێ. سەیرکە هاجەرە و ئیبراهیـــم و ئیســـماعیل چەند بەختەوەر بـــوون!. بەڵام هەر کات ئافـــرەت لـــە گوێڕایەڵی خوای پـــەروەردگاری لای دابێ و بوو بێ بە گوێڕایەڵی شـــەیطان ســـیفەتەکان. کە گورگن و لە ناو پێستی مەڕدا خۆیـــان بۆ مـــەلاس داوە و بە دەمیان دروشـــم و دیعایـــەی بریقەدار دەیانەوێت ڕووتی بکەنەوە و وەکو بووکەشووشە هەڵی بپەڕێنن و تا گەنجە و جوانە و بە کەڵکیان دێ بە کاری بێنن و پاشـــان بەڕەڵا و بەدبەختی بکەن و بەدناوی بکەن!! لەو کاتەدا کە ئافرەت بە قسەی دوژمنانی ئیسلامی کرد. هاجەرەیەکی تێدا هەڵنەکەوتەوە!.

لێرەشـــدا دەڵێـــم: خۆزگە حاجیەکانیشـــمان ئاوا لـــە حەج حاڵی ببوونایە. ئەمجـــا بزانە چۆن خێزانەکان بەختـــەوەر دەبوون. چۆن حاجی تەســـلیمی ئەمـــری خوا دەبوو. ئەوکات حـــەج تەنها ناوێك و بەســـتنی کەشـــیدەیەکی پشـــت نەدەبوو. ئەوکاتە حاجی نەدەبوو بە کەســـێکی چەوسێنەری ماڵ و مناڵ و بێدینەکان نەدەهاتن تەمسیلی لەسەر دەر بکەن و حاجی ڕۆڵی پیاوێکی دڵڕەقی قسەڕەقی بە گومانی جوێنفرۆش بە ماڵ و مناڵ ببینێ، بە هۆی ئەوەی کە حاجیەك ئاوا ڕەفتار و هەڵسوکەوتی لەگەڵ مناڵیدا کردوە!.

دەرس و وانەی دووەم کە لە قوربان و جەژنی قورباندا فێری دەبین ئەوەیە: کاتێ کە فەرمان کرا بە ئیبراهیم، ئیســـماعیل سەرببڕێ، وە ئـــەو تاقیکردنەوە گەورەیە کرا. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ ﴿١٠٦﴾ ﴾ الصافات: ١٠٦.

واتــە: بــە ڕاســتی ئەمــە خــۆی تاقیکردنەوەیەکــی ئاشــکرا و ڕوونە.. تەماشــا کــەن نافەرموێ: (هذا بَلاءٌ مُبــين) بەڵکو بە تەئکید لەسەرکردنەوە و جەخت لەســەرکردنەوەوە دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴾، بەڵام تەماشای ژیاننامەی حەزرەتی ئیبراهیم بکە، خرایە ئاگرەوە، دەربەدەر کرا، فەرمانی پێ کرا ژن و منالی ساوای بە تەنهــا لە چۆڵەوانی مەککەدا بــە جێ بهێڵێ. کەچی خوای گەورە بۆ ئەمانە هیچی نافەرموێ: تاقیکردنەوەیەکی ڕوون و ئاشــکرا و گەورە بوو. بەڵام بۆ ســەربڕینی ڕۆڵەکەی دەفەرموێ: ﴿ إِنَّ هَٰذَا لَهُوَ ٱلْبَلَٰٓؤُا۟ ٱلْمُبِينُ ﴾.. کە ئەمەش گەورەیی و منالّ مردنمان نیشــان دەدات کە چ تاقیکردنەوەیەکــی گەورەیە جەرگســوتان. کە بە ئەندازەی گەورەیی ئەو ئازاری منالّ مردنەش ئەجر و پاداشت تۆمار دەکرێ. بەڵێ (فَلَمّا أَسْــلَما) کاتێ إبراهیم و ئیســماعیل تەســلیمی فەرمانی خوا بوون و گوێڕایەڵی خۆیان بە کردەوە ســەلماند، ئا لــەو کاتەدا خوای گەورە بە دوو پاداشــت پاداشــتی کردن. یەکەم: لە دنیادا، هەر دەستبەجێ (وَفَدَيْنــاهُ بِذِبْحٍ عَظيم). دووەم: (وَتَرَكْنا عَلَيْهِ في الآخِرين)، کە ئەو هەموو ملیۆنەها قوربانیەی ســالانە ســەردەبڕدرێ، هەمــووی یادکردنەوەی ئیبراهیم و ئیسماعیلە..

کەواتە: ئەی ئیماندار تێ بگە و یەقینت ببێ کە: هەرچی خوای گەورە ئەمری پێ کردووی بە بێ دوودڵی وەری بگرە و جێبەجێی بکە و بزانە:

١. کاری خــوا هیچــی بێ حیکمــەت نییە و هەمووی لە شــوێنی خۆیایەتی و لە بەرژەوەندی بەندەدایە.

٢. بزانە کە تەسـلیمی ئەمری خوا بـووی، خوای گەورە لە دونیا و لە قیامەتدا پاداشـتت دەداتەوە. ئیمانداران خوای گەورە لە بارەی مرۆڤەوە دەفەرموێ: ﴿إِنَّهُۥ كَانَ ظَلُومًا جَهُولًا ۝٧٢﴾ الاحزاب: ٧٢.

زۆربەی زۆری مرۆڤ دوو صیفەتی تێ دایە، لە کاتی دەسـەڵات و دەست ڕۆیشتوییدا زۆر ستەمکارە و ستەم دەکات. هەروەها بەرامبەر ئارەزووەکانی نەفس و نەفام و نەزانە.

لێـرەدا خـوای گەورە ئـەو دوو صیفەتە خراپەی بـاس کردووە، بۆچـی؟! چونکـە ئەگەر سـتەم و زوڵم نەبێ عـەدل و دادپەروەری کـوا نرخی دەردەکەوێ؟! ئەگەر نەزانین و نەفامی نەبێ، کوا نرخی زانست و عیلم دەردەکەوێ؟! جا عەقڵی مرۆڤ نە دەتوانێ دادگەر بێ و لە زوڵمی نەفسـی و خۆی و خەڵکی ڕزگاری ببێ، نە بە عەقڵیش هەموو شتێکی عیلمی و زانستی پەی پێ دەبرێ و دەزاندرێ. جا بۆیە واجبە مرۆڤ تەسـلیمی شـەرعی خوا بێ، تا دادپەروەر بێ، (چونکە هەر کەس بە پێی شـەرعی خوا هەنگاو و هەڵوێستی نواند، هەرگیز سـتەم لە کەس ناکات، وە ستەمیشـی لێ ناکرێ). وە بۆ ئەوەی زانا و فامیدە بێ، پێویستە تەسلیمی شەرعی خوا بێ، چونکە ئەوەی خوا و پێغەمبەرەکەی فەرموویانە و فەرمانیان پێ کردوە، هەمووی زانستە و زانیاریە و تۆی موسڵمان کە بە فەرمانی شەرع جووڵایتەوە، ئەگەر نەخوێندەواریش بی. هەنگاو و هەڵوێستەکانت، گوفتار و ڕەفتارەکانت زانایانە و دانایانەیە. با نمونەیەك بێنینەوە: لە حەجدا، حاجی یان بەردە ڕەشەکە (حَجَرُ الأَسْوَد) ماچ دەکات، یان لە دوورەوە دەستی بۆ

بەرز دەکات. ئایا ئەمە لە ڕووی زانستییەوە هیچ بنەمایەکی هەیە؟!
ئایا ئەمە ناچێتە خانەی دواکەوتوویی بە وەی مرۆڤ بەرد ماچ بکات
یان دەستی بۆ بەرزبکاتەوە و سەلامی لێ بکات؟!.. لە وەڵامدا دەڵێین:

١. بەردە ڕەشەکە (حَجَرُ الأَسْوَد) بەردێکە لە هەموو سەرزەوی وێنەی نییـــە. بە وەی کە دوو صیفەتی نــاوازەی تێدایە کە لە هیچ بەردێکی تردا نییە، یەکەم: هەرگیز ئاگر کاری لێ ناکات و نایتەقێنێ. دووەم: لە ئاودا نقوم نابێ، وەکو تەپەدۆر ئەو بەردە گەورە سەرئاو دەبێ!!

٢. بۆ ماچکردن یان دەســتلێدان و دەســت بۆ بڵندکردنی، لە کاتی خۆیدا پێشــەوا شافیعی فەرموویەتی: هەرکەس دەستی لێ بدات، یان دەســتی بۆ بەرز بکات، ئەو بەردە شــاهیدی بــۆ دەدات لە قیامەتدا چونکە یەکسەر ناوی تۆمار دەکات. وتیان ئەی پێشەوا شافیعی، ئەگەر کەسێك چەند جارێك دەستی لێ بدات، یان سەلامی لێ بکات، ئەوە چۆنــە؟! فەرمووی: جــاری یەکەم ناوی تۆمار دەکات. پاشــان چەند جــار دووبارەی بکاتەوە ئەوەندە ئاماژە لە تەنیشــت ناوەکەیەوە لێ دەدات!! سُــبْحانَ اللّٰه ئەمە کەرامەتی فەقیهو موجتەهیدانی ئیسلام دەردەخــات کە چۆن هەموو فەرموودەیەکیــان پڕاوپڕە لە ئیعجازی زانســتی. ئەمڕۆ زانایان دوای دیراسە و لێکۆڵینەوە لە بەردی (حَجَرُ الأَسْوَد) بە وردبینی زۆر تایبەتمەند بۆیان دەرکەوت کە بە ملیۆنەها نــاوی لەســەر تۆمارکراوە و نــاوی وا هەیە چەندین جــار ئاماژەی پــێ کراوە!! ئەگــەر یەکێ بڵێ چۆن ئەمە دەگونجــێ؟! پێی دەڵێین: ئەگەر کۆمپیوتەرێك بە ملیۆنەها ناوی تێدا تۆمار کرابێ، ئایا خوای

پەروەردگاری جیهانیان ناتوانێ لە ناو بەردێکی بەهەشتدا کە بەردە ڕەشـــەکەیە و پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتـــی: کاتێ ئەو بەردە هاتە سەرزەوی لە شیر سپیتر بوو. بەڵام ئەوەندە دەم و چاوی گوناهبارانی بەرکـــەوت ئاوا ڕەش بوو. (سَـــوَّدَتْها خَطا يا ابـــن آدم). ئایا بۆ خوا چی تـــێ دەچێ کە توانایەکی ئاوا لەو بەردەدا درووســـت بکات، کە وەکو چۆن لە ئاودا نقوم نابێ، ئاواش ناوی ملیۆنەها مرۆڤ تۆمار بکات؟! کەواتە: تەســـلیم بە بەوەی کـــە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی، خەلیفە عومـــەری کوڕی خطاب فەرمووی: (إِنَّكَ حَجَـــرٌ لاتَنْفَعُ وَلاتَضُرُّ، وَلَوْلا أَنِّي رَأَيْتُ رَسُولَ الله (ﷺ) قَبَّلَكَ ماقَبَّلْتُكَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ

تەماشـــای ئەو وشـــە جوانەی خەلیفە عومەر بکە، کە فەرمووی: دڵنیام کە تۆ بەردێکی نە ســـود دەگەیەنی و نە زەرەر دەگەیەنی، بە خـــوا ئەگەر نەم بینیایە کە پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) ماچی کردووی ماچم نەدەکردی.. بە واتایەکی تر مادام پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماچی کـــردووی دڵنیام بێ حیکمـــەت نییە.. لەبەر ئەوە مرۆڤی موســـڵمان دڵنیام هەرچی دەی کات بە پێی فەرمانی شـــەرع هەمووی زانســـتە، ئەگەر ئەمڕۆش زانســـت پەی پـــێ نەبردبێ، بەیانی بە ملکەچییەوە دەی سەلمێنێ..

بەڵـــێ بەڕێـــزان: کە ئیســـلام دەفەرمـــوێ فلان شـــت خراپە، لە زەرەری مرۆڤدایـــە، ڕۆژێ دادێ هـــەر ئەوانەی کە ئەمڕۆ بانگەشـــە بـــۆ ئەو بێشـــەرعی و خراپە دەکەن. خۆیـــان دان دەنێن بە وەدا کە ئەوە خراپە و پێویســـتە مرۆڤ وازی لێ بینـــێ. بۆ نموونە: کەناڵی

(B.B.C) دەڵــێ: پارێزگاری شــاری (لویجی بوبیــۆ)ی ئیطالیا بڕیاری داوە کە دەبێ ڕەوشـــت و ئادابی جــوان بگەڕێتەوە بۆ ناو کۆمەڵگا و بۆ ئەم مەبەســـتەش چەندین ڕێوشــوێنی جیــا گیراوەتە بەر، وەك: قەدەغەکردنـــی جلوبەرگی کورت و تەنك و ڕووت. وە یاری تۆپی پێ لە شــوێنە گشــتیەکان بەو جلانەوە. وە هەر کەس ســەرپێچی بکات بە بڕی (٦٩٦) دۆلاری ئەمریکی ســزا دەدرێت، وە سیاســەتی: (نا بۆ لەبەرکردنی جلی ڕووت) ڕاگەیەنرا، وە قەشــە (دۆن پاولۆ سیسیری) ئەم بڕیارەی پێ باشــە و دەڵێ دەبێتە هۆی ڕیشەکێشکردنی دیاردەی دەستدرێژی سێکسی و بەدڕەوشتی..

بەڕێــزان: ئایا ئەمە گەڕانەوە نییە بــۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێ: (صِنْفانِ مِنْ أُمَّتي لَمْ أَرَهُما ..... یەکیان: وَنِساءٌ كاسِياتٌ عارِيات)؟! بەڵێ. دەی کەواتە: شانازی بە ئیسلام و پێغەمبەرەکەمانەوە دەکەین (اللّهُمَّ صَلِّ عَلى حَبيبنا محمد).

ئیمانــداران: جــۆری دووەم لە مــرۆڤ ئەوانەن کــە وەڵامی خوا نادەنــەوە، خــوای گــەورە دەربارەیــان دەفەرمــوێ: ﴿ وَٱلَّذِينَ لَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُۥ لَوْ أَنَّ لَهُم مَّا فِى ٱلْأَرْضِ جَمِيعًا وَمِثْلَهُۥ مَعَهُۥ لَٱفْتَدَوْا۟ بِهِۦٓ أُو۟لَٰٓئِكَ لَهُمْ سُوٓءُ ٱلْحِسَابِ وَمَأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ ٱلْمِهَادُ ﴿١٨﴾ ﴾ الرعد: ١٨

واتــە: ئەو کەســانەش کە بــە دەم بانگــەوازی پەروەردگاریانەوە نەچوون، ئەگەر بە ڕاستی خاوەنی هەر هەموو شتێك بن لە زەویدا و ئەوەندەی تریشی لەگەڵدا بێت، ئەوە دەیان کردە قوربانی خۆیان و لە پێناوی ڕزگاری خۆیاندا دەیان بەخشی. چونکە ئا ئەو جۆرە کەسانە

بە خراپترین شـێوە حیسـابیان لەگەڵدا دەکرێت، سـەرئەنجامیش جێگەیان دۆزەخە ئای کە شوێنێکی خراپە..

بەڵێ ئیمانداران: ئەوەتا ئەمڕۆ مرۆڤایەتی هەرچی لە سەر زەوییە، ئەوەندەش زیاتر لە ژێر دەریا و ناخی زەوی -نەوت و کانزاکان- لە ژێـر دەسـتیایەتی و بەرهەمی لێ وەردەگرێ. بەڵکـو ئەمڕۆ مرۆڤ دەچێتە ئاسمان و لە ئاسمانیش سود وەردەگرێ. بە هۆی گواستنەوەی مـرۆڤ و کەلوپەل بە هـۆی فڕۆکەوە، کەچی هەمووی دەبەخشـێ بـەس ئەوەندەی کە بەختەوەر ببـێ. خۆزگە دەخوازێتەوە بە ژیانە سـادەکەی جاران. بەڵام دڵە خۆش و بێ گرفتەکەی جاران!!. ئەمەش هەمووی هۆکارەکەی تەسـلیمنەبوونە بە فەرمانـی خوا، گوێڕایەڵی نەکردنی شـەریعەتەکەی پەروەردگارە کە کالآیەکە پڕ بە بالآی ئەم مرۆڤـە و هـەر بـەوەوە جوانە و غەیـری ڕێبازی ئیسـلام بە هەر شتێکی تر ژیانی ببات بەڕێوە، وەکو مرۆڤێکی گەورە وایە کە بتەوێ جلوبەرگی منالێکی ساوای لەبەر بکەی!!

جـا ئەی مرۆڤ: ئەگەر لەم دونیـا کورتەدا، وەلآمی خوای خۆتت دایەوە و تەسـلیم بە ئەمر و فەرمانەکانی بووی، کە بە (يأَيُّها الَّذينَ آمَنُـوا) بانگی کردی، یان بە (يأَيُّها الإِنْسـان) بانگـەوازی لێ کردی. ووتـت: لَبَّيْـكَ يارَبِّي. ئـەوە یەقینت هەبێ هەر لـە دنیادا هەرکات تـۆش هانا و هاوارت بۆ لای خوا بـرد. خوا وەلآمت دەداتەوە، وە لە قەبرەکەشتدا بە ئاسانی وەلآمی فریشتەکان دەدەیتەوە. دەی وەرە بە موسـڵمانی بژی. یا بە موسـڵمانی بمری بە موسڵمانیەتیش زیندوو

بكرێیتەوە و بەختەوەری دونیا و قیامەت بی.. خوای پەروەردگار لە سـەر ڕێبازی ئیسلام دامەزراوەكان بكەی و بەسیرەی خۆشەویستمان حەزرەتی محمد (ﷺ) ئاشـنا و زیاتر شـارەزامان بكەی (رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ) اللّهُمَّ أمين

## سەرچاوەكان:


١. تەفسیری ئاسان، م. بورهان محمد أمین.

٢. المَجْمُوعَة الثانِيَة مِنْ صَحيح وَصايا الرَّسُول (ﷺ) سَعْد یوسف أَبوعَزیز ج١ ص ٦٠٧.

٣. الإِعْجاز العِلْمي في القُرْآنِ وَالسُّنَة، نايف منير فارس، ج١ ص٥٠١.

٤. رِفْقاً بالْقَوارير، د. محمد عبدالرحْمن العريفي، ص٢٧٥.

٥. مَوْسُوعَة الإعْجاز العِلْمي في القُرْآنِ وَالسُّنَة، یوسف الحاج أَحمد، ص٩٦٠.

٦. هەفتـە نامەی (پەیـام) ڕاگەیاندنی یەكیەتی زانایانی ئاینی ئیسـلامی كوردستان دەری دەكات، ژ: ٦٣ لە ٢٠١٠/١٠/٣١.

وتاری سێیەم بۆ مانگی ذي الحجة

# ڕۆژی جیهانی ڕووبەڕووبونەوەی توندوتیژی دژی ژنان
## بەشی یەکەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیمانداران و خواناسانی بەڕێز: ڕۆژی (١١/٢٥)ی هەموو ساڵێکی زاینی، ڕۆژی جیهانییە بۆ ڕووبەڕوبوونەوەی توندوتیژی دژی ژنان. کە لێرەدا دەڵێم: جێگای داخە زۆربەی بۆنە و ڕۆژەکانی ژنان وەکو (٨ مارس) و (١١/٢٥) هەمووی هەر باسی کلۆڵی و کزۆڵی ژنانە و لە لایەن ئافرەتانەوە هەروەکو دیفاع لەخۆکردن بەکار دێت. بەڵام لە ئیسلامدا ئافرەت نەك مەزلۆم و کلۆڵ و مەزلوم و کلۆڵە. جێی بەزەیی و دیفاعە، بەڵکو خاوەن ڕێزە و خۆی بوونی خۆی سەلماندوە. بەو ماف و ڕێزەی کە پەروەردگار پێی بەخشیوە. ئێمە کە باسی ژن دەکەین، دەبێ بزانین ژن کێیە؟! ئافرەت یەکێ لەمانەیە:**

**١. دایکە، دەی لەم کاتەدا خوای گەورە ئەوپەڕی حورمەت و ڕێزی بۆ دیاری کردوە، چی لەوە گەورەترە کە خوای گەورە بەعەظەمەت و دەسەڵاتی خۆیەوە -سُبْحانَهُ وتَعالى- فەرمانی بە ئادەمیزاد کردوە کە لە خزمەت دایك و باوکیدا بێ، چۆن فەرمانی پێ کردوە بە نوێژو ڕۆژوو زەکات و حەج، ئاوا بگرە زیاتر بە ئاشکراییەوە فەرمانی بە بەندەکانی کردووە کە چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوکیاندا، با**

بچینــە خزمەت قورئــان بزانین چی دەفەرمــوێ: ﴿ وَوَصَّيْنَا ٱلْإِنسَٰنَ بِوَٰلِدَيْهِ إِحْسَٰنًا ۖ حَمَلَتْهُ أُمُّهُۥ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا ۖ وَحَمْلُهُۥ وَفِصَٰلُهُۥ ثَلَٰثُونَ شَهْرًا ﴾ الاحقاف: ١٥

واتــە: ئێمــە فەرمانمان بــە ئادەمیزاد داوە کــە چاکەکار و چاك ڕەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا، دایکی بە ئازارەوە هەڵی گرتوە و بە دەم ئێش و ئازارەوە بوویەتی. سکپڕبوون و لە شیربڕینەوەی سی دانە مانگی خایاندوە...

جا تەماشــاکەن: باسی دایك و باوکی بە یەکەوە کردوە، پاشان لە بەر زێدە ڕێز و مافی دایك بە تەنها باســی دەکات و سێ مەردایەتی و قوربانیدانی ئافرەت باس دەکات، کە بە پیاو ناکرێ. ئەوانیش:

١. حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهاً.

٢. وَوَضَعْتَهُ كُرْهاً.

٣. وَحَمْلُهُ وَفِصالُهُ ثَلاثُونَ شَهْراً...

لێرەدا لەگەڵ باسی شــیرخواردنەکەدا، باسی کاتی حامیلەبوون و ناوســکی دایکی کردۆتەوە، بۆچی؟! خۆ پێشتر لە (حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهاً) دا، باســی کردبوو؟! لە وەڵامدا دەڵێین: وَاللّٰه أَعْلَم پەروەردگار ئەوەمان دەخاتــە بەرچــاو کە ئــەی مرۆڤ چۆن لــە دوای لــە دایکبوونەوە ماوەی دوو ســاڵ شیری دایکت دەخۆی و ئەمە لە بەرچاوە و هەموو کەس هەســتی پێ دەکات. بە هەمان شــێوە ئەو کاتەی کە لە ســکی دایکتــا بــووی هەر لە دایکتــەوە خواردنت وەردەگــرت و لە ڕێگەی ناوکەپەتکــەوە خــۆراك لە دایکتەوە بۆ تۆ دەهــات. ئەو کاتیش -کە

ئەمەیـــان لە بەرچاو نییە و ڕەنگە هەمـــوو کەس نەیزانێ- هەر لە دایکتەوە خواردنت وەردەگرت. دەی ئەم سێ حاڵەتە بە هەموو پیاوی دونیـــا ئەنجام دەدرێ بۆ لەدایکبوون و هێنانە دونیا و بەخێوکردنی کۆرپەیەك؟! نەخێر هەر بۆیە لە صەحیحی بوخاری دا (فَتْحُ الباری ج١٢ ص٤)دا هاتوە کە: پیاوێك عەرزی پێغەمبەری خوای (ﷺ) کرد، کـێ لە هەموو کەس زیاتـــر حەقی چاکەکـــردن و خزمەتکردنی لە ســـەرمە؟! فەرمووی: دایکت. کابرا وتی ئەی دوای دایکم؟ فەرمووی: دایکت، تا سێ جار هەر ئەو کەسە پرسیاری دەکرد و پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر دەی فەرموو: دایکت، لە جاری چوارەمدا ئەمجا فەرمووی: باوکت. دەی ئایا دایکت کە نیوەی کۆمەڵە و دایکی نیوەکەی تریەتی دەگونجێ کەســـێ هەبێ بیر لەوە بکاتەوە کە توندووتیژی بەرامبەر بـــکات و ئـــازاری بدات؟! بێگومان. ئەوەی موســـڵمانێکی تێگەیشـــتوو مرۆڤێکـــی عاقڵ و پێگەیشـــتوو بێ، نەخێر. بەڵکـــو واجبە کە دایك لەسەر چاوان بگیرێ و پێڵاوی بۆ دابنرێ.

٢. ژن، یـــان ئافرەتە لە کۆمەڵـــدا (کچە). دەی کچ بە نەصی قورئان هەدیە و دیاری خالیقی ئەرز و ئاسمانەکانە کە بە مرۆڤی دەبەخشێ، دیاری خوایە. قورئان دەفەرموێ: ﴿ لِّلَّهِ مُلْكُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۚ يَخْلُقُ مَا يَشَآءُ ۚ يَهَبُ لِمَنْ يَشَآءُ إِنَٰثًا وَيَهَبُ لِمَن يَشَآءُ ٱلذُّكُورَ ﴿٤٩﴾ ﴾ الشورى: ٤٩

واتە: هەر بۆ خوایە خاوەنداریەتی ئاســـمانەکان و زەوی. هەرچی بوێت دروستی دەکات، بە هەرکەس کە بیەوێت تەنها کچ دەبەخشێت و بە هەرکەس بیەوێت کوڕ دەبەخشـــێت. واتە: کچ و کوڕ خەڵات و

دیاری خوان دەیان بەخشێ بە دایك و باوك. بەڵام کامیان گەورەترە؟ لە پێشـــەوە باســـی کچی کرد (إناثاً). بەڵام بۆ ڕاگرتنی هاوســـەنگی و یەکســـانکردنی نێوان کـــچ و کوڕ. کە زۆربەی بێدینەکان درووشـــمی (یەکســـانی نێوان نێرومێ)یان هەڵ گرتوە و مەبەســـتیان ئەومیە ژن و پیاو بچەوســـێننەوە، وەکو تۆڵەکردنەوە لە سیستەمی پیاوسالاری. بـــەڵام بـــێ ئاگان لە قورئان، کە بەم شـــێوازە نایابـــە ناوازەیە. چۆن ئەو یەکبســـانیەی نێـــوان نێرومێی جێگیر کـــرد. ئەویش بە وەی کە یەکەمجـــار قەدر و حورمەتی ئافرەتی لای خوا دیاری کردوە دایك و باوك و بنەماڵەکانی تێ گەیاند کە چەند بە بوونی کچ شـــادمان بن و ئـــەو هەدیە و دیاریەی خوا (کە کچە) بە کەمنرخ تەماشـــا ناکەن. پاشـــان ســـەرنج بدەن وشـــەی (إناثاً) بە نەکیرەیی هاتوە، چونکە لە پێشـــەوە هاتوە، بەڵام وشـــەی (الذّکور) بە مەعریفەیی هاتوە چونکە لە دواوە هاتوە و تۆڵەی دواکەوتنەکەی بۆ کراوەتەوە!! سُبْحانَ اللّه لەم هاوســـەنگی ڕاگرتنە گەورە و گرنگە کـــە خوای گەورە لە نێوان نێرومێدا چەسپاندی..

ئەمجـــا با گوێ بگرین لە خۆشەویســـت و ســـەرومرمان حەزرەتی محمد المصطفی (ﷺ) کە چۆن باســـی گەورەیی و ڕێزی کچ دەکات. دەفەرمـــوێ: (مَنْ كانَتْ لَهُ أُنْثى، فَلَمْ يَئِدْها، وَلَمْ يُهِنْهـــا، وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ الذُّكُورُ عَلَيْها، أَدْخَلَهُ اللهُ الجَنَّةَ) رَواهُ مُسْلِم

واتە: هەر کەسێ کچێکی هەبێ سووکایەتی پێ نەکات، زیندەبەچاڵی نـــەکات، مافی پێشـــێل نەکات، کوڕەکـــەی زاڵ نەکات بە ســـەریدا و

کوڕەکەی نەکات بە فەرمانداری ماڵ و کچەکەشی بە خزمەتکار. ئەوە خوای گەورە ئەو باوکە بە حورمەتی ئەو کچە دەخاتە بەهەشــتەوە. وە پێغەمبــەر (ﷺ) موژدەی داوە بەو دایــك و باوکانەی کە کچیان هەیە بە ڕێزەوە بەخێویان دەکەن و موسڵمانانە پەروەردەیان دەکەن و مافەکانیــان بۆ دابین دەکەن، دەفەرموێ: (مَنْ عالَ جارِيَتَيْنَ حَتَّى تَبْلُغا جاءَ يَوْمَ القِيامَةِ أَنا وَهُوَ كَهاتَيْنِ وَضَمَّ أَصابِعَهُ) رَواهُ مُسْلِم

واتە: هەر کەسێ دوو کچ بەخێو بکات هەتا پێ دەگەن، بە جوانترین بەخێوکــردن و پەروەردەکردن پێی گەیاندن. ئەوا لە ڕۆژی قیامەتدا من و ئەو کەسە ئاوا دەبین، وە بە دوو پەنجەی شایەتمان و بالابەرزەی ئاماژەی کــرد. واتە تەنها پێغەمبەریەتیەکەم لە پێش ئەوەوە دەبێ!! ئایا هیچ پلە و پایەیەکی گەورەتر هەیە لە وەی کە کەسێك ڕەفاقەتی پێغەمبەر (ﷺ) بە دەست بێنێ؟! پاشان سەرنجی فەرموودەکە بدەن کــە فەرمــووی: (مَنْ عالَ جارِيَتَيْنِ) هەر کەســێ سەرپەرشــتی دوو کچ بــکات، ئیتر دیاری نەکرد کە ئەو کەســە بــاوك و دایکیان بن. مام و خاڵیان بن. برایان بن. کەسێکی بێگانە بێ و لە دوای مردنی دایك و باوکــی ئەو دوو کچە، نەهێڵێ بێناز بن ئەو موژدەیە دەی گرێتەوە... بەڵێ ئەوەیە ڕێزی کچ لە ئیســلامدا. کەواتە: کچ جێگای سووکایەتی پێکــردن و توندوتیژیی و بێڕێزی بەرامبەرکردن نییە، بەڵکو جێگای شانازی پێوەکردن و قەدر و حورمەتگرتنی پێویستە..

٣. ژن، هاوسەرە، لەم کاتەشدا کە ئافرەت هاوسەر و هاوژنی پیاوە. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَخَذْنَ مِنكُم مِّيثَاقًا غَلِيظًا ﴿٢١﴾﴾ النساء: ٢١

واتە: ئەی پیاوان، ژنەکانتان پەیمان و بەڵێنێکی گەورە و گرنگیان لێ وەرگرتوون لە کاتی مارەکردنیاندا... دەی کەواتە ئەی پیاو هەمیشە وەفــادار بە بەرامبەر ئەو بەڵێنەی بە هاوســەرەکەت داوە. هەروەها پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی: (أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمانَةِ الله، وَاسْــتَحْلَلْتُمْ فُرُجَهُنَّ بِكَلِمَةِ الله). رَواهُ مُسْلِمْ (١٢١٨)

ســوێند بە خوا، لە مارەکردندا پیاوی موسڵمان تەنها لەمە بگات، هیچ پیاوێ ســووکایەتی بە ژنەکەی نەدەکرد. سُبْحانَ اللّٰه لەم وشە بــە هێز و بــە پێزانە، (أَمانَةِ اللّٰهِ) وە هەروەهــا: (كَلِمَةِ اللّٰهِ) بەڵێ مارەکردنی شەرعی یانی ئەی پیاو بزانە ئەو ئافرەتە ئامانەتی خوایە لای تۆ، ئاگاداری بە بی پارێزە. بزانە ئەو هاوسەرەت، ئەو هاوژیانەت، پێش ئەوەی ئەمانەتی دایك و باوکی بێ لە لات. ئەمانەتی خوایە لە لای تۆ!! دەی توخوا کەسێ یەك زەڕە ئیمان لە دڵیابێ چۆن جورئەتی ئەوە دەکات کە ســوکایەتی بــە ئامانەتی خوا بکات. کە بە کەلیمەی خوا لێی حەڵاڵ بوە و بۆتە هاوسەری؟!

ڕەحمەتی خوا لە مەلای گەورەی کۆیە بێ کە فەرموویەتی:

(ژن زینەتی دونیایە.... ئەمانەتی خودایە.... حەبیبی موصطەفایە.... قەڵاتن لە بۆ مێردان)

بەڕێزان: ئەگەر کەســێك خۆزگــەی ئەوە بخوازێ کە بڵێ: خۆزگە کۆتا قســەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لە سەرەمەرگا کردوویەتی و کۆتا ڕاســپاردە (وەصیەت) کە بــۆ ئوممەتەکەی کردوویەتی دەمزانی چییە. چونکە ئەوە لە هەموو شتێ بە لایەوە گرنگتر بوە. لە وەڵامدا

ده‌ڵێین: ده گوێ بگره بۆ هاوه‌ڵی هه‌میشـه‌یی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) که ئه‌نه‌ســی کوڕی مالیکه و ماوه‌ی (ده) ساڵ له خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ری خوادا بوه و هه‌ر له ماڵی پێغه‌مبه‌ریش ژیاوه. وه له دوا ســاته‌کانی ژیانی پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) له لای بووه ده‌فه‌رموێ: (كانَتْ وَصِيَّة رَسُـولِ اللهِ (ﷺ) حينَ حَضَرَهُ المَـوْتُ: الصّلاة، الصّلاة وَما مَلَكَتْ أَيْمانَكُمْ، حَتّى جَعَلَ يغرغر بِها في صَدْرِهِ، وَلايَفيضُ بِها لِسانُهُ) رَواهُ أَحمد (١١٧/٣) وإبْنُ ماجَة (٢٦٩٧)

وه له فه‌رمووده‌ی (مُتَّفَقٌ عَلَيْه) بُخاري (٥١٨٦) وَمُسْلِم (١٤٦٨)دا هاتوه که کۆتا وشــه و ڕاســپارده‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ئه‌وه بوو: (إِسْتَوْصُوا بالنِّساءِ خَيْراً)..

به‌ڵێ ئیمانداران: له ئیسلامدا ژن وا ته‌ماشا کراوه که خۆی خاوه‌نی هـه‌وڵ و هیمه‌تــه، نه‌ك پێی به‌خشـرابێ، یه‌ك ســوره‌تی گه‌وره له قورئاندا به ناوی: (النِّســاء) هاتوه، به‌ڵام سوره‌تێك به‌ناوی (الرِّجال) هوه نییه!. وه یه‌ك سوره‌تی قورئان به ناوی ته‌نها یه‌ك ئافره‌ته‌وه‌یه که ئه‌ویش (مَرْيَمَ). هه‌روه‌ها له بواری یه‌که‌میدا، ئافره‌تان له زۆر شتدا پێشــی پیاوانیان داوه‌ته‌وه. ئه‌وه‌تا: یه‌که‌م کــه‌س حه‌ره‌می مه‌ککه‌ی ئــاوه‌دان کردوه‌وه، ئافره‌ت بوو. هاجــه‌ره خاتوون. یه‌که‌م که‌س که له ئاوی زه‌مزه‌می خواردوه. ئافره‌ت بوو (هاجه‌ره خاتوون) یه‌که‌م که‌س که سه‌عی نێوان صه‌فا و مه‌روه‌ی کرد هه‌ر ئافره‌ت بوو (هاجه‌ره). که به ملیۆنه‌ها پیاو ساڵانه به شوێن پێی ئه‌و ئافره‌ته‌دا ده‌ڕۆن و یادی ده‌که‌ن!!. هه‌روه‌ها یه‌که‌م که‌س که ڕووبه‌ڕووی گه‌وره‌ترین دیکتاتۆری دونیا بۆوه که فیرعه‌ونه، له ناو ماڵه‌که‌ی خۆیدا له به‌رچاوی هه‌موو

بەرپرســـان و خزمەتکاران، ژنێك بوو کە (ئاسیا) بوو. لە بەسەرهاتی هەڵتەکاندنی حکومەتی دیکتاتۆری فیرعەون لەگەڵ موســـا و هارون ناوی (إمْرَأة فرعَون) هاتوە. وە لەو پێناوەدا گیانی بەخشیوە!..

بەڵێ ژنان لە زۆربەی بوارەکاندا یەکەم بوون و پێشـــی پیاوانیان داوەتەوە، بۆ نمونە:

یەکەم کەس کە ئیمانی بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی محمد (ﷺ) هێنـــا، ژنێـــك بوو. خاتوو خەدیجە الله أکبر لـــەو پلە و پایە گەورە. کە شەرەفی بە ئەندامبوونی ژمارەیەك لە ئوممەتی محمد (ﷺ) بۆ ئافرەتێکە و بۆ پیاوێك نەبوە.

پاشـــان، یەکەم کـــەس کە لە پێناوی ئیســـلامدا شـــەهید بوو. وە بـــە خوێنـــی خۆی داری ئیســـلامی ئاودا. ژنێك بـــوو. بەناوی خاتوو (سومەییە).

هەروەهـــا یەکـــەم کەس کـــە خوای پـــەروەردگار ڕاســـتەوخۆ لە قورئانەکەیدا باســـی ئەوە بکات کە گوێی لە قسەی گرتوە ژنێك بوو. بە نـــاوی (خەولەی کچی ثەعلەبە). کە دەفەرموێ: ﴿قَدْ سَمِعَ ٱللَّهُ قَوْلَ ٱلَّتِي تُجَٰدِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِيٓ إِلَى ٱللَّهِ وَٱللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَآ﴾ المجادلە: ١

١. سُـــبْحانَ اللّه دووجار باســـی گوێگرتنی خوا بـــۆ ئەو ئافرەتە دووبـــارە دەکاتەوە. هەروەهـــا لەگەڵ گەورەی هەمـــوو پێغەمبەران. خاتەمـــی ئەنبیـــا و مورســـەلین (محمەـــدی أمیـــن) هاوشـــانی دەکات (تُجَادِلُـــكَ) یـــان (تَحَاوُرَكُمـا) تـــۆ ئەی محمد (ﷺ) لەگـــەڵ ئەو ژنە!! ئایا چ پلەوپایەیەك لەمە گەورەترە کە کەســـێك خوا خۆی گوێی بۆ

بگرێ، چارەســەری کێشــەکەی بکات. لە قورئانەکەیدا هەتا قیامەت تۆمــاری بکاتەوە و هەموو خولەکێــك بخوێنرێتەوە. وە لەگەڵ ناوی پێغەمبەرەکەیدا هاوشــانی بکات. وە تەنانەت تەواوی ئەو جوزئەش کە بەم بەســەرهاتە دەســتی پێ کردوە. هەر بە جوزئی (قَد سَــمِعَ اللّٰه) بە ناوبانگە؟! بەڵێ ئەمە تێڕوانینی ئافرەتە بۆ ئیسلام. کە ئاوا خاوەن ڕێز و ئەمانەتی تایبەتە.

بەڕێــزان: لە قورئاندا هەرگیز ڕۆڵــی ژن فەرامۆش نەکراوە و لە هەر جێگایەك پیاو ســەرکەوتنی بە دەســت هێنابــێ بە دڵنیاییەوە ژنێك پاڵپشــتی بووە. بۆ نمونە: کە ئیبراهیم دەبێتە یەکەم بتشکێن و ئــەو ڕۆڵە گەورە دەبینــێ و دەبێتە (خَلیــلُ الرَّحْمن) و لەهەموو تاقیکردنەوەکانــدا ســەربەرزانە دەردەچــێ، بــە پشــتیوانی و لــە خۆبوردوویی هەردوو هاوسەرەکەی بوە کە (هاجەرە و سارا خاتوون) بوون کە بە ڕاســتی پاڵپشــتی بەردەوامی ئەو دوو شێرە ژنە هێز بە ئیبراهیم دەبەخشی.

یان: پێغەمبەرێکی پایەبەرزی وەکو (موسى)، کە درێژترین باس و خواســی هەیە لە قورئاندا و هەتا قیامەت باســی دیکتاتۆریەت و بە گژاچوونەوەی ستەمکاری بکرێ. نموونەی موسى و فیرعەون بەرچاوە و ســەدان دەرس و ئامۆژگاری لێ وەر دەگیرێ. لە باســی حەزرەتی موسادا چەند ئافرەتێك ڕۆڵی کاریگەریان هەیە. نەك تەنها هەریەك دانە ئافرەت، ئەوانیش: دایکی (أُمُّ مُوسـى) کە دەگاتە ڕادەیەك وشەی (وەحی) لەگەڵیا بەکار دێ: (وَأَوْحَيْنا إِلى أُمِّ مُوســى) ئەمجا باســی ڕۆڵی

خوشـــکەکەی موســـا (أُخْـتـيـهِ).. ئەمجا ژنەکەی. (إِذْ قـــالَ لأَهْلِهِ امْكُثُوا) ئەو ژنەی کە باوکی پێغەمبەری (شــوعەیب) و خوشك و کەسوکار و مەدیەنی نیشــتمانی خۆی بە جێ هێشـــت و ڕووی کردە غەریبی بۆ وڵاتی (میصر) بۆ شــوێنێکی مەترسیدار، کە پێشتر موسای هاوسەری لێی هەڵاتوە و فەرمانی کوشـــتنی بۆ دەرچوە، بۆ لای ســـتەمکارترین ســـەرکردە و دەســـەڵاتداری مێـــژوو. کە هەر وتت (فیرعـــەون) ئیتر پێویســـت بە شەرح و ماناکردن ناکات. چونکە یەکسەر تەواوی زوڵم و ستەم و کوشتن و لە ناوبردن و تەواوی خراپە و ستەمکاری دێتە بەر دیدەی مرۆڤ! کەچی ئەم خێزانەی موسا هەمووی قبوڵ دەکات و دەبێتە باشـــترین پشتیوان بۆ موســـای هاوسەری.. پێش ئەوانیش ڕۆڵـــی هەرە گـــەورە و کاریگەری ئافرەتێکی تر لە ژیانی موســـادا لە بەر چاوە، ناســـکترین و ســـامناکترین و چارەنووسسازترین قۆناغ لە ژیانی حەزرەتی موســـادا. ئەویش ئەوە بوو کە شـــەپۆلی ئاوەکە ئەو تابوتەی مەلۆتکەکەی تێدا بوو، خستیە ماڵی فیرعەونەوە. لەو کاتەدا فیرعەون خەریك بوو بی کوژێ. یەکسەر (ئاسیا)ی ژنی فیرعەون هاتە وەلام و وتی: (لاتَقْتُلُوهُ، قُرَّةُ عَيْنٍ لِي وَلَكَ).. بەڵێ سەبەبی ڕزگارکردنی گیانی موسا، ئافرەتێکە!!.

بەم شـــێوەیە دەبینین لەگەڵ باسی موسا و خەبات و هەوڵیدا، کە بە ویست و پشـــتیوانی خوا، گەورەترین ستەمکاری سەردەمی خۆی، کە بوو بە ڕەمزی دیکتاتۆرەکانی دونیا، لە ســـەر دەستی ئەو کۆتایی پـــێ هات. لەگەڵ باســـی ئەو چەند ئافرەتە ڕۆڵی گـــەورە و کاریگەر

و بەرچاویان هەیە. ئەمجا وەرە تەماشـــای ســیرەی پیغەمبەری خوا بکــە (ﷺ)، چۆن لە هەرە ســاتەوەختی بنەڕەتی و چارەنووســـاز و بنچینەیـــی و گـــەورە و گرنگەکانـــی ژیانی پێغەمبەری ئیســلامدا (ﷺ)، کە سەرەتای وەحی و قۆناغی مەککەیە. پشتیوانی و پشتگیری مادی و مەعنەوی خاتوو خەدیجەی هاوســـەری بە ئاشــکرا و ڕوونی لە بەرچاوە. هەروەها پشــتیوانی و هاوکاری ســـەرجەم خێزانەکانی، کە لە کاتێکدا سەرپشــك کران لە نێــوان هەڵبژاردنی ژیانی دونیا و خۆشــگوزەرانیدا، لەگەڵ هەڵبژاردنی هاوسەریەتی حەزرەتی محمددا (ﷺ) بەڵام بە هەژاری و نەداری وەکو هەژاران ژیان بە ســـەربردن. بە مەبەستی بە دەستهێنانی ڕەزامەندی خوا و قیامەتی سەرفرازی و بەهەشتی بەرین. سەرجەم هاوسەرە بەڕێزەکانی پێغەمبەری خوایان هەڵبژارد. کە ئەمەش پشتیوانیەکی گەورەی ماددی و مەعنەوی بوو بـــۆ پێغەمبەری خوا (ﷺ). هەروەها پشــتیوانی کچەکانی پێغەمبەر (ﷺ) لە باوکیان، یەکێ لە هۆکارەکانی سەرکەوتنی پەیامەکەی بوو. دوای تەوفیقی خوای گەورە.

بەڵـــێ ئیمانداران: لە هەر جێگایەکیشـــدا، ژن پشـــتیوانی لە پیاو نەکردبـــێ. پیاو ســـەرکەوتنی بە دەســـت نەهێناوە و نەگەیشـــتۆتە لوتکەی ســـەرکەوتن، هەر لە ژیانی پێغەمبەرانی خوادا تەماشـــا بکە. دوو پێغەمبـــەری پایەبەرزی ماندوونەناس. (نوح و لوط) لەگەڵ ئەو هەمـــوو هەوڵ و هیممەتەی کە بۆ بانگەوازی دینی خوا و گەیاندنی بـــە مرۆڤەکان بـــە کاریان هێنـــا، حەزرەتی نوح، ماوەی (٩٥٠) ســـاڵ

شـــەو و ڕۆژ. (لَيْلاً وَنَهَــاراً) خەریکی بانگەواز بـــوو!! کەچی کەمترین خەڵك ئیمانی پێ هێنان!! یەکێ لە هۆکارەکان دوای سەرسـەختی و کەللەشەقی و دڵڕەقی گەلەکانیان. ژنە بێباوەڕەکانیان بوون. کە ژنی ئەو دوو پێغەمبەرە خۆشەویسـتە (نوح و لـــوط) بە کافری مردن!!. ئەبێ ئــەو دوو پێغەمبەرە چ ئازارێکی دەروونییان تووش بووبێ کە کاتێ کە ژنەکانیان، هاودەم و هاوســەر و هاوژینی تەواوی تەمەنیان دایکــی منداڵیــان. ئیمانی پێ نەهێنێ و کافر بـــێ و دژایەتی پەیامی هاوسەرەکەی بکات؟!!

بەڵێ بەڕێزان: ئەمە تێڕوانینی ئیســلامە بۆ ژن، ژن لە سەنگەری دژایەتـــی پیاودا نییـــە. بەڵکو وەکو دوو باڵی یـــەك باڵندە وان و بە هەردووکیان بەرەو بەرزی بەرز دەبنەوە. تەنانەت لەو کاتەشـــدا کە ژن و پیـــاو دەگەنـــە قۆناغی جیابوونەوە و بە یەکەوە هەڵنەکردن و نەگونجـــان. دوای ئەوەی کە تەواوی هەوڵەکان خرانە گەڕ بۆ ئەوەی شـــیرازەی ژن و مێردایەتی هەرەس نەهێنێ. بەڵام سوودی نەبوو. ئا لەو کاتەشدا، ژن و مێرد کە بۆ دواجار لە یەکتری جیا دەبنەوە. کە پەنا بە خوا نارەحەتترین ساتی ژیانە. لەو کاتە سامناکە، خەمناکە، خەمهێنەرە، هەژێنەرەشـــدا. ژن و پیاو ناکەونە ســـەنگەری تەقە لە یەککردن و دژایەتی و شـــەڕە قســـە و بوختان بۆ یەك هەڵبەستن و یەکتـــری عەیبدارکردن، بەڵکو لەو کاتەشـــدا بە جوانترین شـــێوە و شـــێواز لە یەکتری جیا دەبنەوە (أَوْ تَسْـــرِيحٌ بِإِحْسانٍ) یان دەفەرموێ: (وَسَـــرِّحُوهُنَّ سَـــراحاً جَمِيلاً). بەڵێ لە ئیســـلامدا ژن و مێرد لە کاتی

تەڵاق و لە یەکجیابوونەوەشــدا هەر بە (إحْســان) بە (سَراحاً جَميلاً) ڕەفتار لەگەڵ یەکــدی دەکەن. لە ژیانی ئافرەتانی صەحابیدا هاتوە. کە ئافرەتیان تیا بوە. لەگەڵ مێردەکەیدا نەگونجاوە. هاتۆتە خزمەت پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) داوای ئەوەی کردوە کە لە هاوســەری جیا ببێتــەوە. پێغەمبــەری خوا (ﷺ) لێی پرســیوە باشــە هۆی چییە دەتــەوێ لە مێردەکەت جیــا ببیتەوە؟! کەم و کورتــی چییە؟! ئەم ژنە بە ئەوپــەڕی ویژدانەوە وتوویەتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە خوا فلان کەســی مێردم هەتا بڵێی دیندار و خواناسە. هەتا بڵێی ڕەوشــتبەرزە، ســەخییە، ڕاســتگۆیە، مەردە، ئازایە، بە خوا لە هیچ ڕوویەکەوە گلەییم لێی نییە. بەڵام بە دەســت خۆم نییە. ئەو دڵەی من جێگای ئەو پیاوە بەڕێزەی وەکو هاوســەر تێدا نابێتەوە و وەکو مێردێك ناتوانم خۆشــم بوێ، لەبەر ئــەوە دەمەوێ لێی جیاببمەوە بۆ ئەوەی خۆشــم و ئەویش گوناهبار نەکەم لە ئەنجامی ئەوەدا کە نەتوانــم مافی هاوســەریەتی بدەم!! ئیتر لە یەکتــر جیابوونەتەوە و یەك قســەی ســارد و ســووك و درۆ و بوختان چییە بۆ یەکتریان نەکردوە و هەڵ نەبەستوە. بەڵێ لەو کاتەشدا ژن و مێرد لە سەنگەری دژایەتی یەکتردا نین! چونکە ئیســلام فێری کردوون و لەســەر ئەو مەبدەئــە پــەروەردەی کــردوون. کە ژن و مێرد ئەگــەر بە یەکەوە بــوون ئەوە لەســەر بنەمای (هُنَّ لِباسٌ لَكُــمْ وَأَنْتُمْ لِبــاسٌ لَهُنَّ) ڕەفتار لەگەڵ یەکتر دەکەن. لەســەر بنەمای (وَعاشِرُوهُنَّ بالْمَعْرُوف) ژیان بە یەکەوە بە ســەر دەبەن. لە ســەر بنەمای (النِّســاءُ شَــقائِقُ الرِّجال)

تەماشـــای یەکتری دەکەن. ئەگەر کێشـــە و نیزاع و ناکۆکیش کەوتە نێوانیانەوە بە شـــەرعی خوا هەوڵی چارەســـەری دەدەن ئەگەر هەر چارەسەر نەبوو. بە جوانترین شێوە، لە یەکتر جیا دەبنەوە. ئا لەو کاتەدا ئەگەر گرێی هاوســـەریەتی کە ئـــەو ژن و پیاوەی بە یەکەوە کـــۆ کردبۆوە لـــەو عەقدی زەواجەدا ئەگەر ئەوەش هەڵوەشـــایەوە و کرایەوە، خۆ ئەو ژن و مێردە لە ژێر چەتری برایەتی و خوشکایەتی ئیمانـــداری جیا نابنەوە و دەبنەوە بە خوشـــك و برای دینی یەکتر و دەبێ لەم بوارەدا هەر دڵســـۆز و پشـــتیوانی یەکتر بن و هەر کات پێویســـتیان بە یەکتر هەبوو، وەکو مافی برا و خوشـــکی ئیمانی لە سەر یەکتر بە دەم یەکەوە بچن!! بەم شێوەیە لە ئیسلامدا جێگایەك بـــۆ ڕق و دژایەتـــی و ســـووکایەتی و بـــە نزم تەماشـــاکردن و ئازار پێگەیاندن، لە نێوان نێر و مێ دا نییە. جا چ دایك و کوڕ بن، خوشك و برا بن، بەڵکو ســـەرتاپا لە ســـەر ڕێز و خۆشەویستی و وەفاداری و ئەرك و ماف بەرامبەر یەکتر. تەماشـــای نێر و مێ کراوە، کە ئەمە لە غەیری ئیســـلامدا لە هیچ بیروباوەڕێکی تردا دەســـت ناکەوێ و پەی پێ نابرێ و کاری پێ ناکرێ. بەڵام هەمیشـــە نەیارانی ئیســـلام بـــە چاوێکی کۆنەپەرســـتانە دەڕواننە ئافرەتی موســـڵمان و دێن بە ناوی مافی ئافرەتەوە تەشـــهیر بە دینی ئیسلام دەکەن و باسی ئەوە دەکەن کە لە دینی ئیســـلامدا ڕێز و تەقدیری پیاوان زیاترە و هیچ مافێك نەدراوە بە ئافرەت. بەڵام خوای گەورە ئافرەتی هەڵبژاردوە بۆ پلـــەی دایکایەتی. ئەو دایکەی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

(الجَنَّةُ تَحْتَ أَقْدامِ الأُمَّهاتِ) بەهەشت لەژێر پێی دایکاندایە. هەموو ئەو پێغەمبەر و هاوەڵە بەڕێز و کەسایەتی و پاڵەوان و ناودارەکانی ئەم جیهانە، بەخێوکەر و پێگەیەنەر و تێگەیەنەریان کێ بوە؟! هەر ژنە، هەر دایکە. هەرکچی خوشکی تۆیە و کچی منە. ژن ڕۆڵێکی گەورە و کاریگەری هەیە لە ناو کۆمەڵگەدا، هیچ کات ئیسلام ڕێگری نەکردوە لــە وەی ژن بەشــدار بێت لە دنیای دەرەکی. بــەو مانایەی تەنها لە چوارچێوەی ماڵەکەی خۆیدا بێ. لە مێژووی پرشــنگداری ئیسلامدا بە سەدان ئافرەت ناویان بە فەخرەوە تۆمار کراوە و ڕۆڵی بەرچاویان هەبوە لە ســەرکردایەتیکردنی جەماوەر و میرنشین و بنەماڵە و ناو کایەی سیاســی لە ســەردەمی کۆن و نوێدا. مێژوو ناوی (ســومەییە و نوســەیبەی کچی کەعب و خەنســا و ئەســمائی کچی ئەبوبەکر و زەینەب غەزالی و بەنان و خانزاد و عادیلە خانم و حەپسەخان و .... هتــد) تۆمار کردوە کە ئەمانە و هاووێنەکانیان لە ئافرەتان پاڵەوانی شــۆڕش و بەگژاچوونەوەی ستەم و دیکتاتۆریەت بوون و چۆکیان بە زاڵمان داداوە و زەمینەســازی بواری سیاســی و کۆمەڵایەتی و گشــت ڕەهەندەکانی تری ژیاندا... بەڵێ لە ئیسلامدا کچ خەڵاتی خوایە. لە کاتی لە دایکبوونیەوە دەرگایەکی بەهەشت بۆ باوکی دەکاتەوە، کاتێ دەبێتە خێزانی پیاوێك نیوەی دینی هاوسەرەکەی تەواو دەکات. کاتێ دەبێتە دایك بەهەشت لەژێر پێی دایە.

بەڕێزان: ئێمە لە ســەرەتای باســەکەماندا باســی توندوتیژی دژی ژنانمان کرد. بەڵام ســوپاس بۆ خوا ئەو پیاوانەی کە باوکن یان بران،

یان هاوسەرن، ئەگەر مولتەزیم بن بە ئیسلامەوە و لە دینەکە باش تێگەیشتبن. نەك هەر لە سەنگەری دژایەتی و چەوساندنەوەی ژندا نین بەڵکو لە ئەوپەڕی فیداکاری و خۆبەختکردندان لە پێناوی ژنەکانیاندا و هەرگیز پشتیان تێ ناکەن، نەك وەکو بێدینەکان کە بەرگری لە ئافرەت دەکەن و ئافرەتیان دەوێ تا ئەو کاتەی کە گەنجە، کە جوانە، کە لەشی ساغە، بەڵام هەرکە چوە تەمەنەوە، یان سیمای جوان نەبوو، یان نەخۆش کەوت ئەوە بە لاوەی دەنێن و پشتی تێ دەکەن و نای ناسن و نایانەوێ.. فەرموون با چەند نموونەیەك باس بکەین لەو ڕێز و قەدر و وەفا و ئەمەکداریەی کە لە نێوان ژن و پیاوی موسڵمان و لە خواترسدا هەیە. کە هی ئەم سەردەمەن و هی زەمانی پێشوو نین:

شێخ محمد حەسسان کە وتاربێژێکی ناودار و نوسەرێکی بە توانای میصریە. دەفەرموێ: کەسێك دەناسم (١٦) ساڵە ژنەکەی دووچاری نەخۆشیەك بووە و پزیشکە تایبەتیەکەی دەڵێ: نابێ لە خەستەخانە دەرچێت. بەڵکو دەبێ شەو و ڕۆژ، ساڵ دوانزە مانگە لە ژێر چاودێری پزیشکدا بێت!! لێرەدا شێخ محمد حەسسان باسی لە وەفاداری و بە ئەمەکی هاوسەری ئەو ئافرەتە نەخۆشە بوو. کە لە ماوەی ئەو شانزە ساڵەدا ئێوارە و بەیانی سەردانی هاوسەرەکەی کردووە. واتە ڕۆژی دووجار، بە بێ ئەوەی ڕووی لێ گرژ کردبێت. یان خۆی بە لێقەوماو و گرفتار و ماڵوێران نیشانی هاوسەرەکەی دابێت. بەڵکو لەوەش سەیرتر ئەوەیە: کە مایەی سەرسامییە لە سەدەی بیستەمدا هاوسەری ئاوا وەفادار هەبێت، هاوسەرەکەی مۆڵەتی داوە ژنی تر

بهێنێت. بەڵام ئەم پیاوە لە وەڵامی ئەو داوایەی هاوسەری نەخۆشیدا هەمــوو جارێ وتوویەتی: من کە غەم و پــەژارە و گرفتاریم دەبوو. تۆ دڵخۆشــیت دەدامەوە و بە دەورمدا دەهاتی و قســەی خۆشــت بۆ دەکردم. چۆن دەبێ ئێســتا من سپڵە بم و پاداشتی تۆ نەدەمەوە. کە تۆ ئێســتا دووچار و گرفتاری ئەم تاقیکردنەوە خواییيە بوویت؟ بە خــوا هەرگیــز خەفەتی وا بە دڵی تۆدا ناکــەم و چۆن تۆ لە ماوەی ژیانی هاوســەریماندا بۆ منت ســەلماند کە هاوســەری ڕاستەقینە و دڵســۆز و ئەمەکــداری من بوویت، دەبێ منیش بۆت بســەلمێنم کە هاوسەری وەفادار و خەمخۆری تۆم و هەموو ئەو قسە و وتە و وشە شیرین و گفتوگۆ و بەڵێنانەی لە سەرەتای یەکترناسینمانەوە بە تۆم داون بە ڕاســتیم بوون و ئێســتا بە کردەوە بۆت دەســەلمێنم.. ئەوە بەرهەمی دینە و بەرهەمی ئیســلامە، دەنــا چەندەها کەس دەبینی تەنهــا یەك وشــەی هەڵە لە هاوســەرەکەی قبوڵ نــاکات و تەنها بە جوانــی و بــە لاوی دەیەوێت و لە کاتی پیری و لە کاتی نەخۆشــی و زەبوونیــدا دەبێتە دوژمنی. ئەوە لە وڵاتی موســڵماناندا. ئەگەرنا باســی ناموســڵمانان هەر مەکە، کە لە ئاهەنگێکدا زۆریان چەندەها پیــاو دەگۆڕن. لە هەفتەی حەوت ڕۆژیــدا، حەوت پیاو دەگۆڕن. یان پیاوەکانیــان لە یەك کاتدا پەیوەندیان لەگــەڵ چەند ئافرەت هەیە و وەفایشــیان بۆ هیچیان نییە. یان ژنانێکی دونیاپەرســتی دوور لە دینی خوا. کە هاوســەرەکانیان تەنها لە کاتــی دەوڵەمەندی و پلەوپایە و دەســەڵاتدا دەوێت. بەڵام کە گرۆڵەی کەوتە لێژی ئیتر نای ناســێ و

نایەوێ. هەروەکو: شـاژنی ئێران هاوسـەری محمد رەزا شـای پەهلەوی، خوێنـدەوار، خاوەن شـەهادە و یەکەم خانمی ئێـران و خاوەنی چەند ناونیشـانی بێ ناوەرۆکی گەورە و سـەرداری خانمانی ئێران و خاوەنی چەندەهـا نازناوی بریقەدار، بڕوانە بۆ وەفاداری ئەم شـاژنە گەورەیە!! کە شـای ئێران لێی قەومـا و داوای پەنابەری لە هەموو دونیا دەکرد و کـەس نەی گرتە خۆی، بە پاڕانەوەیەکی زۆر وڵاتی میصر ڕازی بوو کە پەنای بدەن. هەر بە گەیشتنی بۆ وڵاتی میصر، شاژنی بیر هاتەوە. دەبێ لە کوێ بێت، کەوتە هەواڵ زانینی، بۆی دەرکەوت بە گەیشتنی شاژن بۆ وڵاتانی ڕۆژئاوا بە بێ تەڵاق و جیابوونەوە لە شای لێقەوما و خەفەتبار شووی کردەوە و لەگەڵ پیاوێکی ئەڵمانیدا دەستی تێکەڵ کردا!!

بەڵـێ ئەمە هەمووی بەرهەمی بێدینی، دوور لە خوایی. بەڵام لە سـایەی ئیماندا، لە کوردەواری خۆمانـدا. پیاوێکی (باڵخە)یی، حاکم بانگی کرد تا لە سـەر کێشـەیەك بە ناچاری بۆ دەفعی فیتنەیەکی گەورە و ڕازیبوونی لایەنی ناکۆك، سـوێند بە تەڵاق بخوات، کە لەو کاتەدا، ئەو پیاوە (١٥) ساڵ زیاتر یا کەمتر دەبوو کە ژنەکەی مردبوو، لـە وەڵامی حاکـم دا وتی: بەخوا تەڵاق ناخـۆم. چونکە فلانی (....) خێزانم لێم عاجز دەبێت!!.

ئیماندارانی بەڕێز: با بە یەکەوە بچینە خزمەت خێزانێکی کورد. خێزانێکی بەختەوەر. کە لە سایەی ئیسلامەتی و خواناسی و ڕەوشتی بـەرزدا، نەیان دەزانی توندوتیژی خێزانی هەرچۆنە و بوونی چییە. بەڵکـو ژیانیان یەك پارچە خۆشەویسـتی و تەبایـی بوو. ئەوانیش

(حاجــی تۆفیــق و خێزانەکەی بوون. کە خەڵکــی گوندی (میراوا)ی شارباژێڕی ســەخت بوون، حاجی لەگەڵ حاجی ژندا ژیانێکی خۆش و بێ کێشــەیان بە ســەر دەبرد. بەردەوام لەگەڵ یەکدی ڕووخۆش و قسەخۆش و دڵنەرم و بەوەفا و بەئەمەك بوون. زۆر مەدحی یەکتریان دەکرد و هەرگیز ئامادە نەبوون بە سووکی باسی یەکدی بکەن. هەرگیز ڕێگەیان نەدەدا کەس بە ئەندازەی ســەنگی باڵە مێشــولەیەك باسی ئەوی تریان بە خراپە بکات و قەبووڵیان نەدەکرد. لە تەواوی ژیانی هاوســەریاندا کەس ئاگاداری کێشەی ئەم دوو هاوسەرە نەبوە. کەس ســوڵحی نەکردوون بە ئامادەبوونی کەسی ســێیەم ئەگەر منداڵیش بووبێت قســەی زبر و ناخۆشــیان لێ نەبیســتراوە. زۆر زۆر ڕێزیان لە یەکتر دەگرت. زۆر کەس ئاواتیان بەوان دەخواســت. کوێخا تۆفیق تەنهــا کوێخای گوندی میراوا بوو. بەڵام بە بۆچوونی هاوســەرەکەی شایســتەی ســەرۆکایەتی وڵاتێك بوو. هەرکات کوێخا تۆفیق تارمایی دەرکەوتایە، حاجی ژن بەرزەپێ لەبەری هەڵدەســتا. دەســتی لەسەر ســنگی دادەنا و بەخێرهاتنەوەی دەکرد. بەڕووی خۆشــەوە قســەی لەگەڵ دەکرد و وەکو چۆن پێشــوازی لە پاشــای وڵات دەکرێت، ئاوا پێشــوازی لــێ دەکرد. ســاڵی (٢٠٠٦) کوێخا بە ڕەحمەتــی خوا چوو. دوای ژیانێکی بەختەوەر و شــاهانە لەگەڵ هاوسەری خۆشەویست و بە وەفای. با بزانین هاوســەری وەفاداری کوێخا هەڵوێســتی چی بوو لە پرســەکەی کوێخادا، هەر لە پرســەکەدا وەفاداری خۆی بۆ نواند. لە بەرچاوی خەڵکی کوێخا ژن هەردوو دەســتی بەرزکردەوە و وتی:

(یاخــوا کوێخــا خوا لێت خۆش بێت و لەم شــەویش زیاتر بە تەنها نەبیت).. واتە منیش بمرم و بێم بۆ لات! کوێخا تۆفیق ئەمڕۆ مرد. ئەم شــەویش بــە تەنها لە گۆڕدا مایەوە. بــۆ بەیانی نزاکەی کوێخا ژن گیــرا بوو. ئەویش مرد و چوو بۆ جیهانی ئەودیو پەردە. بۆ لای هاوســەری خۆشەویســتی و بە ئاواتی خۆی گەیشــت. یەکسەر نزای وەفاداری گیرا بوو. هەر بۆ سبەینێ حاجی ژن بە بێ نەخۆشی گیانی سپارد و ڕۆیشت بۆ لای حاجی هاوسەری.. سُبْحانَ اللهِ العَظيم!!..

بەڵــێ ئەمــە ژن و مێردی موســڵمان و خواناس، کە لــە ژیانیاندا توندوتیژی دژ بەژن یان دژایەتی ژن دژ بە پیاویان هەر نەزانی چییە.

داواکارم لــە خوای گەورە لە دینەکەی زیاتر شــارەزا و ئاشــنامان بکات و دونیا و دوارۆژمان پڕ خێروبەرەکەت بکات. (رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ). اللّهُمَّ آمين..

## سەرچاوەکان:


١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.

٢. السيرَة النَبَوِيَّة. د.علي محمد محمد الصَلابي ج٢ ص٦٨٨.

٣. ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا، م.عەلی باپیر، ل١٥٠.

٤. گۆڤاری ڕێگای هزر. ژمارە: ٧ ل١١٨.

٥. پایزە برا، مەلا أحمدی شەریعە، ل٤٤، ل٤٨، ل٤٩.

وتاری چوارەم بۆ مانگی ذي الحجة

# ڕۆژی جیهانی ڕووبەڕووبونەوەی توندوتیژی دژی ژنان
## بەشی دووەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِه وَصَحْبِه أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: لە وتاری ڕابردوودا باسی توندووتیژیمان کرد دژی ژنان. کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زۆرترین قسە و باسی لە سەر دەکرێ و تەنانەت ڕۆژی (١١/٢٥)ی هەموو ساڵێك وەکو ڕۆژی بە گژاچوونەوەی توندووتیژی دژی ژنان دیاری کراوە و لەو ڕۆژەدا دەیان کۆڕ و سیمینار و مێزگرد دەگیرێ و قسە و بابەت و پێشنیار و ڕەخنەی تێدا ئاراستە دەکرێ. کە ئەمە خۆی لە خۆیدا شتێکی باشە و دیفاع لە ستەملێکراو واجبە ئەگەر هەر کەس بێ، خۆ ئەگەر ئەو ستەملێکراوە ئافرەت بێ کە یان دایکە یان خوشکە یان کچە یان هاوسەری پیاوە. ئەوە ستەمەکە و توندووتیژیەکە قێزەونترە و ناشرینترە و لابردنی و ڕێگەلێگرتنی واجبتر و پێویستترە، ئێمەی موسڵمان هاودەست و هاودڵ و هاوخەباتین لەگەڵ هەر کەسێکدا کە دژی توندووتیژی و ستەم و چەوساندنەوەی هەر مرۆڤێك خەبات دەکا و کاردەکا و کارنامە و کاری هەیە. وە بە بەشێکی گەورە لە دینەکەمانی دەزانین، بەڵام جێگای داخە هەندێ جار و لە لایەن هەندێ کەسی ناحاڵی یان دژ بە ئیسلامەوە، ئەم بابەتی توندووتیژی**

دژی ژنانە، ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ دەدرێتە پاڵ ئاینی پاك و بێگەرد و سەرتاپا پڕ دادگەری ئیسلامەوە. کە لە وتاری ڕابردوودا باسمان کرد ئیسلام چۆن تەماشای ئافرەت دەکات و دید و تێڕوانینی بۆی چۆنە.. بە پشتیوانی خوای گەورە (إِنْشَاءَ اللّٰه) لەم وتارەشدا تیشکێکی تر دەخەینە سەر ئەو بابەتە گەورە و گرنگە.

بەڕێزان: کە باسی توندووتیژی دژی ژنان دەکرێ، توندووتیژی و ستەم لەگەڵ ژن دەگرێتەوە وەکو: دایك، وەکو کچ، وەکو خوشك. بەڵام ئەوەی زیاتر باسی لێ دەکرێ و ئاگر و مەترسیەکەی کەسانێکی تریش دەگرێتەوە، توندووتیژی نێوان پیاوە لەگەڵ ژنەکەی. کە بێگومان توندووتیژی و سووکایەتی و بێ حورمەتی بەرهەمی:

١. تێنەگەیشتنە لە تێڕوانینی ئیسلام بۆ ژن و هاوسەر و پەیامی هاوژینی و هاوسەریەتی.

٢. دروستبوونی ناکۆکی خێزانییە، کە خوای کاربەجێ چارەسەری بۆ داناوە. با بچینە خزمەت قورئان کە دەفەرموێ: ﴿وَٱلَّٰتِي تَخَافُونَ نُشُوزَهُنَّ فَعِظُوهُنَّ وَٱهْجُرُوهُنَّ فِي ٱلْمَضَاجِعِ وَٱضْرِبُوهُنَّ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا۟ عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾﴾ النساء: ٣٤

واتە: ئەو ئافرەتانەی کە ئێوە دەترسن سەرکەشی و سەرپێچی بکەن، سەرەتا ئامۆژگاریان بکەن، ئەگەر سوودی نەبوو. لە ناوجێدا پشتیان تێ بکەن. ئەگەر ئەوەش سوودی نەبوو لێیان بدەن (بەمەرجێك لێدانەکە لە دەم و چاو نەبێت و ئاسەوار بە جێ نەهێڵێت). ئەگەر بەم هۆیانە لە لادان و یاخیبوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ستەمیان لێ

مەکــەن و ڕێگەی تر مەگرنە بەر بۆ ئازاردانیان، بێگومان خوا بەرز و بڵند و گەورەیە، ئەگەر ستەمیان لێ بکەن تۆڵەتان لێ دەستێنێت..

ئیمانــداران: ئەمــە مانای ئایەتەکە بوو بە کورتــی و بە کوردی. ئێستا بە ویستی خوا، هەندێ ڕوونکردنەوەی زیاتری لە بارەوە باس دەکەین. ســەرەتا وشــەی (نُشـوز) لە (نَشَــزَ) وە هاتوە. کە بە مانای: (المُرْتَفِــعُ مِنَ الأَرْضِ) دێت. (راغب الأَصْفَهانی) دەفەرموێ لە (مُفْرَدات أَلْفاظ القُرْآن ص٨٠٦)دا: یاخیبوونی ژن بریتییە لەم سێ شتە، (نەك لەســەر چایەکی ســارد و دیارنەبوونی گۆرەویەکانــی پیاو وا بزانێ ژنەکەی یاخی بوە و ناشیزەیە!!). ئەو سێ شتەش ئەمانەن:

١. . بَعْضُها لِزَوْجِها. ڕقی لە هاوســەرەکەی بێ و دوای ئەوەی بە ئەوپــەڕی ڕەزامەندی خۆی شــوەی پێ کــردوە، کەچی بە بێ بوونی هیچ هۆیەکی دیار و بەرچاو و قبوڵ، ڕقی لە مێردەکەی بێ.

٢.وَرَفْــعُ نَفْسِــها عَــنْ طاعَتِهِ.. خــۆی بەزل بگرێ لــە بەرامبەر مێردەکەیدا.

٣. وَعَيْنِهــا عَنْــهُ إلى غَيْرِهِ.. دڵی بە پیاوێکــی ترەوە بێ و چاوی لەســەر و لــەدوای بــێ!.. وە ئەو ئافرەتە ئەمەشــی بە کــردەوە لێ ببینــرێ، نەك بە گومــان. وە چەندین جار دووبــارە ببێتەوە. نەك تەنهــا یەك جار کتووپڕی ڕووی دابێ و خێــرا تەوبەی کردبێ.. جا لەم حاڵەتەدا کە خەریکە کۆشــکی خێزان خەریکە دەلەرزێ و بەرەو قڵشــبردن و ڕووخــان دەچێ و ژیانی هاوســەری خەریکە دەکەوێتە مەترســییەوە، پیاوەکە (مێردی ژنەکە) پێویســتە لە سەری ئەم سێ

ڕێگایـــە بگرێتەبـــەر، بەڵام یەك لـــە دوای یەك. بـــە (تەرتیب) نەك پێش یەکەم دووەم یان سێیەم بکات. هەروەکو لە: (الفِقْهُ الإسْلامي وَأَدِلَّتُهُ، د.وَهْبَة الزُّحَيلي ج٩ ص٦٨٥٦ دا. وە تەفسـیری قورطوبي ج٣ ص١٤٣٣. وَمِفْتاحُ الغَيْب، فَخْرَالدين الرَّازي ج١٠ ص٩٠).دا دەفەرمون: لەم ئایەتەدا (واللاّتي تَخافُونَ نُشُـوزَهُنَّ....). هەرچەندە (واو)ی عەطفە. بـــەڵام تەرتیب واجبە. واتـــە: نابێ یەکەمجار پەنا بـــۆ لێدان ببات، یان یەکســـەر جێگای لـــێ جیابکاتەوە. بە بێ ئـــەوەی قۆناغی وەعز و ئامـــۆژگاری پیـــادە کردبێ و لە ئاکام و بەرهەمـــی دڵنیابووبێ کە بێبەرهەمە.. ئەم سێ ڕێگایەش:

١. فَعِظُوهُنَّ : راغب لە - مُفردات ص٨٧٦ دا. دەفەرموێ: الوَعْظ: (هُـوَ التَّذكيـرُ بالخَيْـرِ فِما يَرِقُ لَـهُ القَلْبُ). ئەمە پێناسـەی وەعز و ئامۆژگاریـــە. بە کوردی خۆمان، ئـــەم پیاوە کە زانی ژنەکەی لارەمل و هەڵچـــوە و بەرەو هەڵدێر دەڕوات، دەبێ لەگەڵ ژنەکەی دابنیشـــێ و لە کەشـــێکی گونجاو و ئارامدا کە ژنەکەش توانای قســـەوەرگرتنی هەبێ لەگەڵ ژنەکەی دابنیشـــێ و بە زمانێکی شیرین و بەکارهێنانی وشەی ناسك باسی خۆشەویستی خۆی بۆ هاوسەری باس بکات و ئەو کاتانەی بیربخاتەوە کە چۆن بە خۆشەویســـتی بە یەك گەیشـــتن و چۆن هەردووکیان بەم زەواجە چەند شـــادمان بوون. وە باسی ئەوەی بـــۆ بـــکات کە چەندیـــن ژن و پیاو هەن بێ هاوســـەرن. ئاواتی ئەوە دەخـــوازن کە خانـــە و لایەنەیەکیان هەبێ، هاوژیـــن و هاودەمێکیان هەبێ، ســـوپاس بۆ خوا خوا بە من و تۆی بەخشـــیوە. وەرە ژنەکە،

هاوســەری بەرێزم، وەرە با پارێزگاری لێ بکەین. لە ســەر شــتێکی بچکۆلە ژیان لە خۆمان تێك نەدەین.. پێی بڵێ: وەرە تۆ قسە بکە و من ئامادەم گوێت بۆ بگرم. بزانم تۆی چاك و باش و دڵسۆزی من بۆ وات لێهاتوە. ڕەنگە خەتای من بێ و نەم زانیبێ، وەرە با بە یەکەوە گفتوگۆ بکەین. چونکە دڵنیام هیچ کێشــەیەك نییە بە گفتوگۆ و لە یەکتێگەیشتن چارەسەری نەبێ!!..

کەواتە: یەکەم جار پیاو قســە لەگــەڵ عەقڵی ژنەکەی دەکات، بە ئاگای دێنێتەوە، بەڵام بە زمانێك کە وەکو وترا: (یرقُّ لَهُ القَلْبُ) دڵ نەرم بکات، بە تەنها ئەم قسانەی لەگەڵ بکات، لە بەرچاوی کەسوکار و منداڵەکانی و خەڵکی ئامۆژگاری نەکات، لە ناخی دڵەوە بە ئەوپەڕی دڵسۆزی و پاکی و خۆشەویستی بۆ ژنەکەی ئەم قسانە بکات، چونکە قســەی دڵ کار لە دڵ دەکات. ئەمجا ئەگەر ئەم پیاوە چەند جارێك لە کەش و بارودۆخێکی نەگونجاودا، ئاوا وەعز و ئامۆژگاری ژنەکەی کرد، بەڵام هیچ ســوودی نەبوو. ژنەکە هــەر ئامادە نەبوو گوێی لێ بگرێ، یان گاڵتەی بە قسەکانی دەهات، قسەکانی پێ دەبڕی و دەیگوت ئەو قســانەم ناچێ بــە گوێدا. ئەوا لەم کاتەدا پیــاو پەنا دەبات بۆ قۆناغی دووەم کە:

٢. وَٱهۡجُرُوهُنَّ فِي ٱلۡمَضَاجِعِ: دووری لــە جێــگای خەوتنیان بکەن، بەم شێوەیە: یەکەم جار پیاو سەرینەکەی لە ژنەکەی دوور دەخاتەوە، تۆزێ پشــتیەکەی خۆی دەبات بەو لاوە کە جاران جووت بوو لەگەڵ هاوســەری. بەڵام هــەر لە ژێر یەك بەتانیدا دەبــن لەگەڵ ژنەکەی.

هەنـــدێ لە زانایان دەڵێن: لەگەڵی بخەوی لەناو یەك پێخەف و یەك ســەریندا، بەڵام جیماعی لەگەڵ نەکات، بەڵام دەبێ لەم کاتەدا پیاو ئــاگاداری ئەوە بێ، کە ئەو تەرککردنی جیماعە نەگاتە چوار مانگ، ئەینــا ئەبێ بە (ئیلا) و حوکمی خۆی هەیـــە. .وَقيلَ: بَلْ يُجامِعُها. لكِنْ لايُكَلِّمُها حالَ مَضاجَعَتِهِ)..

واتـــە: هەندێکی تـــر لە زانایـــان و توێژەرەوان دەڵێـــن: جیماعی لەگەڵ دەکات، بەڵام لە کاتی جووتبووندا قســەی لەگەڵ ناکات. قسە و ســوعبەتی خۆشی جارانی لەو حاڵەتەدا لەگەڵ ناکات. بەڵام: نابێ پیـــاو ئەمە لە لای هیچ کەس باس بکات، وە تەنانەت ئەگەر منالّیان هەبوو نابـــێ منالّەکانیان بەمە بزانن. وە لە بەرچاوی منالّەکانی لە کاتی دانیشتن و نانخواردن و سەفەر و میوانیدا، هەروەکو جاران رێز لە ژنەکەی بگرێ.. ئایا حیکمەت لەمە چییە؟! مادام ژن زمانی عەقڵ و مەنتیقـــی فەرامۆش کرد، ئـــەی پیاو ئەمجا بەزمانی -جنس- بە ئــاگای بێنەوە و بە زمانـــی کردار پێی بڵێ: ژنەکەم، هاوســەرەکەم، دڵنیابـــە من تـــۆم بە تەنها کاری ســـەرجێگاوە ناوێ، مـــن تۆم وەکو هاوبەشـــی ژیانم قبووڵە، ئەوەتا دەبینـــی دەتوانم لە ناو جێگادا بم لەگەڵت و لەگەڵیشت جووت نەبم. ئا لەم کاتەدا ئومێدی ئەوە دەکرێ کــە ژن تێ بگا و بۆی دەربکەوێ، کە ئەوەتا پیاوەکەی هێندەی ئێش پێ گەیشتوە، گەیشتۆتە رادەیەك خۆشترین خۆشیەکانی خۆی واز لێ هێناوە.. جا ئەگەر ئەم رێگایەش سوودی نەبوو کە نابێ بگاتە چوار مانگ، ئەو پیاوە رێگای سێیەمی لە بەردەمە، کە بریتییە لە لێدان.

٣. وَٱضۡرِبُوهُنَّ: لێرەدا ڕووکەشــی وشــەکە باســی (لێــدان) دەکات. بەڵام پێویســتە بە وردی ســەرنج بدەین لە وشــەی (لێدان) زانایان هەندێکیان دەفەرموون: لێدان لێرەدا مەبەست پێکێشانە. بەڵام چۆن پێداکێشــانێك؟! لە تەفســیری قورطوبیــدا ج٥ ص١٧٢ دا هاتوە کە: (عطــاء) دەفەرموێ: لە (إِبْنُ عَبّاس)م پرســی لە بــارەی لێدانی پیاو لە ژنەکەی کە بە چی لێی بدات؟! فەرمووی: (السِّــواك ونَحْوَهُ). بە ســیواك و هاوشــێوەکانی وەکو قەڵەمێك!! نەك بە گۆچان و تێلا و شــورکی بۆ لە ئاو بکات!!! لە تەفســیری ڕەوانی مامۆستا مەحمودی گەلاڵەییــدا لە بەرگی ســێ جزمی پێنج لاپــەڕەی (٣٧)دا دەفەرموێ: لێدان مەبەســت لێدانی بە ئەســپاییە وەکو ئەوە: سووك سووك بە دەســت لە سەرشــانی بدا. یا بە ســیواکێ لە ژنەکەی بدات. کە ئەم لێدانــە بــۆ دارکاری و ئێشــپێگەیاندن نییە، وە بۆ داخیدڵپێرشــتن نییــە. بەڵکو بــۆ ئاگادارکردنەوەیــە بەڵێ بەم تــۆزە لێدانە، کە وا دابنێین (ضَرْب) بەمانــای لێدانە. پیاوەکە لەم ڕێگەیەوە بە ژنەکەی دەڵێ: ژنەکە ئەوە خەریکە دوو بناغەی ژیانی هاوســەریمان کە خوا لــە ئایەتی: (وَجَعَلْنا بَيْنَكُــمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً) دیاری کــردوە، خەریکە ئەو مەوەدە و ڕەحمەتەی نێوانمان تۆزی لێ دەنیشــێ. ســەرنجی قورئان بــدەن، دەفەرموێ: (مَوَدَّةً)، نافەرمــوێ: (مَحَبَّةً). چونکە (مَوَدَّةً) وەکو نەخشــی هەڵکۆڵدراوی ســەر بــەرد وایە. هەرگیز کوێــر نابێتەوە و ناســڕێتەوە. بەڵێ جاروبــار ئەو هەڵکەنــدراوە پڕدەبێتەوە، خۆڵ و تۆزی لێ دەنیشــێ، بەڵام پاك دەبێتەوە و وەکو جاران نووســینەکەی

دەخوێندرێتەوە. بەڵام (مَحَبَّةً) وەکو نووســـینی سەر لم وایە، هەرکە بایەك هەڵی کرد و گێژەڵووکەیەك پەیدا بوو، بە یەکجاری ئاسەواری نامێنێ و دەســـڕێتەوە. ئەمڕۆ بۆیە ژن و مێردەکان بە بچکۆلەترین گرفــت و دەمەقاڵێ دەگەنـــە حاڵەتی لێــدان و توندوتیژی و تەقەو تـــەلاق، چونکە لە ســـەر بناغـــەی حوب حوبێنە و دڵــداری بە یەك گەیشــتون. نەك خۆشەویســتیەکی (مَوَدَّةً) کە لـــە دڵی یەکتردا وەکو نەخشی سەر بەرد هەڵکۆڵدرابێ. بەم لێدانە سووکە بێ ئێشە. پیاوەکە بە زمانی حاڵ بە ژنەکەی دەڵێ: هاوسەرەکەم خەریکە خۆڵ بکەیتە سەر ناوەکەم لە دڵتا، بەڵام من بەم سیواکە ئەیتەکێنم و لای دەبەم و پاکــی دەکەمەوە، هاوژینەکەم دڵنیابە ئازارت نادەم، چونکە (رَحْمَةً) لـــە نێوانماندایە... ئەم هەنگاوە دەروون بە ئـــاگا دێنێتەوە. کەواتە: لە ئیســـلامدا لێدان بە مانای داخی دڵپێڕشـــتن نییە. چونکە ئەگەر پیاوێـــك لـــە ژنەکـــەی دا و ژنەکە بەو لێدانە مرد. ئـــەوە ئەو پیاوە بە بکوژ دەناســـرێ و وەکو (قاتڵ) بڕیاری لە ســـەر دەدرێ. هەروەها لەو لێدانەدا هەرگیزا و هەرگیز نابێ لە جێگا ناســـك و بەڕێزەکانی ژن بدرێ، وەکو: دەم و چاو، شـــەرمگا، سەری پەنجەکان، وە نابێ بە گۆچـــان و دارعەصا لێی بدات. وە دەبێ زۆر بە ئەســـپایی لێی بدات و کەرکوژی تێی نەسرەوێنێ. (تەفسیری ڕەوان ب٣ جزمی (٥) ل٣٧).

ئیماندارانی بەڕێـــز: زۆرێکیش لە زانایان دەفەرموون: (وَاضْرِبُوهُنَّ) مانای لێدان بە دار و دارکاریکردن ناگرێتەوە کە بگاتە ڕادەیەك ئازاری بـــدات. چونکـــە لێدانی ئازاردەر لە قورئاندا بـــە (جَلْد) هاتوە. خوای

گەورە دەفەرموێ: (الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا....) نەیفەرمووە: (فاضْرِبُوا)!!
وە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە باسی لێدانی ئازار پێگەیەنەری کردوە، وشەی (جَلْد)ی بە کار هێناوە. نەك وشەی (ضَرْب). هەروەکو لەو فەرموودەیەدا کە ئیمامی (بوخاری) ڕیوایەتی کردوە فەرموویەتی: (لایَجْلِدُ أحدكُمْ امْرَأَتَهُ جَلْدَ العَبْدِ ثُمَّ يُجامِعُها فی آخِرِ اليَوْمِ).. واتە: با یەکێکتان وەك کۆیلە بە قەمچی لە ژنەکەی نەدات پاشان شەو لەگەڵی جووت ببێت.. لێرەدا کە باسی دارکاری و ئێش و ئازارپێگەیاندنە وشەی (جَلد) بەکارهاتوە، نەك وشەی (ضَرْب).

بەڕێزان: یەکێکی تر لەو شتانەی کە دەی سەلمێنێ (ضَرْب) بە مانای لێدان بە دار و قەمچی نییە. ئەوەیە کە: وشەی (ضَرْب) لە قورئانی پیرۆزدا بە (١٧) شێوە هاتووە:

١. ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا ﴾ النحل: ٧٦
٢. ﴿ وَإِذَا ضَرَبْتُمْ فِي ٱلْأَرْضِ ﴾ النساء: ١٠١
٣. ﴿ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ ﴾ الكهف: ١١
٤. ﴿ أَفَنَضْرِبُ عَنكُمُ ٱلذِّكْرَ ﴾ الزخرف: ٥
٥. ﴿ كَذَٰلِكَ يَضْرِبُ ٱللَّهُ ٱلْحَقَّ ﴾ الرعد: ١٧
٦. ﴿ وَلْيَضْرِبْنَ بِخُمُرِهِنَّ ﴾ النور: ٣١
٧. ﴿ فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا ﴾ طه: ٧٧
٨. ﴿ وَضُرِبَتْ عَلَيْهِمُ ٱلذِّلَّةُ ﴾ البقرة: ٦١
٩. ﴿ فَٱضْرِبُوا۟ فَوْقَ ٱلْأَعْنَاقِ ﴾ الانفال: ١٢
١٠. ﴿ فَٱضْرِب بِّهِۦ وَلَا ﴾ ص: ٤٤

١١. ﴿ فَضَرْبَ ٱلرِّقَابِ ﴾ محمد: ٤
١٢. ﴿ فَضُرِبَ بَيْنَهُم بِسُورٍ ﴾ الحديد: ١٣
١٣. ﴿ وَلَا يَضْرِبْنَ بِأَرْجُلِهِنَّ ﴾ النور: ٣١
١٤. ﴿ يَضْرِبُونَ وُجُوهَهُمْ ﴾ محمد: ٢٧
١٥. ﴿ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْحَجَرَ ﴾ البقرة: ٦٠
١٦. ﴿ ضَرْبًا بِٱلْيَمِينِ ﴾ الصافات: ٩٣
١٧. ﴿ وَٱضْرِبُوهُنَّ ﴾ النساء: ٣٤

بەڕێزان: لەم ئایەتە قورئانیەوە لەوە تێ دەگەین کە (ضَرْب) ئەگەر لە هەندێ جێگادا مانای لێدان بگەیەنێ، بەڵام لە چەندین جێگاشـــدا مانای: (بەجێهێشــتن و جیابوونـــەوە و دوورەپەرێزی) دەگەیەنێ. کە لێـــرەدا دەتوانین بڵێین: لـــە جیاتی ئەوەی لە ژن بدرێ و ژن بتۆرێ، چـــی تێدایە ئەگەر لەو کاتەدا پیاوماڵەوە بە جێ بهێڵێ و ماوەیەکی کورت دوور بکەوێتەوە. جا ئەگەر ئافرەت هیچ ســـۆز و خۆشەویستی بـــۆ مێردەکەی مابێت، ئەوا ئاشـــتبوونەوە ڕوو دەدات. هەروەکو کاتێ خێزانەکانـــی پێغەمبـــەری خوا (ﷺ) هەر ســـوور بوون لە ســـەر بە دەستهێنانی ژیانی خۆشگوزەرانی، لێرەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوای ئامۆژگاریکردن و پشـــتتێکردنیان، ماڵی خێزانەکانی بە جێ هێشت و ماوەیەك ماڵی بە جێ هێشـــت. تا ســـەرەنجام خێزانە بەڕێزەکانی بە خۆیانـــدا چوونـــەوە و تەحەمولی دووری پێغەمبـــەری خوایان (ﷺ) نەکرد و بە خۆیاندا چوونەوە و لە کاتی سەرپشککردنیاندا، ڕەزامەندی خوا و بەهەشـــت و پێغەمبەری خۆشەویســـتیان هەڵبژارد و کێشەکە

چارەسەر بوو.. بەڵێ بەم ڕۆیشتنی پیاوە بۆ دەرەوەی ماڵ بۆ ماوەیەك و وەكو جاران نەگەڕانەوەی بۆ ماڵەوە و لە كاتی خۆیدا دانەنیشتن لە سەر سفرە و خوان. لە لایەك هەست و سۆزی ژن و عەقڵی بە ئاگا دێنێتەوە و لە لایەكی تریشەوە بە زمانی حاڵ پێی دەڵێ: ئەی هاوسەری ژیانم، ئەم ماڵە ماڵی خۆتە و من تۆ دەر ناكەم و حەز ناكەم بتۆرێی. ئەم ماڵە هەروەكو هی منە، هی تۆشە. دەی وەرە با هەردووكمان هەوڵی پاراستنی بدەین و نەهێڵین بڕووخێ!.. هەروەكو لە بەسەرهاتی نێوان ئیمامی عەلی و خاتوو فاطمەی هاوسەریشیدا دەردەكەوێ. كاتێ كێشە و ناكۆكی كەوتە نێوان ئیمامی عەلی و فاطمەوە (كە بەڵگەیە لە سەر ئەوەی ئەگەر ژن و مێرد ناكۆكیەك كەوتە نێوانیانەوە مانای خراپی هەردووكیان یان یەكیان نییە. ئایا كێ لە عەلی و فاطمە باشتر و چاكتر و خواناسترە؟! كەچی ناكۆكیش ڕودەدات لە نێوانیاندا چونكە ئەوانیش مرۆڤن) لەم كاتەدا ئیمامی عەلی نە لە فاطمەی دا، نە قسەی پێ وت، بەڵكو ماڵی بەجێ هێشت و چوو لە كۆڵانی مزگەوت، لە سێبەرێكدا لە سەر گڵەكە خەوت. پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێ چوو بۆ ماڵی ئیمامی عەلی و زانی فاطمە و عەلی كێشەیان بوە و عەلی ماڵی بە جێ هێشتوە، ڕۆیشت بە شوێنیدا و لە كۆڵانی مزگەوت بینیەوە كەوا خەوتوە لە سەر گڵەكە و بە خۆشەویستیەوە بانگی كرد و فەرمووی: (قُمْ يا أَبا تُراب) هەستە ئەی خۆڵاوی. ئەوە چییە تۆراوی؟! ئیتر بە یەكەوە چوونەوە ماڵەوە و چارەسەری كێشەكە بوو. رواهُ البُخاري (٤٤١، ٣٧٠٣، ٣٢٨٠) وَمُسْلِمْ (٢٤٠٩)

ئیمانـــداران: بەڵگەیەکی تر لە ســەر ئــەوەی کە وشــەی (فَاضْرِبُوهُنَّ) مەبەســت لێی دارکاریکردن نییە. ژیاننامــەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) کە باشــترین شــیکردنەوەی قورئان قســە و گوفتار و ڕەفتار و کرداری پێغەمبــەری خوایە (ﷺ) . ئەی خاتوو عائیشــە فەرمــووی: (كانَ خُلُقُهُ القُــرْآن). خوای گــەورەش فەرمویەتی: (لَقَدْ كانَ لَكُمْ في رَسُــوْلِ اللهِ أُسْــوَةٌ حَسَــنَةٌ).. دەی با سەرنجی هەڵســوکەوتی پێغەمبەری خوا بدەین (ﷺ) لەم بوارەدا. عَنْ عائِشَةَ: (ماضَرَبَ رَسُولُ اللهِ (ﷺ) بِيَدِهِ إمْرَأَةً قَطٌّ) رَواهُ مُسْلِم (٧٩)

واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرگیز بە دەستی لە هیچ ئافرەتێکی نەداوە. نە لە کچی داوە، نە لە ژنی خۆی داوە. نە لە هیچ ئافرەتێکی تــری داوە. کەواتە توندوتیژیی دژی هەمــوو ئافرەتێك ڕەت کردەوە، نەك هەر خێزانێك، بەڵکو هەموو ژنێك، چونکە پیاوی وا هەیە لەگەڵ ژنەکەی باشــە بەڵام لەگەڵ کچەکانــی توندووتیژە. پیاو هەیە لەگەڵ دایکی خراپە و هەیە لە دایکی خۆی داوە!! پیاو هەبوە لە براژنی خۆی داوە! بەڵام پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە هیچ ئافرەتێکی نەداوە.

وە لــە فەرموودەیەکــی تردا ئەمــەی دووپات کردۆتــەوە. کاتێ کە (فاطمەی کچی قەیس) پرســی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) کرد کە دوو کەس هاتوونەتە خوازبێنی. ئەوانیش (أبوجەهم و معاویە)ن. ئایا شــوو بــە کامیان بکات؟! پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (أَمّا أَبُوجَهْم فَرَجُلٌ ضَرّابٌ لِلْنِساءِ) رَواهُ مُسْلِم لە ڕیوایەتی پێشەوا (النسائی)دا هاتوە کەفەرموی: (إنَّهُ صاحِبُ شَرٍّ لاخَيْرَ فيهِ). واتە: بەڵام ئەبوجەهم پیاوێکە لە ژن دەدات. ڕابردوی ژیانی دیارە کەچەند توندوتیژە لەگەڵ ژندا و بەڕاستی خاوەن

شـــەڕ و خراپەیە و خێری تێدا نی یە و شـــوی پێ مەکە.. تەماشاکەن چـــۆن پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەم ڕەوشـــتەی پێ خـــراپ بوو. وە ئەو پیاوەی بە چاك وەصف نەکرد کە توندووتیژە بەرامبەر ئافرەت.

٣. ئیمانداران: ســـەرنجی ئەم بەسەرهاتە بدەن، کە ئەگەر پیاوێك لەم حاڵەتەدا خۆی ڕاگرێ و لە ژنەکەی نەدات و قســـەی پێ نەڵێ و هەڵوێســـتەیەکی ناشایستە نەنوێنی، ئایا هیچ ڕێگایەکی تر بۆ لێدان دەمێنێتەوە؟! لە صەحیحی بوخاریدا، بە ژمارە فەرموودەی: (٥٢٥٧)دا هاتووە، کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) ژنێکی خواست، کاتێ گواستیەوە: (فَلَمّـــا دَنـــا مِنْها قالَتْ: أعُوذُ باللهِ مِنْـــكَ!!!) پێغەمبەری خوا (ﷺ) لێی نزیـــك بۆوە، لەو کاتەدا ئـــەو ئافرەتە وتی: پەنا دەگرم بەخوا لە تۆ لێم نزیك مەبەوە!!! ئەو پێغەمبەرەی کە نەك هەر موسڵمانان بەڵکو بەرد و دار خۆشەویستی خۆیان بۆ دەردەبڕی. ئاژەڵ و باڵندەکان بە زمانـــی حاڵـــی خۆیان خۆیان بە قوربان دەکرد. کەچی ئەم ژنە دوای ئەوەی بە ئەوپەڕی ڕەزامەندی خۆی شووی پێ کردوە، کەچی لە کاتی شـــەوی گواستنەوەدا، قسەیەکی ئاوا بەرامبەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەڵێ، با بزانین پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەڵوێستی بەرامبەری چۆن دەبێت؟! ئایا لێی دەدات؟ ئایا قســـەی ڕەق و ناخۆشـــی پێ دەڵێت؟! ئایا بۆڵەی بە ســـەردا دەکات؟! نەخێر، هەرگیز ئەوە لە پێغەمبەری ڕەحمەت ناوەشـــێتەوە. بەڵکو تەنها فەرمووی: (لَقَدْ عُذْتِ بِمعاذ، أَلْحِقي بِأَهْلِكِ). بە ڕاستی پەنات گرت بە کەسێك کە پەنادەرە -کە الله-یە. بڕۆرەوە بۆ لای کەسوکارت و پەیوەندی بکەوە بە بنەماڵەکەتەوە!..

بەڕێزان: ســوێند بە -الله- هەموو شــتێ لەم گەردوونەدا (یاخی و ســەرپێچیکارانی مرۆڤ و جنۆکە نەبێ) دەزانن کە (مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللّٰه) هەمووی عاشقی جوانی و جەمالی رَسُولُ اللّٰه بوە، بەلام بۆیە ئەمە ڕوو دەدات، چونکە پێغەمبەری خوا (ﷺ) پێشەنگە بۆ هەموو مرۆڤایەتی. دەبێ ئەم حاڵەتە ڕوو بدات، تا بەهانە بە دەست کەسەوە نەمێنێ کە لەم جۆرە حاڵەتە نەخوازراوە نارەحەتەشدا لە ژن بدات و توندووتیژی بەرامبەر بنوێنێ.!!

بەڵێ، ئەگەر دوای ئەم سێ قۆناغە: مەوعیزە و ئامۆژگاری کاریگەر و جوان و ناخ هەژێن و پرسۆز و ئەوین، دوورکەوتنەوە لە سەرجێیی و لێدانێکی ســووکی بێ ئــازاری بە ئاگاهێنەرەوە (ئەگەر مەبەســت لــە (ضَرْب) لێدانیش بــێ) ئەگەر ئەمەش هیچ ســوودی نەبوو. ئەو کاتە بێ توندوتیژی و قســەی ناشــرین، کێشــەکە با لە نێوان ژن و مێردەوە بچێتە لای کەســێکی دڵســۆزی لێزان (فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ أَهْلِهِ وَحَكَماً مِنْ أَهْلِهَا) کەســێکی بنەماڵەی پیاوەکە و کەســێکی بنەماڵەی ژنەکە بە یەکەوە دابنیشــن. بەلام بە خوا هەموو کەس شایەنی ئەو نوێنەرایەتیەی نییە. بەڵکو دەبێ لە خواترس و دڵسۆز و خەمخۆر و لێــزان و خاوەن تەجروبەی ژیان و بە تەواوی مانا حەکەم و دادوەر بن و هەوڵی چاککردنەوەی نێوان ئەو ژن و مێردە بدەن.. جا ئەگەر هــەر ســوودی نەبوو. ئەوانیــش هیچیان بۆ نەکرا، تــەلاق و لەیەك جیابونەوە باشترین چارەسەرە. بەلام بە حورمەتەوە. (فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْــرِيحٌ بِإِحْسَانٍ). واتە بە تەلاقدان مەی کوژە. بە جوانترین شێوە

بـــا لەیەك جیا ببنەوە، هەروەکو یەکەمجار دەســـتی باوکی کچەکەی ماچ کرد. با لە جیابوونەوەشـــدا دەستی ماچ بکات، چونکە ئەم پیاوە هەتـــا هەتایە کـــوڕی ئەو ماڵەیە. ئـــەی ئەوە نییە خەســـوو، دایکی ژنەکەت، هەتا هەتایە دەســـتنوێژی لێت ناشکێ و پێت ناشێ و وەکو دایکت وایە. یان خەزوور هەرگیز دەســـتنوێژی لە بووکەکەی ناشکێ، ئەمـــە بۆ؟! بـــۆ ئەوەی ئەگەر جیابوونەوەش ڕووی دا، با حورمەت و ڕێز هەر بمێنێ. بەم حەرام بوونی هەتا هەتاییە. بە کوڕ دەڵێ: ئەی کوڕ ئاگادار بە خەسووت دایکتە. ئەی باوکی کوڕ ئاگاداربە بووکەکەت هەر کچتە!! ئای ئیســـلام چەند گەورەیە، ئای چۆن مرۆڤ دەپارێزێ لە هەر بێڕێزی و توندوتیژییەك.

ئیمانداران: پێویســـتە ئاماژە بە خاڵێکی گرنگ بکەین کە ئەویش ئەوەیە: زۆربەی کێشەی خێزانی کە سەرەنجام توندووتیژی خێزانیشی لـــێ دەکەوێتەوە، لەم ســـێ حاڵەتەدا ڕوو دەدات. کـــە دەبێ پیاو زۆر ئاگاداری ئەم سێ حاڵەتە بێت:

١. لە کاتی حامیلەبووندا.

٢. لە کاتی سوڕی مانگانەدا.

٣. لە کاتی شیردان بە کۆرپەدا.

چونکـــە لە کاتـــی ســـکپڕی و حامیلەبووندا، ژن بێـــزووی هەیە، تەنانـــەت ئافرەتـــی وا هەیە بێز لە مێردەکـــەی دەکاتەوە و بە بۆنی مێردەکەی دڵی تێکەڵ دێ. لە کاتی ســـووڕی مانگانەشدا ژن حاڵەتی تایبەتـــی بە ســـەردا دێ و لـــە ڕووی دەروونییەوە زۆر جار تووشـــی

دڵتەنگیەکــی بێ هۆ دێ. غەمگینیــەك ڕووی تێ دەکات، ڕووی وەکو جاران خۆش نامێنێ. لە قۆناغی شــیردان بە کۆرپەشــدا، ژن مەیلی جارانی بەو شــێوەیەی پێشــوو بۆ مێردەکەی نامێنێ و کەمێ سارد و ســڕی لە هەڵســوکەوتیدا ڕوو دەدات.. جا لەم ســێ حاڵەتەدا دەبێ پیــاو زیاتر بــە دەم خێزانەکەیــەوە بێ و زیاتــر دڵنەوایی بکات و زیاتر لێبوردە بێ، ئەگەر پیاو موسڵمانێکی ڕاستەقینە بێ و خاوەنی تێگەیشــتنێکی درووست و ڕۆشــنبیرانە بێ، دەبێ سەرنج بدا و بیر لەوە بکاتەوە، کە خوای گەورە بەو عەظەمەتەی خۆیەوە لە خالیق و ڕازیق و (مُحْيِّ وَمُمِيت) مرۆڤی بۆ عیادەت دروست کردوە. جنۆکەی بۆ عیبادەت دروســت کردوە ﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات: ٥٦، تەماشــا کەن گەورەتریــن عیبادەت نوێژە، کەچی خوای گــەورە ڕێــگای داوە کە ئافرەت لە کاتی مناڵبوون تا پاك بوونەوە لە خوێنــی پاش مناڵ.. وە لە کاتی ســووڕی مانگانەدا و هاتنی خوێنی حەیــزدا، ئافرەت نوێژی لە ســەر نییــە و نابێ نوێژ بــکات. دواتر قەزاشی ناکاتەوە و نوێژەکانی کە لەو ماوەدا نەی کردوون گێڕانەوەی لــە ســەر نییە.. جا ئایا کــە ئافرەت لەم دوو حاڵەتــەدا نوێژ ناکات لە بەر پیســی خوێنەکەیە؟! نەخێر. چونکــە ئەگەر پیاوێك میز و پیســایی لــە بەر بڕوات و کــەس لە بەر بۆن میــز و بۆگەنی خۆی لــە نزیکــی نەگرێ، خۆی پــێ خاوێن نەکرێتەوە و کەســیش نەبێ بــە بێ منەتبەســەردانکردن خاوێنی بکاتەوە، ئــەوە هەر دەبێ ئەو پیــاوە نوێژەکــەی بــکات. وە ئەگەر بەو حاڵەشــەوە نوێژێکی فەوتا

واجبــە قــەزای بکاتەوە.. بەڵام خۆ ژن، یان کــچ لە کاتی هاتنی ئەو خوێنــەدا، کەس پێی نازانێ مەگەر مێردەکەی، وە هیچ بۆنیشــی لێ نایــەت و دەتوانێ وەختــی نوێژەکان بە جوانی خــۆی پاك بکاتەوە و جلــی ژێرەوەی پاك لە بەر بکات، کەچی نوێژەکەی هەر لە ســەر لابراوە. وە لە حاڵەتی حەمل و شیرداندا، ڕۆژووی لە سەر لا براوە.. پێشینانی میللەتەکەمان، میللەتی دیندار و دڵپاکی کورد. زۆر ژیرانە قسەیان کردوە. دەبینی بە خوێنی سووڕی مانگانەیان وتوە: (خوێنی بێنوێــژی). کە لەو بڕوایەدام بۆیە وایان پێ وتوە کە کاتێ پیاو زانی ژنەکەی لە سوڕی مانگانەدایە، یان خوێنی پاش منالی هەیە، ئەوەی بە بیر بێتەوە، کە خوای پەروەردگار بە عەظەمەت و گەورەیی خۆی، گەورەترین عیبادەت کە نوێژە لە سەر ئەو ئافرەتە لای بردوە. ئەی پیاو، ئەی هاوســەری ئەو ژنە. ئیتر چۆن تۆ لە هەندێ مافی خۆت نابووری و دەتەوێ وەکو حاڵەتی ئاسایی ڕەفتارت لەگەڵ بکات!..

خوای پەروەردگار بە ئافرەتی فەرموە ئەگەر چووی بۆ مزگەوت بۆ نوێژی جەماعەت و جومعە. ئەجر و پاداشتت گەورەیە و کەس نابێ مەنعت بکات، بەڵام ئەگەر بۆت نەکرا و حەزت لێ نەبوو کە نەچیتە مزگەوت بۆ جومعە و جەماعەت، ئەوە گوناهبار نی، بەڵکو خزمەتی کۆرپەکەت و مێرد وماڵەکەت وەکو پاداشــتی جومعە و جەماعەتی پیــاوان وایە. دەی خوا ئاوا لە حەقــی خۆی دەبورێ، ئایا تۆی مێرد لە ژەمە خواردنێك. لە چایەکی ســارد لەکــەم و کورپەك نابووری؟! تو خوا با بە وردی لە شەرع بگەین، ئەو نوێژ و ڕۆژوو نەگرتنە بە

ئاگاهێنانەوەی تۆی پیاوە، جا باوکی، برای، مێردی، پێت دەڵێ: تۆش ئاگات لە حاڵەتی نەفسـی ئەو ئافرەتە بێ.. ئەی پیاو ژن هەرچەندە خراپ بێ لەگەڵت نابێ لەو کاتانەدا کە لە سـوڕی مانگانە و خوێنی پاش منداڵبووندایـە، تەڵاقی بدەی، ئەگەر تەڵاقت دا گوناهێکی گەلێ گـەورەت کردوە. هەندێکـی کەمیش لە زانایـان فەرموویانە: لەبەر خاتری ئەو حاڵەتەی ئافرەتەکە، تەڵاقەکە ناکەوێ.

ئیمانداران: هەروەکو وتمان لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا باس و خواسی توندوتیژی دژی ژنان، زۆر قسەی لە سەر دەکرێ و هەندێ جار وای لـێ کراوە کە هانـی ئافرەتی پێ دەدرێ کە بەردەوام لە سـەنگەری دژایەتیدا بـێ لەگەڵ پیاودا، ئەوەندەی بیر لە دژایەتی و تۆڵەکردن لـە پیـاو بکاتەوە، کەمێکـی زۆر کەم بیر لەوە نەکاتـەوە کە ژن و پیـاو تەواوکەری یەکترن و ژیـان بە تەنها بە یەکیان نابێ و ئەگەر لە ژیانی هاوسـەریدا هەڵەیەکیش ڕووی دا سـتەمێکیش کرا. ئەگەر لـە جیاتـی تۆڵەکردنەوە، لێبوردن بە کار بـێ، چەند گەورەیی ئەو کەسـە و بەرزی کەسـایەتی دەردەخات. ئیمامی عەلی فەرموویەتی: ئەو کەسەی کە هەڵەی بەرامبەر دەکرێ و ستەمی لێ دەکرێ. ئەگەر تۆڵـە بکاتەوە و مافی خـۆی وەربگرێتەوە ئەوە ڕۆژێك خۆشـحاڵە، بەڵام ئەگەر لێبوردەیی بە کار هێنا و بەرامبەرەکەی عەفو کرد ئەوە تەواوی ژیانی خۆشحاڵە و پاداشتی لای خواشی مسۆگەرە..

خۆزگە ئەوەندەی کە باسـی ئـەوە دەکرێ لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێـز و پۆلیـس و دادگاوە توندووتیـژی نێوان نێرومـێ نەهێڵدرێ

(چونکــە جــاری وا هەیــە ژن توندووتیــژی دژی مێردەکەی دەکات. ژنیــش هەبوە مێردی لە ماڵ دەرکردوە، یان هەبوە کوشــتوویەتی!). لــە جیاتی ئەوە باســی گەورەیی لێبوردن و چاوپۆشــی نێوان ژن و مێــرد بکرێ، کە لە هەڵەی یەکتر ببوورن.. نموونەی پیاوان و ژنانی لێبوردە بۆ خێزانەکان باس بکەن. کە لێرەدا لە کۆتایی ئەم وتارەدا، ئەم بەســەرهاتە. کە لێبوردنی شــێرەژنێك باس دەكات بۆ جەنابتان بــاس بکــەم: مەلا خالیــد بەڕێوەبەری پەیمانگەی ئیســلامی (معهد الإســلامی) بوو لە شاری ســلێمانی. دواتر ماستەری بە دەست هێنا و بوو بە مامۆســتا لە زانکۆی سلێمانی. لە کۆتایی ژیانیدا (ساڵی ٢٠٠٨) نەخۆش کەوت. جەڵتە لێی دابوو توانای جموجۆڵ و خۆپاککردنەوەی نەمابوو، پێشــتریش ژنەکەی تەڵاق دابوو، لــە یەکتر جیاببوونەوە، بــەڵام لەو کاتەدا کــە لە ماڵــەوە کەوتبوو، کەس نەبــوو خزمەتی باشــی بکات. لەو حاڵەتانەشــدا مرۆڤ زۆر بــە زەحمەت خزمەت و ئەمدیو و ئەودیو دەکرێت و پاك دەکرێتەوە. ئەگەر کەســی دڵسۆزی نەبێــت دوور نییــە کــرم لێی بــدات و بۆگەنیش بــکات، بەڵام لەم کاتەدا هاوسەری تەڵاقدراوی وەفاداری خۆی نواند و چاکەکاری خۆی ســەلماند، هەڵوێستێکی نواند کە دەبێ کەســوکاری دۆستانی، بەڵکو ئافرەتانیش بە گشــتی شــانازی پێوە بکەن. بە وەها خزم و دۆست و تاکێکی کۆمەڵگە و ڕەگەزەکەیانەوە. بە هەرحاڵ هاوســەرە سەنگین و دڵســۆز و وەفادارە تەلاقدراوەکەی مامۆســتا مــەلا خالید دەچێتە خزمەت مامۆســتایەکی شــارەزا و متمانەپێکراو، دەڵێ: مامۆســتا بۆ

پرســیارێك و پرس و ڕایه‌ك هاتۆتــه خزمه‌تت. وتی: فه‌رمووو. وتی: هاوســه‌ره‌که‌م فلان که‌ســه جه‌نابیشت باشی ده‌ناســی، چه‌ند ساڵێکه منــی ته‌لاق داوه و لێی جیابوومه‌ته‌وه، به‌ڵام ئێســتا له‌ســه‌ر جێگه که‌وتــوه و جه‌ڵتــه لێی داوه، که‌نه‌فت و په‌ککه‌وته‌یه و خۆی بۆ پاك ناکرێته‌وه‌و ناتوانێت بچێته ســه‌ر ئاو، هه‌ڵسوکه‌وتیشــی بۆ ناکرێت، ته‌نانه‌ت ناتوانێت خواردن و خواردنه‌وه‌ش بخوات، ده‌بێ به ده‌میه‌وه بکرێت. ڕاســته ئه‌و خانه و لانه‌ی له من شــێواند، ماڵی لێ تێکدام و سه‌رگه‌ردانی کردم. خه‌م و په‌ژاره و ناسۆری زۆر به دڵدا کردم، به‌ڵام ئێستا که لێی قه‌وماوه و داماو بووه، ده‌مه‌وێت ته‌نها له به‌رخوا بچم خزمه‌تــی بکه‌م هه‌تا ده‌مرێت، یان باشــتر بڵێم تا ده‌توانم خزمه‌تی بکه‌م و به ته‌لاقدراویش دڵسۆزی خۆمی بۆ بنوێنم، ئایا شه‌رع ڕێگه‌م پێ ده‌دات؟! مامۆستا زۆر سه‌ری سوڕما، که ئه‌م خوشکه ئاوا پاداشتی خراپــه بــه چاکه ئه‌داته‌وه. بۆیه به سه‌رســامی فه‌توای بۆ ئه‌دات و پێــی ده‌ڵێ: وه‌کو تــۆ ده‌ڵێیت که هیچ توانا و ئاره‌زوو ده‌ســه‌ڵاتێکی نه‌ماوه، درووسته بچۆ خزمه‌تی بکه. ئافره‌ته‌ی دڵسۆز و به وه‌فا، به بیســتنی فه‌تواکه گــه‌ش ده‌بێته‌وه و دڵی خــۆش ده‌بێت. ده‌ڕوات بۆ خزمه‌تکردنی مامۆستا و ماوه‌ی نزیکه‌ی دوو ساڵ به‌و حاڵه خزمه‌تی ده‌کات، تا مامۆســتا به ڕه‌حمه‌ت چوو. خوا پاداشــتی ئه‌و خوشــکه بداته‌وه و نموونه‌ی زۆر بێت. سه‌رمان به‌رزه که له میلله‌تی کورددا، نموونــه‌ی ئافره‌تــی ئاوا پایه‌به‌رزمان هه‌یه. به ســه‌رهاتێکی تر، که له کتێبی (موســوعَة أخلاق الرَّسُــول) ی شێخ محمود المصری یه‌وه

وەرگیراوە ئەمەیە: ژن و پیاوێك ناكۆكی دەكەوێتە نێوانیان، چونكە ژنەكە (٥٠٠) مسـقاڵ ئاڵتوون مارەیی قەرز بوو لای هاوسـەرەكەی و ئەویـش ئینكاری لێ دەكرد، ئەم ژن و پیاوە بۆ كێشـەكەیان چوونە دادگا (مەحكەمـە)، قازی دوو حەكەمـی دانابوو بۆ تەحقیقكردن لە كێشـەكەیان. لە پیاوەكەیان پرسـی، قسـەی خۆی كرد، لە سـەرەی قسەكردنی ژنەكەدا، شاهیدەكان (حەكەمەكان) وتیان: دەبێ پەچەكەت لادەی هەتا ڕووخسـارت ببینین و بت ناسینەوە. لەمشتومڕی ئەوەدا بوون، هاوسەری ژنەكە هەڵی دایە، وتی: پەچەكەی پێ لامەدەن. پێنج سەد دینارەكەی دەدەمێ. ژنەكەش وتی: مادام ئەوەندە بەغیرەتە بۆ مـن، ئـەوا منیش گەردنم ئازاد كرد لە (٥٠٠) مسـقاڵە ئاڵتوونەكە و لەگەڵیشیدا دەڕۆمەوە بۆ ماڵەوە و لێشی جیانابمەوە!...

دەی خۆزگـە هەموو ژن و پیاوەكان بـەم ڕوحیەتەوە، بەم گیانی لێبوردنەوە مامەڵەیان لەگەڵ یەكتریدا بكردایە. ئەوسـا بزانە چۆن توندووتیـژی هیـچ كام لە ژن و پیاو بەرامبـەر ئەوی تریان بوونی نەدەما. خوای پەروەردگار عیلم و حیلمی هەمووولایەكمان زیاد بكا و زیاتر لە ئیسلام شارەزامان بكا و هەموو ئەو ژن و مێردانەی ناكۆكن، خوای گەورە ئیصلاحی حاڵیان بكات. اللّهُمَّ آمین..

## سەرچاوەکان:

١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمین.

٢. الزَّواج الإِسْلامِيّ السَّعيد. الشَّيْخ محمود المِصري. ص٧٧٢، ص٧٧٤، ص٧٧٧، ص٧٧٨.

٣. تەفسیری ڕەوان. مەلا محمودی گەلاڵەیی، ب٣ جزمی (٥) لاپەڕە: ٣٧.

٤. لێدانی ئافرەت، چارەسەرێکە بۆ ناکۆکیەکانی ژن و مێرد، د.عبدالحمید أحمد أبوسلیمان وەرگێڕانی: مامۆستا: یوسف محمد صالح، ل٤١، ل٣٨، ل٤٤.

٥. سیرَة عَلي بن أَبي طالب. د.علی محمد الصَّلابي. ص٢٦.

٦. پایزە برا، مەلا أحمدی شەریعە، ل٥٢.

وتاری پێنجەم بۆ مانگی ذي الحجة

# ڕۆژی جیهانی ڕووبەڕووبونەوەی توندوتیژی دژی ژنان
## بەشی سێیەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: بە ویست و پشتیوانی خوای تاك و تەنها و بێشەریك وتاری ئەمڕۆشمان تایبەت دەکەین بە تەواوکەری دوو وتاری ڕابردوو دەربارەی مەسەلەی (توندوتیی دژی نان).. کە لە مرۆدا زۆرترین قسەی لە بارەوە دەکرێت و زۆرجاریش بە ناحەق و نارەوا و نەزانانە و زۆر زانانە، ئیسلام و پەیامی ئاسودە بەخشی ئیسلام وەکو سەرچاوەی دروستکردنی ئەو توندوتیژیە تەماشا دەکرێ و وا وێنا دەکرێ و لە خەڵکی دەگەیەندرێ کە گوایە ئیسلام پیاوی باڵادەست کردوە بە سەر ژنەوە و پیاوی کردوە بە ئاغا و ژنی کردوە بە خزمەتکاری. پیاوی کردوە بە فەرماندەرکەر و ژنی کردوە بە جێبەجێکردنی فرمانەکانی، کە بە ڕاستی ئەمە تەواو پێچەوانەی ئاینی ئیسلامە و دژایەتی هەیە لەگەڵ پەیامی ئیسلام کە پیاو و ژنی وەکو یەك تەماشا کردوون و بۆ هەریەکەیان. هەم ئەرك، هەم مافی دیاری کردوون. بە تایبەت پێغەمبەری خوا (ﷺ) باشترین داکۆکیکاری مافەکانی ئافرەت بوە بە گوفتار و بە کرداری. ڕەحمەتی خوا لە شاعیری کوردزوبان: (د.صباح بەرزنجی) کە فەرموویەتی:**

پەیامبەر مەزهەری لوتفی خودایە .... وەکو خۆر وایە ئەنواری هودایە
هەموو عالەم فیدای نوتقێکی ئەو بێ .... کە نوتقی ئەو لە گشت نوتقێ جودایە
کەچی ئەو سەروەرە فەرمووی بە ئێمە .... لە عایشە وەرگرن نیوەی ریوایە
کەواتە فەرزە بۆ ئێمەش، کە ئافرەت .... چ خێزان و چ کچ، هەم خوشك و دایە
بکەینە تاجی سەر عینوانی دەفتەر .... هەتا گەنجی تەمەن نەڕوا بە زایە

بەڕێزان: لە پێش هاتنی ئەم نور و بەرەکەتی ئیسـلامەدا، لە لای هەمــوو ئاین و بیروباوەڕەکانی ئەو کاتە، ئافرەت یان هەر بە مرۆڤ تەماشـا نەدەکرا، یان بە مرۆڤێکی خزمەتکاری پیاو تەماشـا دەکرا، یـان بە پیس و مایەی شـەڕ و خراپە دەبینرا، بـە تایبەتی لە لای جولەکەکان کە کاتێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی کۆچی کرد بۆ مەدینە. ئەو جولەکانە وایان لە خەڵکی گەیاندبوو، کە کاتێ ئافرەت کەوتە حاڵەتی بێنوێژیەوە و زەیسـتانیەوە، ئەوە نابێ نانی دەسـتی بخـورێ و نابێ پیـاو لەگەڵی لە ژورێکدا بخـەوێ و نابێ بەرماوەی بخورێتەوە، چونکە پیسـە. بەڵام بـا بزانین پێغەمبەری ڕەحمەت و بەرەکـەت (ﷺ) ڕۆحمان قوربانی بێ. لـەو بارەیەوە چی فەرموە و هەڵوێسـتی لەگەڵ خێزانەکانیدا چۆن بووە؟! ئاشـکرایە لە حاڵەتی بێنوێژیدا، پیاو بێبەشە لە لەزەتوەرگرتن لە خێزانەکەی. پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کردەوە ڕوونی کردەوە کە پەیوەندی نێوان ژن و مێرد، کە لە سەر بنەمای بە هێزی (مَوَدَّةً وَرَحْمَةً) دامەزراوە، زۆر بە هێزتر بوە لە بواری جنس و ئارەزوو. سـەرنجی ئەم فەرموودانە بدەن، کە لە سیرەی خۆشەویسماندا هاتوون:

(– عَنْ عائِشَةَ، كُنْتُ أَشْرَبُ وَأَنا حائِضٌ، ثُمَّ أَناوِلُهُ النَبيَّ (a)، فَيَضَعُ فاهُ عَلى مَوْضِعِ فِيَّ، فَيَشْــرَبُ، وَأَتَعَرَّقُ العِرْقَ – أَي آخِذَ اللَحْمَ مِنَ العَرْقِ، أي الَّذي أُخِذَ مِنــهُ مُعَظَّمُ اللَّحمِ وَبقيت عَلْيهِ بَقِيَةٌ (وَأَنا حائِــضٌ) ثُمَّ أُناوِلُهُ النَبيَّ (a) فَيَضَعُ فاهُ عَلى مَوْ ضِعِ فِيَّ) صَحيحُ مُسْلِمْ –كِتابُ الحَيْضِ (٣٠٠)

**واتــە: دایكمــان، دایكی هەموو ئیمانداران، خاتوو عائیشــە بۆمان دەگێڕێتــەوە و دەفەرمــوێ: مــن لە ســوڕی مانگانەدا بــووم و ئاوم دەخــواردەوە. پاشــان جامە ئاوەكەم دەدایە دەســت پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە ئەویش بخواتەوە (تەماشــاكەن لە ئیســلامدا، ئافرەت نەك هــەر بەرماوەخۆری پیاو نییە. بەڵكو پیاوێك، كە ســەرومر و گەورە و ســالار و پێشــەوا و پێشــەنگی نەك هەر پیاوانی ئاســایی بەڵكو پیاوانێكە كە پێغەمبەرانی خوان، كەچی بەرماوەی ژنێك دەخواتەوە، كە خێزانەكەیەتی. كە ئەویش خاتوو عائیشەیە). جا خاتوو عائیشە دەفەرموێ: تەماشــام دەكرد وا پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەمی خســتە ســەر ئەو جێگایەی كەدەم و لێوی منی بەركەوتبوو. دەمی دەخستە شــوێن دەمی من!!، ئەمجا ئاوەكــەی دەخواردەوە. وە هەروەها ئەگەر جاروبــارێ گۆشــتمان ببوایە، من كە لەگــەڵ پێغەمبەری خوا (ﷺ) نانــم دەخــوارد. ئەو كوتە گۆشــتەی كە بە ئێســقانێكەوەیە هەڵم دەگرت و بە ددان دەمكرۆســاندەوە و پاشــان گۆشــتێكی كەمی پێوە دەما، ئەمجا لەســەر سینی یان ســفرەكە دام دەنایەوە. لەو كاتەشدا من لــە خوێنی بێنوێژیدا بووم. تەماشــام دەكــرد پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو ئێســقانەی كە من بە ددان گۆشــتەكەم لــێ كردبۆوە. لە**

دەستی منی وەردەگرت و ئەمجارەش ددانی دەخستە شوێن ددانەکانی من و دەمی دەخستە شوێن دەمی من!!! کە بەم کردەوەیەی کە ئەوەندە دڵی خاتوو عائیشەی خۆش کردوە، ئەوەتا دوای وەفاتیشی (ﷺ)، عائیشە هەر بە تامەزرۆییەوە ئەمە دەگێڕێتەوە و ئەگەر پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە تەنها حەیوانێکی بۆ خاتوو عائیشە سەربېڕیایە و پێشکەشی بکردایە، بە ئەندازەی ئەوە لەزەتی لێ نەدەکرد و لەیادەوریدا نەدەمایەوە کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) چۆن ئەو ئێسقانەی کرۆساندۆتەوە و تام کردوە کە ئەو پێشتر بە ددان گۆشتی لێ پچڕیوە. کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەم کارە جوانەی بە زمانی حاڵ و ئاماژە بە خاتوو عائیشەی فەرموە، ئەی هاوسەر و هاوژینی خۆشەویستم، لەم کاتەدا کە تۆ لە بێنوێژیدای، نەك هەر بێزت لێ ناکامەوە، بەڵکو ئەوەتا لەزەت لە شوێن دەمەکەشت دەبینم. وە ئەوەشمان بۆ دەردەکەوێ و ئەو وانەیەی لێ فێر دەبین کە خاتوو عائیشە وەکو ئافرەتێکی وریا و وشیار و بە هەست و هەست ناسك و بەڕێز، ئەمەی هێندە پێخۆش بوە، کە هەرگیز و هیچ کات لە یادی نەکردوە و بە لای ئافرەتەوە یەك حاڵەتی ئاوا ڕێزلێگرتن و خۆشەویستی ڕاستەقینە بۆ دەربڕین، زۆر زۆر بە نرخترە لە کڕینی جلوبەرگی گرانبەهاو خواردنی بەلەزەت و خۆش و سەفەرەو سەیران و گەشتوگوزار، هەرچەندە ئەمە ئەو وانەیەشمان فێر دەکات و پێمان دەڵێ: ئەی پیاو، ئەی مێرد. هەرچەندە هەژار بی، هەرچەندە نەدار و گیرفانبەتاڵ بی، دەتوانی ئەگەر لە جیاتی گۆشتی نەرمە توانای

کرپینــی ئێسقانیشــت هەبێ، بە یەك هەڵوێســتی ئــاوا دڵی ژنەکەت ڕازی بکــە و خێزان دوور بێ لە ئــاژاوە. چونکە زۆرن ئەو پیاوانەی کە ســەرمایەداری گەورەن، بە زەبری پارە توانیویانە ڕووی دەرەوەی ژنەکانیان ڕازاوە دەر بخەن بە ئاڵتونی زۆر و جلوبەرگی گرانبەها و خواردنی ڕازاوە و سەیرانپێکردنی زۆر. بەڵام ناخی ژنەکانیان خاڵییە لە خۆشەویســتی، چونکە ڕۆژێ لە ڕۆژان ئەم پیاوە هەڵوێســتەیەکی ئــاوا زێڕینی نەنواندوە، کە پێغەمبــەری خوا (ﷺ) نواندی بە وەی دەمی خســتە ســەر جێگەددانی خێزانەکەی! بەڵکــو پیاوی وا هەیە هــەر بێز لە ژنەکەی دەکاتــەوە کە بەرماوەی بخواتەوە. ئیتر ئەمە هــۆکاری ئاژاوەی خێزانە و ســەرەنجام توندوتیژی لــە ناو خێزاندا دەســت پێ دەکات. ئەمــڕۆ کە زۆربەی ئەو خێزانانــەی تەڵاقدان و شــکات و شــکاتکاری و گلەیی و گازنــدە لە یەکتری لــە ناویاندایە. ئــەو خێزانانــەن، ئەو ژن و مێردانەن، کە لــە هیچیان کەم نییە لە ڕووی مــاددی و لەزەتــی تام و چێژی دەم و گــەدەوە. بەڵام لە یەك شــتدا زۆر هەژارن، زۆر موحتاجن، ئەم موحتاجیە گەورەیە کە وای کــردوە پەلاماری یەکتر بدەن و لــە یەکتر جیاببنەوە و توندوتیژی بەرامبەر یەکتر بنوێنن. ئەویش نەبوونی یان کەمی و هەژاری بواری خۆشەویســتی نێو دڵە!! کە ئەم خۆشەویســتییەش بە پارە و پوڵ و زێڕ و زیو دروست ناکرێ. بەڵکو بە هەڵوێستەی ئاوا زێڕین درووست دەکرێ و ئەگەر هەبێ لە وشــکبوون و فەوتان دەپارێزێ.. دیمەنێکی تر لە ژیانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەژیانی هاوسەریدا:

عَنْ عائِشَةَ قالَتْ: (خَرَجْنا مَعَ رَسُولِ اللهِ (ﷺ) في بَعْضِ أَسْفارِهِ، فَجاءَ أَبُوبكر وَرَسُولَ اللهِ (ﷺ) واضِعاً رَأْسَــهُ عَلى فَخِذي قَدْ نامَ) مُتَّفَقٌ عَلَيْهِ، بُخاري (٣٣٤) وَمُسْــلِم (٣٦٧)

**واتە: عائیشــە دەفەرموێ: لە سەفەرێکدا لە خزمەت پێغەمبەری خــوادا بووم (ﷺ) لەو کاتەدا کە لامان دابوو بۆ پشــوو. ئەبوبەکری صدیق -باوکی عائیشــە- هات بۆ لامان. لــەو کاتەدا کە باوکم هات، پێغەمبەری خوا (ﷺ) ســەری پڕ بەرەکەتی خســتبوە ســەر ڕانم و خەوتبوو!.. کە لەو کاتەدا خاتوو عائیشە لە حەیزدا بوە. بە بەڵگەی ئــەوەی، کە ئیمامی مســلم، ئــەم فەرمودەیەی لە (کتــاب الحیض)دا هێناوە.. کەبەم کردارەش پێغەمبەری خوا (ﷺ) بە کردار بە عائیشەی فەرموە: ئەی هاوسەرەکەم، نەك لەم کاتی بێنوێژیەدا دوورەپەرێزیت لــێ ناکەم، بەڵکو بەو حاڵەشــتەوە لەزەت و چێژ لە خەوتنی ســەر ڕانت دەکەم!.. وە ســەرنج بدەن: عائیشە ئەبوبەکر باوکیەتی کەچی ناڵێ. عەیبە باوکم ئاوا لەگەڵ هاوسەرەکەمدا بمانبینێ، هەڵناستێ و سەری پێغەمبەری خوا (ﷺ) لە سەر ڕانی خۆی لا نابات و لە خەوی نــاکات. چونکە ئەمە عەیبە نیە، عەیبە ئەوەیە ئاژاوە و دڵئازاردانی بــاوك و دایــك بکەی بە هۆی ناکۆکی لەگەڵ هاوســەرەکەتدا. کە بە داخەوە ئەمڕۆ بوایە، زۆر ئافرەت هەیە. لە حاڵەتی ئاوادا کە باوکی بێتە ماڵەوە و ســەری مێردەکەی لە سەر ڕانی بێ، سەری مێردەکەی بەزەویەکە دەکێشێ و دەڵێ عەیبە باوکم ئاوا بمانبینێ...**

**بەڕێــزان: لە وتاری ڕابردوودا، باســی ئەوەمــان کرد کە کاتێ ژن لارەملی کرد و کەوتە ئازاردانی مێرد و بە ناحەق و ناڕەوا بەهانەی**

پــێ دەگرت و خەریك بوو لانە و خانەی هاوســەری تێك بچێ، ئەوا خوای گەورە ســێ ڕێگا و قۆناغی یەك بە دوای یەكی نیشــانی پیاو -مێردی ژنەكە- دا، كە بەو سێ ڕێگایە ژنەكەی بێنێتەوە سەر ڕێگای ڕاستی هاوسەریەتی ڕاستەقینە.. جا ئەگەر بەم ڕێگایانە. بە یەكیان. یان بە هەرســێكیان ژن هاتەوە ســەر بارودۆخی ئاسایی و ڕێكوپێك بۆوە. ئەوە خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ فَإِنْ أَطَعْنَكُمْ فَلَا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَبِيلًا إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلِيًّا كَبِيرًا ﴿٣٤﴾ ﴾ النساء: ٣٤

واتە: ئەگەر خێزانەكەتان بەم هۆیانەی كە باس كران، لە لادان و یاخیبوون وازیان هێنا، ئەوە ئیتر ســتەمیان لێ مەكەن و ڕێگەی تر مەگرنــە بەر بۆ ئازاردانیان. بێگومــان خوا بەرز و بڵند و گەورەیە، ئەگەر ستەمیان لێ بكەن تۆڵەتان لێ دەستێنێت..

بەڕێــزان: لێــرەدا پێــم خۆشــە ســەرنجێك لەســەر وشــەی ﴿ أَطَعْنَكُمْ ﴾ بــدەن. كە ڕەنگە هەندێ لە دژانی ئیســلام بڵێن: ئەمە بە مانای ملكەچی و باربەرییە. بەڵام نەخێر. لە ســنوری ئەو شــەرعەدا، كە مافی ژن و پیاوی وەك یەك پاراســتوە. ژن گوێڕایەڵی مێردەكەی دەكات. سەرنجی قورئان بدەن، لە باسی بەیعەتی ئافرەتاندا، كە پەیمان دەدەن بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەفەرموێ:

﴿ يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ الممتحنة: ١٢

واتە: ئەی پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك ئافرەتانی ئیماندار هاتن بۆ لات و پەیمانیان پێ دایت کە: هیچ جۆرە هاوەڵێك بۆ خوا بڕیار نەدەن، دزی نەکــەن، زینا نەکەن، ڕۆڵەکانی خۆیان نەکوژن. هیچ جۆرە بوختانێك نەکەن لە نێوان دەست و پێی خۆیاندا (واتە دوورەپەرێزبن لە هەموو جۆرە خیانەتێك) و فەرمانبەردارت بن لە هەموو چاکەیەکدا و یاخی نەبــن لێت. جا ئەوە تــۆ پەیمانیان لەگەڵ ببەســتە و لە خوا داوای لێخۆشــبوونیان بۆ بکە، چونکە بە ڕاستی خوا لێخۆشبوو میهرەبانە. جا تەماشای ﴿وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ﴾ بکەن. کە مانای ئەوەیە لە مەعروف و چاکە و کاری جوان و شەرعیدا نەبێ، گوێ بۆ پێغەمبەری خــواش (ﷺ) ناگیــرێ، بۆیە ئیطاعــە و گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بــە موتڵەقــی واجبە، چونکــە هەرگیز فەرمان بە شــتێك ناکات کە مەعروف و چاکە نەبێ.. وە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (إِنَّمَا الطَّاعَةُ فِي الْمَعْرُوفِ) رَوَاهُ الْبُخَارِي. بە ڕاستی گوێڕایەڵی و بە قسەکردن تەنها هەر لەو شتانەدا دەکرێ، کە جوانن و چاکن. کەواتە: ئەگەر پیاو داواکاری ناشــەرعی لــە ژنەکەی کــرد، وەکو جووتبــوون لەگەڵی لــەو کاتەدا کــە ئافرەتەکە لە خوێنــی (حەیز)دایە. یان داوای لــێ کرد لە کونی پشــتەوە (دُبُر) جووت ببێ لەگەڵی، ئەوە نابێ ژن گوێڕایەڵی داواکاری مێردەکەی بکات و بە قســەی بکات. بەڵکو دەبێ هەڵوێســت وەربگرێ و مێردەکەی لەو داواکاریە هەڵە ناشــەرعیە پەشیمان بکاتەوە. ئەگەر مێردەکەی هەر سوور بوو لە سەر داواکاریەکەی، ئەوا لە دادگا شکاتی لێ دەکات و حاکم تەمێی دەکات. یان پیاوەکە وتی: کە چوومە دەرەوە

ئـــەی ژنەکەم دەرگات لە ســـەر دادەخەم و دەبێ تـــا دەگەڕێمەوە لەم ژووورە نەچیتـــە دەرەوە و کـــەس نەبینی و کەس نەت بینێ، یان نابێ هاتووچۆی کەسوکارت بکەی. یان هاوڕێی عەرەقخۆرم دێنمەوە بۆ ماڵ و دەبێ مێزی عەرەقم بۆ برازێنیتەوە. ئەمە لەم کاتەدا نابێ ئەم ژنە بە قســـەی پیاوەکەی بکات، بەڵکو دەبێ مەردانە هەڵوێســـتی هەبێ و مێردەکەی تێ بگەیەنی کە ئەم هاوســـەری ژیانیەتی، نەك خزمەتکار و کۆیلەی بەر دەستی!!

بەڵـــێ ئیمانداران: خوای گەورە فەرمووی (فَلا تَبْغُوا عَلَيْهِنَّ سَـــبِيلاً) ئیتر ڕێگەی تـــر مەگرنەبەر ئازاریان مەدەن، بەهانەیان پێ مەگرن.. لە تەفسیری (طَبَری) ج٥ ص٦٩ دا دەفەرموێ: ئەی مێرد بەهانە بە ژن مەگرە بە وەی بڵێی: (إنَك لَسْتِ تحبيني) دڵنیام، چاك دەزانم کە تۆ منت خۆش ناوێ. (فَيَضْرِبَها عَلى ذالِكَ أَوْ يُؤْذيها) ئەمجا لە سەر ئەوە لێی بدات و جەستەی ئازار بدات. یان قسەی سارد و سوکی پێ بڵێ و دەروونی ئازار بدات.. بەڵکو ئەی مێرد ئەگەر دەزانی خۆشەویســـتیت لە ناو دڵی هاوســـەرەکەتدا نەماوە یـــان زۆر کەمی کردوە، هەوڵ بدە خۆشەویستی لە نێوانتاندا درووست بکەیتەوە. بەوەی کە: ڕێزی بگرە، ڕاوێـــژی پێ بکە، بە قسەشـــی بکە، هەدیە و دیـــاری بۆ بکڕە -تَهادُوا تحابُوا-. هەر کات هاتیەوە بۆ ماڵەوە ســـەلامی لێ بکە. جاران قســـەت ڕەق بـــوو، ئێســـتا زمانت با شـــیرین بێ، ڕووت خـــۆش بێ، دەمت بە خەندە بێ، ســـەردانی کەســـوکارتی پێ بکە، سەردانی کەسوکاری بکە، ڕێز لە دایك و باوك و برا و خوشك و بنەماڵەکەی بگرە..

لە تەفسیری (ڕەوان)دا ب ٥ جزمی (٥) ل ٣٩دا دەفەرموێ: هەندێ لە زانایان دەفەرموون: ئایەتەکە هەڵنانی تێدایە بۆ مێردەکان کە تەوبە و پەشیمانبوونەوە لە خێزانەکانیان قبوڵ بکەن، چونکە خوای پەروەردگار بەو گەورەیی و دەسەڵاتی خۆیەوە لە تاوانی گەورە خۆش دەبێت، دەی ئێوە دەبێ زیاتر ئامادەباشیتان تێدا بێ بۆ تەوبەوەرگرتن و لێبووردەیی. هەر خوایە کە هەڵە ناکات. دەی کە ژن هەڵەی کرد، بەڵام پەشیمان بۆوە و ڕەفتاری خۆی چاك کرد، ئیتر دوای ئەوە هەموو ڕۆژێ ئەو لاپەڕەیەی بۆ هەڵمەدەوە، خوای گەورە لە قورئاندا باسی گوناهی هەرە گەورەی شیرك و قەتڵ و زینا دەكات، کەچی دەفەرموێ: (إلاّ مَنْ تابَ). کە تەوبەی کرد، خوا دەفەرموێ: خراپەکانی ڕابردووی ئەو بەندە تەوبەکارەم دەگۆڕم بە چاکە. دەی تۆش ئەی مێرد، هەرکات ژنەکەت چاك بوو، بە خۆیدا چۆوە، وازی لە لارەملێیی هێنا، تۆش ڕابردوە خراپەکەشی بۆ بە چاکە حیساب بکە و وا بزانە ڕۆژێ لە ڕۆژان هەر خراپ نەبوە!.. لە کۆتایی ئایەتەکەدا دەفەرموێ: (إنَ اللهَ كانَ عَليّاً كَبيراً).

ئیبن کەثیر لە تەفسیرەکەیدا، ج٢ ص٢٥٩ دا دەفەرموێ: ئەم ئایەتە، ئەم کۆتایی ئایەتە کە دەفەرموێ: (إنَ اللهَ كانَ عَليّاً كَبيراً). لەم چەند وشەیەدا: (تَهْديدٌ لِلْرِّجالِ إذا بَغَوا عَلى النِّساءِ مِنْ غَيْرِ سَبَبٍ، فَإنَّ اللهَ العَلِيَّ الكَبير وَلِيُّهُنَّ وَهُوَ مُنْتَقِمٌ مِّنْ ظَلَمَهُنَّ وَبَغَى عَلَيْهِنَّ).

واتە: ئەم چەند وشەیە تەهدید و هەڕەشەی خوایە بۆ پیاوان، ئەو پیاوانەی کە بە بێ هیچ هۆیەك، هیچ هۆیەکی ڕەوا، ستەم و زوڵم

لە ژنان دەکەن و توندوتیژیان بەرامبەر دەکەن و ئازاری جەسـتەیی و دەروونیـان دەدەن. ئەوە بە ڕاسـتی و بە دڵنیاییەوە خوای بەرزی باڵادەست پشت و پەنایان دەبێت بۆ ئەو ژنانە و لە سەریان بە جواب دێت و خوای گەورە -سُـبْحانَهُ وتَعالی- بۆ خۆی تۆڵە دەسـتێنێ لە هەر کەسێ کە ستەم لە ئافرەتان بکات و توندوتیژیان دژ بنوێنێ...

بەڕێـزان: بـە چاوی خۆمـان بینیومانـە، ئەوانەی کـە زوڵم و سـتەمیان لە ژن کردوە، مافیان خواردوە، زەلیلیان کردوە، لە خۆشی ژیانی دونیا بێبەشیان کردوە، لە سەر هەڵەیەکی بچکۆلەی کێوێکیان داوە بە کۆڵدا!، لە ئازادی و سەربەسـتی کە خوا پێی بەخشـیوە بۆ هەڵبژاردنی هاوسەر و هاوژینی خۆی مەحرومیان کردوە، بینیومانە و بیسـتوومانە کە چۆن خوای بەرزی باڵادەست ئەو پیاوانەی زەلیل کردوە، هەر لەم دنیادا زەلیلی کردوون یان بە ژنی دوەمیان تۆڵەی لێ کردونەتەوە، یان تووشی بەڵا و موصیبەت بوون یان تووشی نەخۆشی و زەلیلی ناوجێگا بوون..

ئیمانـداران، ئـەی هەمـوو ئەو کەسـانەی کە داکۆکـی لە مافی ڕەوای ئافرەت دەکـەن، هەموو ئەو ڕێکخراوانەی هەوڵی ئەوە دەدەن کـە ڕووبەڕووی توندوتیـژی دژی ژنان ببنەوە. گـوێ بگرن بۆ ئەم فەرموودەیەی سـالار و سـەروەرمان (ﷺ)، کە وا دەزانم بەس بێ و کافی بێ بۆ بەگژاچوونـەوەی توندوتیژی دژی ژنان. کە دەفەرموێ: (مـا أَكْرَمَهُنَّ إلاّ كَريم، وَمـا أَهانَهُنَّ إلاّ لَئيم).. ئەمـە پێوانە و تەرازووی پیاوەتـی و شـەهامەت و جوامێری پیاوە لەگەڵ پیـاوی (لئيم)، کە

لەئیم یانی: مرۆڤی سوك، نامەرد، نانەجیب، سوك و چروك، بێنرخ. یەعنی هەر کەسێ ڕێزی ژنان بگرێ، جا ئەو ژنە دایکی بێ، خێزانی بێ، کچی بێ، خوشـــك و پووری بێ، دایەگەورەی بێ، ئەوە نیشـــانەی ئەوەیە بۆ خۆی پیاوێکی بەڕێزە. وە هەر کەس ســـوکایەتی بە ژنان بکات، جا ســـەرنج بدەن دەفەرموێ: (مـــا أَهانَهُنَّ). ئیهانەی ژن بکات، تەریقـــی بکاتەوە، حورمەتی نەگرێ، قســـەی ســـووکی پێ بڵێ، ئەوە ئەو کەسە لەئیم و ناکەسبەچە و بێنرخە و هیچوپوچە!، ئەی باشە ئەگەر کەسێ نەك هەر ئیهانە، بەڵکو لەگەڵ ئیهانە و قسەپێوتنەکەدا، لێشـــی بدات و لاشەی بشـــکێنێ و بریندار بکات و خوێن لە لاشەی بێنێ، ئەی ئەو کەســـەی ئافرەتێك بســـووتێنێ ڕاستەوخۆ یان ببێتە هۆکاری خۆســـووتاندنی، ئەی ئەو کەسەی کە ژنێك، کچێك دەکوژێ، دەبێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەربارەی ئەوانە چی بفەرموێ. ئەبێ چ وشەیەك بەو پیاوانە بڵێ و چەند بە سوك و بێنرخ تەماشایان بکات. کـــە پێغەمبەری خوا (ﷺ) وشـــەی (لئیم)ی بۆ هیـــچ خراپەکارێکی تـــر بەکارنەهێناوە. کـــە ئەمەش گەورەیی تاوانی ســـوکایەتی بە ژن دەردەخات.

بەڕێزان: لە ئێوەی ڕێزدار دەپرسم: ئەگەر کەسێ لەسەر ئەو جادە گشتییە، جلوبەرگ لە بەرخۆی بکاتەوە و خۆی ڕووت بکاتەوە. توخوا هەموو خەڵکی ناڵێن شـــێت بووە، ئایا کەس حیســـابی پیاوماقوڵی و مەردایەتـــی و ئازایەتـــی و جوامێری بـــۆ دەکات؟! نەخێر، دەی ئەو پیـــاوە کە لە ژنەکـــەی دەدات و جلوبەرگ بە بەریـــەوە ناهێڵێ، ڕای

دەکێشێ و ئیهانەی دەکات. هەمان حوکمی هەیە، چونکە خوای گەورە ژن و مێـــردی بە جلوبـــەرگ بۆ یەك ناوبردوە. ﴿ هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ ﴾ البقرە: ١٨٧

کەواتـــە: ئەو کەســـەی لـــە ژنەکـــەی دەدات و جلوبەرگـــی لەبەر دادەڕنێ، ئەوە شێتە!! وە هەروەها، ئەگەر کەسێك دەست بداتە پاچ و خاکەناز و خانوو ماڵەکەی خۆی بڕوخێنێ، کە شـــوێنی ئارامگرتن و حەوانەوەیەتی، ئایا خەڵکی بەو کەســـە ناڵێن ئەمە عەقڵی لە دەست داوە و شـــێت بووە؟! بەڵێ، دەی ئەو کەســـەش کـــە ژنەکەی، خانمی ماڵەکەی، دایکی منداڵەکەی، بەڕێوەبەری ماڵ و بەڕێکەری میوانەکەی، هاودەم و هاوسۆزەکەی خۆی دارکاری دەکات و جەستەی ناسکی تێك دەشـــکێنێ، هەمان حوکمی هەیە. چونکە، خـــوای گەورە دەفەرموێ: (وَمِنْ آياتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْواجاً لِتَسْكُنُوا إِلَيْها)..

چۆن خانوو و ماڵ ســـوکنایە و شـــوێنی حەوانەوە و ئارامگرتنە، ژنیش بۆ پیاو هەمان شێوەیە.

ئیمانداران: دەبێ ئەوەش بزانین کە هەروەکو چۆن دوچاری دەردی سەرکەشی و یاخیبوون دەبێ، بە هەمان شێوە پیاویش جاری وا هەیە دووچـــاری ئەو دەردە دەبـــێ، وەك خوای زانا و توانـــا فەرموویەتی: ﴿ وَإِنِ امْرَأَةٌ خَافَتْ مِن بَعْلِهَا نُشُوزًا أَوْ إِعْرَاضًا فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا أَن يُصْلِحَا بَيْنَهُمَا صُلْحًا وَالصُّلْحُ خَيْرٌ ﴾ النساء: ١٢٨

واتە: وە هەرکات ژنێك مەترســـی یاخیبوون و پشـــتهەڵکردنی لە مێردەکـــەی هەبوو، ئەوە گوناحیان ناگاتێ کە لە نێوان خۆیاندا پێك

بێــن و بێگومان هەر صولح و پێکهاتنیـــش چاکترە. کەواتە: با هیچ کــەس وا نەزانێ کە شــەریعەتی خوا یاخیبوون (نشــوز)ی تەنها بە بالآی ژنان بڕیوە و تەنها ڕێڕوونی پیاوانیشــی کردوە بۆ چارەسەری واقیعیانــەی حاڵەتی یاخیبوونی ژنان. بەڵکو لە شــەریعەتدا باســی حاڵەتی -نشــوز-ی پیاوانیش کراوە و ڕێی چارەســەری واقیعیانە و حەکیمانەش نیشــانی ژنان دراوە، ئەوەندە هەیە شــەریعەتی خوای کاربەجێ دوو ڕێگا و شێوازی جیاوازی بۆ هەرکام لە پیاوان و ژنان دیاری کردوون بۆ چارەســەری حاڵەتی ناوبراو، کە هەر کام لەو دوو ڕێباز و شــێوازە لەگەڵ سروشــت و کەسایەتی پیاوان و ژناندا پڕ بە پێستن!..

بەڵــێ ژن دەبــێ بــە لێزانــی و حەکیمــی و وریاییــەوە، هەوڵی ڕاســتکردنەوەی مێردەکەی بدات و هەردووکیان لە یەك ســەرنگەردا بــن و لە یەکتــری نەچنە ســەنگەرەوە.. لە کتێبەکانــدا ڕووداوێك دەگێڕدرێتــەوە و دەڵێن: ژنێك دەچێتە لای پیاوباشــێك و شــەکوای حاڵــی خۆی بۆ دەکات کــە مێردێکی زۆر خراپی هەیە و زۆر ئازاری دەدات و لێی دەدات و ســووکایەتی پێ دەکات. بەڵکو ئەم پیاوباشــە نوشــتەیەکی بۆ بنوســێ و ئەمیش بــە دەمی مێردەکەیــدا بکات و مێردەکــەی چاك ببێ و ڕەفتار و هەڵســوکەوتی لەگەڵی بگۆڕێ. ئەم پیاوچاکە خواناســە تێگەیشــتوە لە دینی خوا. دەزانــێ کە پیاو بە نوشتە بە دەمداکردن نابێ بە پیاوی چاك و ڕەنگە ئەم دوعایە ئاگەر چاکیش بێ لە ناوەڕۆکدا کێشــەی ئەم ژنە زیاتر بکا و قورەکەی بۆ

خەســـتتر بکاتەوە، ئەویش بە وەی کە ئەم پیاوە ئەگەر ئەو دوعایە بە دەســـت ژنەکەیەوە ببینێ وا خەریکە بۆی دەکاتە ئاو و چاوە، وە نوشـــتەی بە دەمدا دەکات، دەبێ چ بێت بە مێشکیدا و وا بزانێ ئەم ژنەی چ ســـیحر و جادوویەکی لێ کـــردوە و بە دووری نەزانێ ڕۆژێ ژەهرخواردیشـــی بکات! ســـەرەنجام بە هۆی ئەم نوشتەیەوە ژنەکەی تەڵاق بدات، یان لانی کەم هیچ متمانە نەمێنێ لە نێوانیاندا. لەبەر ئەوە ئەم پیاوباشـــە لە خواترســـە ویســـتی ڕێگایەکی ژیرانە نیشانی ئـــەم ژنە بدات بە ئومێدی ئەوەی ئاســـودەیی خێزانی بۆ بگەڕێتەوە و ئەڤین و خۆشەویستی بگەڕێتەوە بۆ ناو دڵ و دەروونی ئەم ژن و مێردە جارێکی تر بەرامبەر یەکتری. بۆیە بە ژنەکەی وت: کچی خۆم ئەو نوشتەیەی تۆ داوای دەکەی، بۆ ئەوەی کاریگەر بێ پێویستە تاڵێ مووی ســـمێڵی شـــێرێکم بۆ بێنی و بیخەمە ناو دوعاکەوە، ئەو کاتە چۆنت بوێ مێردەکەت ئاوا دەبێ. ژنەکە وتی: ئاخر مووی سمێڵی شێر چۆن دەســـت من دەکەوێ؟! پیاوباشەکە فەرمووی: ئەوەیان دەکەوێتە سەر خۆت، بەڵام دەتوانی سەردانی باخچەی ئاژەڵان بکەی، کە شێری لێیە و کارێکی وا بکەی بتوانی لێی نزیك ببیتەوە و سەرەنجام تاڵێ مووی ســـمێڵی ئەو شێرە دەربکێشی!! بەڵێ ژنەکە ئەوەندە ئازاری بە دەســـت مێردەکەیەوە چەشتبوو، ئامادەبوو هەرچی لە دەستی بێ بۆ چاکبوونی مێردەکەی لەگەڵی بیکات. ئەگەر ئەم کارە سەختەش بێت. بۆیە چوو بۆ باخچەی ئاژەڵان و چوە ئەو بەشەی کە شێری لێ بوو. بینی شێر زۆر سامناکە و نەی دەتوانی لەو شیشانەش نزیك ببێتەوە

کە شـــێرەکەی لەو دیوەوە بوو. بەڵام بەو ئومێدەی کە بۆی هاتبوو. ڕۆژ لـــە دوای ڕۆژ نزیکتـــر دەبـــۆوە و خواردنی چەوری و گۆشـــتی تازە و بەتامی بە هاوکاری ئەوکەســـانەی سەرپەرشتی بەخێوکردنی شـــێرەکانیان دەکرد، دەخســـتە بەردەم شـــێرەکە و ســـەرەنجام دوای ماوەیەك ئەم ژنە بە تەواوی سەرنجی شێرەکەی بە لای خۆیدا ڕاکێشا و وای لێکرد کە لەم دیوو شیشەکانیشـــەوە، دەســـتی دەبرد بۆ سمێڵی شـــێرەکە و دەســـتی بە سەردا دەهێنا و شـــێرەکەش هیچ جوڵەیەکی نەدەکـــرد. هەتا ســـەرەنجام ڕۆێك ژنەکە بە ئاواتی خۆی گەیشـــت و تاڵێ لە مووی ســـمێڵی شـــێرەکەی دەرهێنا و شـــێرەکە نەجولایەوە. بە پەلە و بە دڵخۆشـــیەوە چوو بۆ لای پیاوباشـــەکە و تاڵە موەکەی خســـتە بەر دەســـتی. پیاوچاکەکـــە فەرمووی: کچی خۆم دانیشـــە با چەند پرســـیارێکت لێ بکەم.. ئایـــا یەکەمجار بە عەقڵتدا دەهات کە بتوانی لەو شـــێرە دڕندەیە نزیك ببیتەوە؟! وتی: نەخێر. فەرمووی: ئەی چۆن بوو وا تاڵێ لە مووی سمێڵیت کردەوە و جووڵەشی نەکرد، خۆ هەر ئەو شێرە دڕندەی جاران بوو؟! ژنەکە وتی: قوربان جار لە دوای جار خۆم لێ نزیك کردەوە و سەرەنجام توانیم گۆشتی نەرم و جوان و تازەی پێشـــکەش بکەم. بە نەرمونیانی و دەم و چاوی کراوە و زەردەخەنەوە سەلامم لە شێرەکە دەکردو خواحافیزیم لێ دەکردو بە نازەوە ئاوڕم لێ دەدایەوە، تا وای لێ هات ئەو شـــێرە دڕندە نەرم بوو بۆم و دەستم بە سەریدا دێنا نەدەجولا و مووی سمێڵیم هەڵکێشا نەجوولایـــەوە و ئازاری نـــەدام!!.. پیاوباشـــەکە فەرمووی: دەی کچی

خۆم مێردەکەت لەو شـێرە دڕندەتر نییە. چـۆن بە ڕەفتاری جوان و نەرمونیانی و ڕووخۆشـی و خزمەتکردن توانیت ڕەفتاری شێرەکە بگۆڕی و بیکەی بە هاوەڵ و دۆسـت و خۆشەویسـتی خۆت. دڵنیا بە ئـاواش دەتوانی ڕەفتاری مێردەکەت بگۆڕی، بەڵام بە وەی کە لەگەڵ ئەویشـدا ئاوا نەرمونیان و ڕووخۆش و دەم بەخەندە و بە ڕێز بی. حەزی لە چ خواردنێك بوو پێشکەشی بکەی. کە لە ماڵ چوە دەرەوە خواحافیزی لێ بکەی. کە گەڕایەوە بە گەرمی بەخێرهاتنەوەی بکە. بـە نازەوە بۆی بڕوانـە و خەندەی بە دەمەوە بکـە. ئیتر تۆ وەرە ئەمەش لەگەڵ مێردەکەت بکە و پاش ماوەیەك وەرەوە بۆ لام بزانم چیـت کـردوە!!.. بەڵێ ژنەکە ڕۆیشـت و پاش ماوەیـەك هاتەوە و پیاوچاکەکـە هەر کە دەموچـاوی ئافرەتەکەی بینی فەرمووی: کچی خـۆم ئەزانـم ئاواتت هاتۆتـە جێ و مێردەکەت بـاش بوە لەگەڵت، چونکە ئەو ڕەنگەی جارانت نەماوە و ڕووت کراوەتەوە و شوێنەواری دڵخۆشـیت بە سەر ڕوخسـارتەوە دیارە. ئەویش وتی: بەڵێ قوربان، ئامۆژگاریەکانـی تۆم جێبەجێ کرد و ڕەفتارم لەگەڵ پیاوەکەم گۆڕی و سـەرەنجام ئەویش جار لە دوای جار ڕەفتاری لەگەڵ من باشـتر دەبوو. تا ئەوە بوو گەیشـتینە ئەم قۆناغەی ئێسـتا و سـوپاس بۆ خوای گەورە و پاشانیش خوا پاداشتی بە خێری جەنابیشت بداتەوە، کە ئێسـتا لە خۆشـترین ژیاندا دەژیم و مێردەکەم وا لەگەڵم چاك بوە کە هەر دەڵێی ئەو پیاوەی جارانیش نیە و ئێسـتا مێردەکەم بە هەموو دنیا نادەم و بە چاکترین پیاوی دەزانم، بەم شێوەیە ڕەفتاری

جــوان، بە وازهێنان لە کەلەڕەقی. بە وەی کە ئەم ژنە خۆی کرد بە خزمەتکاری پیاوەکەی. پیاوەکەشــی بۆی بوو بە ڕەنجبەر و کرێکاری بەردەســتی و بە تەواوی مانا گۆڕاو بوو بە کەســێکی نوێ و ژیانیان پڕ بۆوە لە ئەڤین و خۆشەویستی.

بەڕێزان: ئەگەر بمانەوێ ژیانی خێزانی پڕ بێ لە ئارامی و دووربێ لە ئاژاوە و توندوتیژی ئەوا پێویستی بە هاوکاری و هەماهەنگی نێوان ژن و پیاو هەیە، بە شێوەیەك کە هەردووکیان هونەری مامەڵەکردنی خێزانــی بزانــن. بە تایبەتــی ئاگاداری ئەوە بن کە گوێ بە قســەی خەڵکی نەدەن، چونکە زۆر قســە و قســەڵۆك و تانە و تەشەر هەیە کــە ژیانــی ژن و مێــرد تــاڵ دەکات ئەگەر وریاری خۆیــان نەبن و ئیماندارانە و ژیرانە بیر نەکەنەوە. بۆ نمونە:

کاتێك پیاوێك دەرگای ســەیارەکەی بۆ هاوســەرەکەی دەکاتەوە و پاشان قاپیەکەی بۆ دادەخاتەوە. پێی دەڵێن: پیاوێکی ژنانی..

یــان کاتێك پیاوێــك ڕێزێکی تایبــەت لە ژنەکــەی دەگرێ، پێی دەڵێن ترســنۆك. زۆرجار پیاوان لە ترســی قسە و قسەڵۆك و تانە و تەشــەری دەورووبەر و نزیك و ناســیاوان نیشاندانی خۆشەویستیان بۆ هاوســەرەکانیان دەشــارنەوە، چونکە وا دەزانن کەســایەتیان پێی دەڕوشــێت. بەڵام وەرن با ســەیر بکەین و بزانیــن گەورەترین پیاو لــە مێژوو ئایندەی مرۆڤایەتیدا، کە پێغەمبەری ئازیزە (ﷺ)، چۆن هەڵســوکەوتی کردوە لەگەڵ هاوسەری ژیانیدا کاتێك خاتوو عائیشە دەیویســت بچێتەسەر وشتر، پێغەمبەر (ﷺ) ئەژنۆی دادەنا، تا وەکو

بەردێکی گەورە خاتوو عائیشــە قاچ بخاتە ســەری و بتوانێ بچێتە ســەر پشــتی وشــترەکە!! یان پێغەمبەری خــوا (ﷺ) بانگی خاتوو عائیشــەی دەکرد و پێی دەوت (عائیش) لە خۆشەویســتیدا. جا ئەی پیاو ئەگەر شــوێن کەوتەی پێغەمبەریت (ﷺ) ئەوا با هەڵسوکەوتت محمــدی بێت. ئەو چۆن ڕێزی هاوســەری ژیانــی خۆی گرتوە تۆش ئــاوا بە. ئەوە پیاوەتی و مەردایەتیە. ئەمجا با ژن و پیاوی ئیماندار تەماشای سەلەفی صاڵحی ئەم ئوممەتی ئیسلامە بکەن و بزانن چۆن بە ئەوپەڕی خۆشەویســتی و گوێڕایەڵی لەســەر بنەمای ڕێزگرتنی یەکتــری ژیــاون. ئەوەتــا پیاوێکی زانــا و بەناوبانگــی وەکو ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەل فەرموویەتی: خێزانەکەم کەناوی (عَباسَـة بِنْـت المفضَــل) بوو. هەتا بڵێی ئافرەتێکــی صاڵحە و ڕێکوپێك بوو. لە حەقی ژنەکەیدا دەفەرموێ: (قالَتْ أُمُّ صالِح مَعِي عِشْـرينَ سَـنَةً، فَما اخْتَلَفْتُ أَنا وَهِيَ فـي كَلِمَةٍ). واتە: ماوەی بیست ساڵ من لەگەڵ خێزانم -دایکی صاڵح- بە یەکەوە ژیانی هاوســەریمان بردە ســەر، ڕۆژێ لە ڕۆژان لە ماوەی ئەو بیســت ســاڵەدا من و ئەو خێزانەم لە ســەر تەنها وشــەیەکیش ناکۆکی نەکەوتە نێوانمانەوە!!! سبحان الله (بیست) دانە ساڵی ڕەبەق. ئەو ژن و مێردە بۆ یەك قسەش ناکۆکی لە نێوانیاندا ڕووی نەداوە. بەو ژیانەی ئەو ســەردەمەش کە نەبوونی و نەداری و هەژاری بوە. خانووی خۆش و کەلوپەلی ناوماڵیشیان وەکو پێویست نەبوە، پارە و سامانیشیان نەبوە. بەڵام ئیمانیان هەبوە، بەڵام قەناعەتیان هەبوە، بــەڵام لێبوردنیان بەرامبەر یەکتر هەبوە، بەڵام

چاوپۆشـــیان لە کەموکورِی یەکتر هەبوە، بـــەڵام دڵیان لە بەرامبەر یەکتر پاراستوە لە رِق و قین، بەڵام نەرمونیان بوون لەگەڵ یەکتردا. ئیتر بەو شێوە خۆشە بە یەکەوە ژیاون..

نموونەیەکی تر لە ژیانی ژن و مێردێکی موســڵمان لە ســـەلەفی صاڵحـــی ئوممەتی ئیســـلامی: ئافرەتێکی خواناس و شـــارەزا لە دین هەبـــوو. نـــاوی (موعازەی کچـــی عبدالله) بـــوو، زۆر کـــەس چوونە خوازبێنـــی، بـــەڵام بە کەســـیان رِازی نەبوو. تەمەنـــی زۆر بوو، بوە ئافرەتێکی کامڵ، ســـەرەنجام زانا و خواناسی پایەبەرز (واصلی کورِی ئەشـــەم) ناردیە داخوازی. وەك دەڵێن، خوا قەڵەمی لێ دابوو. دەستی بـــە روویـــەوە نەنا و رِازی بـــووە، بەڵام ئەم ژن و مێـــردە لە نێوان خۆیاندا چەند مەرجێکیان بۆ یەکتر دانا: ئەگەر شـــەو هەســـتای بۆ شەونوێژ، منیش خەبەر بکەیتەوە. ئەگەر لە پێش من شەهید بویت و رِێگای شـــەفاعەتت پێدرا، لە لای خوا تکام بۆ بکەی. هەردووکیان ئـــەم بەڵێنانەیان بـــە یەکتر دا و قەبووڵیان کرد. دوای چەند ســـاڵ لە هاوســـەریەتی پرِ شانازی و بێ گیروگرفت، لە غەزایەکدا واصل و کورِە گەورەکەی لە یەك رِۆژدا شەهید بوون و هەواڵی شەهیدبوونیان گەیشـــتە ماڵەوە، کۆمەڵێ لە ئافرەتی دراوســـێ و خـــزم و دەوروبەر کۆبونەوە و رِۆشـــتن بەرەو ماڵیان بۆ پرســـە و سەرەخۆشـــی، کاتێك چوونـــە بەردەرگا و داوای مۆڵەتـــی چوونە ژوورەوەیان کرد. موعازە خۆی چوو بەرەو پیریان و پێی وتن: ئەگەر بۆ پرسە و سەرەخۆشی هاتـــوون، مۆڵەتی چونە ژوورەوەتان نییە و خواتان لەگەڵ. ئەگەر بۆ

پیرۆزباییــش هاتوون، یا خوا بەخێربێن ســەرچاومان!! بە هەرحاڵ دوای شــەهیدبوونی هاوسەرەکەی بە تەواوی لێ بڕا بۆ خواپەرستی. دوای حەوت ساڵ لەو ڕووداوە، موعازە نەخۆش کەوت و کەوتە سەر جێــگا، لە ســەرەمەرگدا و لە کاتــی گیانەڵادا، بە دەم ئــازار و ژانی ســەرەمەرگەوە ڕووی وەرگێڕا بۆ لای چەپ و دەستی کرد بە گریان، هــەر دەســتبەجێ ڕووی وەرگێــڕا بۆ لای ڕاســت و دەســتی کرد بە پێکەنین، لێیان پرسی: هۆی چی بوو بە لای چەپدا ڕووت وەرگێڕا و گریایت، بەڵام بە لای ڕاستدا ڕووت وەرگیڕا و  پێکەنیت؟! فەرمووی: ناتوانــم بۆ تان باس بکەم. زۆریان تکا لێکرد، ناچار وتی: کە بە لای چەپدا ڕووم وەرگێڕا شــوێنی شەونوێژەکەمم بینی، زانیم لە مەودوا چۆڵ دەبێ، لەوە زیاتر شەونوێژم بۆ ناکرێ. بۆیە دڵم پڕ بوو، گریام، کە ڕوویشــم وەرگێڕا بۆ لای ڕاســت هاوسەرەکەم بینی، ئەو بەڵێنەی کە لەسەرەتای هاوسەرگیرمدا پێی دابووم، هاتبوو جێبەجێی بکات!!.. ئەوانیش زۆر ئەم قســەیان پێ ســەیر بوو. وتیان چۆن؟! فەرمووی: واصڵی هاوســەرم لە یەکەم هەنگاوی ژیانی هاوســەرێتیماندا بەڵێنی پێــدام ئەگەر لە پێش مندا شــەهید بوو، لە لای خوا تکام بۆ بکات. کە ڕووم وەرگێڕا بۆ لای دەرگاکە ڕۆحی هاوســەرەکەم بینی لەســەر شــێوازی خــۆی هاتبوو موژدەم بداتێ، ئیتر مــن لەگەڵی دەڕۆم بەو جۆرە شایەتمانی هێنا و گیانی سپارد!!..

بەڵێ ئەمە هەمووی بەرهەمی ئیمان و خواناســییە، بڕوابوونە بە قیامەت و ژیانی نەبڕاوەی بەهەشت کەوا لە ژن و مێرد دەکات، نەك

هەر لەم دنیادا، لەم چەند ســاڵە کەم و کورت و بڕاوەدا، بڕیار بدەن بە یەکەوە بن، بەڵکو هیوادار بن و داوا بکەن لە خوا کە هەردووکیان بە ئیمانەوە بمرن و لە قیامەتیشــدا هەر بە یەکەوە بن. لە کۆتایی وتارەکەماندا، ڕوو لە ئافرەتان و ژنان. خوشکان و کچانی میللەتەکەم دەکەم و پێیان دەڵێم: بە توندی دەست بگرن بە ئاینی ئیسلامەوە، کە ئاینی فیطرەتە، کە ئافرەتی پاراستوە لە توانەوە لە کەسایەتی پیاودا، چونکە ئەوەتا بە چاوی خۆمان دەبینین لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا، کاتێــك ئافرەتێك دەچێتە ناو ژیانی هاوســەرایەتیەوە، دەبێت ناوی خانەوادەی بگۆڕێت وە بیکات بە ناوی خانەوادەی هاوسەرەکەی. بەو مانایــەی کە ناوی خانەوادەی خۆی لە دەســت دەدات، وە بە فەرمی دەبێت هەڵگری ناوی هاوســەرەکەی بێــت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئافرەت خۆی بە کەســێکی زۆر نزم ســەیر دەکرێت، تا لە ماڵی باوکیەتی ناوی باوکی هەڵدەگرێت. وە کاتێکیش چوە لای هاوســەری و شــووی کــرد، دەبێت نــاوی پیاوەکەی هەڵبگرێت. کــە دووبارە لە هەبوونی ناو، ئافرەت بەهایەکی سەربەخۆی خۆی نییە.. کە ئەمەش ســەرەتاییترین مافــە ئافرەت لــە ڕۆژئاوادا نیەتــی، ئەوەتا وەزیری دەرەوەی ئەمریکا (هیلاری کلنتۆن) کە ژنی (بیل کلنتۆن)ی ســەرۆکی پێشــووتری ئەمریکایــە، ناوی (کلنتــۆن)ی لــە مێردەکەیەوە پێوە لکێنراوە و خراوەتە پاڵ مێردەکەی!. یان (دانیاڵ میتران)ی فەڕەنسی ناوی (میتران)ی لە هاوســەرەکەی (فرانســۆ میتران)ەوە وەرگرتبوو!! بــەڵام لە ئیســلامدا ئافــرەت خاوەنی ناوی خۆیەتی و کاتێ شــووی

کـــرد ناوەکـــەی لەگەڵ ناوی هاوســـەرەکەی ئاوێتە نابـــێ و خۆی لە هاوســـەرەکەیدا بە تواوەیی نابینێ. دەی خوشکانم، شانازی بکەن بە دینەکەتانـــەوە ئەوانەی کە بە ناوی (ئازادی بۆ ئافرەتان، یەکســـانی بۆ ئافرەتان، فێمێنیســـتی)یەوە دژایەتی ئیســـلام دەکـــەن و دەیانەوێ ئافرەتانی موســـڵمان لـــە دینەکەیان دابڕن. ئەوانـــە نەك ئافرەتیان خۆشـــبەخت و بەختـــەوەر نەکرد، بەڵکو خۆشـــیان بە بەدبەختی و کلۆڵـــی ســـەریان نایەوە، بە داخـــەوە ئەو جۆرە کەســـانە کە لە ژێر دروشمی بەگژاچوونەوەی توندوتیژی دژ بە ژنان و ئافرەتاندا، هەوڵ دەدەن، کـــە خـــۆی لە خۆیدا کارێکی پیرۆز و جوانە، چونکە ڕێگرتن لە هەر ســـتەمێك، لە هەر کەســـێکەوە بکرێت بۆ ســـەر هەر کەسێك پێچەوانەیە لەگەڵ ئاینی ئیســـلامدا و هەر کەس دەســـتی ســـتەمکار بگرێ و دیفاع لە مەزڵوم بکات و ماف بۆ مافخوراو بگێرێتەوە، ئەوە لە ئیســـلامدا دەستخۆشـــی لێ دەکرێ و دەســـتباری لەگەل دەکرێ و پشـــتیوانی هاوکاری دەکرێ و کارەکەی بەرز دەنرخێنرێ. بەڵام وەکو وتمان ئەوەی جێگای داخە، هەڵوێســـتی پیاوێکی نوێژخوێن، حاجی، ئەهلی مزگەوت، کە توندوتیژی بەرامبەر هاوسەری دەکات، کچەکەی لە شـــووکردن بـــە دڵی خۆی بە گەنجێکـــی ڕێکوپێك بێبەش دەکات، بـــڕوای بە ژنبەژن و گەورە بچوك و کچ لەســـەر بێشـــکە مارەکردن هەیە، بێنی ئەمە لە ســـەر ئیســـلام حســـاب بکەی و وا بزانی ئەمە نوێنەری ئیســـلامە و شـــەریعەتی جێبەجێ کـــردوە، وە بەو ناوەوە دژایەتی هەموو ئیسلام بکەی، ئەمانە نەك هەر نەیان توانی خزمەت

بە خێزان بە گشـتی و ژنان بە تایبەتی بکەن، بەڵکو وا یان لە ژنان کـرد کە لە سـەر بچووکترین عاجـزی و دەمەقاڵێی خێزان پەنا بۆ پۆلیس و دادگا و شکات ببا و مێردەکەی بە گرتن و غەرامەکردن و بەڵێننامە نوسین بکات و سەرەنجام ئەگەرچی لە ژێر ترس و حوکمی دادگادا لە ژێر چەتری یەك خێزانیشـدا بمێننەوە. بەڵام لە ناخەوە ئەڤین و خۆشەویسـتی لە نێوانیاندا هەڵ دەتەکێ. وەکو ئەو برینە بچکۆلـەی کە زیپکەیەکی بچکۆلەیە، ئەگەر ئارامی لە سـەر بگری و دەسـتی لێ نـەدەی و زۆر لێی نەکۆڵیتەوە، بـۆ خۆی دەپوکێتەوە و کۆتایـی پێ دێت. بەلام ئەگەر ئارامت نەگـرت و دەرزی ئاژنت کرد و خێرا خۆت گەیاندە پزیشـك و نەخۆشـخانە و بەر نەشـتەرت دا، ئەوا سـەرەنجام نەك برینەکە کە هیچی وا نەبوو شایەنی ئەمە بێ، چاك نابێ، بەڵکو زۆر جار دەبێتە سـەرەطان و خاوەنەکەی دەکوژێ، یـان دەبێ ئەو ئەندامە ببڕدرێتەوە. لەبـەر ئەوە با بگەڕێینەوە بۆ ئیسـلام. بـا بگەڕێینەوە بۆ رێـز و حورمەت لـە یەکگرتن. ئەمڕۆ سـەردەمی حیوار و گفتوگۆیە. هەمووومان بـە یەك دەنگ بڵێین: نا بۆ توندوتیژی دژی لاشـەی ئافرەت، نا بۆ شـکاندنی کەسـایەتی و کەرامەتـی ئافرەت، نەخێر بۆ سـوکایەتی بە جەسـتەی ئافرەت بە وەی بکـرێ بە کلیپـی گۆرانیەك و گۆرانیبێژێـك کە کەس گوێ لە دەنگی ناگرێ، ئافرەتێك بکاتە هۆکاری سـاغکردنەوەی بەرهەمەکانی بـە وەی لە کلیپەکەیدا رەقس و سـەمای پێ بکا و رۆڵی ئافرەتێکی خیانەتـکاری پی بگێڕی!! هەمووومان بڵێین: بەسـە سـووکایەتی بە

ئافرەت، بە وەی لە سەر سەلکە سابونێ، دەبەی شامپۆیەك وێنەکەی دابنرێ و ڕیکلامی پێ بکرێ و پاشـــان فڕێ بدرێ و ژێر پێ بخرێ. نەخێر، نەخێر بۆ توندوتیژی. بەڵێ، بەڵێ بۆ نەرمونیانی. بەڵێ بۆ گەڕانەوە بۆ فەرموودەی سەروەرمان (ﷺ) کە فەرمووی: (ماكانَ الرِّفْقُ في شَيءٍ إلاّ زانَّهُ) نەرمونیانی لە هەر شتێکا بێ ئەوا جوانی دەکات.

(رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَةً وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النّارِ)

اللّهُمَّ آمين..

## سەرچاوەکان:


١. تەفسیری ئاسان. بورهان محمد أمين.

٢. الزّواج الإسْلاميّ السَّعيد. محمود المِصري. ص٧٩٣. ص٧٧٥. ص٧٧٦. ص٧٢٤.

٣. ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا. م.عەلی باپیر، ل٢٠٨، ل٢١٥.

٤. گۆڤاری (ڕێگای هزر)، ژمارە: ٥، لاپەڕە: ٨٠.

٥. پایزە برا، مەلا أحمدی شەریعە ل٤٦.

# وتاری تایبەت بە نوێژەبارانە
## بەشی یەکەم

الحَمْدُلله رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**بەڕێزان: گەورەترین خەڵات و بەخششی خوا بۆ ئێمەی مرۆڤ، لە خەڵاتە مادیەکان، ئاوە لەبەر ئەوەی هیچ شتێ وەکو ئاو کاریگەری لە سەر ژیان و بوونی مرۆڤ نییە. چونکە ئاو: هەموو دروستکراوەکانی خوا لە ئاو پێك هاتوون، هەموو گیانلەبەرەکان، زیندەوەرەکان، مرۆڤ. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَٱللَّهُ خَلَقَ كُلَّ دَآبَّةٍ مِّن مَّآءٍ﴾ النور: ٤٥**

**خوای گەورە لە قورئانی پڕ بەخشش و بەرەکەتدا، بە نەکیرەیی (٣٣) جار وشەی (ماء)ی بەکارهێناوە. وە (١٦) جاریش وشەی ئاوی بە مەعریفی (الماء) بەکارهێناوە. پاشان تەماشا کەن: کۆرپە لە ناوسکی دایکیدا (٩٣٪)ی ئاوە. خوێنی مرۆڤ (٨٠٪)ی ئاوە، ڕوەك و گژوگیا و هەندێ گیانلەبەر هەیە کە (٩٧٪)ی ئاوە. لاشەی مرۆڤی پێگەیشتوو بە گشتی (٧٥٪)ی ئاوە. بەڵام تەنها دڵی مرۆڤ (٨٥٪)ی ئاوە.. سییەکانی مرۆڤ (٧٣٪)ی ئاوە.**

**یەکێ لە تایبەتمەندیەکانی ئاو ئەوەیە: کە تەنها ئاوە بۆ ژیان دەگونجێ، خوای گەورە فەرمویەتی: (وَجَعَلْنا مِنَ الماءِ كُلَّ شَيءٍ حَيّ) لە تایبەتمەندیە ناوازەکانی ئاو ئەمانەن:**

پلەی دارژانی ئاو: کاتێ لە سوراحیەکەوە ئاو دەکەینە پەرداخێکەوە، ئـــەو هاتنە خـوارەوەی ئاوە بە پلەیەکی دیاریکـــراو دانراوە. چونکە ئـــاو پلـــەی دارژانەکەی بـــە (١٠) ملیار جار لە قەتـــران و (١٠٠٠) جار لـــە گلیســـرین و (١٠٠) جـــار لە ڕۆنـــی زەیتون و (٢٥) جار لە ترشـــی کیبریتیك زیاترە. ئەمجا ســـەرنج بدەن و ورد ببنەوە: لاشەی مرۆڤ بە خوێن کار دەکات، ئەگەر خوێن خانە و پرۆتین و هۆرمۆنەکانی لێ بپاڵێوین ئەوا ماددەیەکی شل دەمێنێتەوە، پێی دەوترێ: (پلازما) کە بە ڕێژەی (٩٥٪) لە ئاو پێك دێت.. خوێنیش لە دڵەوە دابەش دەکرێت بە ســـەر لاشـــەدا، هەموو خانەیەك دەبێ خوێنـــی پێ بگات، کە ئەو گەیەنـــەرەی لە نێوان خانەکان و دڵدایە پێی دەوترێ: (مولوولەکانی خوێن). جا بۆ ئەوەی خانە کەڵك لەم مادانە وەربگرێت کە لە لایەن مولوولەخوێنەکانەوە پێی دەگات، دەبێ دووریەکەی لە (٥٠) مایکرۆن زیاتـــر نەبێـــت. مایکرۆنێـــك = ١/١٠٠٠ ملیمەترا، ئـــەو خانانەی لەو دووریيە دوورترن، ناتوانن خۆراك بە دەســـت بهێنن و بە دڵنیاییەوە دەمـــرن. (هەنـــدێ جار وەرە پێســـتی بنی پێی خۆت ببـــڕە، خوێنی لـــێ نایەت و ئازاری نییـــە، چونکە مولووله خوێنـــی ناگاتێ).. بۆیە خوای گەورە لەشـــی مرۆڤی وا درووســـت کـــردوە، مولوولەخوێنەکان وەکو تۆڕێك بە ناو هەموو لەشـــدا بڵاوبوونەتەوە و ئیش دەکەن، لە لەشـــی مرۆڤدا: (پێنج ملیار) مولوولەخوێن هەیە. درێژیان بە ســـەر یەکـــەوە دەگاتـــە (٩٥٠)کلم. لە هەندێ لە شـــیردەرەکاندا ســـێ هەزار مولووله خوێن لە یەك ســـانتیمەتر چوارجای ماسولکەیەکدا هەیە..

مولووولەخوێــن ئەوەندە باریکــە ئەگەر (دە هــەزار) مولووولەخوێنی لەشــی مرۆڤ بخەینــە پاڵ یەکتر، ئــەوا ئەســتووریەکەی نزیکەی وەکو ئەســتووری نوکە قەڵەمێکی ڕەساســی لێ دێت. وە تیرەی ئەو مولووولانــە لە نێوان: (٣ — ٥) مایکــڕۆن دەبێ. ئەمەش دەکاتە (٠,٠٠٣ یان ٠,٠٠٥) ملیمەتر.. پرۆفیســۆر: (مایکڵ دینتۆن) دەڵێ: ئەگەر پلەی داڕژانــی ئاو کەمتر بوایە لە وەی ئێســتای، بــۆ نموونە وەکو ڕۆنی زەیتــون بوایە، واتە (١٠٠) پلە کەمتر لە وەی ئێســتای. ئەوا دڵ نەی دەتوانــی پاڵ بــە خوێنەوە بنێت، چونکە زۆربــەی پێکهاتەی خوێن ئــاوە!. وە دڵ خۆی نــەی دەتوانی ئاوا بە خێرایــی لە دەقیقەیەکدا (٧٢) جار لێ بدات، ئەگەر لە (٨٥٪)ی دڵ ئاو نەبوایە. وە ئەگەر پلەی ڕژانــی ئاو کەمتر بوایــە، ئەوا خوێن نەی دەتوانی بــە دەمارەکاندا تێپــەڕ بکات و هەرچەندە دڵ پاڵ بەو ماددە شلەشــەوە بنێت، ئەوا ناتوانێــت بگاتە مولووولەخوێنەکانی ناو لەش.. کەواتە: تایبەتمەندی داڕژانی ئاو هەروەك هەموو خەســڵەتەکانی تری خاوەنی بەهایەکی نایــاب و گونجــاوە بۆ ژیــان. جیاوازییەکی بەرچاو هەیــە لە نێوان پلەی داڕژانی مادە شــلە جیاجیاکاندا و ئەم جیاوازیەش هەندێ جار دەگاتــە چەندین ملیار ئەوەندە، وە لە ناوەندی ئەو چەند ملیار پلە جیاجیایــەی داڕژاند دەبینین تەنها ئاو خاوەنی پلەیەکی داڕژانە کە بۆ ژیان دەگونجێت. دەی خوایە گیان شوکر و سوپاس هەر بۆ تۆیە. کە ئاوا بەندەکانی خۆت بە ئاو بەختەوەر و ئاسودە کردوە.

بەڕێزان: ئاو چەند جۆرێکی هەیە. لە جۆرەکانی ئاو:

١. ئـــاوی باران: خوای گـــەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً طَهُورًا ﴿٤٨﴾﴾ الفرقان: ٤٨

بەڵــێ لە ڕوانگەی زانســتییەوە ئاوی باران لە ســەدا ســەد بە ئاوی دڵۆپێنراو (ماء المُقَطَــر) دادەنرێ، چونکە ئاوی بارانیش هەروەکو ئاوی دڵۆپێنراو هەر لە ئەنجامی بە هەڵمبوونی ئاودا درووست دەبێ، هەروەکو لای هەمووومان ئاشــکرایە. باران لە ئەنجامی بە هەڵمبوونی ئاوی زەریا و دەریاکانــەوە پەیدا دەبێت. پاشــان چڕدەبێتەوە و دەبێتە هەور و بە شێوەی باران دێتەوە سەر زەوی. جا ئەو ئاوی بارانە بە تەواوی پاکە و خاوێنە و خاڵییە لە پیســی. ئەم ئاوی بارانە پاککەرەوەیە (مُعَقِّم) وە لە خۆشیا پاکە. لە ڕووی پزیشکییەوە ئاوی باران دەتوانرێ وەکو دیتۆڵ بەکار بهێنرێ بە مەبەســتی خاوێنکردنەوە، چونکە ئاوی باران خاڵییە لە ڤایرۆســات و بەکتریــا. هەروەها یەکێکی تر لــە تایبەتمەندیەکانی ئــاوی باران کە خوای پەروەردگار بــە (طَهُوراً) ناوی بردوە، ئەوەیە کە هەموو ئەو مەعادین و غازات و تەپوتۆز و هەر ماددەیەك کە لە کاتی هاتنەخوارەوەیدا بۆ ســەر زەوی تووشی دەبێت بە ڕێژەیەکی زۆر، هەر لەبەر ئەمەشە ئاوی باران بە پاککەرەوەی هەوا -جەو- دادەنرێت، هەر بۆیە ســاڵانە لە پاییزاندا پێش بارانبارینی پەڵە نەخۆشــی زۆرە، کاتێ کە بارانی پەڵە باری، ئەو نەخۆشــیانە کە زۆربەیان لە ڕێگەی هەواوە دەگوێزرێنەوە، نامێنن. چونکە باران جەوەکەی لە پیسی پاك کردۆتەوە.

خوای گەورە لە قورئاندا لە بارەی ئاوی بارانەوە بە ئاوێکی موبارەك و پیرۆز ناوی دەبات و دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً مُّبَٰرَكًا﴾ ق: ٩

هەر بۆیە لە کۆندا خەڵکی هاتوون ئاوی بارانیان گرتوە و خۆیان پێ شـــۆردوە و بۆ چارەســـەری نەخۆشی پێست بە کاریان هێناوە. بە تایبەت کە لەو زەمانەدا ئاووهەوا پاك بوە و ئەو بارانەی کە باریوە بە پاکوخاوێنی گەیشـــتۆتە ســـەرزەوی و هیچ دوکەڵ و ڤایرۆسات و غازاتێکـــی تێکەڵ نەبوە. بەڵام لەم ســـەردەمەی ئەمڕۆماندا بارانەکە بە پاکی ناگاتە سەرزەوی ئەویش بە هۆی بوونی ئەو هەموو دوکەڵ و مـــاددە ژەهریانەی کە لە کارگەکان و ئۆتۆمبێلەکان و پاڵاوگەکانی نـــەوت دەردەچـــن لە غـــازی کبریت و مەعادنی ڕەصـــاص و ماددەی ژەهراوی. کەواتە: باران پێش ئەوەی بۆ ژیانەوەی ســـەرچاوەکانی ئاو و کانی و کارێزەکانمان بە ســـوود بێ. ئاســـمانمان لە هەموو پیسیەك کە لە هەوادا هەیە بۆ خاوێن دەکاتەوە. دەی کەواتە: ئەگەر گەنم و هەمـــوو جۆرەکانی دانەوێڵەمان لـــەو وڵاتانەوە بۆ بێ، بە هۆی ئاوی ژێرزەویەوە موحتاج بە ئاوی تر نەبین، هێشـــتا هەر موحتاجین بە ئاوی باران، بۆ پاککردنەوەی هەوای سەرمان و دەوروبەرمان. کە پیس بوە و بارانبارین پاکی دەکاتەوە. نەك وەکو هەندێ بێدین و بێئاگا لە دیـــن و لە دنیا، دەڵێن: مادام گەنم لە وڵاتانەوە دێ و ئاردی بایەعی بە بەلاش بۆ مان دێ و بە تانکەر ئاو دەگاتە هەموو ماڵێك و زۆری ئاوی بیری هەیە، دەی ئەگەر نەشـــبارێ کوا کێشـــەمان بۆ درووســـت دەبێ؟! بەو جۆرە کەســـانە دەڵێین: پەنا دەگرین بە خوا لە وشـــکە ســـاڵی و نەبارینـــی باران. چونکە هەر بە جـــەوی پیس و دوکەڵاوی ژیانمان لێ دەبێت بە ژان! هەروەها ســـەرنجی وشەی (طَهُوراً) بدەن،

بـــاران بۆیە پـــاك و پاككەرەوەیە چونكە لە ئاســـمانەوە دادەبارێ بۆ سەر زەوی، دەی هەر مەنهەج و پەیڕەوی ئاسمانیشە كە قورئانە ئەم ســـەرزەوییەمان بۆ خاوێن دەكاتەوە. لە هەموو پۆخڵیەكی ڕەوشتی و كۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕامیاری. كە مرۆڤی خراپەكار تێكی داوە.

٢. جـــۆری دووەمی ئـــاو بریتییە لە ئاوی شـــیرین و تامخۆش بۆ خواردنـــەوە، وەكو ئـــاوی كانی و كارێز و ڕووبـــارەكان. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَسْقَيْنَٰكُم مَّآءً فُرَاتًا ﴿٢٧﴾ ﴾ المرسلات: ٢٧

لەبـــەر ئەوەی ئەو ئـــاوەی كە لە زەوییەوە بۆ مـــان هەڵدەقوڵێ و دەی خۆینـــەوە، پێكهاتەیەكـــی زۆری لە مـــاددەی ئەندامی تێدایە و زۆر زینـــدەوەری وا وردی تێدایـــە كە بە چاو نابینرێ. وەكو بەكتریا و ڤایرۆســـات. وە مـــەوادی مەعدەنـــی تێدایە وەكو: ئاســـن، نوحاس، صۆدیۆم، كالســـیۆم، وە مادەی ئەندامی زۆری تێدایە وەكو كاربۆن و گڵ. كە بێگومان پێویستە ئەم ماددانەش لە ئاودا هەبن چونكە لەش پێویستی پێیانە، بەڵام بە ڕێژەیەكی دیاریكراو و لەوە زیاتر نەبن.

بەڵێ خوای گەورە ئەم جۆرە ئاوەی بە ئاوی شـــیرین و تام خۆش بـــۆ خواردنەوە گونجاو ناو بردوە. خـــوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ هَٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ ﴾ فاطر: ١٢

ڕەحمەتـــی خـــوا لە مەلای گـــەورەی كۆیە كە لە تەفســـیرەكەیدا (تەفسیری كوردی) زۆر جوان مانای ئەم ئایەتەی كردوە و فەرموویەتی: (عَـــذْبٌ) شـــیرینە، ئاوێكی شیرینە. (فُراتٌ): ســـوكە (دافعی عەطشە).. بەڵێ بەم ئاوە نەبێ مرۆڤ تینویەتی ناشكێ.

٣. جۆری سێیەمی ئاو پێی دەوترێ: (الماء الأُجاج). سوێر و تاڵ. هەر وەکو خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿ وَهَٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ﴾ فاطر: ١٢. سـبحان الله قورئان چەند بە وردی وشـەکان دەردەبڕێ، ئەوەتا ئاوی وا هەیە ئەوەندە سـوێرە، لە سـوێریان تاڵ بوە. بۆیە بە تەنها نافەرمـوێ: (وهـذا مِلْحٌ) چونکە ئاوی خواردنـەوەش خوێی تێدایە، بەڵام ئەم جۆرە سوێریە زیاد لە حەدە و ئاوەکەی تاڵ کردوە!! بۆیە وشەی (أُجاج)ی بە کار هێناوە لەگەڵیدا. بەم شێوەیە یەك وشەی ئەم قورئانە بێ مەبەست نییە. ئەم ئاوەش ئاوی زەریاکانە، ئەگەر یەکێ پرسـیار بکات: باشـە بۆچی خوای کاربەجێ ئاوی ئەو هەموو زەریا و ئۆقیانووسانەی ئاوا سوێر کردوە، کە لە سوێریدا تاڵ بوە، کە ئەم ئـاوە زۆربەی هەرە زۆری ئاوی سـەر ڕووی زەوی پێك دێنێت. ئەی باشە بۆچی ئاوێکی شیرین و خۆش نەبوو؟! لە وەڵامدا دەڵێین: کاری خـوا هەمووی پڕ حیکمەتە و هەمووی لە خزمەتی ئەم مرۆڤەدایە. ئەگەر ئاوی ئەو زەریا و ئۆقیانوسانە وەکو ئاوی کانی و کارێزەکانمان شـیرین و خۆش بوایە و بۆ خواردنەوە بگونجایە. ئەوا تەواوی ئەو هەموو ئاوە دوای ماوەیەك لە وەستانی بەم شێوەی ئێستای هەمووی بۆگەنـی دەکـرد، بەڵام بە هۆی ئەو سـوێریە زۆرەوە لە بۆگەنبوون و تێکچـوون دەپارێزرێ. هەروەها ئەو هەمـوو گەوهەر و مرواری و یاقوتە، تەنها لە ئاوی سـوێردا درووسـت دەبێ، وە هەروەها سودێکی تری ئەو سـوێریە ئەوەیـە کە: یارمەتـی نقومنەبوونی ئەو پاپۆڕە گەورانە دەدات کە بە ناو ئەو زەریایانەدا دەڕۆن و وەکو شاخی گەورە

دەردەکەون. هەروەکو خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَلَهُ ٱلْجَوَارِ ٱلْمُنشَـَٔاتُ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴾ الرحمن: ٢٤.. یان دەفەرموێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَـٰتِهِ ٱلْجَوَارِ فِى ٱلْبَحْرِ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴾ الشورى: ٣٢.. کە لە فەرهەنگەکاندا دەڵێ: ﴿ كَٱلْأَعْلَـٰمِ ﴾ یانی: کالجِبالِ الشّاهِقَ.. وەکو شاخ و کێوی بەرز و دیار و گەورە ئاوان. کە بە ڕاستی ئەمانەش موعجیزەی قورئانە. ئەینا لەو کاتەدا کە ئەم ئایەتانە هاتوونەتە خوارەوە، بگرە چەندین سەدەش دوای ئەوە پاپۆڕی ئاوا گەورە لە دەریا و زەریاکاندا نەبوە کە وەکو کێو و شاخی گەورە وا بووبێ! بەڵام پەروەدگار زانا بە وەی کە چی درووست دەبێ و چ کەشتیگەل و پاپۆڕێکی گەورە درووست دەبێ. کە لە ئەمڕۆدا پاپۆڕی بارهەڵگر هەیە کە (٢٠٠) هەزار طەن هەڵدەگرێ لە نەوت و کەلوپەل و مرۆڤ. تەنانەت پاپۆڕی بارهەڵگر هەیە کە پێش چەند ساڵێ دەیانگوت (٧٠٠) هەزار طەن هەڵدەگرێ، پاشان بوو بە (٨٠٠) هەزار طەن. ئەمڕۆ پاپۆڕی نەوت هەڵگر هەیە کە ئەو بارەی هەڵی دەگرێ لە یەك ملیۆن طەن زیاترە!! هەر بە ڕاستی کە لە دوورەوە دەبینرێ وا ئەزانێ ئەمە شاخێکی گەورەیە لە ناو ئاودا! ئەمەش بە فەزڵی خوا و بە فەرمانی خوای پەروەردگارە کە ئاوا ئاوی موسەخەر کردوە و ئەو سوێریەی پێ بەخشیوە کە دەبێتە هۆی ئەوەی ئەو هەموو قورساییە لە سەر ئەو ئاوە بوەستێ و نقوم نەبێ. خوای گەورە لە بارەی ئەم سوێر و تاڵەوە دەفەرموێ: ﴿ وَمَا يَسْتَوِى ٱلْبَحْرَانِ هَـٰذَا عَذْبٌ فُرَاتٌ سَآئِغٌ شَرَابُهُۥ وَهَـٰذَا مِلْحٌ أُجَاجٌ ۖ وَمِن كُلٍّ تَأْكُلُونَ لَحْمًا طَرِيًّا وَتَسْتَخْرِجُونَ حِلْيَةً تَلْبَسُونَهَا ۖ ﴾ فاطر: ١٢

لە بارەی ئەو کەشـتیگەلە گەورانەشـەوە، کە بە ڕاستی خزمەتی مرۆڤایەتی دەکەن دەفەرموێ: ﴿ وَتَرَى ٱلْفُلْكَ فِيهِ مَوَاخِرَ لِتَبْتَغُواْ مِن فَضْلِهِۦ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿١٢﴾ ﴾ فاطر: ١٢

بەڵـێ ئیمانـداری بەڕێـز، ئەمە باسـێك بوو بە کورتی لەسـەر جۆرەکانی ئاو، ئەمجا با بزانین باران چۆن درووست دەبێت؟! سەرەتا دەبێ ئەوە بزانین کە ئەو ئاوەی لە بارانەوە دێتە سـەر زەوی، هەر هەمان ئاوە کە لە کانی و سـەرچاوەکانەوە بۆمان هەڵدەقوڵێ. خوای گـەورە دەفەرمـوێ: ﴿ أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَسَلَكَهُۥ يَنَٰبِيعَ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ يُخْرِجُ بِهِۦ زَرْعًا مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهُۥ ﴾ الزمر: ٢١

واتە: ئایا تۆ نەت بینیوە و سـەرنجیت نەداوە: بە ڕاسـتی خوا لە ئاسمانەوە بارانی باراندوە، لەوەو دوا لە ناخی زەویدا کۆی دەکاتەوە، پاشان بە شێوەی کارێز و کانی دەری دەهێنێت، ئەوسا هەر بەو ئاوە کشتوکاڵی هەمەجۆر و هەمەڕەنگ دەڕوێنێت.....

لەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار ئەوەی پێ ڕاگەیاندین کە ئاو لە خودی زەویـەوە هەڵناقوڵێ بەڵکو ئەو ئاوی کانی و کارێز و بیرانە، ئاوی بارانە و لـە ناخـی زەویدا پەنگی خواردۆتەوە و بە ویسـتی خوا و بە لوتف و ڕەحمەتی خوا، بە پێی پێویست دێتە دەرەوە لە زەوی و مرۆڤ سوودی لێ وەردەگرێ. کە ئەم ڕاستییە زانستییەی قورئان باسی کردوە لەم ئایەتەدا. لە ساڵی (١٥٧٠)ی زاینیدا، زانایەك بە ناوی (بلیسی) ئەمەی ئاشکرا کرد.

بەڕێزان: پاشان هەمووومان ئەو ڕاستییە دەزانین کە باران لە هەڵمی ئـاوەوە پەیدا دەبێ، خوای گەورە و کاربەجێ، هەوای بە شـێوەیەك

درووست کردوە کە هەڵمی ئاو هەڵدەگرێت. بەڵگە و نیشانەی گەورە ئەوەیــە کە هــەوا هەڵمی ئاو هەڵدەگرێ بە ڕێــژەی جیاواز بە پێی جیــاوازی پلەی گەرمــا. لەبەر ئەوەی کە یەك مەتــر موکەعەب لە هــەوا بــۆ نمونــە، هەڵمی ئاو لە نــاو خۆیدا هەڵدەگــرێ بە ڕێژەی جیاواز کە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی پلەی گەرما. بۆ نمونە: هەر ئەو مەتــر موکەعەبە لە هەوا لە پلەی ســفردا، پێنــج غەرام لە هەڵمی ئــاو لە ناو خۆیدا هەڵدەگرێت. بەڵام هەر ئەو مەترە هەوایە ئەگەر خەســت بکرێتەوە تا پلەی بیســت یان بە پلەی سی، ئەوا لەو کاتەدا (١٣٠) غرام لە هەڵمــی ئاو لەگەڵ خۆی هەڵدەگرێ. کەواتە: جیاوازی هەڵگرتنــی هەڵمی ئاو لــە لایەن هەواوە بە پێی جیــاوازی پلەکانی گەرمــا هۆکاری ســەرەکیە بە ویســتی خوا بۆ بارینی بــاران.. بەڵام لێرەدا پرســیارێك دێتە پێشــەوە، ئەویش ئەوەیە: باشە چۆن خوای گەورە -ســبحانە وتعالی- ئاو هەڵدەگرێ و دەنێرێ لە هەڵمی ئاوەوە بۆ هەموو کیشــوەرەکان. لە ڕێگەی بارانبارینــەوە؟! هەروەکو وتمان هەڵگرتنــی هەڵمی ئاو لە ناو هەوادا بــە پێی جیاوازی پلەی گەرما، هەڵگرتنــی بڕی ئەو هەڵمی ئاوەش جیاواز دەبێت. بۆ نمونە: ئەگەر یەك مەتر موکەعەب لە هەوا (١٣٠) غرام هەڵمی ئاوی هەڵگرتبێ. لە ڕێگەی بە هەڵمبوون و چڕبوونەوەوە، پاشان ئەم هەوایەی کە هەڵمی ئاوەکەی هەڵگرتووە، گواســترایەوە بۆ شــوێنێکی سارد، ئەوە هەر بە گەیشــتنی بەم هەوا ســاردە، ئەو هەوایە هەڵمــی ئاوەکەی کە هەڵی گرتــوە فڕێی دەدات و لە خــۆی جیادەکاتەوە. مەگەر ئەو بڕە کەمە

پێویســتەی کە دەبێ لە هەواکەدا هەر بمێنێ، ئەینا هەڵمی ئاوەکەی کە هەڵی گرتوە، بە شێوەی دڵۆپە باران دێتە خوارەوە بۆ سەر زەوی و بەم شــێوەیە بە هەموو دڵۆپە ئاوەکان باران درووســت دەبێ و لە ســەر زەوی دەبارێت. ئەمەش شێوازی زانســتیانەی بارانبارینە. هەر لەبەر ئەم یاسایەشە کە بەردەوام باران لە شاخەکان کە ساردە، زیاتر دەبارێ لە شوێنە دەشتەکان کە پلەی گەرمی بەرزترە!..

بەڵێ ئیمانداران: بە ویســتی خوای گەورە، کاتێ تیشــکی خۆر لە ســەر ڕووبەرێکی زۆر گەورەی سەر زەوی دەدات، کە دەریا و زەریا و ئۆقیانوســەکانن، کە بەشی هەرە زۆری ســەر ڕووی زەوی داپۆشیوە. چونکە دەریا و زەریاکان نزیکەی (٧٢٪)ی سەر ڕووی زەوی داپۆشیوە. جا کاتێ تیشکی گەرمی خۆر لەو هەموو ئاوە دەدات، ئەم ئاوە دەبێ بە هەڵم و هەواش ئەم هەڵمی ئاوە هەڵدەگرێ لە ناو خۆیدا. پاشــان ئەم هەوایە دەجوڵێ جا بە هۆی جیاوازی پلەی گەرما لە نێوان بیابان و دەشتەکاندا، لەگەڵ ناوچە بەرز و شاخاویەکاندا. وە جیاوازی پلەی گەرما لە نێوان هێڵی ناوەڕاســتی زەوی و جەمسەرەکاندا (قوتبەکان). ئــەم جیاوازیە گەورەی پلەی گەرما کە لــە نێوان ئەم دوانەدا هەیە -هێڵی یەکســانی و جەمسەرەکانی زەوی. وە دەشتایی و شاخەکاندا- ئەمــە وای کــردوە کە ئەو هەوایەی کە هەڵمــی ئاوەکەی هەڵگرتوە، بجوڵــێ و بــڕوات. جا ئەگەر ئــەم هەوایەی کە پڕە لــە هەڵمی ئاو تووشــی ناوچەیەکی ســارد بوو، ئەوا ئاوەکەی ناوی دادەڕژێ و باران بە ســەر ئەو شــوێنەدا دەبارێ. بۆ زیاتر ڕوونکردنــەوەی بابەتەکە

دەڵێین: ئەگەر وا دابنێین لە مەترێك هەوادا، پێویستە (٢٠) غرام ئاو هەبــێ، کەچی ئەو مەترە هەوایــە (٦٠) غرامی هەڵگرتووە، جا کاتێ ئەو هەوایە کە ئەم هەڵمی ئاوەی لە ناو خۆیدا هەڵگرتوە. گەیشــتە پلەیەکی گەرمی زۆر سارد، ئەوا ٤٠ غرام لەو هەڵمی ئاوە دەبارێنێ و (٢٠) غرامی وەکو پێویســتی لە ناو خۆیدا دێڵێتەوە. ئەگەر شوێنەکە کەمتر ســارد بوو، ئەوا ٣٠ غرام لەو هەڵمی ئاوە دەبارێنێ. لێرەوەیە کە تێ دەگەین، یەکێ لە فەزڵ و خەڵاتی خوا بە سەرمانەوە ئەوەیە کە: بیابان گەرمە، چونکە ئەگەر سەر ڕووی زەوی لە بەشی وشکانیدا هەمووی شــاخ و بەرزایی و کوێســتانی دڵگیر بوایە وەکو قەندیل و پیرەمەگــرون، ئەوە هەر زوو بارانەکە لەوێ دەباری و نەدەگەشــتە وڵاتــی ئێمە یان وڵاتی دوورتر لە زەریاکانەوە. کە ئەمەش وەڵامێکە بۆ ئەو کەســانەی کە بە نەزانی و ڕواڵەتبینی و سەرکێڵیەوە ڕەخنە دەگرن و دەڵێن: باشــە ئەم هەموو بیابانە وشکە لماویە بۆچی باشە. ســودی چییە؟ نە ئاوی لێیە. نە گژوگیای وەکو پێویستە لێ دەڕوێ. نــە بارانــی زۆر لێ دەبارێ. باشــە بۆچی خوای گــەورە ئەم هەموو بیابانەشــی نەدەکرد بە شــاخ و ســەیرانگا و تافگەی ئاو و خوڕەی بەفــراو؟! لە وەڵامدا دەڵێین: هەرچی خوای گــەورە بیکات بەجێیە و ڕەخنە هەرگیزا و هەرگیز لە درووســتکراوی خوا ناگیرێ. چونکە ئــەو خوایەی کە (خالق)ە، لە هەمان کاتدا (حەکیم) و کاربەجێشــە.. ئەوەتا لێرەدا لەم باسی بارانەدا گرنگی و بەنرخی ئەو بیابانە لماویە گەرمەمان بۆ دەردەکەوێ. کە ئەگەر هەموو دونیا شاخ و کوێستان و

گــوڵ و گوڵزار و ئاوی بەفــراوی هەبوایە، ئەوا دڵنیا بە دڵۆپێ باران نەدەگەیشــتە لای ئێمە.. چونکە تیشــکی خۆر لە (هێڵی إستواء)دا، بە ڕێکی لە ئاوەکان دەدات و زۆرترینی دەکاتە هەڵم، جا بۆ ئەوەی ئەم هەڵمە بگاتە شــوێنە ساردەکان و بە شێوەی باران بە سەریدا بباری، خــوای گەورە ئەو بیابانە گەورەی گەرم کردوە و تەخت کردوە!!. تا هەڵمی ئاوەکە بە هۆی باوە بگاتە هەموو ئەمســەرا و ســەری دونیا. (ســبحان الخالق) ئایا کێ ئەم سستەمە ڕێکوپێکەی بۆ هەوا و هەڵمی ئــاو دانا؟! کــێ تایبەتمەندی بە هەڵمبــوون و چڕبوونەوەی بە ئاو بەخشی؟! تەنها -الله- چونکە بەڕێزان: ئەگەر بهاتبایە ئاو وەکو ڕۆن زەیت گەرم ببوایە. ئەوا هەرگیز هەور درووست نەدەبوو!! وە ئەگەر ئاو وەکو بەنزین ببوایە بە هەڵم ئەوا ئاو لەم ســەرزەویە نەدەما و هەمــووی بــە یەك جار دەبوو بە هەڵم!!!، بەڵام ســەرنج بدە خوای گــەورە چەنــد بە جوانی پلەی بە هەڵمبوونی بــۆ ئاو داناوە، کە بە ئەندازەی پێویســت لێی دەبێ بە هەڵم.. یان کێ غەیری -الله- ئەو تایبەتمەندیەی بە هەوا بەخشیوە، کە ئاوا بە جوانی ئاو لەگەڵ خۆی هەڵدەگــری؟! کێ هەیــە غەیری -الله- بتوانێ بــۆ هەموو پلەیەکی گەرمــی، ڕێژەیەکی دیاریکراو لــە هەڵمی ئاوی دیاری کردوە، کە لەو پلە گەرمیەدا کە هەوا پێیدا تێپەڕ دەبێ، ناتوانێ لەوە زیاتر هەڵمی ئــاو لەگەڵ خــۆی هەڵبگری و دەبێ فڕێی بداتە خــوارەوە؟!! ئەوەتا ئەگەر پلەی گەرمی ســفری ســەدی بێ، ئەوا (٥) غرام لە هەڵمی ئاو لــە هەر مەتــر هەوایەکدا هەیــە. وە لە (٢٠) پلــەدا، (١٣٠) غرام ئاو

هەڵدەگرێ. جا ئەگەر پلەی گەرمی نزم بۆوە بۆ ســفری سەدی، ئەوا هەوا ئەو هەڵمی ئاوەی لە ناو خۆیدا هەڵی گرتوە، بە شــێوەی باران فــڕێ دەداتە خوارەوە بۆ ســەرزەوی و بەم شــێوەیە بــاران دەبارێ. ســبحان الله، هەمووی لەبەر خاتری تۆیە ئەی مرۆڤ، خوای گەورە ئــاوا تایبەتمەنــدی داوە بە هەوا، بە ئاو، بە تیشــکی خۆر، بە دەریا و زەریا، بە (با)، بە پلەکانی گەرمی، بە بەرزی و نزمی ســەر ڕووی زەوی، بە گەرمیان و کوێستان، بۆ ئەوەی تۆ بارانت بۆبباری، کەچی خەریکــە ئەوەندەی بارانمان لە بیرە، خالیقی بارانمان ئاوا بەردەوام لە یاد نەبێت؟!!..

ئیمانداران: قورئانی پڕ بەرەکەت، ئەم هەموو زانستەی کە باسمان کــرد لە یەك ئایەتدا کورت دەکاتەوە و دەفەرموێ: ﴿ ٱللَّهُ ٱلَّذِى يُرۡسِلُ ٱلرِّيَٰحَ فَتُثِيرُ سَحَابًا فَيَبۡسُطُهُۥ فِى ٱلسَّمَآءِ كَيۡفَ يَشَآءُ وَيَجۡعَلُهُۥ كِسَفًا فَتَرَى ٱلۡوَدۡقَ يَخۡرُجُ مِنۡ خِلَٰلِهِۦۖ فَإِذَآ أَصَابَ بِهِۦ مَن يَشَآءُ مِنۡ عِبَادِهِۦٓ إِذَا هُمۡ يَسۡتَبۡشِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَإِن كَانُواْ مِن قَبۡلِ أَن يُنَزَّلَ عَلَيۡهِم مِّن قَبۡلِهِۦ لَمُبۡلِسِينَ ﴿٤٩﴾ فَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ ءَاثَٰرِ رَحۡمَتِ ٱللَّهِ كَيۡفَ يُحۡىِ ٱلۡأَرۡضَ بَعۡدَ مَوۡتِهَآۚ إِنَّ ذَٰلِكَ لَمُحۡىِ ٱلۡمَوۡتَىٰۖ وَهُوَ عَلَىٰ كُلِّ شَىۡءٖ قَدِيرٞ ﴿٥٠﴾ ﴾ الروم: ٤٨ - ٥٠

واتە: خوا ئەو زاتەیە، کە چەندەها جۆر (با) دەنێرێت، ئەو (با)یە هەور هەڵدەگرێت و لەگەڵ خۆیدا ڕاپێچی دەکات. جا خوا پەخشــی دەکاتــەوە بە ئاســماندا، بە هەر شــێواز و شــێوەیەك کــە بیەوێت، هەورەکان پارچە پارچــە دەکات. ئینجا دەبینیت باران لە نێوانیاندا دەردەچێت و دادەبەزێتە سەر زەوی، جا کاتێك بارانەکەی باراند. بۆ

هەر تاقمێك لە بەندەكانی كە بیەوێت ئەوانیش یەكسەر خۆشحاڵ و دڵخۆش دەبن و موژدە دەدەن بە یەكتری، بە ڕاستی پێش ئەوەی باران داباریێتە سەریان، زۆر نائومێد و بێ هیوا بوون. جا ئیتر سەرنج بدە و تەماشای چەندەها ئاسەواری ڕەحمەتی خوا بكە، كە چۆن زەوی زیندوو دەكاتەوە و هەر ئەو زاتە دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێكدا هەیە. (مردووانیش وەك ڕووەك لە كاتی خۆیدا لە زەوی دەردەهێنێتەوە بۆ لێپرسینەوە)..

ئیمانداران: ئایا پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمەی چۆن زانی كە ئاوا هەڵمی ئاو لە خۆی دەگرێ و پاشان بە هۆی جیاوازی پلەكانی گەرمییەوە لە ناوچە جیاجیاكان باران دەبارێت؟! بەڵێ ئەمە قورئانە و كەلامی خوایە و قسەی پێغەمبەری (ﷺ) تێدا نییە و گەورەترین نەزان ئەو كەسەیە كە ئیمانی بەو قورئانە نییە.. پاشان سەرنجێكی تر: ئەم بارانە كە دەبارێتە سەر زەوی، ئایا كێ بۆمان هەڵدەگرێ؟! خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴾ الحجر: ٢٢

واتە: یەكێك لە بەخششەكانی خوا ئەوەیە، ئێمە شنەبامان ناردوە كە پیتێنەری ڕووەك و دار و درەختە، هەروەها بارانمان لە ئاسمانەوە باراندوە و ئیوەی پێ تێراو دەكەین (سەرەڕای كشتوكاڵ و زیندەوەران). بێ ئەوەی ئێوە ئەو ئاوانەتان زەخیرە كردبێت، ئێمە لە ژێر زەویدا بۆمان دابین كردوون، بە هۆی كانی یاخود بیرەوە دەستتان دەكەوێت..

بەڵێ با بیر بکەینەوە، ئەگەر خوای گەورە لە شـێوەی کانی و کارێز و ڕوبـاردا ئـەو ئاوەمـان بۆ هەڵنەگرێ لـە ژێر زەوی و سـەر زەویدا، توخوا بە ئێمـەی مرۆڤ هەڵدەگیرێ و عەمبار دەکرێ؟! مانایەکی تری ﴿بِخَـٰزِنِينَ﴾ ئەوەیە کە زانایان دەفەرموون: ئەو ئاوەی کە لە ناو سکی زەویدا عەمبار بوە و زەخیرە بوە، ئەوەندە زۆرە کە بەشـی ئەوە دەکات تەواوی سـەر زەوی دابپۆشـێ بە تەواوەتی. ئەوەندە زۆرە ئەو ئاوەی کە لە ژێر زەویدایە، ئەگەر کتوپڕ و بەیەك جار هەمووی بێتە دەرەوە، ئەوا بەشی ئەوە دەکات هەموو شاخەکانیش دابپۆشێ!!، ئەوەتا جاروبارێك لە کتوپـڕدا کانییەك دەتەقێ، ناوچەیەکی فراوان ژێر ئاو دەکەوێ!، کەچی سـبحان الله ئەو کانییە بە قەدەر پێویسـتی دێتە دەر، وە لە جێگایەك دێتە دەرەوە کە مرۆڤ بتوانێ سودی لێ ببینێ. بە شێوەیەك کە بەردەمی ئەو کانییە دەشتێکە، یان شاخە و بۆ ئاژەڵداری لە بارە، چەندە پێویستی مرۆڤ و کشتوکاڵ و ئاژەڵ بێ، ئەوەندە لەو کانییە دێتەدەر!!

ئیمانـداران: لە وەتەی دونیا هەیە، باران هەر بەو ڕێژەیە دەبارێ و هیچ کەمی نەکردوە. خـوای گەورە دەفەرموێ: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءًۢ بِقَدَرٍ﴾ المؤمنون: ١٨

واتـە: ئێمە لە ئاسـمانەوە بە ئەندازە و نەخشـەیەکی دیاریکراو بارانمان باراندوە..

زانایان دەڵێن: ئەو بڕە بارانەی کە دادەبارێتە سـەر زەوی، دەگاتە (١٦) ملیۆن تەن ئاو لە چرکەیەکدا. ئەمەش بە مانای ئەوەی کە ئەو بـڕە ئـاوەی کە دەبێ بە هەڵم لە یەك سـاڵدا، دەگاتە (٥١٣) تریلیۆن

طەن ئاو. ئەم ژمارەیەش یەکسانە بەو بڕە بارانەی کە لە سەر زەوی دەبــارێ لە ماوەی ســاڵێکدا. کەواتە: ئاو لــە خولانەوەدایە و دەوران دەکاتەوە بە ئەندازەگیری و حسابێکی تەواو. کە بەو بارانەوە ژیانی مــرۆڤ و هەموو زیندەوەران لە ســەر زەوی بەردەوام دەبێت. وە لە هەموو ساڵێکدا هەمان بڕی باران دەبارێ بە بێ کەم و زیاد هەروەکو قورئانی پیرۆز ئاماژەی پێ کرد. بەڵام ئایا بۆچی ساڵی وا هەیە باران زۆر دەبارێ و ســاڵانێکیش هەن، کە وشکە ساڵین و باران نابارێ، یان زۆر کــەم دەبارێ؟! لــە وەڵامدا دەڵێین: ئەو بــڕە بارانە وەکو خۆی لە ســەر زەوی دەبــارێ، بەڵام جاری وا هەیە بە ویســت و فەرمانی خوا لە شــوێنێك زۆر دەبارێ و لە شــوێنێ کەمتر، هەروەکو هەردوو صەحابەی پایەبەرزی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، (ئیبن عەباس و ئیبن مەســعود) لە پێغەمبەری خوایان (ﷺ) گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی:

(ماعامٌ بِأَمْطَرَ مِنْ عامٍ، مامِنْ عامٍ بِأَقَلَّ مَطَراً مِنْ عامٍ) سُنَن البَيْهَقي (٦٧١٥)

واتە: هیچ ساڵێك باراناویتر نابێت لە هیچ ساڵێکی تر، هیچ ساڵێکیش بێبارانیتر نابێت لە هیچ ســاڵێکی تر.. بەڵام ئەی کەواتە: بۆچی ساڵێك باران زۆرە و ســاڵێکیش بــاران کەمە؟! لێکۆڵینەوەکان دەریان خســتوە کــە ڕێژەیەکی زۆر سەرســوڕهێنەر ئاو لە زەویــدا هەیە کە بە نزیکەی (١٣٦٠) ملیــۆن کیلۆمەتــر دەخەملێنرێــت. کەلە (٩٧٪)ی ئاوی ســوێرە و لە (٢،٨٠٪)ی ئاوی شــیرین و ســازگارە، لەم ڕێژەیەشــی بەشی (٢،١٥٪)ی بەســتووی لە بەستەڵەکی جەمسەرەکان و سەرچیاکاندایە. ئەوی تریشی کــە ماوەتەوە بریتییە لە (٠،٦٥٪) کۆی هەموو ئەو ئاوانەن کە زۆربەیان

لە بەرگەزەویدا و بەشێوەی ئاوی ژێرزەوی هەڵگیراون و دواتر بە شێوەی کانیاو و بیر دێتە دەرەوە، هەندێکی تریان بریتین لە دەریا و ڕووبار و جۆگەلەی شـیرین و هەندێکی دیکەش بە شـێوەی هەڵمی ئاو لە بەرگی گازی زەویدا یان ناو زەوییە. ئاو (٧١٪)ی سەر زەوی داپۆشیوە کە فراوانی زەویەکەی نزیکەی (٥١٠) ملیۆن کم چوارگۆشەیە. واتە: زەوی (٣٦١) ملیۆن کم چوارگۆشـەی ئاوە و تەنها (١٤٩) ملیۆن کم چوارگۆشـەی وشـکانییە، بەم پێیەش ڕێژەی بوون بە هەڵم لە سەر ڕووی دەریا و زەریاکانەوە لە سـاڵێکدا خۆی دەدات لە: (٣٢٠,٠٠٠) کیلۆمەتر چوارگۆشـە لە کاتێکدا کە ڕێژەی بە هەڵمبوون لە وشـکانیدا نزیکەی (٦٠,٠٠٠) کلم چوارگۆشـەیە. گـەر بێـت و ئەم دوو ژمارەیەش کۆ بکەیتەوە، دەردەکەوێت کە سـوڕی ئاو لە نێوان زەوی و بەرگی گازیدا دەکاتە: (٣٨٠,٠٠٠) کلم لە چوارگۆشە لە سـاڵێکدا زۆربەی ئەم بە هەڵمبوونەش لە ناوچە بەستوەکاندا دەبێت کە پلەی گەرمای سـاڵانەی (٢٥) پلەی سـەدییە. هەروەها بوونی هەواش دەسـتێکی بـاڵای هەیە لـە بەهەڵمکردنیدا و بردنی بۆ پشـتێنەی لای خواروی بەرگە گازی زەوی ئەمەش بەوە دەبێت کە پلەی سـاردیەکەی زۆر دەبێت. تا دەگاتە (٦٠) پلەی ژێر سـفری سـەدییەوە. لە سـەر هێڵی سـتونی (خَط الإِسْـتِواء) بەم سـاردییە زۆرەش کرداری هەڵماندن چڕ دەبێتەوە و پاشان بە فەرمانی خوای کار ڕەوا، بە شێوەی باران یان بەفر یان تەرزە، یان شـەونم دێتە خوارەوە، توانستی خوای کردگار ڕێژەیەکی زیاتر دەنێرێتەوە بۆ سـەر وشـکانی لە وەی کە لێـی بوە بە هەڵم، کە بریتی بوو لە (٦٠,٠٠٠) کلم چوارگۆشـە. بەڵام (٩٦,٠٠٠) کلم چوارگۆشـە

گەڕایـــەوە بۆی. لە کاتێکـــدا کە (٢٨٤,٠٠٠) کلم چوارگۆشـــە لە (٣٢٠,٠٠٠) کلم چوارگۆشـــە گەڕایەوە بۆ دەریا و زەریـــاکان، واتە: ئەو (٣٦,٠٠٠) کلم چوارگۆشەی لە ڕێژەی خۆی زیاتر گەڕایەوە بۆ زەوی لە ڕێژەی گەڕانەوە بـــۆ دەریـــاکان کەمی کرد.. کەواتە: ڕێژەی بارانی وشـــکانی زیاتر بوو لە دەریاکان. هەر بۆیەشـــە ناتوانرێت بوترێت زیاتر باران دەبارێت، چونکە ئەگـــەر لەمـــلا کەم بکات لـــەولا زیاتر دەبێت و بـــە پێچەوانەوە، ئەگەر ژمـــارەی یەکەم و دووەم کۆبکرێتەوە، واتە: (٩٦,٠٠٠)مکە لەگەڵ (٢٨٤,٠٠٠) مکە، دەکاتەوە (٣٨٠,٠٠٠) کلم چوارگۆشـــە، هەروەك: (٦٠,٠٠٠ + ٣٢٠,٠٠٠) دەکاتەوە: (٣٨٠,٠٠٠) کلم چوارگۆشە. کە ئەمەش ڕێژەی سوڕی ئاو بوو لە نێـــوان زەوی و بەرگی گازییدا!!! مانای جیاوازی نێوان ئەم دوو ژمارەیە هەمان جیاوازییە کە لە نێوان بوونبەهەڵم و بارانەکەدا ڕووی داوە، بەو مانایـــەی چەند لـــە یەکەمدا زیادی کردوە، ئەوەنـــدە لە دووەمدا کەمی کـــردوە. لـــە دوای ئەوەی کە ڕێژەی باران لەســـەر وشـــکانیەکان بە بڕی (٣٦,٠٠٠) کلم چوارگۆشە زیادی کرد. دیسان لە وشکانیەکەشەوە دەڕژێتەوە دەریـــا و زەریـــاکان. واتە: نە هیچ زیادی کـــرد و نەهیچیش کەمی کرد. ئەم کرداری بە هەڵمبوونەش یەکێکی ترە لە گەواهیدەرەکانی بەدیهێنەر و ڕێکســـازیان کە چەندین حیکمەتی لە خۆ گرتوە. وەك: پاککردنەوەی ئـــاو و هەوا لە میکرۆب، ئینجا کەمکردنەوەی پلەی گەرما لە هاویندا و کەمکردنەوەی جیاوازی پلەی گەرما لە نێوان هاوین و زستاندا.

ئیمانداران: خوای پەروەردگار لە قورئاندا دەفەرمویٚ:

﴿ وَٱلسَّمَآءِ ذَاتِ ٱلرَّجۡعِ ﴾ الطارق: ١١

واتــە: ســوێند بە ئاســمانێك کــە خاوەنــی گێڕانەوەیــە.. جا ئەم گێڕانەوەیە ئەمڕۆ زانســت چەند شتێکی لێ دۆزیوەتەوە، وەکو: (سوڕی ئاو لە سروشــتدا، شــەپۆلەکانی تەلەفــۆن و ڕادیــۆ و تەلەفزیۆن و... هتد). کە ئێمە مەبەســتەکەمان زیاتر باســی بــاران بارینە. کە خوای پەروەردگار لەم ئایەتە پیرۆزەدا ڕاستییەکی زانستی گرنگمان بۆ ڕوون دەکاتــەوە کە زانســتی ئەمڕۆ دوای چەند ســەدەیەك لــە دوای هاتنە خوارەوەی قورئان گەیشت بەم ڕاستییە. ئەویش ئەوەیە کە: ئاوی زەریا و دەریاکان دەبن بە هەڵم ئەمجا بەرز دەبنەوە بۆ ئاســمان و پاشــان دەبن بە هەور و جارێکی تر بە شــێوەی باران دەگەڕێتەوە بۆ زەوی و جارێکی تر دەبێتەوە بە هەڵم و پاشــان دەبێتەوە بە ئاو و باران، ئەم کرداره ساڵانە دووبارە دەبێتەوە و بڕەکەیان زیاد و کەم ناکات. چونکە ئەوەی دەبێت بە هەڵم هەر ئەویشە دەبێتەوە بە باران.. باشە بەڕێزان: ئایــا دەگونجێ ئەم کارە دەراســا و موعجیزانە لەخۆوە ببن؟! ئەی ئایا دەگونجێــت پێغەمبەری ســەروەر و پێشــەوامان (ﷺ) لــە خۆوە ئەم زانیاریە گەورە حیســابیە گرنگــەی وتبێ؟!! بێگومان نەخێر. هەمووی خــوای پەروەردگاری جیهانیان پێی ڕاگەیاندوە.. بەڵام زۆرجار باران لە هەندێك شــوێندا زۆر دەبارێت و جارجار بە شێوەی لافاو دەردەکەوێت و لە هەندێك شوێنیشــدا بێبارانی دەبێت و وشکەســاڵی بە دوادا دێت. خۆ بێگومان ئێمەش بە ویســتی خوای خاوەن دانســت و توانست ڕوو دەدات و پــڕ لــە حیکمــەت و نهێنییە کە زۆرجار پــەی بەو نهێنیانە نابرێت. یاخود جۆرێکە لە سزای خۆی و ئاگادارکردنەوەشە بۆ کەسانی

ژیر و فامیدە. خۆ هەموو شــتێك لە بەدیهێنراوەكانی پەروەردگارا بە ڕێســا و یاســای خۆی و تایبەتیدا دەڕوات و هەمووی ئەندازە و كات و شــوێن و تەمەنیان بۆ دیاری كراوە. هەروەكو خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: ﴿ إِنَّا كُلَّ شَيْءٍ خَلَقْنَاهُ بِقَدَرٍ ﴿٤٩﴾ ﴾ القمر: ٤٩

یاخــود دەفەرموێ: ﴿ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَائِنُهُ وَمَا نُنَزِّلُهُ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ ﴾ الحجر: ٢١

واتە: هیچ شتێك نییە لە بەهرە و خەڵاتەكان كە گەنجینەكانی لای ئێمە نەبێت و ئێمە نای بەخشین بە ئەندازەی دیاریكراو لە كاتی لە باردا نەبێت..

## سەرچاوەكان:


١. حَدَّثَنا البَحر. د.محمد عبدالرحْمن العريفي، ص١٠.

٢. مَوْسُوعَة الإِعْجاز القُرْآني. د.نادِيَة طَيّارة. ج٢. ص١٩٧. ص٢٢٧. ص١٩٩.

٣. زنجیرەی موعجیزەكان، نووسینی: هارون یەحیا، و: ڕوناك عثمان سعید، ل ١٥٨.

٤. رَقائِق العَريفي. د.محمد عبدالرَّحْمن العريفي. ص٢٩.

٥. مَوْسُوعَة إِعْجاز القُرْآن الكريم. د.أَحمد مَصطَفى متولي. ص١٦١.

٦.آياتُ اللّه في الآفاق. د.محمد راتب النابُلُسي. ص١٨١.

٧. آياتُ الإِعْجاز العِلْمي. عبدالرَّحْمن سَعيدْ. ص١٠٣.

٨. خُطَب الشَّيْخ صالح الفوزان. ص٣٥٦.

٩. گۆڤاری (دوانگە)، ژمارە: ٤٠، ل٢٩.

# وتاری تایبەت بە نوێژەبارانە
## بەشی دووەکەم

الحَمْدُللهِ رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانی بەڕێز: زەریاکان ئاویان سوێرە و نزیکەی (٤/٣)ی ڕووی گۆی زەوی دادەپۆشن. واتە: نزیکەی (٣٦١) ملیۆن کیلۆمەتر چوارگۆشە. لە هەندێك جێگەدا دووری قوڵایی ئەم ئاوانە دەگەنە زیاتر لە (١١٥٢١) مەتر، هەروەکو: (دەمی ماریا لە زەریای ئارام) لە کاتێکدا ڕێژەی خوێ لە ئاوی زەریاکاندا دەگاتە (٣٥) بەش لە هەزار، لە ئاوی دەریاکانیشــدا (٣١ — ٣٨) بەش لە هەزار پێك دەهێنێت. خوێکان لە قوڵاییە دوورەکانی نێو زەریاکاندا دەبنە هۆی پاراســتنی ئاو لــە خراپبوون. چونکە ئاو لە قوڵاییەکاندا بۆ ماوەی درێژخایەن بە وەســتاویی دەمێنێتەوە. ئەم ڕێژە بەرزەی خوێش لە زەریاکاندا نەبوایە، کە چڕیەکەی بە شێوەی پلەبەند لە ڕووی ئاوەوە بۆ قوڵاییەکەی زیاد دەکات. ئەوا ئاوی دەریاکان خــراپ دەبوون. بەم شــێوەیە خوای گەورە بە خوێــکان دەریاکان لە بۆنکردن و خراپبوون دەپارێزێت. ئەگەرنا بەو ملیۆنەها ساڵەی کە لە تەمەنی زەوی تێپەڕی کردوە یان ئەو ماوەیەی، کە لە تەمەنی زەوی مــاوە، ئاوی دەریــاکان خراپ و بۆگەن دەبوون. خــوای کردگار دەریا سوێرەکانی کردوە بە عەمباری هەمیشەیی بۆ ئاوی شیرینی پێویست**

بۆ مرۆڤەکان و هەموو زیندەوەرانی سەر ڕووی زەوی. چونکە ناکرێت و ناتوانرێت ئاوی شیرین بۆ ماوەی درێژخایەن هەڵبگیرێت، واتە بەم شـێوەیە نەبوایە کە باسـمان کرد، ئەوا ئاو بۆگەنی دەکرد و بەکتریا مشەخۆرە جۆراوجۆرەکان ئاویان خراپ دەکرد.

بەڕێزان: باران بارین بە ویسـتی خوای گەورە بە چەند کارلێك و قۆناغێکدا دەڕوات، وەکو: پرۆسـەکانی تێربوونی هەوا بە هەڵمی ئاو: بـە پێی بیردۆزە تازەکانی داینامیـکای گەرمی، لە کاتی تێپەڕبوونی هەوای وشـك بە سەر ڕووی ئاوە سـوێرەکاندا، هەوا وشکەکە ئاوەکان دەخرۆشێنێت و دەیانجوڵێنێت. تاکو برێك لە هەڵمی ئاوی شیرینیان لێ دەربچێت. ئەو هەڵمەش سەر ڕووی ئاو دەکەوێت و هەوا وشکەکە بـە سـەر ئاوەکەدا تێپـەڕ دەبێت بە هەڵمەکە تـەڕ دەبێت و پڕ ئاو و شـێدار دەبێـت و پێـی دەگوترێت (بای بە هەڵمتێربـوو) یان پێی دەگوترێ: (شـێ).. شـێ بریتیە لـە هەڵمی ئاوی شـیرین، کاتێکیش هـەوا بە هەڵمی ئاو تێـر دەبێت، دەگاتە پلەیەك لە هاوسـەنگی کە پێی دەگوترێت (هاوسـەنگی داینامیکی). ئیتـر ئەوکاتە هەور توانای هەڵگرتنی چەندێکی تر لە هەڵمی نامێنێت، بە شێوەیەك لەو حاڵەتە هاوسەنگیەدا، ڕێژەی ئەوەی لە دەریا بە هەڵم دەبێت بەرامبەر دەبێت بـە ڕێژەی ئەو هەڵمەی لە هـەوادا چڕدەبێتەوە، کە ئەمەش زانایان بە (سـوڕی ئاو لە زەویدا ناوی دەبەن. ئەمەش کاتێ کە تیشـکی خۆر دەریا سوێرەکان دادەگرێت. هەڵمی ئاوی شیرینیش بە هۆی باوە سەر ڕووی دەریـا دەکەوێت. ئەو کاتە ئەو چینە هەوا وشـکەی بەر ڕووی

دەریا دەکەوێت پێشـوازی لە هەڵمە سـەرئاوکەوتوەکە دەکات و ڕێژە و بڕێکی دیاریکراو لە هەڵمی سـەر ئاوکەوتوەکـە وەردەگرێت. هەتا هەواکە دەگاتە ڕادەی بە ئاوتێربوون. یان: بە ئاوپڕبوون، یان: هەڵم، یـان حاڵەتی هاوسـەنگی داینامیکی، ئەو حاڵەتەی کـە بڕی هەڵمی سـەرئاوکەوتوو لە ڕووی ئاو یان زەریا سوێرەکان بەرامبەر دەبێت بە بـڕی چڕبوونـەوەی هەڵمی ئاو لە هەوای سـەر ڕووی دەریاکاندا، لە پلەی بە ئاوتێربوونی هەواشدا، توانای هەوا بۆ مژینی بڕی هەڵمی ئاو زیاد دەکات بە زیادبوونی پلەی گەرما، هەر بۆیە لە کاتی درەخشـانی تیشـکی خۆردا بە هەڵمبوون زیـاد دەکات. کاتێك بە فەرمانی خوای پـەروەردگار، با بە سـەر ڕووی زەریاکاندا دەگەڕێت، ئەو کات با ئەو چینە لە هەوای بەهەڵمتێربووی سەر ڕووی دەریاکان لادەبات و لەگەڵ خۆیـدا هەڵی دەگرێـت، لەبەر ئەوەی چڕی هەوای بـە هەڵمتێربوو کەمتـرە لە چڕی هەوای وشـك. بۆیە هەوا بـە هەڵمتێربووەکە، بە هـۆی کاریگەری باوە سـەر دەکەوێت بۆ چینـە بەرزەکانی هەوا. کە لـە وێش پلەکانی گەرما کـەم دەبێتەوە، لەو بەرزاییانەشـدا هەڵمی ئـاو چڕ دەبێتەوە و لە شـێوەی دڵۆپە، دڵۆپەی ئـاودا کۆدەبێتەوە و هەوری بە باران لە نێوان زەوی و ئاسماندا درووست دەکات. کاتێکیش با بۆ ماوەیەکی فراوان پاڵ بە چینە هەوا تێرئاوبوەکانەوە بە سـەر پانتایی و زەریاکاندا دەنێت، بە هۆکاری (با) هەوای وشـك جێی هەوا شـێدارەکە دەگرێتەوە، لێرەدا بۆ جارێکی تر ڕووی دەریا و زەریاکان بە هۆی ئەو هەوا وشـکەوە بە گەڕ دەکەونەوە و بڕێکی زۆری تر لە

ئـــاو لە شـــێوەی هەڵمدا لێ دەردەچێت و بـــە وەش ئەو هەوایەی بەر ڕووی دەریاكان دەكەوێت جارێكی تر شێدار و پڕ ئاو دەبێتەوە، تا بۆ جارێكی تر بە حاڵەتی هاوسەنگی داینامیكی دەگاتەوە، ئەم هەڵمەش بـــە هـــۆی كاری باوە دووبارە بەرز دەبێتەوەو بەو شـــێوەیە بەردەوام هـــەور درووســـت دەبێت و ســـووڕی ئاو لە زەویدا جـــار لە دوای جار دووبـــارە دەبێتەوە، ئەم هەڵمەش بە هـــۆی جووڵانی بەردەوامی باوە هەورە بارانیە قورســـەكان درووست دەكات و دەبێتە هۆی بارانبارین. لە هەموو جارێكدا هەوا ڕووی دەریاكان دەخرۆشێنێت، تاوەكو هەورە باراناویـــەكان درووســـت ببن، بڕی ئەو هەڵمەش كە ســـاڵانە هەوا لە دەریاكانـــی هەڵدەگرێت بە بڕی: (٣٦١٠٠٠) كلم ســـێجا، دەخەمڵێنرێت. بڕی هەڵمی ئاو كە بەرگەهەوا لە هەر كاتێكدا عەمباری دەكات، ساڵانە بە (١٣٥٠٠٠) كلم سێجا، دەخەمڵێنرێت، بەڵام بڕی هەڵمی عەمبارەكراو لە دەریا و زەریاكاندا بە بڕی (١٤٠٠,٠٠٠,٠٠٠) هەزار و چوارسەد ملیۆن كیلۆمەتر ســـێجا دەخەمڵێنرێت!!. دەی پاك و بێگەردی و ســـوپاس و ســـتایش و گەورەیی هەر بۆ ئەو خوایەیە كە ئاوی شـــیرین لە ئاوی ســـوێری دەریاكان درووست دەكات. كە ئەو ئاوە پاك و پڕبەرەكەت و شیرینەی باران كە لە ئاسمانەوە بۆمان دێتە خوارەوە لە ئاوی سوێری دەریاكان درووست دەبێت. شوكر و سوپاست دەكەین یا الله..

ئیماندارانی بەڕێز: پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە سەرچاوەی هەموو فەرمـــوودە و فەرمایشـــتەكانی لـــە خواوەیە و سروشـــتی خواییە و هـــەردەم دەبێت ڕاســـت دەرچێـــت. زۆرن ئـــەو فەرموودانەی كە لەم

ســەردەمەدا شایەتی لە سەر ڕاســتی پێغەمبەرایەتی ئەو کەسایەتیە گەورەیــە دەدەن. لە نێو ئــەو فەرموودانەدا، فەرموودەیەك هەیە کە زۆر سەرســوڕهێنەر و باس لە (باران) دەکات، هیچ کەس ناتوانێ ئەو پێشــبینیە بکات ئەگەر لە لایەن خوای بەدیهێنەرەوە نەنێردرابێت. بەڵام لە پێشدا با لە ڕووی زانستییەوە تیشکێك بخەینە سەر باران:

لــە ســەدەی حەوتەمــی زاینیــدا، ئەستێرەناســەکان ئاژانســی باوەڕپێکــراوی هەواڵەکانی کەشناســی بوون. ئەوان وایان دانابوو، کە باران بە هۆی بوونی هەندێك ئەســتێرە لە باری دیاریکراودا، کە بە بورج ناوزەد کرابوون دەبارێت و هەندێکیان وای بۆ دەچوون کە باران بژێوییــە و لە لایەن خواوەندەوە بۆ مــرۆڤ دەنێردرێت. بەڵام هەر بــە هاتنی پێغەمبەری خۆشەویســتمان (ﷺ) ئەو بیروبۆچوونانەی ڕەت کردەوە و بیرکردنەوەی زانســتی لە مێشکیاندا چاندو و ڕوونی کردەوە کە: باران و هەورە گرمە و هەورە برووسکە و خۆر و مانگ گیران و ئەوانی تر هەموویان بەڵگەن لە ســەر دەسەڵات و گەورەیی خوای باڵادەست و هەموو دیاردە سروشتیەکان بە پێی فەرمانی خوای بەدیهێنەریان بەڕێوە دەچن...

لــە شارســتانیەتی گریکەکاندا، خەڵکــی بارانیان بــە توڕەبوون و خەشمی خوا دادەنا. کە ئەوەش ئەفسانەیەکی تری ئەو کاتەی ئەوروپا بووە، بۆ ئەوەش پەیکەری تایبەتیان داتاشــیوە... هەموو زاناکانی ئەم ســەردەمە جەخت لەوە دەکەنەوە، کە باران دیاردەیەکی سروشتی زۆر ڕێکوپێــك و ئاڵۆزە و بۆ دروســتبوونی هەر دڵۆپێکــی باران چەندین

یاسـاى فیزیایـی ئاڵـۆز ڕۆڵ دەبینێت، بەڵام ئەوەى ئێسـتا نوێ بێت ئەوەیـە کە بە هۆى مانگە دەسـتکردەکانەوە دەرکەوتـووە، باران بە شێوەى بەردەوام لە شوێنە جیاجیاکانی سەر زەویدا دەبارێت. بە پێی ئەو مانگە دەسـتکردانە و بە پێی قسـەى زاناکان بەردەوام ئاسـمانی زەوى داپۆشراوە بە هەور و لە هەموو چرکەیەکدا هەورەبروسکە ڕوو دەدات. کـە ئەویش بەڵگەى بارانبارینە، بۆیە بەردەوام باران لەسـەر ڕووى زەوى دەبارێت!! بەشەکانی گۆى زەوى ئاڵوگۆڕى چوار وەرزەکان دەکەن. کاتێك لە نیوەى باکورى زەوى هاوین دەبێت، لە نیوەى باشورى زستان دەبێت و هەروەها... واتە: هیچ کاتێك نامێنێتەوە کە لە ناوچە جیاجیاکانی سـەر ڕووى زەوى بارانی تێدا نەبارێت. هەروەها زۆربەى ئەو بارانانەش دەچنە نێو دەریاکانەوە، ئەمانەش ڕاستی زانستین.. دەبا بزانین پێغەمبەرى ئیسلام، پێغەمبەرى سەروەر و سەرمەشقمان (ﷺ) لەو بارەیەوە چی دەفەرموێت؟! خۆشەویستمان دەفەرموێ: (مامِنْ ساعَةٍ مِنْ لَيْلٍ ولانَهارٍ إلاّ السّماءُ تَمطرُ فيها، يصرفه الله حَيْثُ يَشاءُ). رَواهُ الحاكم

ئەم فەرمودەیە جەخت لە ڕاسـتییەکی زانستی دەکاتەوە، ئەویش ئەوەیـە کـە هیچ کاتێك نییە بـە درێژایی شـەو و ڕۆژ بارانی تێدا نەبارێـت. ئەمـڕۆ مانگە دەسـتکردەکانیش بە ڕوونی ئەو ڕاسـتییە زانستییەیان دەرخستووە!! خواى گەورە دەفەرموێت: ﴿وَهُوَ ٱلَّذِيٓ أَرۡسَلَ ٱلرِّيَٰحَ بُشۡرَۢا بَيۡنَ يَدَيۡ رَحۡمَتِهِۦۚ وَأَنزَلۡنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءٗ طَهُورٗا ﴿٤٨﴾ لِّنُحۡـِۧيَ بِهِۦ بَلۡدَةٗ مَّيۡتٗا وَنُسۡقِيَهُۥ مِمَّا خَلَقۡنَآ أَنۡعَٰمٗا وَأَنَاسِيَّ كَثِيرٗا ﴿٤٩﴾ وَلَقَدۡ صَرَّفۡنَٰهُ بَيۡنَهُمۡ لِيَذَّكَّرُواْ فَأَبَىٰٓ أَكۡثَرُ ٱلنَّاسِ إِلَّا كُفُورٗا ﴿٥٠﴾﴾ الفرقان: ٤٨ - ٥٠

لە ڕاڤەی بەغەویدا هاتووە: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَاهُ بَيْنَهُمْ ﴾ بە مانای باران دێت کە ئاڵوگۆڕی پێ دەکات لە نێوان ناوچەکاندا.. ئیبن ئیسحاق و ئیبن جەریر و موقاتل و ئیبن مەسعود هەموو دەڵێن: هیچ ساڵێك لە ساڵێکی تر بە بارانتر نابێت. بەڵام خوای گەورە ئەو ڕۆزیەی دابەش کردوە کە لە ئاسماندایە، لەم وڵاتە بڕێك دەبارێنێت و لەوی تر بڕێکی تر و هەرکات ویستی لەمیان دەبڕێت و دەیدات بە لایەکی تر. بە ویست و ئیرادەی خوا کە خۆی پێی زانایە.

بەڕێزان: پێغەمبەری پێشەوامان، لە ژینگەیەکی بیاباناویدا دەژیا و نە مانگی دەستکرد و نە کامێرای وێنەگرتن و نە هەواڵنامەی کەشناسی لەلا بووە. هەروەها هیچ هۆکارێك بۆ پێشبینیکردن لە بارانبارین نەبووە. خۆ دەیتوانی قسەیەکی وا بکات کە نەتەوەکەی پێی قایل بن. بەڵام چۆن قسە لە ڕووداوێك یان دیاردەیەك دەکات کە بە سەدان ساڵ دوای خۆی دەدۆزرێتەوە، ئەگەر ئەوە وەحی خوایی نەبێت. ئەگەر ئەوە نەبێت ئەو چ پێویستی بەوەیە. کە باس لە دیاردەیەك بکات کە لەم سەردەمە و لە داهاتودا دەدۆزرێتەوە.. ئێستا با بزانین ڕووەکانی ئیعجاز لەو فەرمودەیەی پێشوودا کامانەن:

١. فەرموودەکە لە چەند وشەیەکی کورت و پاراودا باس لە ڕاستییەکی زانستی دەکات: (مامِن سـاعَةٍ مِنْ لَيْلٍ وَلا نَهارٍ إلاّ السّماء تمطر فيها يصرفه الله حَيْثُ يَشاء). سەرنج بدەن کە چۆن ئەو پێغەمبەرە مەزنە (ﷺ)، ڕاشکاوانە هەواڵێك دەدات کە پاش (١٤) سەدە زیاتر بە شێوەی پراکتیکی بۆ مرۆڤ دەردەکەوێت، هەواڵدانەکەش لە کوێدا

دەبێت؟! لە ژینگەیەکی بیاباناوی وشــك و برینگدا و لە ناو گەلێکی دوور لە زانست و تەکنیکدا!!

٢. پێغەمبــەر (ﷺ) دەربارەی پرســێکی زۆر گرنگ قســە دەکات کە ڕاســتییەکی زانســتییە دەربارەی باران و ئاوی سەر ڕووی زەوی، وەك دەفەرموێت: (یصرفه الله حَيْثُ يَشــاءُ). واتە: خوای گەورە بۆ هەر شوێنێك بیەوێت دەی بات، سەیر لێرەدا ئەوەیە: کە ئەمڕۆ چەندین ســەرچاوەی زانســتی گەورە هەن، باس لە سیستمێکی ورد دەکەن بۆ خولی ئاو لە سروشتدا و زاناکان جەخت لە جێگیری بڕی باران دەکەن لە سروشــتدا، هەروەها ئەو ئاوانەش دابەش دەبن بە ســەر ڕووبار و دەریا و دەریاچەکان و بە سوێر و شیرینیانەوە و بەشێکیشی دەگاتە قووڵایی زەوی و دەبێتە ئاوی ژێرزەوی.

٣. ڕوویەکی تری ئیعجازی فەرموودەکە ئەوەیە: کە کەســێك نەبــوە بتوانێــت بەرپەرچی محمد (ﷺ) بداتەوە، نە لە ســەردەمی خۆیدا کە پێی بڵێن باران چییە و کوا بارانە، خۆ ئێمە لە ژینگەیەکی بیاباناوی وشــکداین و تۆ چیت داوە لەو باســی بارانبارینە. نە لەم ســەردەمەدا کــە ناحەزی یەکجــار زۆرە، ئەمەش هەمــووی بەڵگەی ئیعجازی فەرموودەکەیە.

٤. ئیعجازێکــی دیکــەی فەرموودەکــە ئەوەیە: کە خــوای گەورە ئەو فەرموودەیەی پاراســتوە و بێدەســتکاری وەك خــۆی ماوەتەوە. هەرچەندە بە درێژایی ســەدان ســاڵ پێچەوانەی ڕاســتییەکانی ئەو ســەردەمانە بــووە. لــەو مــاوە زۆر دوور و درێژەی کە بە ســەریدا

تێپەڕیوە، موســڵمانان ئەم فەرمووودەیەیان پاراســتوە و لە ڕاستگۆیی پێغەمبەرەکەیان دڵنیابوون..

٥. پرســیارێك بۆ ئەوانــەی کە نکۆڵی لــە پێغەمبەرایەتی محمد (ﷺ) دەکــەن و دەڵێن: ئەو قورئانی داناوە تا ناوبانگ و دەســەڵات پەیدا بکات، ئەگەر وایە بۆچی باس لە ڕاســتییەکی زانســتی دەکات. کە بۆ ســەردەمانێك لە وانەیە هیچی نەگەیاندبێت؟! بۆ باســی شتی تایبەتی خۆی نەکردوە. ئەگەر ناوبانگ و خۆدەرخستنی ویستبێت؟!.. نەخێر حەزرەتی محمد (ﷺ) هیچی نەوتوە کە هی خۆی بێ بەڵکو (مايَنْطِــقُ عَنِ الهَوى إنْ هُوَ إلاّ وَحْيٌ يُوحَــى). دەی هەزاران صلاوەت لە دیداری بێت.

بەڕێزان: خوای گەورە ئەوەندەی ئاو لە ســەرزەوی دروست کردوە کە تا قیامەت بەشی هەموو مرۆڤایەتی بکات. با سەرنجێکی ژمارەی دانیشــتوانی ســەرزەوی بکەین. بزانین هەرچەندە مرۆڤ بەو شێوە بەرچاوە زۆر دەبێت، کەچی چۆن خوای گەورە هەموو پێویستیەکانی بە تایبەتی لە هەموویان گەورەتر و گرنگتر کە (ئاو)ە. بەشی هەمووی دابین کردوە.

ئەمەش خشتەکەیە. کە ساڵ و ژمارەی دانیشتوانی دیاری دەکات:

| ساڵ | ژمارەی دانیشتوان |
| --- | --- |
| ٦٠٠٠ پ.ز | ٥ ملیۆن مرۆڤ لەسەرزەوی ژیاوە. |
| ٤٥٠٠ پ.ز | ١٠ ملیۆن. |

| | |
|---|---|
| ١٦٥٠ ی زاینی | ٥٤٥ ملیۆن. |
| ١٨٠٠ ی زاینی | ١،١٧١ (یەك ملیار و سەدو حەفتاویەك ملیۆن) مرۆڤ |
| ١٩٣٥ ی زاینی | ٢ ملیار |
| ١٩٥٠ ی زاینی | ٢،٥٥٥ دوو ملیار و پێنج سەد و پەنجاوپێنج ملیۆن |
| ١٩٦٠ ی زاینی | ٣،٠٣٩ سێ ملیار و سی و نۆ ملیۆن |
| ١٩٧٠ ی زاینی | ٣،٧٠٧ سێ ملیار و حەوت سەد و حەوت ملیۆن |
| ١٩٨٠ ی زاینی | ٤،٤٥٦ چوار ملیار و چوارسەد و پەنجاوشەش ملیۆن |
| ١٩٩٠ ی زاینی | ٥،٢٨٣ پێنج ملیار و دووسەد و هەشتا و سێ ملیۆن |
| ٢٠٠٠ ی زاینی | ٦٠،٨٠ شەش ملیار و هەشتا ملیۆن |
| ٢٠٠٢ ی زاینی | ٦،٢٣٤ شەش ملیار و دوسەد و سی و چوار ملیۆن |
| ٢٠٠٤ ی زاینی | ٦،٣٨٦ شەش ملیار و سێ سەدو هەشتاوشەش میۆن |
| ٢٠٠٧ ی زاینی | ٦،٦٠٧ شەش ملیار و شەش سەد و حەوت ملیۆن |

وە لە بەرواری ٢٠٠٨/٣/٢٩ دا، کاتژمێر (١) ی بەیانی بە کاتی عێراق، دانیشتوانی سەرزەوی بوو بە (٦) ملیار و (٦٥٢) ملیۆن و (٩٥٧) هەزار و (٤٠٠) کەس. وە لە کۆتایی (٢٠١١) شدا بوو بە (٧) ملیار مرۆڤی تەواو..

بەڵێ خوای گەورە بۆ خۆی ئاوی ئەو هەموو مرۆڤە دابین دەکات، کە ساڵ بە ساڵ بە ملیۆن مرۆڤ زیاد دەکات. وە ئەگەر لە جیهاندا بە ملیۆنەها مرۆڤ موحتاجن بە ئاوی پاکی شـیاو بۆ خواردنەوە، ئەوە مرۆڤ خۆیەتی کە بە پیسـکردنی ژینگە بە گشتی و ئاو بە تایبەتی مرۆڤی تووشی ئەو قەیرانە کردوە..

ئیماندارانی بەڕێز: ئەم ئاوە کە خەڵاتێکی گەورەی خوای باڵادەست و بەخشندەیە، هەندێ جار لە کاتی خۆی دوادەکەوێ، یان هەرناباری -پەنا بەخوا- هەندێ ساڵیش لە کوردستانی ئێمە و وڵاتان بە گشتی ئەوەندە ناباری کە شایانی باس بێت. جا لەم حاڵەتانەدا کە وشکەساڵی و بێبارانی ڕوو دەکاتە موسڵمانان، لە ئیسلامدا نوێژەبارانە هەیە. کە ئەویش بە چەند شێوەیەك ئەنجام دەدرێت، بە ئومێدی ئەوەی خوای گەورە دەرگای ڕەحمەت بکاتەوە و بارانمان بۆبباریێت:

١. مُطْلَقُ الدُّعاءِ في أَيِّ الأَوْقاتِ أَحَب. وَهِيَ أَدْناها.. لای کەمی نوێژەبارانە ئەوەیە کە هەر کات موسڵمان بۆی گونجا و پێی خۆش بوو، دوعا بکات و لە خوای ڕەحمان و ڕەحیم بپاڕێتەوە کە خوا باران ببارێنێ، جا ئەم دوعاکردنە هەر کەس لە ئاستی خۆیەوە بیکات، یان کۆمەڵە موسڵمانێك بە یەکەوە، لە ماڵێکدا، لە دەشتێکدا، لە مزگەوتیکدا لە دوای نوێژێك، لە خوطبەی جومعەیەکدا، یان لە هەرکاتێکدا بە یەکەوە بیکەن و بە کۆمەڵ لە پەروەردگاریان بپاڕێنەوە کە بارانی ڕەحمەتیان بۆ ببارێنێ لەگەڵ هەموو موسڵمانان.

٢. وَأَوْسَطُها: الدُّعاءُ بَعْدَ رُكوع الرَّكْعَةِ الأَخيرَةِ مِنَّ الصَّلَواتِ الَمكتوبَةِ. وَخَلْفَ الصَّلَواتِ... لای ناوەڕاستی دوعای بارانبارین ئەوەیە کە: لە دوای هەڵسانەوە لە ڕکوعی کۆتا ڕکاتی نوێژی فەڕزەکان، دوعا بکرێت. وەکو دوعای قنوت و ئەو دوعایانە بخوێندرێ کە داوای باران دەکرێ لە خوای پەروەردگار، وە هەروەها لە دوای نوێژە فەرزەکانیشەوە دوعا بکرێت. جا ئەمەش بە تاك یان بە کۆمەڵ ئەنجام دەدرێ..

٣. وأَكْمَلُهـــا. تەواترینیان بریتییە لە نوێژەبارانە، کە لە دەشـــت دەکرێ لە دەرەوەی ئاوایی. باشـــە بۆچی لە دەشـــت دەکرێ و لە ناو مزگەوتدا ناکرێ؟! بۆیە لە دەشت دەکرێ بۆ ئەوەی ئەوە بچەسپێ کە عیبادەتی خوا و سوجدە و ڕکوعبردن بۆ خوا هەر لە مزگەوتا ناکرێ. هەر لە ئاوەدانیدا ناکرێ. ئەوەتا لە دەشت و دەر و دەرەوەی ئاوەدانی و مزگەوتیشدا دەبێ ئەنجام بدرێ. کەواتە: ئەی خەڵکینە بزانن دین تەنها بۆ ناو مزگەوت نییە. بۆیە یەکەم خاڵ کە نوێژەبارانە فێرمان دەکات و دەبـــێ لە ناخی خۆماندا بیچەســـپێنین و یەقینی تەواومان لە ســـەری هەبێت ئەوەیە کە: دینی ئیســـلام بۆ هەموو جێگەیەکە و تەنها بۆ ناو مزگەوت نییە. کە بە ڕاســـتی ئەگەر میللەتی موسڵمان، خوانەخواســـتە وای دەزانـــی، یان وایان تێگەیاندبـــوو کە دینی تەنها نێوانـــی خـــۆت و خوایە و هەر لە ناو مزگەوتا باســـی خوا و دین و ئیسلام دەکرێ، ئەینا لە سەیرانگا و دەشت و دەر و پارك و باخچەدا، نابێ باسی ئیسلام بکرێ، ئەوە پەنا بە خوا مایەی غەزەبی خوایە لەو میللەتە. ئەگەر یەکێ بڵێ: ئەی باشە خۆ لەو ئەوروپا و ئەمریکایە بە هیچ شـــێوەیەك ئیسلام نەك لە مزگەوتا لە هیچ جێگەیەکی ژیانیدا نییە. ئەی بۆچی بارانیشیان بۆ دەبارێ و تووشی وشکەساڵیش نابن؟! لە وەڵامـــدا دەڵێین: ئەوان نەیانوتووە ئێمە موســـڵمانین و پابەندی ئیســـلامین. خوای گەورەش ســـزای بێدینیەکەیانی بۆ هەڵگرتوون بۆ قیامەت و هەندێ سزای دونیاش وەکو دڵەڕاوکێ و نائارامی یەخەیان پـــێ دەگرێ. بەڵام ئێمە وتومانە موســـڵمانین و پابەندی ئیســـلامین

و ئەهلــی مزگەوتین لەبەر ئەوە نابێ بە ســەقەتی لــە دینەکەمان تــێ بگەین و وا بزانین تەنها لە مزگەوتا خواپەرســتی دەکرێ. دەی لە نوێژە بارانەدا، کە لە دەشــت دەکرێ، ئەو هەڵەیەمان بۆ ڕاســت دەکرێتەوە. پاشــان: پێویستە لە نوێژەبارانەدا کاربەدەستی وڵات لەو شــار و گوند و جێگەیە ئامادە بێ، لەگەڵ گەل و میللەتدا بەشــداری نوێــژە بارانەکــە بکات. کە ئەمەش ئەو پەیامەمــان پێ ڕادەگەیەنێ کە پێویســتە حکومەت و میللەت ئاشــت ببنەوە و بــە یەکەوە بن، نــەك بوتــرێ، دین و دەوڵەت لە یەکتر جیــان، بەڵکو دەبێ دەوڵەت لــە خزمەتی دینی خەڵکدا بێ. نوێژەبارانە کە یەکێ لە مەرجەکانی ئەوەیە کاربەدەســت و فەرمانڕەوا بەشــداری تێدا بــکات، ئەو وانە گەورەیەمــان فێــردەکات کــە: بەرەکەتی خوا بەســەر ئــەو گەل و میللەتەدا دەبارێ، کە کاربەدەســتانی هاوشانی میللەتە برسی و ڕەش و ڕووتەکە بێ. دەبێ کاربەدەســت هاوبەشــی میللەت بێ، هاوخەمی بــێ، نەك کاربەدەســت وا بزانێ بــاران هەر بۆ فــەلاح و جوتیار و هــەژار پێویســتە. خۆ ئەم گەنم و جۆی نییــە. ئەم کانی و کارێز و زەوی کشــتوکاڵی نییــە. ئەم بیرە نەوتی هەیە. ئیتر چ موشــکیلەی ئەوە باران دەبارێ یان نا!!. ئەو میللەتەش بەو کاربەدەستە ڕازی بێ کە هاوبەشــی خەم و گرفت و قەیران نەبێ، ئەویش موســتەحەقی بارانــی ڕەحمەت نییە. ئا لێــرەوە یەکێکی تر لە هۆکارەکانی ئەوەی کە لە ئەوروپا و ڕۆژئاوادا باران دەبارێ و بەرەکەت هەیە، ئەوەیە کە میللەت و حکومەت لە یەك بەرەدان و لە یەك جیا و جیاوازنین..

خاڵێکــی تر: کە پێویســتە لــە نوێژەبارانەدا هەبێ: (الخُــرُوجُ عَنِ المَظالِــمِ وَإِصْلاحِ ذاتِ البَيْنِ). خۆڕزگارکردن لە هەر ســتەمێك کە لە کەســێکت کردبــێ و لابردنــی ناکۆکیەکان و گەردنئــازادی یەکتر و صوڵح و ئاشــتەوایی نێوان کەســە ناکۆکەکان. هەرکەســە لە ئاستی خۆیەوە تەماشا بکات کە ستەمی لە کێ کردووە، ماڵی کێی خواردووە، دڵی کێی ئازار داوە، بچێ حەقەکەی بداتەوە و ئاشــتی بکاتەوە. بەم شێوەیە ئەم نوێژەبارانە دەبێتە فرسەتێك بۆ ئاشتبوونەوەی دڵەکان. بۆ چاکســازی لە کۆمەڵگادا. خوای پەروەردگار دەفەرموێ: (حەزرەتی نوح بە گەلەکەی فەرموو: ﴿ فَقُلْتُ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ غَفَّارًا ﴿١٠﴾ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴿١١﴾ ﴾ نوح: ١٠ – ١١

وە هەروەها لەســەر زمانی حەزرەتــی (هود) دەفەرموێ: ﴿ وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا ﴾ هود: ٥٢

ئیمانــداران: ئەگەر ســەرنجی ئــەم ئایەتە بدەیــن دەبینین کە: ﴿ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ﴾ هاتوە، پاشــان ﴿ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ﴾یــش هاتوە. خۆ لە ڕواڵەتدا داوای لێخۆشــبوون لە خــوا و تەوبەکردن هەر وەکو یەکە. ئــەی بۆچــی ئەمە ئــاوا هەردووکیانی هێناوە؟! خۆ بــە دڵنیاییەوە نابــێ قورئــان دووبارەبوونــەوەی تێدا بــێ؟! دەڵێیــن: واللّٰه أَعْلَم. مرۆڤی موسڵمان دەبێ لەم ئایەتەوە، وانەی (تَخْلِيە) بە (خاء) لەگەڵ (تَحْلِيَة) بە (حاء) فێر ببێ. بۆ ڕوونکردنەوەی ئەمەش دەڵێین: ئەگەر پەرداخێــك پڕ بێ لە قوڕاو، تۆش بتــەوێ ئاوێکی پاکی تێ بکەی و بی خۆیتەوە، ئەوا پێویستە یەکەم جار بێی (التَّخْلِيَة) ئەنجام بدەی،

ئەویــش بە وەی قوڕاوی ناو پەرداخەکــە بڕێژی و خاڵی بکەی لەو پیســیەی تیایەتی. پاشــان ئاوە پاکەکەی تێ بکەی کە پێی دەوترێ (التَّحْلِيَة). بە هەمان شــێوە تەوبە و پەشــیمانبوونەوە و گەڕانەوە بۆ لای خوای پەروەردگار هەر بە قســە نابێ، بەڵکو کردەوەی دەوێ، پێویســتی بەوە هەیە یەکەمجار چی ڕەوشــت و ڕەفتاری خراپە لە خۆتــی دوور بخەیتەوە و وازی لێ بینی و مافی ئەو کەســەی مافت خــواردوە بگێڕیتــەوە. ئەمجا کە ئاوا خۆت خاڵــی و پاك کردەوە لە خراپەکان، خۆشــت بڕازێنیتەوە بە جوانــی و چاکیەکان. لە جیاتی هــەر کردەوەیەکــی خراپ کە کردووتە هەوڵ بدەی و تێ بکۆشــی و خۆت ڕابێنی لە ســەر ئەوەی کە کردەوەیەکــی جوان ئەنجام بدەی. جا کە هەریەك لە ئێمە ئاوا تەوبەی کرد و داوای لێخۆشــبوونی لە خوا کرد و نێوانی خۆی لەگەڵ ئیماندارانی دەورووبەر و هاوپیشە و هاوماڵ و هاوشاریدا چاك کرد، ئەوە بێگومان خوای گەورە ڕەحمەتی خۆیمان بە سەردا دەبارێنێ و بارانی ڕەحمەتمان بۆ دەبارێ.

٤. پاشــان پێشــەوای موسڵمانان فەرمان بە موســڵمانان دەکات کە چوار ڕۆژ لە سەر یەك بە ڕۆژوو بن و لە ڕۆژی چوارەمدا، بە زمانی بــە ڕۆژووەوە، بە زەلیلی و ملکەچییەوە، هەموو خەڵکەکە تێکڕا ڕوو بکەنە دەشت و دەر و نوێژەبارانە بکەن.

ئیماندارانی خۆشەویســت: بێبارانی هەر ئەم ساڵە و ساڵانێکی تر ڕووی نــەداوە، بەڵکو لە دێرزەمانــەوە بێبارانی ڕووی داوە. هەروەکو لە زەمانی پێغەمبەری خۆشەویســتماندا (ﷺ) ڕووی داوە، با بچینە

خزمــەت هاوەڵی بەڕێزی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە ئەنەســی کوڕی مالیکــە. کە بۆمــان دەگێڕێتــەوە و دەفەرمــوێ: ڕۆژێ هەینی بوو، پێغەمبــەری خــوا (ﷺ) لە ســەر مینبــەر وتــاری ڕۆژی جومعەی دەخوێندەوە، ئا لەو کاتەدا کابرایەك خۆی کرد بە ناو مزگەوتدا و لە دەرگاوە هاواری کرد و وتی: (يارَسُــولَ اللهِ هَلَكَتِ الأَمْوالُ وانْقَطَعْتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ يَغِثْنا). ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ماڵ و سامانمان کشتوکاڵ و فەلاحەتمــان، ئاژەڵ و لەوەڕگامان هیچــی نەما. هەمووی فەوتا و لــە بێبارانیدا وشــك بوو. جۆگە و جۆبار و کانــی و کارێزمان ئاوی تێدا نەماو خەریکە زۆربەی شوێنەکان لە بەر بێئاوی کۆچ دەکەن و نازانــن ڕوو لە کوێ بکــەن. دەی توخوا بۆمان لە خوا بپاڕێوە بەڵکو خــوای گەورە بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنێ، پێغەمبەری خوا (ﷺ) جوان گوێی بۆ قســەی ئەم کابرایە گرت. کە دەروونی وەکو دەشــتی وشکی لێ هاتبوو. کاریگەری ئەو ساڵە وشك و بێبارانیە کاری کردبوە ســەر ناخی و ســەر دەمی و سەر زمانی و ســەر قسەکانیشی. بەڵکو داوای دوعای خێری دەکرد. پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەر لە ناو وتاری جومعەکەدا (رَفَعَ رَسُــولُ اللهِ (ﷺ) يَدَيْهِ) حەزرەتی رســول الله. هەردوو دەســتی بەرز کردەوە بەرەو ئاسمان و فەرموی: (اللّهُمَّ أَغْثِنا اللّهُمَّ أَغْثِنا) خوایــە گیان بارانمان بۆ ببارێنی، خوایە گیان بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنی. ئەنەس کە ئەم بە سەرهاتەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێ: (وَاللهِ مانَرى في السَّــماءِ سَــحابٌ وَلا قزعَةٌ، وَمــا بَيْنَنا وَبَيْنَ سَــلْعٍ – جَبَلٌ في المَدنيةِ – مِنْ بُنْيانٍ وَلا دارٍ، فَطَلَعَتْ مِنْ وَرِئِهِ سَــحابَةٌ مِثْلُ الترسِ، فَلَمَّا توسطتِ

السَّــماءُ انْتَشَــرَتْ، ثُمَّ امْطَرَتْ). واتە: ســوێند بە خوا هەرچی پارچەو پەڵــە هەورێك بێ بەو ئاســمانەوە نەمانبینی بوو، لە نێوان ئێمە و شاخەکەشدا نە باڵەخانەیەك و نە خانویەك نەبوو. هەر ئەوەندەمان زانی کە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعاکەی کرد. لەو دیو شــاخەکەوە هەورێك وەکو شاخێکی گەورە دەرکەوت. جا کاتێ گەیشتە ناوەڕاستی ئاســمان بڵاو بۆوە و پاشان باران دای کرد!! ئەنەس دەفەرموێ: (فَلا وَاللهِ مارَأَيْنا الشَّــمْسَ سَبْتاً) سوێندی کەسم لەسەر نییە، بە خوای گەورە ماوەی یەك حەفتە چاومان بە خۆر نەکەوت، بەردەوام هەر هەور و باران بوو. (ثُمَّ دَخَلَ رَجُلٌ مِنْ ذالِكَ الباب في الجُمُعَةِ المُقْبِلَة، وَرَسُولُ الله (ﷺ) قائِــمٌ يَخْطُبُ) پــاش ئەو حەفتەیە لە هەمان دەرگای جاری پێشــوەوە کابرایــەك هاتــە مزگەوتــەوە و لەو کاتەدا پێغەمبــەری خوا (ﷺ) خوطبەی ڕۆژی جومعەی لەســەر مینبەر دەخوێندەوە. کابرا هاواری کردەوە: (يارَسُولَ اللهِ، هَلَكَتِ الأَمْوالُ وانْقَطَعَتِ السُّبُلُ، فَادْعُ اللهَ يُمْسِكها عَنّا). ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەرچی ماڵ و حاڵمان هەیە، کشتوکاڵ و فەلاحەتمان هەیە، باخ و دێبەرمان هەیە، هەمووی وێران بوو. جۆگە و کارێــز و کانیمــان هەمووی تەقی و تێکچــوو. بە هۆی ئەو هەموو بارانە زۆرەوە کە لە ماوەی ئەم حەفتەیەدا بە سەرماندا باریوە. دەی توخوا ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) دوعامان بۆ بکە کە خوای گەورە لە ســەرمان بیگرێتەوە و هیچی تر نەباری!!.. (فَرَفَعَ رَسُــولُ الله (ﷺ) يَدَيْــهِ ثُمَّ قــالَ: (اللّهُمَّ حَوالَيْنا وَلا عَلَيْنــا). پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەردوو دەســتی بەرز کردەوە و فەرمووی: خوایە گیــان بە دەوروبەرماندا

بــی بارێنه و به ســەرماندا مــەی بارێنه. (ئەمــەش ئەدەبی دوعای پێغەمبــەری خوایــە (ﷺ) کە داوای لە خوای گــەورە نەکرد کە بە یەکجاری بارانەکە بگرێتەوە. چونکە ڕەنگبێ هێشتا موحتاج بین بە ئــەوەی بەردەوام بێ و خوای گەورە هیچ کارێکی بێ حیکمەت نییە. بۆیــە لە دوعاکەیــدا فەرمووی: خوایە گیــان زەرەری ئەم بارانەمان لێ لادە و لە نەفع و خێر و بەرەکەتی بێبەشــمان مەکە!!) بەڵام بە داخــەوە ئێمە کە کاتێ زۆر باری ئاوا وەکــو پێغەمبەری خوا (ﷺ) ناپاڕێینەوە، بەڵکو ناشــکوری دەکەیــن و دەڵێین ئەمە چی بوو هەر خۆشــی نەکــردەوە!! بەڵێ پێغەمبەری خوا (ﷺ) دەســتەکانی بەرز کردەوە و فەرمووی: خوایە لە دەوروبەرمان بی بارێنە و لە سەرمان مــەی بارێنــە. خوایە گیان لە ســەر شــیو و دۆڵ و دارســتانەکان و ڕەگی درەختەکان بباریێ.. ئەنەس دەفەرموێ: (فَانْقَلَعَتْ وَخَرَجْنا نَمْشي في الشَّمْسِ). بارانەکە وەستایەوە و ئێمەش کە لە مزگەوت هاتینە دەرەوە دوای تەواوبوونی نوێژی جومعە، لە بەر خۆر دەڕۆشــتین و بوو بە ســامالّی پاك و هەور بە ئاســمانەوە نەما!! ئــەم فەرموودەیە (مُتَّفَقٌ عَلَيْــهِ). دەی خوای پەروەردگار ئێمەش لەم وشکەســاڵی و بێبارانیەدا، لێــت دەپاڕێینەوە کە بە حورمەتی ئەم دوعایــەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کــردی و فەرمــووی: (اللّهُمَّ أَغِثْنا، اللّهُــمَّ أَغِثْنا). ئێمەش دەڵێین خوایــە: بارانمان بۆ ببارێنە، بارانمان بۆ ببارێنە بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنە. اللهم آمین..

# وتاری تایبەت بە نوێژەبارانە
## بەشی سێیەکەم

الحَمْدُلله رَبِّ العالَمين. والصَّلاة والسَّلام عَلى سَيِّدنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ أَجْمَعينَ:

**ئیماندارانـــی بەڕێز: لـــە زەمانی پێغەمبەری پێشـــەواماندا (ﷺ) موســـڵمانان تووشـــی وشـــکە ســـاڵی بوون و بێبارانی تینی بۆ هێنان. بۆیـــە چوونە خزمەت پێغەمبەری خوا و (ﷺ)شـــکوای حاڵی خۆیان کـــرد کە چـــۆن بێبارانی تینی بۆ هێنـــاون و پێغەمبەری خوا (ﷺ) چـــۆن ڕێنماییـــان دەکات. پێغەمبەری خـــوا (ﷺ) فەرمانی فەرموو مینبەرێکی بۆ درووست بکەن و پاشان ڕۆژێکی دیاری کرد کە تێکڕای خەڵکەکە چوونە دەشـــت و پاشان لە خوا پاڕایەوە و ئەوەندە دەستی موبارەکـــی بەرز کردەوە بەرەو ئاســـمان** (حَتَّى بَدا بَيـــاضَ إِبْطَيْهِ). **هەتا ســـپیایی بن باڵی دەرکەوت.. خوای پـــەروەردگار وەڵامی داوا و نزای پێغەمبـــەری دایەوە و** (فَأَنْشَـــأَ اللهُ سَـــحابَةً، فرعدت وَبرقـــت، ثُمَّ بِإِذْنِ اللهِ) **دەســـت بەجێ خوای گەورە هەوری هێنا و هەورە بروســـکە دەســـتی پێکرد و باران دایکرد بە ویســـتی خوا.** (فَلَمْ يَأْتِ مَسْـــجِدَهُ، حَتَّى سالَتِ السُّـــيُولُ) **هێشتا نەگەیشـــتبوونەوە مزگەوتەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کە ســـوراو لە هەموو شـــیو و دۆڵەکانەوە هات.** (فَلَمّا رَأَى سرعتهم إِلى الكِنِّ ضَحِـــكَ (ﷺ) حَتَّى بَـــدَتْ نَواجِذَهُ) **پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە بینی ئەو**

خەڵکــە چۆن ڕادەکات لەبەر بە خوڕەمی بارانەکە و خۆی بۆ پەنا و پەسیر دەکوتێ، پێکەنی و زەردەخەنەی هاتێ، هەتا خرێ ی پیرۆزی لەکاتی پێکەنین و زەردەخەنەکەدا دەرکەوتن، ئەمجا فەرموی: (أَشْهَدُ أَنَّ اللهَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدير، وَأَنِّي عَبْدُاللهِ وَرَسُولُهُ). شایەتی دەدەم کە بە ڕاستی خوای پەروەردگار توانا و دەسەڵاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیە و بە ڕاستی من بەندە و پێغەمبەری خوام..

ئیماندارانــی بەڕێز: لــە زەمانی ئەمیــری ئیمانــداران، خەلیفە عومــەری کوڕی خطــاب دا، بێبارانــی ڕووی دا. جــا ئەنەس بۆمان دەگێڕێتــەوە و دەفەرموێ: (أَنَّ عُمَرَ ابنَ الخَطّاب كانَ إذا قَحَطُوا إسْتَسْــقى بالْعَبّاس بنْ عَبْدُالمُطَلّبِ، فَقالَ: اللّهُمَّ إنّا كُنّا نَتَوَسَّــلُ إلَيْكَ بنَبيّنا فَتَســقينا، وَإنّا نَتَوَسَّلُ إلَيْكَ بِعَمّ نَبِيّنا فَاسْقِنا، قالَ: فَيُسْقَوْنَ) رَواهُ البُخاريُّ (٩٦٤)

واتە: ئیمامی عومەر عادەتی وا بوو، لە کاتی وشکەســاڵی و بێبارانیدا، بە خاتری عەبباســی کــوڕی عبدالمطلب، کە مامــەی پێغەمبەری خوایە (ﷺ) لە خوا دەپاڕایەوە و داوای بارانی دەکرد و دەیفەرموو: پەروەردگارا ئێمــە جاران کە پێغەمبەری خــوا (ﷺ) لە ناوماندا بوو بە خاتری قەدر و حورمەتــی پێغەمبــەری خوا (ﷺ) لە لای تۆ، لێت دەپاڕاینەوە و داوای بارانی ڕەحمەتمان لێ دەکردی و خوایە تۆش بۆت دەباراندین. دەی خوایە گیان وا ئێســتا ئێمە لێت دەپاڕێینەوە و داوات لێ دەکەین کە بە قەدر و حورمەتــی مامی پێغەمبەرەکەمان عەبباس، ڕەحممان پێ بکەی و بارانی ڕەحمەتمان بە سەردا ببارێنی. ئەنەس دەفەرموێ: کە ئیمامی عومەر ئاوا دەپاڕایەوە لە خوا و داوای بارانی دەکرد، خوای گەورە بارانی بۆ دەباراندن.

ئیماندارانـــی بەرێـــز: ســـوننەتە لـــە کاتی ڕۆیشـــتن بۆ دەشـــت و دەر بـــۆ ئەنجامدانـــی نوێژەبارانە، موســـڵمانان منالانی بچوك و پیر و بە ســـالاچوان لەگـــەڵ خۆیان ببەن. هەروەهـــا ئاژەڵ و مەڕ و مالاتەکانیشـــیان لەگـــەڵ خۆیان ببەن. چونکـــە ئەو موصیبەت و نارەحەتیانەی کە ئەمان هەمووی بۆی هاتوونە دەرەوە کە بێبارانی و وشکەساڵییە، هەموویانی گرتۆتەوە، هەر لە منالی ساوا و گەنجەوە تا پیر و بە ســـالاچوو. وە ئاژەڵەکانیشی گرتۆتەوە ئەوانیش بێئاوی و بێلەوەڕگایی تینیان بۆ دێنێ.. لە شەرعدا دەفەرموێ: (وَلا يَنْبَغـي أَنْ يَمْنَـــعَ أَهْلُ الذِّمَّةِ مِنْ حُضُورِها). پێویســـت نییە کە موســـڵمانان ڕێگری بکەن لە وەی ئەهلی زیممە لە گاور و جولەکە بەشداری ئەو نوێژە بارانەیان لەگەڵ بکەن و ئامادەی گردبوونەوەکە ببن. چونکە ئیســـلام مافی هاولاتی بوونی پێ بەخشـــیوین و هەر لە ســـەرەتاوە ئەوەی ڕاگەیاندوە: هەموو ئەو کەســـانەی کە لە دین و بیروباوەڕی ئیسلامەتیشدا لەگەڵمان نین و هاودینمان نین، بەلام خۆ هاوژیانمان و هاولاتیمانـــن، لە ســـەر یـــەك زەوی دەژین، لە ژێر یەك ئاســـمان کۆبووینەتـــەوە، یەك ئاو لە هەمان ســـەرچاوەی ئاو دەخۆینەوە، لە یـــەك زەویدا دەچێنین و کشـــتوکاڵ و فەلاحەت دەکەین و لە یەك بازاڕدا معامەلە و کەســـابەت دەکەین و بە یەك دراوی ولاتەکەمان ئاڵو وێر دەکەین.. لەبەر ئەوە نابێ بە ناوی ئەوەی موســـڵمان نین، ڕێگریان لـــێ بکرێ لەو گردبوونەوەی بۆ داواکردنی باران لە خوای پەروەردگار ئەنجام دەدرێ!..

ئیماندارانك هەندێ جار خوای گەورە كە دەریای كەرەم و بەخشش و سۆزی دەجۆشێ و دەخرۆشێ و ڕەحم دەنوێنێ و غەزەبمان لەسەر لادەبـــات، بە هۆی مێرووولەیەكی بچكۆلەوەیە. كە ئەویش وەكو ئێمە هەســـت بە ئازار و مەینەتـــی و نارەحەتی بێبارانی دەكات و لە خوا دەپاڕێتەوە و داوای باران دەكات. كە ئەمەش لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەرمانـــدا (ﷺ) هاتوە كە ئەم فەرمـــوودەی دەی خوێنینەوە: (صَحَّحَهُ الأَلْبَانِي فِي المِشكَاة، رَقَم (١٥١٠). و دەفەرموێ: سولەیمان پێغەمبەر، لـــەو كاتەدا كە زەوی وشـــك هەڵاتبـــوو، هەمووی قەڵشـــا بوو، درزی گـــەورەی تـــێ ببوو. كاتـــێ كە زۆر دەمێـــك بوو باران نەبـــاری بوو. بۆیە حەزرەتی ســـولەیمان خەڵكەكـــەی كۆكردەوە و بەڕێ كەوتن بۆ دەشـــتودەر بۆ پاڕانەوە و نوێژەبارانە، لە ڕێگادا حەزرەتی سولەیمان چاوی بە مێرولەیەك كەوت كە لە سەر پشت ڕاكشابوو، قاچە باریك و بچكۆلەكانـــی لە ئاســـمان كردبـــوو. لە خوا دەپاڕایـــەوە -بێگومان حەزرەتی سولەیمان لە زمانی مێرولە و هەموو زیندەوەر و باڵندەكان تێگەیشـــتوە بە ویســـتی خوا- مێرووولەكە دەیگوت: خوایە گیان، ئەی پەروەردگارمـــان، ئێمـــەش كـــە مێرولەین، یەكێكین لـــە مەخلوق و درووســـتكراوەكانی تـــۆ. خوایە ئێمە بە پێی ئەو دەســـتور و ڕێگایە دەڕۆیـــن بەڕێوە كە تۆ بـــۆت دیاری كردوین، خوایـــە بە هۆی هەڵە و خراپـــەكاری بەنـــی ئادەمەوە غەزەب لە ئێمـــەش نەگری و بارانی ڕەحمەتمان بۆ ببارێنی. حەزرەتی سولەیمان كە ئەم دیمەنەی بیست و بینی، فەرمووی: ئەی خەڵكینە: (إرجِعُوا فَقَدْ سُقيتُمْ بِدُعاءِ نَمْلَةٍ)

بگەڕێنەوە، دڵنیابن خوای گەورە بارانتان بۆ دەبارێنێ بە هۆی دوعای مێرولەیەکەوە!..

بەڕێـــزان: باشـــە بۆچی مێرولـــە لەناو هەمـــوو زیندەوەراندا لەم فەرمودەیـــەی پێغەمبـــەری خوادا (ﷺ) باس كـــراوە. ئایا مێرووله زمـــان دەزانێ؟! بەڵێ. خـــوای گەورە لە قورئاندا باســـی ئەوەمان بۆ دەكات كە سەركردەی شـــارە مێروولەیەك بە مێروولەكانی شارەكەی وت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّمۡلُ ٱدۡخُلُواْ مَسَٰكِنَكُمۡ لَا يَحۡطِمَنَّكُمۡ سُلَيۡمَٰنُ وَجُنُودُهُۥ وَهُمۡ لَا يَشۡعُرُونَ ١٨ ﴾ النمل: ١٨

لە باســـی ئەوەی كە حەزرەتی ســـولەیمان و لەشـــكرەكەی بەوێدا تێپەڕیـــن ئەم مێروولـــە، وەكو ســـەركردەیەكی خەمخـــۆر داوای لە لەشـــكرەكەی كـــرد كە بڕۆنـــە كونەكانیانەوە، نەوەكـــو بكەونە ژێر ناڵی ئەســـپەكانی لەشـــكرەكەی ســـولەیمانەوە. لە كاتێكا ســـولەیمان و لەشـــكرەكەی ئـــەوان نابینن.. بەڵێ ئەمڕۆ زانســـت دەڵێ: مێرووله زیاتـــر لە (٩) هەزار جۆری هەیە، مێروولـــە ژیانی ڕێك وەكو مرۆڤ وایـــە. (هەیانـــە بە كۆمەڵ لە شـــاردا دەژی، هەیانە كـــۆچ و كۆچبار دەكات. هەیـــە بە كەســـابەتی شـــانی خۆی دەژی، هەشـــیانە بە ڕاوە ڕووت و داگیـــركاری خۆی دەژیەنێت. مێروولـــە حەزی بە ژیانی بە كۆمەڵە. ئەگەر یەكێكیان بە تەنها بكەیتە شووشـــەیەكەوە خۆراك و جێگاو هەوای باشی بۆ دابین بكەی، چونكە بە تەنهایە هەر دەمرێ! مرۆڤیـــش ئەگـــەر (٢٠) ڕۆژ دووری بخەیتـــەوە لە خەڵكـــی، دوور لە تیشـــكی خۆر و ڕووناكی و دەنگ و كاتژمێر و نەزانێ شـــەو و ڕۆژ

چۆنە، تەوازونی لە دەست دەدات.. مێرووله زۆر چالاك و بە تەماحە و حەزی لە كۆشك و خواردنی خۆش هەیە، كە مردیش مێروولەكان لە شارەكەیان لای دەبەن و دەیبەن بۆ گۆڕستان!! ئەم فەرموودەیەش ئیعجازێكــی ترە لە فەرموودی موعجیزەكانی پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە ئاوا باســی مێرووله و خەمخۆری بۆ ژیانی خۆی دەكات و ئەگەر خــوای پەروەردگار پێغەمبەری خۆشەویســتی (ﷺ) فێر نەكردبێ، ئەی چۆن ئەمەی زانی؟!

ئیمانداران: یەكێكی تر لەو شــتانەی كە پێویســتە موسڵمانان لە كاتی بێبارانی و ترسی وشكەساڵیدا ئەنجامی بدەن، بریتییە لە وەی صەدەقە و خێر و خێرات بە هەژاران و داماوان بكرێت.. پێغەمبەری خــوا (ﷺ) دەفەرموێ: (بَيْنَما رَجُلٌ يَمْشــي بفلاة مِــنَ الأَرْضِ) لە كاتێكا كەسێك بە دەشت و چۆڵەوانیەكدا بە تەنها دەڕۆیشت. (فَسَمِعَ صَوْتاً في سَــحابَةٍ) گوێی لە دەنگێك بوو كە لە ناو هەورێكەوە دەهات هەورێك لە ئاســتی سەری ئەم كابرایە بوو لەو بیابانەدا، ئەم پیاوە گوێی لێ بوو دەنگێك لە هەورەكەوە هات و وتی: (إِسْقِ حَديقَةَ فُلانٍ) ئەی هەور باخــی فلان كەس ئــاو بدە. ئەم پیاوە بینی (فَتَنَحَّى ذالِكَ السَّــحابُ) هەركە ئەم قســەو فەرمانە بە هەورەكە كرا، یەكسەر هەورەكە خۆی نەوی كردو ڕۆیشــت (فَأَفْرَغَ ماءَهُ في حَرَّةٍ، فَإذا شــرجَة مِنْ تِلْكَ الشِّــراجِ قَدْ إِسْتَوْعَبَتْ ذالِكَ الماءَ كُلَّهُ) هەورەكە ئاوەكەی ناوی خاڵی كرد و هەمووی كۆبۆوە و ڕۆیشــت بۆ ناو ئەســتێلێكی گەورە (كە نیمچە بەنداوێكە). لەو ئەستێلكەوە جۆگەیەك دەڕۆیشــت بەرەو كێڵگە و باخێك. (فَتَتَبَّعَ

الماءُ) کابرا بە شوێن جۆگەلە ئاوەکەدا ڕۆیشت هەتا گەیشتە ناو باخەکە. (فَإذا رَجُلٌ قائِمٌ في حَديقَتِهِ يحول الماء بِمِسْحاتِه). تەماشای کرد وا کابرایەکی باخەوان خەریکی کارکردنە و بە خاکەنازەکەی ئاوەکەی دەکردە ژێر درەختەکانەوە و باخەکەی ئاو دەدا.. کابرا چوە لای باخەوانەکە و سەلامی لێ کرد و پێی وت: (ياعبدالله، ما إسْمُكَ؟!) ئەی بەندەی خوا ناوت چییە؟ وتی: ناوم فلان کەسە. (لِلإسْمِ الَّذي سَمِعَ في السَّحابَةِ) هەمان ناو کە لە ناو هەورەکەدا گوێی لێبو بوو. کابرای باخەوان وتی: (ياعبدالله لِمَ تَسْألُني عَنْ إسْمي؟!) ئەی بەندەی خوا بۆچی لە ناوی منت پرسی؟! (فَقالَ: إنّي سَمِعْتُ صَوْتاً في السَّحابِ الَّذي هذا ماءُوهُ، يَقُولُ: إسْقِ حَديقَةَ فُلانٍ لِلإسْمِكَ) کابرای ڕێبوار وتی: بە ڕاستی من لە ناو ئەو هەورەدا گوێم لە دەنگێك بوو. هەر ئەو هەورەی کە ئەو بارانەی باراند و وا تۆ بە ئاوەکەی باخەکەت ئاو دەدەی. گوێم لە دەنگەکە بوو بە هەورەکەی گوت: باخی فلان کەس ئاو بدە، ڕێك ناوی تۆی گوت!! (فَما تَصْنَعُ فيها؟!) ئایا تۆ چی دەکەی لە بەرووبوومی ئەم باخە و چۆن خەرجی دەکەی و چ خێر و خێراتێکی لێ دەکەی کە خوای گەورە ئاوا ڕێزی لێ ناوی؟! خاوەن باخ وتی: (أمّا إذا قُلْتَ هذا) دەی مادام تۆ ئەو موژدە خۆشەت بە من گەیاند و لەم شتە ئاگادار بووی، ئەوا منیش ناچارم باسی خۆم و بەرهەمی ئەم باخەت بۆ بکەم، کە هیچ کەس پێی نەزانیوە. (فَإنّي أنْظُرُ إلى مايَخْرُجُ مِنْها فَأتَصَدَّقُ بِثُلُثِهِ، وَآكِلُ أنا وَعيالي ثُلُثاً، وَأرُدُّ فيها ثُلُثَهُ) رَواهُ مُسْلِم من هەموو ساڵێ، تەواوی ئەوەی بەرهەمی ئەم باخەیە حیسابی دەکەم و دەزانم چەند

بەرهەمی هەیە. دابەشــی دەکەم بە ســەر ســێ بەشــدا، سێیەکی لێ دەکەم بە خێر و خێرات و یارمەتی فەقیر و هەژاران. وە سێیەکیشی بــۆ خــۆم و ماڵ و منالّم دەی خۆین و ژیان و گوزەرانمانی پێ دابین دەکەین. سێیەکیشــی دەکەمەوە بە خەرجی و مەصرەفی باخەکەم و لە خۆیدا خەرجی دەکەمەوە..

بەڵێ بەڕێزان: ئەو جوتیار و کشــتیار و کاسبکار و دەوڵەمەندەی، کــە پارەی حەلاڵە، کــە ویژدانی زیندووە، کە بــە بەزەییە، هێندە گەورەیە لای خوا، کە فریشــتە لە ئاســماندا ناوی دێنێ و بارانی بە تایبــەت بۆ دەبارێ!! ئەم پیاوە چونکە دڵــی هەژارانی خۆش دەکرد خوای گەورەش دڵی خۆش کرد کە بارانی پێویســتی لە کاتی خۆیدا بــۆ باراند، زەویەکەی بە پیت کــرد و بەرهەمی جوانی لێ دەرچوو. دەی ئەو کەســانەی کە هەر کەسابەت و پیشەیەکتان هەیە و ئاوا لە ماڵ و سامانەکەتان ســەخاوەتمەندانە دەبەخشن، دوعا بکەن، خوای گــەورە دوعاکەتان گیرا دەکات و إن شــاء الله بارانمــان بۆ دەبارێ.. کەواتە: نوێژەبارانە پێویســتی بە هەمووەمانــە، دەوڵەمەند بە خێر و صەدەقە و بەخشــین. کاربەدەســت بە ڕاستگۆیی و دڵسۆزی لەگەڵ میللەت، پیشــەوەر بە دڵســۆزی لە کاردا، گەنــج و لاوەکانمان کوڕ و کچەکانمان بە ڕەوشــتە بەرز و ســیما موســڵمانیەتەکەیان، زانایانی ئیســلام بە گەیاندنی ئەم ڕەحمەتی ئیسلامە وەکو خۆی. هەمووەمان بە گشتی و بە تایبەتی: هەژار و نەدارەکان، دڵبەخەمەکان، بێکەس و بێدەرەتانەکان، نەناســراوەکان لە ناو کۆمەڵدا، کەسانی ڕەش و ڕووت

به جلوبەرگ و گیرفان و ماڵ. بەڵام دڵی ئاوەدان به خۆشەویستی خوا تەنها له نێوان خۆی و پەروەردگاریدا ئەم خۆشەویستییه پارێزراوه، ئەوەی که پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: (رُبَّ أَشْـعَثَ أَغْبَرَ، مَدْفُوعٌ بالأَبْوابِ، لَوْ أَقْسَمَ عَلى اللهش لأَبَرَّهُ) رَواهُ مُسْلِم

بەڵـێ ئیمانداران: ئەگەر نوێژه بارانه بەم شـێوەیه کراو، کەچی هـەر باران نەبـاری، ئەوه دەبێ جارێکی تـر بەخۆماندا بچینەوه و دڵنیابیـن کەکەم و کورتی لەخۆمانەوەیه، خوای گەوره دەفەرموێت: ﴿ وَأَلَّوِ ٱسْتَقَٰمُوا۟ عَلَى ٱلطَّرِيقَةِ لَأَسْقَيْنَٰهُم مَّآءً غَدَقًا ﴿١٦﴾ لِّنَفْتِنَهُمْ فِيهِ ۚ وَمَن يُعْرِضْ عَن ذِكْرِ رَبِّهِۦ يَسْلُكْهُ عَذَابًا صَعَدًا ﴿١٧﴾ ﴾ الجن: ١٦ - ١٧

هەروەها خـوای گەوره دەفەرموێـت: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الاعراف: ٩٦

پێغەمبەری سـەروەر و پێشـەوامان (ﷺ)، یەکـێ له هۆکارەکانی بارانەبارینمان له کاتی پێویستی خۆیدا بۆ باس دەکات و دەفەرموێ: (وَلَمْ يَمْنَعُوا زَكَاةَ أَمْوالِهِمْ، إلاّ مُنِعُوا القَطْرَ مِنَ السَّماءِ، وَلَوْلا البَهائِمُ لَمْ يُمْطَرُوا) صَحيح الجامع (٧٨٥٥)

واتـه: هەر قەوم و هۆز و گەل و میللەتێك له موسـڵمانان، زەکاتی ماڵ و سـامانیان دەرنەکەن و حەقی فەقیر و هەژارانی لێ دەرنەکەن بـەو ڕێژەی که شـەرع دیاری کردوه، ئەوا بارانیان له ئاسـمانەوه لێ دەگیرێتەوه و ئەگەر بێت و ئاژەڵ و بێزمانەکان نەبن، هەرهیچیان بۆ نەدەباری. ئەوەش که باریوه، لەبەر خاتری ئەو ئاژەڵ و بێزمانه بووه.

کەواتــە: هەنــدێ جار کــە باران نابــارێ غەزەبــی خوایە -خوا بمانپارێــزێ-، هەنــدێ جاریش هــی ئەومیە کە خوای گــەورە ئەو گــەل و میللەتــە ئاگادار دەکاتــەوە کە خەریکە غەفڵــەت ڕووی تێ دەکات. بــۆ ئــەوەی بە ئــاگا بێتەوە و لــە خوا بپارێنــەوە و خوای گەورەش دەرگای ڕەحمەتیان لێ بکاتەوە. (إن شــاء الله) ئەم بێبارانی و وشکەســاڵییەی ڕووی لە وڵاتی ئێمە کردوە، بۆ ئاگادارکردنەوەمانە و بە خەبەرکردنەوەمانە لە خەوی غەفڵەت.

بەڕێزان: زۆرجار بوە و دەشبێ کە بارانیش دەبارێ، کەچی بەڵا و ئافات بۆ ئەو کشتوکاڵ و زەرعاتە دێ و مرۆڤ لێی سوودمەند نابێ، ئەمــەش بۆ ئەوەی کە مــرۆڤ بە ئاگا بێتەوە و وا نەزانێ کە باران هەموو شــتێکە. ئەی لە گرانیەکەی ساڵەکانی سەرەتای نەوەتەکاندا بارانیــش نەبــاری و گەنم و دانەوێڵەش ئەوپەڕی گەشــەی نەکرد. کەچی ســن هات و ئــەو هەموو گەنمە بەڕەڵا کــرا و نەدوورایەوە، ئەوەشــی دوورایــەوە نانی لێ درووســت نەدەکرا. چونکە ســنەکە ناوەکەی مژی بوو.. تەنانەت ئەوەندە ســن و کیســەڵە زۆر کەوتبوو لە ناو گەنم و پەرێزەکاندا. هەندێ جار شــیری مانگاکان کە لەوێ لەوەڕا بوو. ئەوەندەی ســن خواردبوو. شــیرەکەی دەبوو بە خوێن!! بەڵــێ ئەگەر خــوای گەورە ڕەحمــان پێ نــەکات، بارانیش ببارێ هیچمان دەســت ناکــەوێ. ئەم وڵاتی کوردســتانەی خۆمان، زۆرجار تووشی تاقیکردنەوەی خوایی بووە. مامۆستا مەلا محمدی جەلی زادە، ناســراو بە مەلای گەورەی کۆیە، لە تەفسیرەکەیدا تەفسیری کوردی

ب١٠، ل٢١٩ دا دەفەرموێ: ساڵی (١٩٤٠) بە دواوە، برنج (مەرمزە) لەو ڕۆژەی شین بوو. تاوەختی دروێنەی (کوللە) دەستی لێ هەڵنەگرت، هی وا هەبوو. هیچی لە مەرمزەکەی هەڵ نەگرت، ئەمساڵ کەوا مانگی شوباطە، چەڵتوك (کۆتکی) بە ڕوبعە دینارێکە. دوو ئەوەندەی گەنم گرانە!!.

هەروەها دەفەرموێ: دوو سێ ساڵ کوللەی زەرد، کە پێی دەڵێن: (نەجدی) باغاتی نەهێشت، نەك هەر پەلك و بەری دارەکەی دەخوارد، بەڵکو پێستی -توێکڵی- دارەکەی دەخوارد!!. پاشان (ژمنگەسورە) ئەوەندە زۆر بوو، لەگەڵ پارووی نان، یان خواردنی بۆڵەترێ و دەنکە هەنجیرێکدا، ئەکەوتە ناو دەمی مرۆڤەوە و بە زمانیەوە ئەدا!!، کێ دەیتوانی بە ڕۆژ پلە گۆشتێکی بە دەستەوە بێ، یەکسەر ژمنگەسورە لە دەستی ئەسەند!! (خەڵك بە زۆری بە شەو گۆشتیان خواردووە، لەترسی ژمنگە سورە -لە هەندێ شوێنی کوردستاندا بە ژمنگەسورە دەڵێن: زەردەواڵە، کە گەورەیە، زەرگەتەش- بچوکە).

پاش ئەم ئافاتە، ئەمجا سێ ساڵان مشك دنیای وێران کرد. چەند فەلاحی لە فەلاحەت خست، زەویەکانی پێ بەرەڵلا کردن.. بەڵێ ئەگەر خوا ڕەحممان پێ نەکات بە خوا بەرگەی هێرشی مشکیش ناگرین. ئەو حەشەرە پیسە زیانبەخشە ژیانمان لێ تاڵ دەکات، ئەمجا مشك تەواو بوو.سن و کیسەڵە و کوللە و کرم و پێك برە، پەیدا بوو.. مەلای گەورە لە کۆتایی قسەکانیدا دەفەرموێ: خوا بە حورمەتی قورئان چارەیەکی بکات.. آمین.

ئیمانداران: هەر مەلای گەورەی کۆیە لە تەفسیرە بە نرخەکەیدا: (تەفسیری کوردی ب١٠، ل٢٥٧ دا دەفەرموێ: ساڵی گرانی، ساڵی (١٩٣٦) ی زاینـــی، پـــاش پەڵە، یەك جـــار لە کۆتایی مانگـــی کانونی یەکەم، مانگـــی (١٢)دا. بارانێك بـــاری. ئیتر تا بارانی پەڵەی ســـاڵی داهاتوو، باران نەباری!!.

بەڕێزان: زانینی کات و ساتی بارانبارین، کە لە چ چرکە و خولەك و کاتژمێرێك و لە ســـەر کام زەمین دەباریێ. تەنها خوای پەروەردگار خۆی دەیزانێ و، ئەوەی ئەمڕۆ زانست پێی گەیشتوە بریتییە لە وەی کە پێشبینی ئەوە دەکات لە چ کات و ساتێکدا باران دەباریێ، ئەویش بە وەی کە سەرنجی با و ڕادەی شێ و ئەمانە دەکرێ، تەنها پێشبینیە و هیچـــی تـــر، هەروەکو لە کۆنگرەی ئیعجازی زانســـتی لە قورئان و ســـوننەتدا لە ئیسلامئاباد خرایە ڕوو، لە لایەن پسپۆڕێکی هەواناسی ئەمریکییەوە بە ناوی (د.فوت) کە کۆمەڵێ لە کەشناسە موسڵمانەکانیش بەشـــداریان تێدا کرد، ئەم زانایە ناونیشانی کۆڕەکەی بریتی بوو لە: (کەی باران دەباریێ؟!) وتی: ئەمە مەتەڵێکە و تا ئەم ســـاتەش زانینی لە توانای کەســـدا نییە. پاشان بەڵگەیان بۆ ئەمە هێنایەوە و وتیان: ئێمە زانایانی ڕوانگەکاری دەتوانین پێشـــبینی ســـبەی بکەین. سبەی پلەی گەرمی چەندە؟! پاڵەپەستۆی هەوا چەندە؟! ئاڕاستەی با بەرەو کوێیە؟ لە مەدا ســـەرکەوتنی باش بە دەســـت دێنیـــن، بەڵام ئەگەر بڵێین: سبەی بارانە یان باران نییە. لە مەدا بە تەواوی سەرناکەوین، وتیان: تا باران بباریێ پێویســـتە ئاڕاســـتەی جووڵەی با بزانین، بەڵام

ڕێڕەوی با بۆ یەك ئاڕاســتەیەو، لە هیكرا تیراسای دەگۆڕێ، ئەمەش کاردەکاتە سەر پێکهاتنی هەور و پێکهاتنی باران. بۆ بارینی بارانیش دەبێ دەنكە هەلاڵە (حبوب اللقاح) هەبن. كە بریتین لە: تۆز و خۆڵ و دانك و بڕ دوكەڵ و هەندێ خوێ. كە لە دەریاوە پەرش دەبێتەوە، گەر ئەو دانكانە لوس بن ئەو کاتە دەزانین باران دەبارێ یان نا. گەر شێوەی ئەوانە چەماوەیی بێ ئەگەرەكە ئەوەندەیەو، گەر دەرزیلەیی (المدببــە) بن ئەگەرەكە ئەوەندەیە.. دەڵێین ئێســتاكە كەش ئاوایە، کەچی لە نکاوڕا تۆز و خۆڵ هەڵ دەکات و هاوكێشــەكەمان دەگۆڕێ، هەرچەنــد هەوڵ بدەین لە لایەكــەوە ڕێكی بخەین لە لایەكی ترەوە دەگۆڕێ، ئەو هۆیانەش جیاجیان و نوێ دەبنەوە!!..

بەڕێزان: هەندێ كەس دەپرسن و دەڵێن: ئەی باشە بۆ لە ئەورووپا لەگــەڵ ئــەو هەموو بەدڕەوشــتی و گوناه و بێ شــەرعیەی ئەنجام دەدرێ، کەچــی بەردەوام بارانیان بۆ دەبارێ و دنیایان ســەوزە؟! لە وەڵامــی ئەو جۆرە كەس و پرســیارەكەیاندا دەڵێیــن: خوای گەورە خۆی لە هەموو كەس باشــتر دەزانێ چی بۆ بەندەكانی باشە و ئەم گەردوونە بە دیار و نادیاریەوە، هەمووی هی خۆیەتی و چۆنی بوێ ئاوا ڕەفتاری تێدا دەکات، بەڵام دەبێ یەقینمان هەبێ كە خوای گەورە لــە دنیادا -العــدل-ە و زوڵم لە هیچ كەس نــاكات. ئەو ئەورووپیانە لە ناو وڵاتەكانیاندا. ســەرکردە و میللەتیان لە یەك بەرەدان، غەش لە كڕین و فرۆشــتنیاندا، لە كار و پیشــەیاندا زۆر كەمە، سەروەت و سامانی وڵات بۆ هەموانە، ئازاردانی یەكتر و حەسودی و چاوپیسی و

غەیبەت زۆر کەمە. هەوڵ دەدەن لە بواری زانستیدا پێش بکەون. خوای گەورەش وڵاتیان ئاوەدان دەکات، وە شوێنی جوگرافی وڵاتەکانیشیان کاریگەری خۆی هەیە بەو ڕێسایانەی کە خوای گەورە لە گەردووندا بۆ بارانی داناون، ئەوێ زۆرتری لێ دەبارێ و وڵاتیشیان سەوز دەبێت. هەرچەندە: زۆرجاریش مەرج نییە باران هەر ڕەحمەت بێ، ئەوەتا زۆر وڵات لە لافاودا غەرق بوون.. ئەو تیشـکی خۆرەی لە لای ئێمە هەیە، ئەوان عەودالّن بە شوێنیدا و خواخوایانە دەربکەوێ و خۆیان بخەنە بەر. پاشان ئەوان دەروون و ناخ و ڕوحیان تینویەتی و ئەم ئاوی قورئانە، ئاوی نەداوە و بە هەموو ئاوی سـەر زەوی و خۆشی و لەزەتەکانی تینویەتی ناشکێ، هەروەکو چۆن ئەگەر هەرچی ئاوی سـەر زەویە بە تانکەر و فڕۆکە بیکەیتە سـەر ئـەم خاکە، ئەگەر خوا بە ڕەحمی خۆی بە ئاوی بارانی ئەو ئاسمانە ئاوی نەدات، تێر ئـاو نابێ و هەرچەند خولەکێ دوای ئەوە وشـك دەبێتەوە و تەنها ڕووکەشی زەوی پێ تەڕ دەکرێ. ئەویش ڕووبەرێکی یەکجار کەمی.. بە خودا خۆشـیەکانی ئەوانیـش ئاوایە. تەنها بە ڕووکەش دڵخۆش و تەڕن. بەڵام لە ناخدا سـووتاو و تینوون، هەموو خۆشـیەکانیان ناگاتە تام و لەزەتی یەك نوێژ و سـوژدە و جومعە و جەماعەت و کۆبوونەوەیەکـی ئـاوای ئێمە و دوعا و پاڕانەوەیەکی بە کوڵمان لە خزمەت پەروەردگارماندا.. ناگاتـە لەزەتی بەربانگێکی ڕەمەزانمان طەواف و عەرەفە و حەج و عەمرەی حاجیەکمان. بەخشـندەیی و خێرەومەنـدی دەوڵەمەندێکی دڵ پڕلەئیمـان. ناگاتە لەزەتی دوو

ڕکات شـــەونوێژ و دوو دڵـــۆپ فرمێســـك كە لە ترســـی خوا هەڵی وەرێنـــێ لە تەنهاییدا!! دەی مادام قورئانمان هەیە و دڵمان ئاوەدارە، إنشـــاء الله زەویشمان تێر ئاو دەبێتەوە و هەرگیز لە ڕەحمەتی خوا مەئیویس نابین.

ئیماندارانی بەڕێز: ســـوننەتە هەموو ئەو كەســـانەی كە بەشداری نوێژەبارانە دەكەن. جلەكانی خۆیان هەڵگێڕانەوە و بە هەڵگەڕاوەیی لە بەری بكەن، كە ئەمەش ڕەمزە بۆ جارێكی تر لە دایكبوونەوە، كە هەموو ئەو خەڵكە لە كاتی ئەم جلوبەرگهەڵگێڕانەوە بە زمانی حاڵ دەڵێن: خوایە گیان ئەوەی لەوەو پێش كردوومانە لێی دەگەڕێین، واز لە هەموو ئەوانە دەهێنین كە بووبوونە ڕێگر لە ڕێگەی ئەوەی ئێمە بتوانین ڕاستەوخۆ مامەڵە لەگەڵ تۆ بكەین. كە ئەگەر جلەكانیشمانە، ئـــەو جلوبەرگەكانیشـــمان هەڵ دەگێڕینەوە.. (ئا لـــەم كاتەدا هەموو خەڵكەكە جلوبەرگەكانیان هەڵ دەگێڕنەوە). با هەموومان دەســـتمان بـــۆ لای خـــوای خالقمان، ڕازقمـــان، پەروەردگارمان بـــەرز بكەینەوە بڵێیـــن: خوایە گیان، ئەی خوایەك كە بەزەیی و میهرەبانی و ســـۆز و ڕەحمەتـــت هەمـــوو جیهانـــی گرتۆتەوە. ئەی خوایـــەك كە چرای نور و ڕەحمەت و موحیبەت و خۆشەویســـتیت ئاســـمانی ژیان و دڵی بەندەكانت ڕووناك دەكاتەوە. ئەی خوایەك كە بە گەورەیی و چاكی و جوانی و باشـــیەكانت مامەڵەمان لەگەڵ دەكەیت و لوتف و سۆز و لێبوردنت گوناهو خراپی و هەڵە و كەم و كورتیەكانمان فەرامۆش و لە بیر دەكات. ئەی خوایەك كە بە بارانی ڕەحمەت دڵ و دەروون و

چاومانــت پاك و ڕووناك كــردەوە، ئیلاهی، داوات لێ دەكەین و لێت دەپاڕێینەوە، كە با زیاتر لە وەی ئێستا باراندووتە، بارانی ڕەحمەتت بــەردەوام بێــت. تكات لێ دەكەین و بە كــوڵ و بەدڵ و موحتاجانە، وەك كشــتیار و جوتیــار و وەرزێكــی چاو لە گریانی ئاســمان، لێت دەپاڕێینەوە كە لەم بێئاوی و وشكەساڵی و وشكبوونی بیر و كانی و كارێــز و ڕووبارە، نەجاتمان بــدەی و بە بارانی ڕەحمەتت خۆمان و دەشت و دەر و باخ و بێستان و مەزراكانمان ببوژێنەوە.. پەروەردگارا داوای بە كوڵ و تكات لێ دەكەین كە خۆمان و وڵات و شار و گوند و ماڵ و منداڵمان بپارێزی لە بارانێك كە ببێتە هۆی بەڵا و موصیبەت و ڕووخــان و وێرانــكاری و مەرگی ئازیزانمان.. یــارەب دەپاڕێینەوە لێــت و بەم نزایەش داوای بارانی ڕەحمەتــت لێ دەكەین و دەڵێین: (اللّهُمَّ اسْــقِنا غَيْثاً مُغيثاً هَنيئاً مَريئــاً وَلاتَجْعَلْنا مِنَ القانِطينَ، اللّهُــمَّ طَيِّباً نافعاً، سُــبْحانَ مِنْ يُسَبِّحُ الرّعْدُ بِحَمْدِهِ وَالمَلائِكَةُ مِنْ خيفَتِهِ.. خوایە گیان هەروەكو هەموو جارێ تاوەبارانی ڕەحمەتت زەوی و زار و دار و درەختەكانی پاك كردۆتەوە. داوات لێ دەكەین كە هەر بەو شــێوەیەش بە بارانی لێبوردن و خۆشەویســتی و ڕەحمەتــت، دڵ و دەروونمان لە هەڵە و گوناه و خراپە و تاوان پاك بكەرەوە..

ئیلاهــی، داوای بارانــی ڕەحمەتــی بەردەوامــت لــێ دەكەیــن و نائومێدمــان مەكە، تكای كڵۆڵی و ئاتاجی و نیازمەندیمان دەهێنینە دیوانی بە ئامانەت و دەپاڕێینەوە لێت كە هەرگیز بە وشكەســاڵی و بێئاوی و گرتنەوەی بارانی ڕەحمەتت، زیاتر لەوە تاقیمان مەكەرەوە.

نەکا بەرگە نەگرین و تووشی ناشکوری و هەڵە و گوناه ببین.

خوایـــە گیان: ئەی پەروەردگاری بە میهر و خاوەن لوتف و ســـۆز بەرامبەر بە سەرجەم دروستکراو و بەندەکان. دواجار ئێمەش لەگەڵ -حەسیب قەرەداغی- شاعیردا لێت دەپاڕێینەوە و دەڵێین:

خوایە داکەیت شەستی ڕەحمەت. مەزرەعەی دڵ تەژنەیە.

ڕەحمەتی تۆ بێشومارە و چاوم هەر لەو خەزنەیە.

ئێمە بەندە و دەستە و دوعاین، تۆ غەفوریت و کەریم.

بۆمی ڕابێنە لەسەر خێر، نەفسی ئەممارە و سەقیم.

واعْلَمُوا أَيُّها المُؤمِنُونَ: لَقَدْ أَنْزَلَ اللّٰه غَيْثَيْنِ لِعِبادِهِ:

أَوَّلُهُما: غَيْثُ القُلُوبِ وَالأرْواحِ. بِما أَنْزَلَ اللّٰه مِنَ الوَحيِ عَلى أَفْضَلِ رُسُلِهِ وَخاتَمِهِمْ. مُحَمَّدٍ (ﷺ) وَهذا الغَيْثُ هُوَ مايَفْتَقِدَهُ النّاسُ اليَوْمَ عَلى الحَقيقَةِ. بَـلْ إِنَّ ضَرُورَتَهُمْ إِلَيْهِ وَحاجَّتَهُمْ لَهُ أَشَـدُّ وَأَكْبَرُ مِنَ الغَيْث الثاني. الَّذي هُوَ غَيْثُ الأَرْضِ بالأَمْطارِ.. وَواجِبٌ عَلَيْنا أَنْ نَهْتَمَّ بِغَيْثِ القُلُوبِ وَالأَرْواحِ. لأَنَّ بِهِ سَعادَةً الدُّنيا وَالآخِرَةِ. وَحُصُولَ الغَيْثِ الآخَرِ. يَقُـولُ عَزَّوَجَـلَّ: ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾ الاعراف: ٩٦

## سەرچاوەکان:

١. ئایندەی هەسارەکەمان. م.شەماڵ موفتی، ل٦٤.

٢. الفِقْــهُ المَنْهَجــي عَلــى مَذْهَب الإمــام الشّــافِعي. د.مصطفى الخِن. د.مصطفى البُغا. عَلي الشربجي. ج١ ص٢٤٤.

٣. مَوافِقٌ ضَحِكَ فيها النَبيُّ (ﷺ). خَميس السَّعيد محمد. ص٧٢.

٤. الوَصايا المِنْبَرِيَة. محمد بحيري. ج٢ ص٥٤٢.

٥. مَوْسُوعَة الإعْجاز القُرْآني. د.نادية طَيّارَة. ج٢ ص٢٦٩.

٦. الجامِع في الدُّعاءِ النّافِع. صالح طه عبدالواحِد. ص٣٦٦.

٧. تەفسـیری کوردی، مەلا محمدی جەلی زادە، مەلای گەورەی کۆیە، ب١٠، ل٢١٩، ل٢٥٧.

٨. گۆڤاری هەیڤ، ژ: ١٩، ل٣١، ل٢٩.

٩. گۆڤاری دوانگە، ژ: ٤٠، ل٢٩.

١٠. گەردوون ناسی، محمد حسن سەرگەینێلی، ل٣٩١.

١١. ڕۆژنامەی (دەستور) ژ: ٦٠ لە ٢٠١٠/١٢/٨ ل١٠، بابەتێکی: (تەحسین حمە غەریب).

١٢. ڕۆژنامەی (یەکگرتوو) ژ: ٧٧١، ل١٠، نوسینێکی: هەستیار هەورامی.

١٣. خُطب الشَّيْخ عبدالرحْمن السُّدَيس - ج١ ص٦٤٩.شیرینی پێویست

# وتاری عەرەبی

الحَمْدُلِلّهِ حَمْداً كَثيْراً مُبارَكاً، وَأَشْهَدُ أَن لا إِلهَ إِلاّ اللّه وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولهُ، صَلَّى اللّه عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ وَسَلَّمَ تَسليماً كَثيراً..

أَما بَعْدُ أَيُّها النّاسُ، إِتَّقُوا اللّه حَقَّ التَقْوى. وَاسْتَمْسَكُوا مِنَ الإِسْلام بالعروَةِ الوثْقَى، وَعَلَيْكُمْ بالصِّدْقِ، فَإِنّهُ وَصيَّةُ كُلِّ نَبيٍّ، وعَلَيْكُمْ بِالرِّفْقِ فَإِنَّ اللّه تَعالى يُحِبُّ الرِّفْقَ في كُلِّ شأنٍ، وَعَلَيْكُمْ بالْبِشْرِ فَإِنَّهُ أَوَّلُ البِرِّ. وَعَلَيْكُمْ بالمُحافَظَةِ عَلى دينِكُمْ، وَعَلَيْكُمْ بالْقَصْدِ في سائِرِ أُمُورِكُمْ، وَعَلَيْكُمْ بِمَكارِمِ الأَخْلاقِ، فَإِنَّ مَكارِمَ الأَخْلاقِ مِنْ أَعْمالِ أَهْلِ الجَنَّةِ، وَعَلَيْكُمْ بالصَّبْرِ، فَإِنَّ اللّه يُحِبُّ الصّابِرينَ، وَيثبتهم، كَما يثبت الأَنبياءَ، وَعَلَيْكُمْ بِحِفْظِ أَلْسِنَتِكُمْ، فَإِنَّهُ لايَكُبُّ النّاسُ عَلى مَناخِرِهِمْ في جَهَنَّمَ إِلاَّ حَصائِدُ أَلْسِنَتِهِمْ، وَعَلَيْكُمْ بِهذا القُرْآنِ، اجْعَلُوهُ إِمامَكُمْ وَقائِدَكُمْ، أَحَلُّوا حَلالَهُ، وَحَرِّمُوا حَرامَهُ، وَعَلَيْكُمْ بِسُنَّةِ نَبِيِّكُمْ، وَسُنَّةَ الأَئِمَةِ المَهْدِّيينَ مِنْ بَعْدِهِ، تُنْجِكُمْ مِنَ العَذابِ..

وَاسْتَمْسَكُوا بِثَلاثٍ: الصِّدقِ في الحَدْيثِ، وَالوَفاءِ بالْعَهْدِ، وَأَداءِ الأَمانَةِ، فَإِنَّهُنَّ وَصِيَّةُ الأَنْبِياءِ إِلى الأُمَمِ، وَعَلَيْكُمْ بالتَّواصُلِ وَالتَّعاطُفِ،

وَبرُّوا إخْوانَكُمْ وَلَوْ بالسَّلام، عَلَيْكُمْ ببِرِّ الوالِدَيْن. فَإنَّهُما رَحْمَةٌ مِنَ اللّهِ. وَأَحْسِنُوا إلى عَمّالِكُمْ وَخدّامِكُمْ، وَمَنْ جَعَلَهُمُ اللهُ تَحْتَ أَيْديكُمْ. أَعُوذُ باللّهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيم: (وَتَعاوَنُوا عَلى البِرِّ وَالتَّقوى، وَلاتَعاوَنُوا عَلى الإثْمِ وَالعُدْوانِ، واتَّقُوا اللهَ إنَّ اللهَ شَديدُ العِقاب).. نبهني اللّه وَإيّاكُمْ مِنْ نَوْمَةِ الغافِلين. وَحَشَرَني وَإيّاكُمْ تَحْتَ لِواءِ سَيِّدِ المُرْسَلينَ. اللّهُمَّ آمين..

الحَمْدُللّهِ الَّذي مَنْ تَوَكَّلَ عَلَيْهِ بِصِدْقِ نِيَّةٍ كَفاهُ. وَمَنْ تَوَسَّلَ إلَيْهِ باتباعِ شَريعَتِهِ قَرَّبَهُ، وَأَدْناهُ. وَمَنْ تَوَسَّلَ إلَيْهِ بخالِصِ أَدْعِيَتِهِ أَجابَهُ وَلَبّاهُ. وَمَنْ اسْتَنْصَرَ بِهِ عَلى أَعْدائِهِ. وَحسَدَتِهِ. نَصَرَهُ وَتَوَلاهُ.. أَحْمَدُهُ. سُبْحانَهُ وَتَعالى. وَأَشْكُرُهُ عَلى ماأَعْطاهُ. وَأَشْهَدُ أَن لا إلهَ إلاّ اللّه وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ. إلهٌ لَيْسَ لَنا رَبٌّ سِواهُ. وَأَشْهَدُ أَنَّ سَيِّدنا وَنَبيَّنا مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ. الَّذي أَعْطاهُ اللّه مِنَ الفَضْلِ فَوْقَ مايَتَمَناهُ. صَلّى اللّه عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ وَمَنِ اتَّبَعَ أَثَرَهُ مِنْ يَوْمِنا إلى يَوْمِ نَلْقاهُ...

أَما بَعْدُ: أُصيكُمْ عِبادَ اللّه. وَنَفْسِيَ الخاطِئَةَ قَبْلَكُمْ بِتَقوى اللّهِ الكَريمِ وطاعَتِهِ. وَلُزُومِ أَوامِرِهِ وَكَثْرَةِ مَخافَتِهِ. فَإنَّ اللّه مَعَ الَّذينَ اتَّقَوا وَالَّذينَ هُمَّ مُحْسِنُونَ..

وَاعْلَمُوا ياعِبادَ اللّهِ: أَنَّهُ لَيْسَ لأَحَدٍ شَيٌْ إلاّ ماقَدَّرَهُ اللّه. وَأَمْضاهُ. وَتَوَسَّلُوا إلى رِضا مَوْلاكُمْ كُلُّ مِنْكُمْ عَمّا لايَعْنيهِ بِما عَناهُ. وَلايَبْغي بَعْضُكُمْ عَلى بَعْضٍ، فَإنَّ اللّه قاصِمُ البغاة. وَلاتَجْعَلُوا الدُّنيا الدَّنِيَةِ أَكْبَرَ هَمِّكُمْ، فَقَدْ خابَ وَخَسِرَ مَنْ عَبَدَ دُنياهُ. واجْعَلُوا

الآخِرَةَ مَطْلُوبَكُمْ. فَإِنَّما هِيَ دارُ القَرارِ وَالحَياةِ... وَاعْلَمُوا أَنَّ نِيَّةَ العَبْدِ تَقُومُ مَقامَ عَمَلِهِ. وَإذا أَحْسَنَ العَبْدُ في عِبادَةِ رَبِّهِ. وَوَطَّنَ نفسه عَلى الأَعْمالِ الفاضِلَةِ. الشّاقَةِ. سَهَّلَ اللهُ لَهُ الأُمُورَ. وَهَوَّنَ عَلَيْهِ صِعابُها. وَرُبَّما انْقَلَبَتِ المَخاوِفُ أَمْناً. وَتَبَدَّلَتِ المِحْنَةُ مِنْحَةً. وَاعْلَمُوا: أَنَّ مَنِ اعْتَمَدَ عَلى اللهِ. كَفاهُ وَمَنْ سَأَلَهُ أَعْطاهُ. وَمَنْ اسْتَغْنَى بِهِ عَنْ غَيْرِهِ. أَغْناهُ.... أَعُوذُ باللهِ مِنَ الشَّيْطانِ الرَّجيم: (الَّذينَ قالَ لَهُمُ النّاسُ، إنَّ النّاسَ قَدْ جَمَعُوا لَكُمْ فَاخْشَوْهُمْ، فَزادَهُمْ إِيماناً وَقالُوا: حَسْبُنا اللهُ وَنِعْمَ الوَكيل).. رَبَّنا آتِنا في الدُّنيا حَسَنَة وَفي الآخِرَةِ حَسَنَةً وَقِنا عَذابَ النارَ - اللّهُمَّ آمين.

الحَمْدُللهِ الَّذي أَرْسَلَ رَسُولَهُ بالْهُدى وَديْنِ الحَقِّ لِيُظْهِرَهُ عَلى الدِّينِ كُلِّهِ. وَكَفَى باللهِ شَهيداً. أَحْمَدُهُ تَعالى وَأَشْكُرُهُ. وَأَتُوبُ إِلَيْهِ وَأَسْتَغْفِرُهُ. وَأُثْنِيْ عَلَيْهِ الخَيْرَ كُلَّهُ. تَعْظيماً لِشَأْنِهِ وَتَمْجيداً...

وَأَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ. إِيْماناً بِهِ وَتَوْحيداً. وَكُفْراً بِما سِواهُ وَتَنْديْدا. وَأَشْهَدُ أَنَّ نَبِيَّنا مُحَمَّداً عَبْدُ اللهِ وَرَسُولُهُ. وَصَفِيُّهُ وَحَبيبُهُ. أَرْسَلَهُ هادِياً وَمُبَشِّراً وَنَذِيْراً. وَداعِياً إِلى اللهِ بِإِذْنِهِ وَسِراجاً مُنيراً. أَيَّدَهُ بالْمُعْجِزاتِ الباهِرَةِ. وَالآياتِ الظّاهِرَةِ. وَاخْتَصَّهُ بِالْحُجَّةِ القاهِرَةِ. وَالمِلَّةِ الطّاهِرَةِ. تَرَكَنا عَلى المَحَجَّةِ البَيْضاءِ لَيْلُها كَنَهارِها. لايَزيغُ عَنْها إلاّ هالِكٌ. فَصَلَّى اللهُ وَبارَكَ عَلَيْهِ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ وَأَزْواجِهِ وَذُرِّيَتِهِ. وَمَنِ اسْتَنَّ بِسُنَّتِهِ. وَاقْتَفَى أَثَرَهُ. صَلاةً مُتَتابَعَةً عَديدَةً. وَبَرَكاتٍ مُتَعاقِبَةً مَديدَةً. وَسَلَّمَ تَسْليماً مَزيْداً...

أَما بَعْدُ: أُوصِيكُمْ عِبادَ اللهِ وَنَفْسي قَبْلَكُمْ بِتَقْوى اللهِ وَطاعَتِهِ (يأَيُّها الَّذينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقاتِه وَلاتَمُوتُنَّ إلاّ وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ).

أَيُّها المُسْلِمُونَ: إنَّ حاجَةَ الأُمَّةِ إلى مَعْرِفَةِ سِيرَةِ الحَبيبِ المُصطَفى وَالإقْتِباسِ مِنْ مِشْكاةِ النُّبُوَّةِ، فَوْقَ كُلِّ حاجَةٍ، بَلْ إنَّ ضَرُورَتَها إلى ذاكَ فَوْقَ كُلِّ ضَرُورَةٍ، فَكُلُّ مَنْ يَرْجُوا اللهَ وَاليَوْمَ الآخِرَ، يَجْعَلُ الرَّسُولَ - عَلَيْهِ الصَّلاةُ وَالسَّلامُ - قُدْوَتَهُ، وَالمُصْطَفى (ﷺ) أُسْوَتَهُ، كَما قالَ عَزَّوَجَلَّ: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُواْ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْآخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب: ٢١

نَسْأَلُ اللهَ بِأَسْمائِهِ الحُسْنَى، وَصِفاتِهِ العُلا، أَنْ يَجْعَلَنا هُداةً مُهْتَدينَ، غَيْرَ ضالِّينَ وَلامُضِلِّينَ، عَلى الإيمانِ نَحْيا، وَعَلى العَقِيدَةِ الصَّحيحَةِ نَمُوتُ، وَعَلَيْها نُبْعَثُ يَوْمَ الدِّيْنِ. أَقُولُ قَوْلي هذا، وَأَسْتَغْفِرُ اللهَ لي وَلَكُمْ وَلِجَميعِ المُسْلِمينَ، فَاسْتَغْفِرُوهُ، إنَّهُ هُوَ الغَفُورُ الرَّحيمُ..

الحَمْدُللهِ الواحِدِ الأَحَدِ، الفَرْدِ الصَّمَدِ، الَّذي لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ، وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَدٌ، أَحْمَدُهُ حَمْداً لايُحَدُّ، وَأَشْكُرُهُ شُكْراً لايُعَدُّ، وَأَشْهَدُ أَن لا إلهَ إلاّ اللهُ وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ، وَلاصاحِبَةَ وَلاوَلَدَ، وَأَشْهَدُ أَنَّ سَيِّدِنا مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ، بُعِثَ إلى الأَبْيَضِ وَالأَحْمَرِ وَالأَسْوَدِ، اللَّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ الدَّاعِي إلى سَبيلِ الرُّشْدِ، وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ، وَمَنْ جَدَّ في مُتابَعَتِهِ وَاجْتَهَدَ..

أَما بَعْدُ فَيا عِبادَ اللهِ، أُوصيكُمْ وَنَفْسي قَبْلَكُمْ بِتَقْوى اللهِ وَطاعَتِهِ، إتَّقُوا اللهَ تَعالى وَأَطيعُوهُ، فَيَجْعَلْ لَكُمْ مِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجاً، وَمِنْ كُلِّ ضِيْقٍ مَخْرَجاً، وَمَنْ يَتَّقِ اللهَ يَرْزُقْهُ سَعادَةَ الأَبَدِ، وَيُبارِكْ

**لَهُ في الأَهْلِ وَالمالِ وَالْوَلَدِ.. هذا وَإنَّ نَبيَّكُمُ الأَعْظَمَ (ﷺ) لَيَقُولُ:**
(لاتَحاسَدُوا، وَلاتَناجَشُوا، وَلاتَباغَضُوا، وَلاتَدابَرُوا، وَلايَبِعْ بَعْضُكُمْ عَلى بَيْعِ بَعْضٍ، وَكُونُوا عِبادَ اللهِ إخْواناً، المُسْلِمُ أَخُوا المُسْلِمِ: لايَظْلِمُهُ وَلايَخْذُلُهُ، وَلايَحْقِرُهُ، التَّقْوى هاهُنا (وَيُشيرُ إلى صَدْرِهِ ثَلاثَ مَرّاتٍ) بِحَسَبِ امرِئٍ مِنَ الشَّرِّ أَنْ يَحْقِرَ أَخاهُ المُسْلِمِ، كُلُّ المُسْلِمَ عَلى المُسْلِمِ حَرامٌ: دَمُهُ وَمالُهُ وَعِرْضُهُ) رواهُ مُسْلِم

**فَاتَّقُوا اللهَ عِبادَ اللهِ حَقَّ تَقْواهُ، وَصَلُّوا وَسَلِّمُوا عَلى مَنْ أُمِرْتُمْ بالصَّلاةِ وَالسَّلامِ عَلَيْهِ عُمُوماً، بِقَوْلِهِ تَعالى - وَلَمْ يَزَلْ قائِلاً عَليماً: (إنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ يُصَلُّونَ عَلى النَبِيِّ، يأَيُّها الَّذينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْليماً). فَأَكْثِرُوا مِنَ الصَّلاةِ عَلَيْهِ تَكُونُوا مِنَ الفائِزينَ، اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ عَلى عَبْدِكَ وَرَسُولِكَ مُحَمَّدٍ خاتَمِ النَبيِّنَ وَإمامَ المُرْسَلينَ. وَارْضَ اللّهُمَّ عَنِ الأَرْبَعَةِ الخُلَفاءِ الرَّاشِدينَ، ذَوي الفَضْلِ الجَلِيِّ وَالقَدْرِ العَلِيِّ، ساداتِنا وَأَئِمَّتِنا أَبي بَكْرٍ وَعُمَرَ وَعُثْمانَ وَعَلِيٍّ. وارْضَ اللّهُمَّ عَنْ عَمَّيْ نَبِيِّكَ حَمْزَةَ وَالعَبّاسِ. وَعَنِ السِّبْطَيْنِ السَّعيدَيْنِ، أَبي مُحَمَّدٍ الحَسَنِ، وَأَبي عَبْدِاللهِ الحُسَيْنِ. وَعَنْ أُمِّهِما فاطِمَةَ الزَّهْرا، وَعَنْ جَدَّتِهِما خَديجَةَ الكُبْرى. وَعَنْ زَوْجاتِ نَبِيِّكَ الطّاهِراتِ أُمَّهاتِ المُؤمِنينَ، وَعَنِ الصَّحابَةِ أَجْمَعينَ، وَعَنِ التّابِعينَ لَهُمْ بِإحْسانٍ إلى يَوْمِ الدِّينِ، وَعَنّا مَعَهُمْ بِمَنِّكَ وَكَرَمِكَ ياأَكْرَمَ الأَكْرَمينَ..**

**اللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤمِنينَ وَالمُؤمِناتِ، وَالمُسْلِمينَ وَالمُسْلِماتِ، الأَحْياءِ مِنْهُمْ وَالأَمْواتِ. اللّهُمَّ اشْفِ مَرْضانا، وَعافِ مُبْتَلانا، وَارْحَمْ مَوْتانا، وَخُذْ بِأَيدينا إلى كُلِّ خَيْرٍ، وَاعْصِمْنا مِنْ كُلِّ شَرٍّ، واجْعَل هذا البَلَدَ كُرْدُسْتانَ، وَسائِرَ بِلادِ المُسْلِمينَ، رَخاءً، سَخاءً، آمِناً، مُطْمَئِناً، وَعامِراً**

بالإيمان. وَلاتُؤاخِذنا بِما فَعَلَ السُّفَهاءُ مِنّا... اللّهُمَّ اعِنّا عَلى المَوْتِ وَسَكْرَتِهِ. وَالقَبْرِ وَظُلْمَتِهِ. وَالمَوْقِفِ وَكُرْبَتِهِ. وَالصِّراطِ وَزَلَّتِهِ. ياحَيُّ ياقَيُّوم. اللّهُمَّ اجْعَلْنا مَعَ الَّذينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ مِنَ النَبيِّنَ وَالصِّديقينَ وَالشُّهَداءِ وَالصّالِحينَ. وَحَسُنَ أُولئِكَ رَفيقاً. آمين يامُجيبَ السّائِلينَ.

عِبادَاللّهِ. (إِنَّ اللهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالإِحْسان وَإِيتاءِ ذي القُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الفَحْشاءِ وَالمُنْكَرِ وَالبَغْي، يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ). فَاذْكُرُوا اللهَ العَظيمَ يَذْكُرْكُمْ . وَشْكُرُهُ عَلى نِعَمِهِ يَزِدْكُمْ. وَلَذِكْرُ اللهِ أَكْبَرُ. وَاللهُ يَعْلَمُ ماتَصْنَعُونَ..

الحَمْدُللّهِ الَّذي يَقْبَلُ التَوْبَةَ عَنْ عِبادِهِ. وَيَعْفُوا عَنِ السَّيِّئاتِ. نَحْمَدُهُ تَعالى وَنَشْكُرُهُ. وَنَتُوبُ إِلَيْهِ وَنَسْتَغْفِرُهُ. وَنَعُوذُ بِهِ مِنَ الشُّرُورِ وَالخَطيئاتِ. وَأَشْهَدُ أَن لا إِله إِلاّ اللّهُ وَحْدَهُ لاشَريكَ لَهُ. غَفّارُ الذُّنُوبِ. وَسَتّارُ العُيُوبِ. وَقابِلُ التَّوْبَةِ مِمَّنْ يَتُوبُ. فَسُبْحانَهُ مِنْ إِلهٍ كَريمٍ تَوّاب. يُحِبُّ مِنْ عِبادِهِ كُلَّ مُتَطَهِّرٍ أَوّابٍ. وَأَشْهَدُ أَنَّ نَبِيَّنا مُحَمَّداً عَبْدُ اللّهِ وَرَسُولُهُ. وَمُصْطَفاهُ وَخَليلُهُ. سَيِّدُ المُسْتَغْفِرينَ وَالتّائِبينَ. وَخاتَمُ الأَنْبياءِ وَالمُرْسَلينَ. اللّهُمَّ صَلِّ وَسَلِّمْ وَبارِكْ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ الطَّيِّبينَ الطّاهِرينَ. وَعَلى أَزْواجِهِ أُمَّهاتِ المُؤمِنينَ. وَعَلى التّابِعينَ وَمَنْ تَبِعَهُمْ بِإِحْسانٍ إِلى يَوْمِ الدِّينِ..

أَما بَعْدُ فَيا أَيُّها المُسْلِمونَ. إِتَّقُوا اللّهَ رَبَّكُمْ وَأَطيعُوهُ. وَراقِبُوهُ وَلاتَعْصُوهُ. وَتُوبُوا إِلَيْهِ وَاسْتَغْفِرُوهُ.

وَصَلُّوا وَسَلِّمُوا - رَحِمَكُمُ اللّهُ -. عَلى سَيِّدِ الأَوَّلينَ وَالآخِرينَ. كَما أَمَرَكُمْ بِذالِكَ رَبُّ العالَمينَ. فَقالَ تَعالى قَوْلاً كَريماً: (إِنَّ اللهَ وَمَلائِكَتَهُ

يُصَلُّونَ عَلى النَبِيّ، يأَيُّها الَّذينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وَسَلِّمُوا تَسْليماً). اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ وَعَلى آلِهِ وَأَصْحابِهِ. فَيا أَيُّها العاشِقُونَ بَدْرَ جَمالِ المُصْطَفى في القِيامَةِ. وَالمُشْتاقُونَ لِزِيارَتِهِ. وَالمُحتاجُونَ لِشَفاعَتِهِ. صَلُّوا عَلَيهِ وَسَلِّمُوا تَسْليماً.. اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِ محمد. اللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤمِنينَ وَالمُؤمِناتِ. وَالمُسْلِمينَ المُسْلِماتِ. الأَحْياءِ مِنْهُمْ وَالأَمْواتِ. اللّهُمَّ اجْعَلِ القُرْآنَ الكريم رَبيعَ قُلُوبِنا. وَذهاب هُمُومِنا وَأَحْزانِنا اللّهُمَّ اجْعَلِ القُرْآنَ الكريم حُجَّةً لَنا لاعَلَيْنا. اللّهُمَّ اجْعَلْهُ لَنا في القَبْرِ مؤنَساً وَعَلى الصِّراطِ دَليلاً. وَإِلى الجَنَّةِ هادِياً. اللّهُمَّ اشْفي مَرْضانا وَارحَمْ مَوْتانا وَعافي مُبْتَلانا بِرَحْمَتِكَ ياأَرْحَمَ الرَّحِمين..

الحَمْدُللهِ. الحَمْدُللهِ الَّذي كانَ بِعِبادِهِ خَبيراً بَصيراً. وَتَبارَكَ الَّذي جَعَلَ في السَّماءِ بُرُوجاً وَجَعَلَ فيها سِراجاً وَقَمَراً مُنيراً. وَهُوَ الَّذي جَعَلَ اللَّيْلَ وَالنَّهارَ خِلْفَةً لِمَنْ أَرادَ أَنْ يَذَّكَّرَ أَوْ أَرادَ شُكُوراً.

وَالصَّلاة والسَّلام عَلى مَنْ بَعَثَهُ رَبُّهُ هادِياً وَمُبَشِّراً وَنَذيراً. وَداعِياً إِلى اللهِ بِأذْنِهِ وَسِراجاً مُنيراً.

أَمّا بَعْدُ أُوصيكُمْ عِبادَاللهِ وَنفسي قبلكم بتقوى الله الكريم وطاعَتِهِ. فَإِنَّ الله مَعَ الَّذينَ اتَّقَوا وَالَّذينَ هُمْ مُحْسِنونَ.

أَيُّها الناس: صَلُّوا وَسَلِّمُوا عَلى رَسُولِ الهِدايَةِ وَعَلى مُعَلِّم البَشَرِيَّةِ. (إِنَّ الله وَمَلائِكَتَهُ يَصَلُّونَ عَلى النَبِيّ، يأَيُّها الَّذينَ آمَنُوا صَلُّوا عَلَيْهِ وسَلِّمُوا تَسْليماً). اللّهُمَّ صَلِّ عَلى سَيِّدِنا محمد وَعَلى آلِهِ وَصَحْبِهِ وَسَلَّمَ تَسْلِماً كَثيراً..

اللّهُمَّ اغْفِرْ لِلْمُؤمِنينَ وَالمؤمِنات، وَالمُسْلِمينَ وَالمُسْلِماتِ، الأَحْياء مِنْهُمْ وَالأَمْوات مِنْ أَهْلِ السُّنَةِ الجُمُعَةِ وَالجَماعات.. اللّهُمَّ حَبِّبْ إلَيْنا الإيمان وَزَيِّنْهُ في قلُوبِنا، وَكَرِّه إلَيْنا الكُفْرَ وَالفُسُوقَ وَالعِصيانَ وَاجْعَلنا مِنَ الرَّاشِدينَ. اللّهُمَّ نَوِّرْ عَلى أَهْلِ القُبُور قُبُورَهُمْ، وَاغْفِرْ لِلأَحْياءِ وَيَسِّرْ لَهُمْ أُمُورَهُمْ... نَسْأَلُكَ اللّهُمَّ إصْلاحاً في الوَلَدِ، وَالأَمْنَ في البَلَدِ، وَالعافِيَةَ في الجَسَدِ، اللّهُمَّ ارْحَمْ مَوتانا، وَاشْفي مَرْضانا، وَفُكَّ أَسرانا، و عافي مُبْتَلانا.. اللّهُمَّ أَحيْنا وَأَمِتْنا عَلى مِلَّةِ رَسُولِ اللّهِ واحْشُرْنا تَحْتَ لِوائِهِ، وَفَوِّزْنا بِشفاعَتِهِ. ياأَكْرَمَ الأَكْرَمينَ.

اللّهُمَّ اجْعَلْ بِلادَنا كُرْدُسْتانَ هذهِ وَسائِرَ بِلادِ المُسْلِمينَ رَخاءً سَخاءً آمِناً مُطْمَئِنّاً وَعامِراً بالأِيمانِ. آمين يامُجيبَ السّائِلين.

عِبادَ اللّهِ: إنَّ اللهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْل وَالأحسْان وَإيْتاءِ ذي القُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الفَحْشاءِ وَالمُنْكَرِ وَالبَغى يَعِضُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ.